**حکومەتی هەرێمی کوردستان**

**وەزارەتی ڕۆشنبیری**

**بەڕێوەبەرایەتی خانەی وەرگێڕان**

- **ناوی کتێب**: سایکۆلۆژیی ژیانی هاوسەرێتی
- **نووسەر**: د. عەبدولحەلیم سەمعان
- **وەرگێڕانی لەعەرەبییەوە**: سۆزان جەمال
- **پیتچنین**: سۆزان جەمال
- **دیزاینی ناوەرۆك و بەرگ**: زانا کەمال
- **تیراژ**: ١٠٠٠
- **زنجیرە**: ١٧٠
- **چاپخانە**: کارۆ
- **چاپ**: چاپی یەکەم
- **ژمارەی سپاردن**: (٨٠٥) ساڵی ٢٠٠٧


**پێشکەشە بە:**

**هەردوو جگەرگۆشەی خۆم ژیلاو ژالیا گیان**


**سوپاس بۆ هاوڕێ و هاوسەرو هاوژیانی خۆشەویستم لوقمان غەفوور کە لەوەرگێڕانی ئەم کتێبەدا هاوکارییەکی بێسنووری کردم.**

## پێشەکییەکی کورت

**هاوسەرێتی: ئامانج، یان هۆکارێکی گەیشتن بە بەختیاری؟**

**نووسینی: د.رەفیق سابیر**

١

هێشتا هاوسەرێتیو پاراستنی خێزان، وەك دەزگایەکی کۆمەڵایەتی، لەدنیادا بایەخی زۆری پێدەدرێت، بەڵام خێزانو هاوسەرگیریی، وەك هەر دیاردەیەکی دیکەی کۆمەڵایەتی، بە تایبەتی لەخۆرئاوادا، گۆڕانی زۆریان بەسەردا هاتوون. چیتر خێزان ئەو دەزگا کۆمەڵایەتییە پیرۆزە نییە کە هەڵوەشاندنەوەی بە شورەییو هەڵە دابندرێت تا مرۆڤ ئامادەبێت، بە هەر نرخێك بێت، پارێزگاریی بکات. دوو مرۆڤ، لەرێگای پەیوەندییەکی هاوتاوە، شەیداو هۆگری یەکتری دەبن، خۆیان بڕیاردەدەن، بەو شێوەیەی بە باشی دەزانن، پێکەوە بژینو خێزان پێکبهێنن. کاتێك زانییان ناتوانن پێکەوە بژین، لە نێوان ئازاری جیابوونەوەو ماڵێکی هاوبەشیی دۆزەخئاسادا، یەکەمیان هەڵدەبژێرن، بێئەوەی لەرووی کۆمەڵایەتییەوە باجێك بدەن.

ئەو گۆڕانە گەورانەی لە ئەوروپاو خۆرئاوادا، وەك ئەنجامێکی حەتمی بە مۆدێرنکردن (بە سەنعەتکردنو دیموکراتیزەکردن) بە سەر ژیانی هاوسەریو شێوەی پێکهێنانی خێزاندا هاتوون دەتوانن وێنەیەکمان لە بارەی رەوشی داهاتووی هاوسەرێتیو خێزان لەدنیادا بدەنێ، چونکە پرۆسێسی بەمۆدێرنکردن لەهەر وڵاتێکدا لەگەڵ خۆیدا تەنیا دەرەتانی بەکارهێنانی تەکنۆلۆژیی نوێو ئەقڵانییەتی



زانستییو ئازادیی تاکەکەسی ناڕەخسێنێت، بەڵکو لە هەمانکاتدا گۆڕانکاریی گرنگ لەستروکتووری کۆمەڵو ژیانی کۆمەڵایەتییو کولتووریدا پێکدێنێتو دەسەڵاتی ئاینو دەزگا ئاینییەکان بەسەر کۆمەڵو ژیانی تاکەکەسدا لاوازدەکات.

تا پەنجا ساڵێك پێش ئێستا لەئەوروپاو خۆرئاوادا هاوسەرگیریو خێزان (مەبەست ناوکەخێزانە کە لەژنو مێردو منداڵ پێکدێت) تەنیا لەرێگای مارەبڕی لەدادگادا (هەندێکجار لەکڵێسایش) بە رەوا دادەندران. بەڵام لەکۆتایی ساڵانی شەستەکانی سەدەی رابردوودا، لەگەڵ ئەم شێوە خێزانە نەریتییەدا، کە هێشتا لەخۆرئاوادا باوە، سێ شێوە خێزانی نوێ، یان سێ شێوە هاوسەری نوێی یاساییو قبووڵکراو لەخۆرئاوادا دەرکەوتوونو بوونەتە دیاردەیەکی بڵاو.

١- پێکەوەژیانی بێ مارەبڕی: کوڕو کچێکی رەبەن، دەتوانن پێکەوەبژینو خێزان پێکبهێننو ببنە خاوەن منداڵ بێئەوەی هیچ جۆرە کۆنتراکتێکی یاسایی، یان ئاینی لەنێوانیاندا هەبێت. ئەم جۆرە خێزانەو منداڵەکانیان، لەرووی یاساییو ئاینیو کۆمەڵایەتییەوە، وەك هەر خێزانێکی نەریتی سەیردەکرێن. بۆ نموونە لەساڵی ٢٠٠١ دا سێیەکی خێزانەکانی سوێد خێزانی بێ مارەبڕی بوون. ئەم جۆرە خێزانە لەنێو بیانیانی دانیشتووی ئەوروپادا، لەوانە لە نێو کوڕو کچانی کوردیشدا دەرکەوتووە.

٢- هاوسەرگیریی کچو کچ، یان ژنو ژن: ئەم دووانە دەتوانن بە جۆرێکی یاسایی لەدادگا خۆیان مارەبکەنو خێزان پێکبهێنن. ئەم خێزانانە دەتوانن بە دوو شێوەی یاسایی ببنە خاوەنی منداڵ یان

لەرێگای پیتاندن، یان تۆوتێکردنەوە Insemination کە لەنەخۆشخانە، بەهۆی سپێرمی پیاوێکی نەناسەوە ژنێکیان دووگیان دەکرێت، ژنەکە بە رەسمی بە دایکی منداڵەکە دەناسرێت، هاوسەرەکەشی بە باوکی. یاخود هەردوو ژنەکە لەرێگای تەبەنیکردن Adoption (ئەدەبشن)ەوە بە رەسمی منداڵێك لەخۆدەگرن. ژنێکیان دەبێت بە دایکی منداڵەکەو ئەوی دیکەیان بە باوکی. یاساو کلێسایش ئەو دووانە بە دایكو باوکی منداڵەکە دادەنێن.

٣- هاوسەرگیریی پیاوو پیاو: ئەگەرچی دەیان ساڵە ئەم جۆرە پێکەوەژیانە لەئەوروپادا هەیە، بەڵام تەنیا لەم دە ساڵەی دواییدا بە رەسمی لە هەندێك وڵاتدا (لەوانە لە دانمارك، سویدو هەندێك وڵاتی دی) لە لایەن دادگاو کلێساوە دانی پێدانراوە.

ئاشکرایە ئەم سێ جۆرە خێزانە نوێیە بە ئاینی مەسیحیو کولتووری کۆنی خۆرئاوا نامۆن. تەنانەت مۆدێلی دووەمو سێیەمی خێزان، بەلای زۆر کەسەوە، دژی یاسای سروشتن، بۆیە هێشتا لای زۆرینەی خەڵکی پەسەندناکرێن. بەڵام بە پێی یاسای ئەو وڵاتانە بە بەشێك لەئازادیو ماف مرۆڤ دادەندرێن. کلێساو دەزگا ئاینییەکانی دیکەیش، بە پێی ئەو پرینسیپەو بۆ خۆگونجاندنی خۆیانو ئاینەکە لەگەڵ کۆمەڵدا، قبووڵیان کردوونو بە رەوایان داناون.

لەهەمانکاتدا خێزانی بێ منداڵ لەخۆرئاوادا کەم نین. زۆر لەو ژنانەی کە دەیانەوێت شوێنو پلەیەکی گرنگ لەکارکردنو کۆمەڵدا بە دەست بهێنن، منداڵبوون بە کۆسپی گەورە دەزانن، بۆیە نایانەوێت منداڵیان ببێت.

مۆدێلێکی دیکەی خێزان Distance Family خێزانی لێك



دابڕاو، یان لێك دوور کە لەدنیادا دەرکەوتووە. ئەم جۆرە خێزانە، بە هۆی کارکردنەوە لێك دادەبڕێن. هاوسەرێکیان بۆ کار روو لەشارێکی دی، یان لەوڵاتێکی دی دەکاتو ساڵانێکی زۆر هاوسەرو منداڵەکانی بەجێدێڵێتو ناو بە ناو وەك میوان سەردانیان دەکات.

هەندێك لەم مۆدێلانەی هاوسەریی و خێزان، بە تایبەتی هاوسەریی بێ مارەبڕی، وەك زۆر دیاردەی دیکەی کۆمەڵایەتیی و کولتووریی خۆرئاوایی، لە وڵاتانی دیکەی ئەفریقاو ئاسیاو ئەمریکای لاتیندا بڵاوبوونەتەوە. بۆ نموونە دیاردەی پێکەوەژیانی بێ مارەبڕین لەچیندا، کە هێشتا لەسەدا شەستی ئەوانەی خێزان پێکدەهێنن لەلایەن دایكو باوکیانەوە هاوسەریان بۆ دەدۆزرێتەوە، بە فراوانی لەشارە گەورەکاندا بڵاوبۆتەوە.

٢

کوردستان بەشێکە لەدنیایەك کە بە سەدان رایەڵی سیاسیی، ئابووریی، کولتووریی و زانیاریی و هۆکارەکانی گەیاندنو راگەیاندنەوە پێکەوە بەستراوەتەوە. هەروا کوردستان لەبەردەم گۆڕانکاریی گەورەدایە. سەرەتاکانی مۆدێرنکردنو پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری، وەك تێکڕای پەیوەندییە ئابووری، کۆمەڵایەتیی و کولتوورییەکان، بە خێرایی لەکوردستاندا بڵاو دەبنەوە. لەگەڵ خۆیاندا ژیانی کۆمەڵایەتیی و کولتووریی کۆمەڵ تێڕوانینی ئێمە بە گشتی لەبارەی ژیان، ئەوینو هاوسەرێتیی...تاد دەگۆڕنو جیهانبینیی نوێ، رێساو کولتووری نوێ بڵاو دەکەنەوە. ئەم گۆڕانکارییانە، درەنگ یان زوو، ژیانی ئێمە بە گشتیی و ژیانی

هاوسەریی و خێزانیمان بە تایبەتی دەگۆڕن. ئێمە ئێستا سەرەتای ئەم گۆڕانکارییانە لەبواری شێوەی هاوسەگیریی و پێکهێنانی خێزاندا دەبینین. بەشێکی زۆری کچان و کوڕانی ئیمڕۆ، بە پێچەوانەی دایك و باوکانیانەوە، پێش هاوسەرگیریی جۆرە ئەزموونێکی سێکسییان هەیە. ئەوان دەیانەوێت خۆیان ئازادانە هاوسەری خۆیان هەڵبژێرن و بەختەوەریی و ئەوینێکی ڕۆمانسییانە دەکەنە ئامانجی هاوسەرگیریی و پێکەوەژیان. هەر کاتێکیش ژیانی هاوسەرێتی بەو ئامانجەی نەگەیاندن هەوڵی جیابوونەوە دەدەن. ئەمیش مافێکی سروشتیی خۆیانەو دەبێت کۆمەڵ قبووڵی بکات. زۆربوونی ڕێژەی جیابوونەوە لەکوردستان لەجیاتی ئەوەی بمانتۆقێنێت باشترە هانمان بدات لەهۆکارەکانی بگەین، بیر لەباشترکردنی داهاتووی ئەو ژنانە بکەینەوە کە ستەمی پیاو ژیانی لێکردوون بە دۆزەخ، کەچی ناوێرن لەژێر فشاری کەسوکارو کۆمەڵدا، یان لەبێ پەناییدا جیاببنەوە، لەجیاتیان خۆیان دەسووتێنن. شێوەی هاوسەرگیریی بنەماڵەیی، کە زۆرجار بە زەبری تێڵاو لەژێر فشاری کەسوکاردا ڕێکدەخرێت، زۆر بە زەحمەت دەتوانێت لەبەردەم گۆڕانکاریی کۆمەڵ و ئەرکە سەختەکانی ژیاندا، کە خێزان ڕووبەڕوویان دەبێتەوە، خۆی بگرێت. ئیمرۆ مرۆڤ، کوڕ بێت یان کچ، دەخوازێت لەڕێگای پەیوەندییەکی هاوتاوە خێزان پێکبهێنێت، بۆیە چاوەڕوانیی زۆری لەهاوسەرەکەی هەیە. ئەگەر ئەوان هاریکاریی یەکتری نەکەن تا باشتر یەکتری بناسن و زیاتر لەیەکتری بگەن، ئەگەر پێکەوە بەرپرسیاریی خێزان هەڵنەگرن و بە تەنگ بەردەوامبوونی خۆشەویستی و پاراستنی پەیوەندیی هاوسەرییەوە نەبن زەحمەتە



بتوانن بەختەوەربن و تا سەر پێکەوە بژین.

ئەو گۆڕانکارییانەی بەسەر کۆمەڵ و ژیانی خێزان و هاوسەریدا هاتوون و دێن سەرەنجام تێڕوانینی کۆمەڵ لەبارەی ڕێکخستنی پەیوەندیی هاوسەریی و پێکهێنانی خێزان و جیابوونەوە دەگۆڕن. هەڵبژاردنی هاوسەرو پێکەوەژیانی ژن و پیاو، بەو شێوەیەی کە خۆیان دەیانەوێت، دەبێت وەك بەشێك لەماف و ئازادیی مرۆڤ دابندرێت و پارێزگاری لێبکرێت، بە هەمانشێوە جیابوونەوەیش، لەگەڵ سەختی و ئازارەکانیدا، بەشێکە لەماف و ئازادیی مرۆڤ دەبێت، وەك بڕیاری ئازادانەی دوو کەس، قبووڵ بکرێت و ڕێزی لێبگیرێت، نەك بە هەڵەو شوورەیی، یان بە مەترسییەك بۆ سەر کۆمەڵ (کۆمەڵگا) دابندرێت. هەر کۆمەڵێك پێی وابێت کە جیابوونەوەی چەند ژن و مێردێك لەیەکتری زیانی پێدەگەیەنن ئەوا ئەو کۆمەڵە خۆی ترسنۆك و لاوازە. هەر کۆمەڵێك لەوە بترسێت کە بە هۆی هەڵوەشانەوەی چەند خێزانێکەوە شیرازەکەی تێکدەچیت ئەوا ئەو کۆمەڵە لەبنەڕەتدا خۆی پەرپووت و بێ شیرازەیە. جیابوونەوەو هەڵوەشاندنەوەی خێزان، چەند زۆر بن ناتوانن شیرازەی کۆمەڵێکی تەندروست و ئینسانی تێکبدەن. بە پێچەوانەوە کۆمەڵی زیندوو هەمیشە ئەو توانا و میکانیزمی خۆبەڕێوەبردن و بەردەوامبوونەی تیادا هەیە کە بتوانێت بەرگەی دەیان هەزار خێزانی هەڵوەشاوەو جیابوونەوەی سەدان هەزار هاوسەر بگرێت. لەوەش زیاتر بتوانێت دەرەتانی نوێ، هیواو توانای بڕوابەخۆبوون و بڕوابەژیان و بەداهاتووبوون بۆ ئەو کەسانە بڕەخسێنێت، کە جارێك و چەند جار لەژیانی تایبەتی و خێزانییاندا سەرکەوتوو نەبوون. ژیان نە بە

هاوسەرگیریی و پێکهێنانی خێزان دەست پێدەکات، نە بە جیابوونەوەو هەڵوەشاندنەوەی خێزان دوایی دێت. هاوسەرێتی و جیابوونەوە، لەئاستی کۆمەڵایەتییدا دوو دیاردەی سروشتین، لەئاستی تاکە کەسیشدا بەشێکن لەشادیو خەمەکانی مرۆڤ، کە ژیان پڕیەتی لەم جۆرە شادیی و خەمە چاوەڕواننەکراوانە. بۆیە گرنگە جیابوونەوە وەك هاوسەرێتی بە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتیی سروشتی، نەك بە هەڵەو شورەیی، دابنرێت. بەپێی یاسایەکی نوێ، کە ماف ئەندامانی خێزان یەکسانانە (بە بێ جیاوازی نێوان نێرو مێ) ڕێکبخرێتەوە. ئەو ڕێساو یاسایانەی دەیان ساڵ پێش ئێستاو بەپێی ئەقڵێکی بەدەویانەو باوکسالارانە بۆ ڕێکخستنی هاوسەرێتیی و پێکهێنانی خێزانو جیابوونەوە داندراون، تەنیا دەتوانن بەربەریزمی پیاو بەسەر ژناندا بسەپێننو خێزانو ماڵو جیابوونەوە بۆ ژنو منداڵ بگۆڕن بەدۆزەخ. کۆمەڵی کوردستان ئەگەر بیەوێت خۆی لەکولتووری جەنگەڵئاسایی داگیرکەرو شەریعەتی بیابان ڕزگاربکات، دەبێت یاسایەکی ئەوتۆ بۆ هاوسەرێتی و خێزان دابنێت کە ژنو پیاو لەکاتی هاوسەرێتیدا لەئەركو مافەکانیاندا یەکسان بن، لەکاتی جیابوونەوەشیاندا وەك یەك ماف سەرپەرشتی و پەروەردەکردنی منداڵو ماف خاوەنداریێتیی هاوبەشی موڵكو سامانی خێزانیان هەبێت.

## ٣

ئەم کتێبە (سایکۆلۆژیی ژیانی هاوسەرێتی) کە خاتوو سۆزان جەمال کردوویەتی بە کوردی، لێکۆڵینەوەیەکی گرنگە لەبارەی



دیاردەی ئەوینداری، هاوسەرێتیی و پێکەوەنانی خێزان. گرنگی ئەم کتێبە لەوەدایە کە لەڕوانگەی زانستی دەروونییەوە هەوڵدەدات لەو مۆتیڤو هۆکارە سایکۆلۆژییانە بکۆڵێتەوە کە شێوەی هەڵبژاردنی مۆدێلی هاوسەرو تایبەتمەندیی ژیانی ئەویندارییو ڕەوشی هاوسەرێتیی و خێزان بەگشتی دیاری دەکەن. هاوسەرێتی، یان خێزان تەنیا دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی نییە، بەڵکو مەسەلەیەکی تایبەتو تاکەکەسییشە. بۆیە لێکۆڵینەوەی هۆکارە کۆمەڵایەتی، ئابووریی و کولتوورییەکان، لەگەڵ گرنگییاندا، بە تەنیا ناتوانن جیهانی چڕو دەوڵەمەندو ئاڵۆزی هاوسەرێتیی و ئەو گۆڕانکارییە چاوەڕواننەکردوو دراماتیکییانەی بە سەرپەیوەندیی ئەوینداریو ژیانو ڕەفتاری هەردوو هاوسەرو ڕەوشی هاوسەرێتدا دێن شیبکەنەوە. نووسەری ئەم کتێبە (د.عەبدولحەلیم سەمعان) دەیەوێت لەودیو ئەو هۆکارانەی لەسەرەوە باسکران، بەدوای هۆکاری دیکەدا بگەڕێت: مرۆڤ وەك تاکەکەس (ئیندیڤید)و تایبەتمەندیو لایەنی دەروونیی مرۆڤ.

ئەم کتێبە، وەك هەر کتێبێکی گرنگی سایکۆلۆژی، دەتوانێت یارمەتیمان بدات باشتر لەرەفتارو هەڵسوکەوتی ڕۆژانەی خۆمان بگەینو هەوڵبدەین باشتر خۆمان، هاوسەرو کەسانی دەوروبەرمان بناسین. بەدوای ئەو مۆتیڤە شاردراوە دەروونیی و ڕۆحییانەدا بگەڕێن کە مرۆڤ هان دەدەن لەکاتو ساتێکی دیاریکراودا بەم یان بەو شێوەیە ڕەفتاربکەن. ڕەنگە لەم ڕێگەیەشەوە توانای لەیەکتری گەشتنو هاریکاریی یەکتریی و توانای لێکبووردمان زیاتر ببێتو بتوانین خۆمانو هاوسەرو منداڵەکانمان بەختەوەرانەتر بژین.

دواجار ئەم کتێبە، کە کاری پسپۆڕێکی بواری سایکۆلۆژییە، بە زمانێکی چڕ تا رادەیەك سەخت نووسراوە، پڕە لەزاراوەی جۆراوجۆری سایکۆلۆژی، کە زۆربەیان هێشتا لەزمانی کوردیدا یان بەرامبەریان بۆ دانەندراون، یاخود داندراون و جێگای خۆیان نەگرتووە. ئەمیش کاری وەرگێڕی گرانتر کردووە. بۆیە تێگەیشتن لەهەندێك بەشی ئەم کتێبە، بە تایبەتی بۆ ئەوانەی شتێك لە بارەی دەروونناسییەوە نازانن، ئاسان نییە.

لەکاتی خوێندنەوەی تێکستە کوردییەکەو بەراوردکردنی هەندێك بەشی لەگەڵ تێکستە عەرەبییەکەدا بۆم دەرکەوت کە سۆزان خان ویستوویەتی بە ئەمانەتەوە تێکستەکە بکاتە کوردی. وەرگێڕانی ئەم کتێبە بۆ کوردی کارێکی باشە، چونکە هێشتا ئەم جۆرە کتێبانە بە زمانی ئێمە نین، تەنانەت هێندەی من ئاگادارم بە زمانی عەرەبیش دەگمەنن.

سڵاو لەسۆزان خان کە لەخۆی رادیوە ئەم کتێبە بکاتە کوردی.

سلێمانی
٢٠٠٧/٤/٢٠



## پێشەکی نوسەر

کتێبی سایکۆلۆژیی ژیانی هاوسەرێتی، ئامانجی ئەنجامدانی لێکۆلینەوەیە لەسەر ئەو فاکتەرە سایکۆلۆژییە نەستییانەی لەلایەك کۆنترۆڵی بونیادی پەیوەندی نێوان دوو هاوبەش دەکەن، لەلایەکی دیکەوە پەیوەندی لەگەڵ منداڵەکانیاندا.

کۆمەڵێك هۆکار بۆ دانانی ئەم کتێبە پاڵیان پێوەنام، لەوانەیە گرنگترینیان ئەوە بێت کە زۆربەی لێکۆلینەوەکان لەوڵاتی ئێمەدا کە باسی ژیانی هاوسەرێتی دەکەن بەشێوەیەك ئەنجامدرابن تەنیا لایەنە سۆسیۆلۆژیی و پەروەردەیی و ئابورییەکان لەبەرچاوگیرابن، بێئەوەی لایەنە سایکۆلۆژییەکان هێندەی گرنگی خۆیان بایەخییان پێدرابێت، ئەگەر ئەوە راست بێت پەیوەندی هاوسەرێتیی پشت بە بناغەی ئاینیی و یاسایی و کۆمەڵایەتیی دەبەستێت، کە هەر یەك لەمانەش یارمەتیدەرن بۆ بەردەوامبوونی پەیوەندی هاوسەرێتیی و مانەوەی، ئەوا ئەوەمان لەیاد ناچێت کە فاکتەرە سایکۆلۆژییە نەستییەکانیش رۆڵیان لەدامەزراندنی بونیادی پەیوەندیی و سەرکەوتنیدا، هەیە.

ئەمانەو وێرای بڵاوبونەوەی حاڵەتەکانی تەڵاق و، زیادبوونی گیروگرفتەکانی هاوسەرێتیی و دوورکەوتنەوەی گەنجەکانی ئەم سەردەمە، لەهاوسەرێتی وەك راکردنێك لەگیروگرفتە چاوەڕوانکراوەکانی، کە دەتوانرێت ئەمانە لەگەڵ ئەو فاکتەرانەدا

ریزبەند بکرێن، کەوا لەسایکۆلۆژیست دەکەن بایەخی زیاتر بە باری سایکۆلۆژی هاوسەرێتیی بدات و کاربکات بۆ ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەی سایکۆلۆژیی قوڵ، کە هۆکاری ئەم ئاڵۆزییانە ئاشکرا بکات و چارەسەری ئەو گیروگرفتانە بکات کە دەبنە هۆی وروژاندنی ترس و سڵەمینەوە لەژیانی هاوسەرێتی.

وێڕای ئەمە، لەم کتێبەدا زۆر بەئاگاو بە پەرۆش بووم بۆ داڕشتنەوەی ئەو بناغە زانستیی و سایکۆلۆژییانەی کە بۆ دروستکردنی پەیوەندی هاوسەرێتیی دروست، بەهەند وەردەگیرێن. لەسەر ئەو ئەنگێزانە هەڵوێستەم کردووە کە لەچوارچێوەی ئەم پەیوەندییەدا سەرهەڵدەدەن و لەکاریگەرییەکانیان لەسەر گەشەی منداڵان و رەفتاریان، کۆڵیوەتەوە، لەهۆکارەکانی دەرکەوتنی دیاردەکە ورد بوومەتەوەو هەوڵمداوە چارەسەری ئەم گیروگرفتانە پشتبەستن بە رێگاکانی چارەسەرکردنیی خێزانی بخەمەڕوو، کە ئێستا لەزوربەی دەوڵەتانی پێشکەوتوودا پەیڕەودەکرێن، ئەویش لەپێناوی گەیشتن بە خێزانێکی بەختەوەر کە پەیوەندیی لەسەر ئاستی هاوسەرو لەسەر ئاستی منداڵانیش، وەك یەك دروستبن.

لەچارەسەرکردنەکانمدا پشتم بە میتۆدی کلینکیی لەسایکۆلۆژیدا بەستووە، کە ئەویش میتۆدێکە رێگە دەدات بە شیکەرەوە بگاتە ئەنجامی باش، هەرچەندە ئەنجامەکان رێژەییش بن، کە ناتوانرێت بە هیچ رێگەیەکی زانستی دیکە ئەو ئەنجامانە دەستبکەون و لەرووی ئاماریشەوە ناتوانرێت لەگەڵ هیچ دەرهاویشتەیەکی بابەتی و جۆرێتیی دیکەدا، بەراوردبکرێن.

لەواقیعدا بابەتی کلینکیی لێرەدا پەیوەستە بە چەندەها خاڵی زۆر



جێگیر کە بەبارودۆخی کۆمەڵایەتیی و رۆشنبیرییەوە گرێدراون، هەروەها بەندە بە پێکهاتەی زانستیی شیکارکارو ئامادەباشیی و تواناکانییەوە لەگوێگرتن و شیکردنەوەدا. بواری تاقیکردنەوە لەم میتۆدەدا وەك شیکارکارو فۆرمیچەرس formateurs دوو تەوەرەی سەرەکی چالاکییەکانمان بۆ لەخۆدەگرێت کە چارەسەر تێیدا پشت بە چاوپێکەوتنی تەنیاو رێکخراو دەبەستێت لەلایەك و کۆمەڵگەلی (هاوسەرو منداڵەکانیان) لەلایەکی دیکەوە.

بە دانیشتن لەگەڵ هاوسەرەکان بۆ خستنەرووی گیرگرفتەکان و یارمەتیدانیان بۆ گەیشتن بە چارەسەر، چاوپێکەوتن دەستپێدەکات. ئەم جۆرە چاوپێکەوتنانە کاتێکی دوورودرێژ دەخایەنێت، چونکە دیاریکردنی گیروگرفتەکە پێویستی بە تێگەیشتنی ورد هەیە لەچۆنێتی پەرەسەندنی پەیوەندی هاوسەرێتیی بەشێوەیەکی گشتیی و تێگەیشتن لەوردەکاریی و تایبەتمەندییەکانی، ئەوەش کە بۆ ئەم کارە پێویستە ئاشکراکردنی کەسێتی هەریەکە لەدوو هاوبەشەکەیە بەشێوەیەکی جوداو پاشان تێگەیشتن لەو زنجیرە کرداره سایکۆلۆژیە نەستیەی لای هەر یەکەیان دروستبووەو هەڵوێستەکردن لەسەر رەهەندو بزوێنەرەکانیان، لەدوایشدا لێکۆڵینەوە لەو هۆکارانەی ئەم زنجیرە کردارە سایکۆلۆژییە ئاڵوگۆڕانە، راڤەدەکەن، ئەمەش بۆ ئاشنابوون بە رێگەکانی راستکردنەوەی ئەو هەڵانەی لەگەڵ ئەم کردارانەدا هاوکاتن.

ئەم بابەتە بەیەکدا تێکترنجاوانە پێویستیان بە چارەسەری ورد هەیە، کە لەچوارده بەشدا باسمکردوون: لەبەشی یەکەمدا: گۆڕانەکانی پەیوەندی هاوسەرێتیی و ئامانجەکانی، لەبەشی

دووەمدا: چۆنێتی هەڵبژاردنی هاوبەش پشتبەستن بە دەرهاویشتەی شیکاری سایکۆلۆژی، لەبەشی سێیەمدا: ریکخستنی پەیوەندیی لەرووی نەستییەوە، لەبەشی چوارەمدا: بەکارهێنانی پەیوەندی هاوسەرێتیی بۆ رووبەڕووبوونەوەی پاڵنەری مردن، لەبەشی پێنجەمدا: کاریگەری قەیرانەکان لەسەر دوورکەوتنەوە لەنێوان دوو هاوبەشدا، لەبەشی شەشەمدا: ماتەمینیی و نائومێدیی و هۆکارەکانی تەڵاق، لەبەشی حەوتەمدا: گەڕانەوەی چەپێنراو، لەبەشی هەشتەمدا: دابەشکردنی رۆڵەکان (ئەرکەکان) لەنێوان ئەندامانی خێزاندا، لەبەشی نۆیەمدا: شێوازەکانی پەیوەندیکردن لەچوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتیدا، لەبەشی دەیەمدا: کاریگەری فاکتەرە ئابورییەکان لەسەر پەیوەندییەکانی پلەوپایە لەنێوان دوو هاوبەشدا، لەبەشی یانزەیەمدا: گیروگرفتەکانی ژیانی سێکسوالی لەچوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتیدا، لەبەشی دوانزەیەمدا: پەیوەندییە هاوسەرێتییە پشێوەکان و کاریگەرییان لەسەر گەشەی منداڵ، لەبەشی سیانزەیەمدا: کارلێك و دەستێوەردانەکان لەخێزانە سایکۆسسیەکاندا، لەبەشی چواردەیەمدا: گواستنەوەی توندوتیژی خێزانی لەرێگەی نەوەکانەوە.

لەدوای ئەم کورتەیە لەناوەڕۆکی کتێبەکە، دەتوانم بڵێم لەم کارەمدا دووچاری ئەستەمی زۆر بوومەوە:

یەکەمیان: دەگمەنی سەرچاوەی عەرەبی تایبەت بەم بوارە کە ناچاری کردم پشت بە سەرچاوەی بیانی(فەرەنسیی و ئینگلیزی) ببەستم، دووەمیان: خۆپاریزی ئەو خێزانانەی دانیشتنم لەگەڵیاندا دەکرد، لەخستنەڕووی گیروگرفتە سۆزداریی و سێکسوالییەکانیان،



ئەگەر خستنەڕووی ئەم جۆرە گیروگرفتانە هەمیشە لەئاشکرایی و راشکاوی بەدەربن، ئەوا پێودانگە ئایینی و پەروەردەییەکان زۆرکات بەشێوەیەکی تێروتەواو دەبنە رێگر لەبەردەم ئاشکراکردنی راستییەکاندا. نەخۆشەکان (مەبەست لەوانەی گرفتی دەروونییان هەیە – وەرگێڕ) بەلایانەوە باشتر بوو لەئازارو ئەشکەنجەکانیاندا بمێننەوە وەك لەوەی حاڵەتەکانیان ئاشکرا ببێت، لەبەرئەوە زۆرکات رێگەیان بە بەردەوامبوونی چارەسەرەکەیان نەدەدا بەبیانووی بارودۆخی خێزانیی و ماددیی، ئەویش کاتێك هەستیان دەکرد چارەسەرکردنەکان ئەو مەسەلانە لەخۆدەگرن کە ئەوان دژ بە رەوشتیان دادەنا.

لەکۆتاییدا، پێوستە ئاماژە بەوە بدەم نموونەو ناوی ئەو کەسانەی لەدانیشتنەکاندا هاتوون و لەم کتێبەدا خراونەتەڕوو، چوارچێوەی تیۆری پێشینازکراو روونەکەنەوەو پشتم بە پیتی لاتینی بەستووە لەجیاتی ناوە راستەقینەکانی ئەو کەسانە خۆیان، ئەویش لەپێناوی پاراستنی تەواوی نهێنییەکانیان لەکاتی خستنەڕووی گیروگرفتەکانیاندا.

## بەرایی

### پەیوەندی هاوسەرێتیی: سوودو مەترسییەکانی:

پەیوەندی هاوسەرێتیی لەسەر بنەمای سۆزداری بینادەکرێت، پرۆژەیەکی درێژخایەنەو خەسڵەتی دیاریکراو لەخۆدەگرێت کە ئەمانەن: هەڵبژاردنی هاوبەش لەرووی جۆرەوە، ئایدیالیزەکردن idealisation، جەختلێکردنەوە لەنارسیزمی ئاڵوگۆڕکراو لەنێوان دووهاوبەشەکەدا، دەستتێوەردانی ئاڵوگۆڕکراو لەئارەزووە نەستییەکاندا، بەکارهێنانی پەیوەندی لەگەڵ بابەتەکەدا بەشێوەیەکی ئاڵوگۆڕکراو وەك شێوازێکی بەرگری لەرووبەڕووبونەوەی ئارەزووە پێش جێنیتالییەکاندا pregenital و ئەوانەی بەشێوەیەکی تەواو بۆ ئەولەوییەتی یان هەژمونی زاوزێ ملکەچنەکراون، دواجار دابەشکردنی جۆری رۆڵەکان و ئەویش لەرێگەی دەستتێکەڵاکردنی collusion کردارە سایکۆلۆژییە-ناوەکییە تاکییەکانەوە بۆ هەر هاوبەشێك، کە شێوازێکی پەیوەندی کۆنترۆڵکراو لەلایەن خود-ەوە لەگەڵ کاردانەوەی دەوریدا، رێکدەخات کە رێگە بەدروستبوونی جۆرێك لەهاوسەنگی دەدات.

ئەو بابەتە گرنگەی کە دەشێت هاوسەرەکان تیایدا بژین لەچوارچێوەی ژیانی هاوسەرێتیدا، دەوڵەمەندکردنی سایکۆلۆژیی و جەختلێکردنەوە لەنارسیزمیی هەریەك لەدوو هاوبەشەکەیە. گشت



هەڵسوکەوتەکان بۆ دۆزینەوەی پەیوەندییەك هەوڵدەدەن کە ئامانجی جەختلێکردنەوەیە لەتاکە، بەتایبەتی ئەو تاکەی کە هیچ کاتێك نەگەیشتۆتە قەرەبووکردنەوەی کەموکورتی نارسیزمیی و ئاسودەیی خود. یان ئەو تاکەی کە بەدەست بێبەشبوونی سۆزداریی یان رووبەڕووبونەوەی بارودۆخی سایکۆلۆژیی ناوەکییەوە نالاندویەتیی و رێگر بووە لەگەیشتن بەبەدیهێنانی یەکبوونی خود بەشێوەیەکی تەواو.

لەسەر ئەم بناغەیە، هەڵبژاردنی هاوبەش و رێکخستنی پەیوەندی لەگەڵیدا لەسەرەتادا پشت بە جەختلێکردنەوە لەنارسیزم confirmation narcissique دەبەستێت، ئەم جەختلێکردنەوە نارسیزمییە بۆ هێشتنەوەی لایەنە لاوازەکە پێویستەو ئەم جەختکردنەوەیە سەرچاوەی چێژو بەختەوەرییەو تەنیا لەرێگەی پەیوەندییەکی خۆشەویستی دروستەوە نەبێت، بەدینایەت.

ئەم جۆرە پەیوەندییە، لەسەر ئاستی فەنتازیا fantasme گوزارشت لەمەیلێك بۆ توانەوەی ئاڵوگۆڕکراوو دروستکردنی جۆرێك لەسنووری دەرەکی هاوبەش بۆ هەریەك لەو دوو هاوبەشە، دەکات: ئەم پەیوەندییە هەوڵێك بۆ دووبارە فۆرمەلەکردنەوەی شێوازی پەیوەندی نێوان(دایك-منداڵ)، دەنوێنێت.

ئەمە پرۆسەیەکی لەخۆگرتنی ئەندەکییە، رێگەدەدات خۆیبەدووربگرێت لەجیابوونەوەو ئەو بابەتانەی هاوکاتن لەگەڵیدا وەك دڵەڕاوکێی بەجێهێشتن، هەروەها لەوانەیە گوزارشت بێت لەئارەزوویەك بۆ خاوەندارێتییەکی ئاڵوگۆڕکراو کە سوودی ئیرۆسیی پەیوەست بەتوانەوە لە ناو یەکتریدا، زامندەکات: توانەوەکەش،

توانەوەیەکی خواستراوە، چونکە سۆزێك بۆ قۆناغی یەکەمی منداڵی دەنوێنێت‌و دەشێت تاك لەهەندێك كاتدا لەفەنتازیای توانەوەدا بژی وەك لەكاتی(ئۆرگازم)دا.

ئەم توانەوەیە fusion دەشێت مەترسیدار بێت ئەگەر گەیشتە ئاستێکی دیاریکراو، ئەوکاتە گەڕانەوەیەکی regression توندوتیژ دروستدەکات لەداماڵینی جیانەکردنەوەی indistinction تاکانەیی بۆ گەڕانەوە بەرەو عەدەم‌و نا(کات)، کەسی لاواز ناتوانێت بۆ نادیاریی‌و ڕێکنەخستن، بگەڕێتەوە: زۆرکات پەیوەندی هاوسەرێتیی بەمجۆرە توانەوەیە (توانەوەی جیانەکراوە) دەستپێدەکات، بەڵام گیرگرفت‌و گۆڕانەکانی ژیان دەتوانن کاریکەنە سەر بەردەوامبوونی کەشی ئاسوودەیی‌و دڵەڕاوکێ لەوکاتەدا کە هاوبەشەکە بۆ وێنەیەکی دژ بەو وێنە یەککگرتووە لەگەڵ خوددا، دەگۆڕێت یان دەبێتە کەسێکی نامۆ کە دڵەڕاوکێ لای تاکی بەرامبەر، دەوروژێنێت.

هەموو ئەمانە روودەدەن هەروەك بڵێی ئەو هاوبەشە چیدی پاڵپشتیی سەرەکی خستنەپاڵەکانی بابەتی باش، نانوێنێت، بەڵکو بۆتە پاڵپشتی بابەتە وەرگیراوەکە (هەڵلوشراوەکە)و بەمشێوەیە (من- moi) سڵدەکاتەوە لەوەی بەهۆی ئەو بابەتەوە هەڵبلوشرێت، لەبەرئەوە هەوڵدەدات بۆ بەرگریکردن لەخۆی لەدژی ئەم هەڵلوشینە absorbtion.

بە کورتی دەتوانین بڵێین پەیوەندی هاوسەرێتیی ئەو شوێنەیە گوزارشت لەمەیلە نەستییەکان دەکات‌و ئەو مەیلانەی کە زیاتر پەیوەندییان بە منداڵییەوە هەیە. لەبەر ئەم هۆکارە پەیوەندی



هاوسەرێتیی ئەو شوێنەیە کە تێیدا دیاریکردنی حاڵەتی سروشتی یان نەخۆشی بە ناهەقیی دەبێت، هەروەها ئەو شوێنەیە تێیدا گوزارشت دەکرێت لەو زنجیرە کردارانەی زیاتر پەیوەندییان بە منداڵییەوە هەیەو دێرینن، لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆر توندن لەوانەیە شێوەیەکی ئیرۆسی وەربگرن: چونکە پراکتیزەکردنە سادیی- مازۆشییەکان، جنێو، ریسوایی، لێدان، گەمەبازی، پەیوەندیکردنی سێکسوالی، ئیباحییەت و رەتکردنەوە، ئەمانە لەوانەیە لەچوارچێوەی پەیوەندییدا دەربکەون، کە نەتوانرێت لەدەرەوە(لەکۆمەڵگەدا) گوزارشتیان لێبکرێت.

کەواتە تاك لەپەیوەندی لەگەڵ هاوبەشەکەیدا بە شوێن هەندێك لەپارێزگاریی‌و تێربوونی هەندێك لەئارەزووەکانیدا، دەگەڕێت. چاوەڕێی جەختلێکردنەوەی بەهێز بۆ بەهای نارسیزمی دەکات، ئەگەر ئەم هاوبەشەی گۆڕا ئەوا ئەو پەیوەندییە هەڕەشەی لەسەر دەبێت‌و بەتێپەڕبوونی کات لەناودەچێت.

ژن‌و پیاو لەدوای ئەوەی یەکدەگرن‌و بڕیاری پێکەوە ژیان دەدەن نزیکەی نیوسەدە لەژیانی هاوبەش بەسەردەبەن، لەم قۆناغەدا داوایان لێدەکرێت هەر شتێك لەرووی سۆزدارییەوە دەبێتە بابەتی ئارەزوو، پێشکەشی یەکتری بکەن: خۆشەویستیی‌و سۆزو هاوڕێیەتیی‌و ئالودەبوون ونزیکبوونەوەی فکریی‌و دابەشکردنی کارو پەروەردەکردنی منداڵ بە هاوبەشیی‌و چێژوەرگرتنی سێسوالی، ئەم بابەتانە تەنیا لەچوارچێوەی پەیوەندییەکی دووانی ڕێکخراودا نەبێت، تێرناکرێن.

هەندێجار ئەم پەیوەندییە دوانییانە دووچاری قەیرانی تایبەتی

دەبن کە لەوانەیە ئەمە کاریکاتەسەر بەردەوامبوونی پەیوەندییەکە، لەمحاڵەتەدا ئەودوو هاوبەشە، هەوڵدەدەن هەندێك کرداری بەرگری ڕێکبخەنەوە بۆئەوەی لەو جیابوونەوەیە خۆیان بەدووربگرن کە هەڕەشە لەپەیوەندییەکەیان دەکات، زۆرجار منداڵ وەك هۆکارێك بۆ چارەسەرکردنی ئەو گیروگرفتانەی ڕووبەڕوویاندەبێتەوە، بەکاردێت: کۆمەڵێك کارتێکەر لەدەورووپشتی منداڵ کۆدەبێتەوە کە بەشێوەیەکی ئازاد لەنێوانیاندا، بەڕێوەناچێت.

پارێزگارییکردن لەپەیوەندی، لەوانەیە هەندێجار پشت بە ڕەتکردنەوەی هاوبەشی منداڵێکی بێتاوان، ببەستێت، لەجیاتی ئەوەی ئەو دوو هاوبەشە شەڕانگێزی خۆیان بەرامبەر بە یەکتریی گوزارشتبکەن، پێکەوە یان هەردووکیان بەسەر منداڵەکەدا دەیباڕێننو بەتاڵیدەکەنەوە، بەمەش دەبنە هۆی ڕوودانی زۆر پشێوی لەژیانی منداڵداو دەبنە ڕێگر لەبەردەم گەشەی سروشتیی لەمنداڵەکەدا، بەتایبەتی ئەگەر منداڵەکە هەستیار بوو، هەروەها خاوەنی ئەو هۆکارە زمانەوانییو فکرییانە نەبوو بەهۆیانەوە چارەسەری ئەو دژبەیەکییانەی پێبکات کە لەدایكو باوکییەوە، دەردەچن.



## بەشی یەکەم

# پەیوەندیی هاوسەرێتی
# گۆڕانو ئامانجەکانی

### جیاوازییەکان لەنێوان ژنو پیاودا:

لەڕووی بۆماوەوە جیاوازییەکی گەورە لەنێوان ژن و پیاودا هەیە وەك: مەزاجو هۆرمۆنەکانو فسیۆلۆژی، ئەم جیاوازییانە کاریگەرییان بۆ سەر سروشتی بیرکردنەوەو خەسڵەتە دەروونییەکان لای هەریەك لەژنو پیاو، هەیە.

– **لەسەر ئاستی هۆرمۆنی:** هەموو جەستەیەك، هۆرمۆنەکانی نێرو مێ دەردەدات، بەڵام ڕێژەی دەردانیان لەهەر یەکێکیاندا جیاوازە، بەشێوەیەك یارمەتی گەشەکردنی سیفەتە توخمیە لاوەکییەکان، دەدەن.

–**چالاکیی سێکسوالی:** زۆربەی زاناکان لەسەرئەوە کۆکن، ژنان کەمتر بەهەژێنەرە بینراو یان خەیاڵییەکانی پێش کرداری سێکس، کاریگەرن. هەروەها ژن بەوە جیادەکرێتەوە تاکە ئامانجی تێرکردنی ئارەزووە سێکسوالەکان نییەو چالاکییە سێکسییەکەشی گۆڕاوو پچڕ پچڕە.

سێکس لای ژن مۆرکێکی ڕۆحی هەیەو زیاتر لەپیاو خۆپارێزی

دەکات، واتە وەك پیاو تەنیا ئامانجی دەرچوونی ئەو کرژبوونە ئەندامییە نییە، چونکە سێکس بەلای ئەوەوە زۆر لەوە ئاڵۆزترە، هەر لەبەرئەوەش لەکرداری تێرکردنی سێکسوال و گەیشتن بەلوتکەی نەشوەی سێکسوال (ئۆرگازم) دووچاری ئەستەمی دەبێتەوە.

لای پیاو، سێکسی راستەقینە لەقۆناغی هەرزەکارییەوە دەستپێدەکات، راستەوخۆ لەڕوودانی کرژبوونێکی تایبەتی کە پەیوەستە بەتێربوونی سێکسییەوە، ئاشکرادەبێت، لەبەرامبەردا کچ لەقۆناغی هەرزەکاریدا واهەستدەکات هەستێکی ئاڵۆزو دیارینەکراو باڵی بەسەر کەسێتییدا کێشاوە، ئەم هەستانە بۆ ئارەزوویەکی کڵپەسەندوو بۆ سۆزو خۆشەویستیی دەگۆڕێت. لای ژن کاری سێکسوال بەتەنیاو بەشێوەیەکی جیاکراوە هیچ بەهایەکی نییە، چونکە لای ژن کاری سێکس بەو حاڵەتە ویژدانیی و هەڵچوونییەوە بەندە کە تێیدادەژی.

-**دایکایەتیی و باوکایەتی:** ژیانی سێکسوال، ئەوپەڕی ئازادیی و سەربەخۆیی بەپیاو دەبەخشێت، لەکاتێکدا دایکایەتی دەخاتە ئەستۆی ژن، دایکایەتی بۆ ژن زایەڵەیەکی بایۆلۆژیی هەیە (هەر لەمانگەکانی یەکەمی دووگیانییەوە تا ماوەی لەشیربڕانەوەی منداڵ، هۆرمۆنەکان کاریتێدەکەن).

کێرڤی پەرەسەندنی دەروونیی و فیزیکیی لای ژن بۆ هاوسەنگبوونی هۆرمۆنەکانی ناگاتە ئەوپەڕی، تەنیا لەدوای دایکایەتی یەکەمینجار نەبێت واتە دوای لەدایکبوونی یەکەم منداڵ، لێرەوە لەبنەڕەتدا دایکایەتی لەژیانی سێکسوال جیایە، لەبەرئەوە ئەزموونە سێکسوالە زۆر سەرکەوتووەکانیش کەژن پراکتیزەیان



دەکات، ناتوانن قەرەبووی لەدەستدانی دایکایەتی بۆ ژن بکەنەوە، بەتایبەتی لەکاتێکدا پەیوەندی بەکرانەوەی تایبەتی خۆی و بەو هەستە ناوەکییانەوە هەیە، کە لەئەنجامی ئەم کرانەوەیە بەدەستیدەهێنێت.

هەستی باوکایەتی، هەستی کبریا و دەسەڵاتدارێتییە، هەندێجار هەستی بەرپرسیارێتیی و بڕێکی زۆرتر خۆشەویستیی بۆ ژنەکەی لەگەڵدایە، هەروەها ئارەزوو (ئارەزووی سێکسواڵ) لای پیاو لەگەڵ ویستی دەسەڵاتدارێتیی بەسەر منداڵەکانیدا، بەرجەستە دەبێت.

دواجار، لای پیاو هیچ دژایەتییەك لەنێوان هەستی هاوسەرێتیی و هەستی باوکایەتیدا نییە، بەڵام لای ژن جیاوازە، رێکخستن و گونجان لەنێوان هەستی دایکایەتیی و هەستی هاوسەرێتیی بەڕێگەیەکی ئاسان و جێگیر، بەڕێوەناچێت، چونکە هەندێك لەژنان زیاتر هاوسەرن وەك لەوەی دایك بن (بایەخی زیاتر بەهاوسەرەکانیان دەدەن وەك لەبایەخدان بەمنداڵەکانیان)، هەندێکی دیکە لەژنان زیاتر دایکن وەك لەوەی هاوسەربن (بایەخی زیاتر بەمنداڵەکانیان دەدەن وەك لەبایەخدان بەهاوسەرەکانیان).

- **زیرەکی مێینە:** بەتوانای پێشبینیکردن و تێگەیشتن لەژیان و مرۆڤ، وەسفدەکرێت (زیرەکی ژن بەهەستیاریی و توانای تێگەیشتنی سەراپاگیری بارودۆخی ژیاریی و پەیوەندییە مرۆییەکان، تێرە).

ئەم زیرەکییە، بەشێوەیەکی ئاشکرا لەزیرەکی پیاو جیاوازە کە هەمیشە بەرەو ئامێرو پێکهاتە و ماددەی بێگیان ئاراستەدەگرێت. لەبەرئەوە هەمیشە لەشیکردنەوەو لۆژیکدا بەتوانایە.

- **رەهەندی سۆزداری لای مێ:** ژن لەپیاو زیاتر درك بەجۆری ئەو

پەیوەندییە دەکات کە لەگەڵ کەسانی دیکەدا دەیبەستێت، هەمیشە بەشوێن شوێنکەوتن و هۆگربوونی سۆزداریدا دەگەڕێت (خاوەنی مەیل و ئارەزوویی بەهێزە بۆمانەوە لەنزیک ئەو کەسەی خۆشیدەوێت).

– **شەڕانگێزی نێرینە:** بەتەواوەتی لەشەڕانگێزی مێینە جیاوازە، لەهەموو زیندەوەراندا وایە، تاقیکردنەوەکان ئاماژە بە بەکارهێنانی هۆرمۆنی نێرینە لەڕێگەی دەرزییەوە بۆ کۆرپەلە، دەدەن، کە لەدوای لەدایکبوون دەبێتە هۆی زیادکردنی شەڕانگێزیی، تەنانەت ئەگەر کۆرپەلە توخمی مێ-ش بێت.

شەڕانگێزی نێرینە خەسڵەتێکی هێرشبەری ئاشکراو جوڵەیی هەیە، بەئاسانی دەوروژێت و کاریتێدەکرێت، شەڕانگێزی مێینە دەگمەنە، چونکە بەئیحاو راهێنان کاری تێدەکرێت و زۆرکات خەسڵەتی بەرگریکارانەی هەیەو شێوەیەکی زارەکیی وەردەگرێت.

– **رەوتی وێرانکاری:** لەپیاودا دەرەنجامی ئەو فاکتەرە کولتوری-کۆمەڵایەتیانەیە کە بۆیان ماوەتەوە: رقلێبوونەوە لەکەسانی بیانیی و کێبڕکێ و ململانێ لەپێناوی دەسەڵات و پلەوپایەو زاڵبوون، شەڕو هەموو شێوەکانی چالاکی وێرانکردن و لەناوبردن، ئەمانە دەستکردی پیاون.

بەهاکانی خێڵ و گروپ یان تیرە لای پیاو بایەخی گەورەیان هەیەو هەر ئەمەشە وادەکات پیاو شەرانگێزی بەرامبەر بەهۆزەکانی دیکە هەبێت، ئەو بەهایانەش کە جێگەی بایەخن لای ژن، ئەوانەن کەدەچنە ناو قوڵایی پەیوەندییە مرۆییە بەتین و گەرمەکانەوە.

–**هاوسەرێتی:** بۆ ژن بارێکی زیندەگیی و سەرەکی دەنوێنێت و



لەڕێگەیەوە خۆی بەدیدەهێنێت، ئامانج و هۆکارە بۆ کەماڵبوونی، بەڵام هاوسەرێتی بۆ پیاو ئەو رۆڵە کۆمەڵایەتیەیە کە هەمیشە بەشوێنیدا دەگەڕێت تا بەهۆیەوە خۆی و کرانەوەی خۆی بەدیبهێنێت. هاوسەرێتی بۆ پیاو سەرچاوەی حەوانەوەیە، نەک ئامانج و کەماڵبوون.

–**ماڵ:** بۆ پیاو ئەو شوێنەیە کاتێک رووبەرووی گێروگرفتی دەرەکی دەبێتەوە پەنای بۆ دەبات تا تێیدا بحەوێتەوە، ئاسوودەیی و دڵنەوایی تێیدا دەدۆزێتەوە. ماڵ بۆ ژن کارو سیستەمە، ئەو شوێنەیە کە هەمیشە سەرقاڵیکردووە، ژن وەك پەناگە تەماشای ماڵ ناکات، ئەوکاتەی لێی دێتەدەرەوە هەست بەحەوانەوە، دەکات.

## پەیوەندی هاوسەرێتیی و گۆڕانەکانی بەپێی نەوەکان:

کاروکردەوە باش و بۆماوەکان، نەخشەو هەڵوێست و هزرەکان، کە لەم رۆژگارەدا جیهان بەخۆیانەوە دەیانبینێت هەروا بەڕێکەوت روویاننەداوە، بەڵکو پەیوەستن بەئەزموون و هەوڵی لەپێشینەی زۆرەوە، هەروەها نەریت و سروت و دروشم و رێکخستن لەپێکهاتەی خێزانیدا هەروا بەڕێکەوت روویاننەداوە، بەڵکو ملکەچی زۆرێک لەئەزموون و هەوڵدان بوونەتەوە، کە خێزان نەوە لەدوای نەوە پارێزگاری لەبوونیان کردووە.

لەسەر ئەم بناغەیە پێویستە، بۆچاودێریکردنی پێکهاتەی خێزان، پشت بەچۆنێتی فۆرمەلەبوونی بنەچەی خێزانیی سەرەتایی هەریەکەیان ببەسترێت:

**١–پەیوەندی هاوسەرێتیی:** هەریەك لەدروستبوونی پەیوەندی هاوسەرێتیی، یەکەم سەرنجراکێشان بەرامبەر بەهاوبەشی ژیانی دوارۆژ، پەرەسەندنی قەیرانەکانی نێوانیان، ئەو تاوتوێکردنە نەستییانەی کە هەریەکەیان بەرامبەر بەیەك بەدیدەکەن، پێشبینیە ئاڵوگۆڕکراوەکان و ئەو پێشبینیانەی بەشێوەیەکی نەستی لەمنداڵەکانیان چاوەڕێی دەکەن.

**٢–خێزانە بنەڕەتییەکانی هەریەکە لەباوان:** ژینگەیان، سروتەکانیان، میتۆلۆژیی و ئەو نیشانانەی پێوەی پەیوەستن، ئەو سیفەتەی هەریەك لەباوانی پێدەناسرێت.

## پەیوەندی هاوسەرێتیی:

لێکۆڵینەوە زانستییە جیاوازەکان، زیاتر لەبوارێکدا باسی ئەم پەیوەندییەیان کردووە، بەڵام لەچەند فرمانێکی دیاریکراودا سنووردار بووە: ئەرکی کۆمەڵایەتیی و پەروەردەیی و ئابووریی و تەنانەت ئەرکی سیاسیش، لەبەرامبەردا هەندێك لەئەرکەکان فەرامۆشکراون وەك ئەرکە سایکۆلۆژییەکان، هیچ مرۆڤێك لەگەڵ مرۆڤێکی دیکەدا هاوسەری ناکات، تەنانەت ئەگەر بارودۆخیش رەخساوبێت بۆ ئەو هاوسەرێتییەو پاڵیان پێوەبنێت، وەك: بوونی نزیکیی لەیەك و چالاکیی و ئارەزووی هاوبەش لەنێوانیاندا، هەرچەندە ئەم لایەنانە بایەخی خۆی هەیە، بەڵام لەئاستی پێویستدا نین بۆ کێشکردن و سەرنجراکێشانی ئاڵوگۆڕکراو لەنێوانیاندا، لەبەرامبەردا دەشێت لەهەندێك بارودۆخی نەڕەخساودا، فاکتەرە



سایکۆلۆژییە نەستییەکان دەربکەون، رۆڵی یەکلاکەرەوە لەو سەرنجراکێشانە عەفەویانەدا ببینن. بەشێوەیەکی گشتی ئەم فاکتەرانە پەیوەندیان بەکرداری سایکۆلۆژی تاکەوە هەیە، هەر لەگۆڕانەکانی گەشەکردنەوە کە هەموو مرۆڤێك لەقۆناغە سەرەتاییەکانی منداڵییەوە پێیدا تێپەڕدەبێت تا دەگاتە قۆناغی پێگەیشتن (نەرزەبوون).

هیچ مرۆڤێك نییە لەبەهای خۆیی و رێزدانانی بۆ خۆی دڵنیا بێت هەروەها دڵنیا بێت لەوەی توانای هەیە کەسانی دیکە پێی سەراسیمە بن و خۆشەویستی بکات و خۆیشی کەسێکی خۆشەویست بێت.مرۆڤ بەردەوام پێویستی بەوەیە کەسانی دیکە جەخت بکەنەوە لەهەستکردنی بەبەهای خۆی لەسەر ئەو ئاستە نارسیزمیەی کە بەشێوازی جیاواز گوزارشتی لێدەکات.

– هەستکردن بەناسنامەو تاکانەیی خۆیی و بوونی جیاو سەربەخۆ.

– نائارامی بەرامبەر بە خۆخواردنەوەی خودو لاتەریکبوون و دوورەپەرێزی لەچوارچێوەی سنوورە تاکێتییەکاندا.

هەموو کەسێك پێویستی بەنوێکردنەوەی هەستکردن بەو کەمالە، هەیە کە لەخەیاڵ یان لەواقیعدا هەڕەشەلێکراوو بریندارە، هەموو زیندەوەرێك ئارەزوودەکات و هەوڵ بۆ بەدەستهێنانی تێرکردنی جیاواز دەدات، بەتایبەتی ئەگەر هەستی بە کەموکورتی کرد لەدابینکردنی ئارەزووەکانیدا: لەهەندێك کاتدا گەڕان بەشوێن ئەم تێرکردنانەدا Satsfactions زۆر خۆی بەسەر تاکدا ناسەپێنێت، بەو هێندە یان بەو قەبارەیە نەبێت کە ئەو تاکە لەسەر ئاستی

بايۆلۆژيىو سايكۆلۆژيى بەرامبەر بەبوونى وەك تاكێك چەند پێويستى بە جەختكردنەوە لەخودى خۆى هەيە. بەمشێوەيە پێداويستييەكان بۆ جەختكردنەوە لەنارسيزم reassurance narcissique بەپلەى يەكەم دێتو بۆ هەموو مرۆڤێكيش پێويستە، لەهەندێك تاكدا ئەم پێداويستييانە بەپێى لاوازى ئەو تاكە لەرووى پێكهاتەى بۆماوەيىو وەرگيراوەوە، هەروەها بە پێى پێكهاتەى سايكۆلۆژيى تاك، توندتر يان بەهێزتر دەبن، لەئاكامى پشتبەستن بەمانە، دەڵێين:

– دووبارەكردنەوەى جەختكردنەوە لەنارسيزم توندتر يان بەهێزترە لەو كەسانەدا كە خاوەنى پێكهاتەيەكى سايكۆسس Psychotique[1] ين.

– جەختكردنەوە لەنارسيزم لاى كەسانى دەمارى(نيرۆتيك) Nevrotiques[2] يان كەسانى سروشتى (ئەوانەى كە خاوەنى پێكهاتەيەكى دەمارى نين) گرنگە، بەڵام بەپلەيەكى كەمتر.

لەمانەوە تێدەگەين، بۆ بەردەوامبوونى ژيان پشتيوانيلێكردن لەنارسيزم پێويستو داواكراوو سەرەكييە، كەواتە پەيوەندى بەستن لەگەڵ هاوبەشى ژياندا شوێنكەوتووى ئەو هەستەيە كە بە هەستێكى پێويستو شياوو تا ئاستێك چەسپاو دادەنرێت.

بەگشتيى تاك بەهۆى پەنابردن بۆ چەندەها بابەتى جياواز جەختكردنەوە لەنارسيزمى دەستدەكەوێت، تا جەخت لەخودو ناسنامە، هەستكردن بەكەماڵو بەهاى خودێتىو كارى سێكسوالو كارپێكردنەوە ليبيديەكەى Invetissement Libidinal، بكات.



## پەيوەندييە كورتخايەنو درێژخايەنەكان:

دروستبوونى پەيوەندى هاوسەرێتيى وەڵامدانەوەى دوو هاوبەشە (ژنو پياو) بەرامبەر بەپێداويستييەكانيان بۆ بەرگريكردن لەخودو گەڕان بەدواى پارێزەرێكدا بۆ پاراستنى تاك لەهەر هەستكردن بەلاوازى يان كەموكورتييەك، كە دەشێت لەناو خود-دا هەبن، دەتوانين لەواقيعدا دووجۆر لەم پەيوندييانە جيابكەينەوە:

– لەجۆرى يەكەمياندا: ئەوەى تاك لەهاوبەشەكەى چاوەڕێى دەكات تێركردنى هەستيى خێرايە، گەڕان بەشوێن چێژدا لەڕێگەى گەڕان بەشوێن بابەتدا، ئاشكرادەبێت، تەنانەت ئەگەر ئەو چێژە تەنيا لەسەر ئاستێكى ئاشكراى سێكسواليش بێت: واتا خۆشيىو چێژبينينى سێكسوال يان ئەوەى جێيدەگرێتەوە، يان ئەو چێژەى تاك لەدەستەمۆكردنو داگيركردنى دڵى هاوبەشەكەيەوە دەستى دەكەوێت، لەگەڵ جەختكردنەوە لەتواناى خۆى بۆ راكێشانى سەرنجو ئارەزووى بەرامبەرەكەى.

سوودوەرگرتن لەم بابەتە، تەنيا لەچوارچێوەى ئەم كارەدا دەمێنێتەوەو پەيوەندى نييە بە سيستمى بەرگريكردن لەكەسێتى تاك، ئەگەر ئەو بابەتە تێربوونى لەخۆگرت ئەوا كارێكى باشە، بەڵام ئەگەر وانەبوو ئەوا پەيوەندييەكە بەخێرايىو زوويى لەناودەچێت.

– لەجۆرى دووەمياندا، پێچەوانەى جۆرى يەكەم، تێبينى دەكەين، ئەگەر بابەتەكە ئەركى تێركردنە سەرەكييەكان، بەتايبەتى ليبيدييەكان Libidinaleى خرابووە ئەستۆ، ئەوا لەگەڵ سيستمى

بەرگریکردنی تاك لەدژی خودی خۆی، پێکەوەدەلکێن: ئەو دوو بابەتە واتە تێرکردنە سەرەکییەکان و بابەتی بەرگریکردن لەدژی خود پێکەوە دەلکێن و تاك وەك هۆکارێك بۆ بەرگریکردن لەدژی مەیل و ئارەزووە خودییەکانی خۆی بەکاریاندەهێنێت کە لەئێستادا سڵیان لێدەکاتەوەو لەوانەیە ببنە هۆی لەناوبردنی، پشتبەستن بەم بناغەیە پەیوەندی توند لەگەڵ باتەکەدا کە پشتی بەخاوەنداریێتی بەهێز بەستووە، رۆڵی میکانیزمیی بەرگریکردن دژی ئەو مەیل و ئارەزووانە، دەبینێت.

## ئامانج لەهەڵبژاردن بەمەبەستی بەرگریکردن:

هەڵبژاردن بەشێوەیەك روودەدات، وەك بڵێی لەلایەن ئەو تاکەوە داواکراوە کە خۆی لەمەیلە نەستییە درێژخایەنەکانی بپارێزێت یان هەروەك بڵێی هەڕەشەی ئەوەی لەسەرە ئەو مەیل و ئارەزووانە داگیرو شەکەتی بکەن، ئەو تاکە واهەستدەکات لەناوەوە (لەناخیدا) هەڕەشەی لێدەکرێت، لەبەرئەوە ئامانجی لەو هەڵبژاردنە پاراستنی خۆیەتی لەو دیاردە ناوەکییەی کە وایداناوە هەڕەشەی لێدەکات: تاك بەشێوەیەك ئەو بابەتە هەڵدەبژێرێت کە بپارێزێت و لەوروژاندنی مەیلە ترسناکەکانی دووریبخاتەوە یان پشتیوانی لەچەپاندنیان بکات، وەك ئارەزوویەکی تابۆ یان پاڵنەرێکی پێش جێنیتالی Pregenitale، چونکە ئەو کەسەی لەمەیلە سادییەکان سڵدەکاتەوە لەوانەیە بابەتێکی نامازۆشی هەڵبژێرێت، یان راستره بوترێت بابەتێك هەڵدەبژێرێت بەشێوەیەکی بەهێز بەرگری لێبکات، ئەو



کەسەش کە لەمەیلی خۆرووتکردنەوە[٣] Exhibitionniste سڵدەکاتەوە لەوانەیە هاوبەشێك هەڵبژێرێت کە مەیلەکانی بۆ خۆماتدان[٤] Voyeuriste دەرنەکەون یان زۆر بەتوندی، بیانچەپێنێت.

–ئەم جۆرە هەڵبژاردنە بەسەر مەیلە ئەندەکییەکانیشدا Partielles جێبەجێدەبێت، چونکە ململانێی ئۆدیبییە شی نەبۆوەکان Nonliquide گوزارشت لەخۆیان دەکەن لەهەڵبژاردنی هاوبەشێکدا (کەسێکدا)کە بەئاگایان نەهێنێتەوە (واتە ئەو مەیلانە لای تاك چالاك نەبن و دەرنەکەونەوە–وەرگێڕ) بۆنموونە بۆئەوەی هاوسەرێتی لەگەڵ کەسێکدا نەکات کە لەباوکی بچێت، بەپێچەوانەوە پیاوێك هەڵدەبژێرێت لاواز یان ناکامڵ بێت بەپێچەوانەوەی باوکییەوە.. هتد.

ئەوەی بەسەر مەیلە ئۆدیبییەکاندا جێبەجێدەبێت بەسەر مەیلە هۆمۆسێکسوالییە (Homosxuelles)[٥] کانیشدا جێبەجێدەبێت، چونکە وەك ئاشکرایە هەڵبژاردنی پەیوەندییەکی هیترۆسێکسوالی(Heterosxuelles)[٦] شێوەیەکی تەقلیدیی و سادەیە بۆ دوورخستنەوەی یان رەتکردنەوەی مەیلە هۆمۆسێکسوالییە (Homosxuelles)کان.

ئەم سیفەتە یارمەتی جیاکردنەوەی هەڵبژاردنی بابەت (واتە کەسێك یان هاوبەشێك –وەرگێڕ) لەپەیوەندی هاوسەرێتیدا لەگەڵ شێوەکانی دیکەی ژیانی سۆزداریی دەدات وەك سەرکێشییە سەرپێییەکان و دڵداریی و خەونەکانی هەرزەکاریی و پەیوەندییە سەرەتاییەکانی خۆشەویستیی. چونکە لەو جۆرە پەیوەندییانەدا

کەسی یەکەم لە سنووری چێژو خۆشەویستیی و تێرکردنی ڕاستەوخۆی ئارەزووەکاندا دەمێنێتەوە، لێرەدا ئەو بابەتە هۆکارێکە بۆ تێربوون، ئەگەر وەڵامدانەوە نەبوو بۆی ئەوا ئەو کەسە بەخێرایی بابەتەکە بەجێدەهێڵێت.

بەڵام لەپەیوەندییە هەمیشەییەکانی وەك هاوسەرێتی، پێچەوانەکەی تێبینی دەکەین، خۆشیی و چێژو گەڕان بەشوێن تێربووندا بەگرنگترین خاڵ دادەنرێن، بەڵام بەتەنیا ئەو دوو لایەنە نابنە پاڵنەری سەرەکیی بۆ هەڵبژاردنی هاوبەش، ئەوەی لێرەدا شایانی تێبینیکردنە ئەو هاوبەشە هەر بەباشترین کەس بەرامبەر بەیەك دەمێننەوە تەنانەت ئەگەر بەشێوەیەکی کاتی یان هەمیشەیی ئەو ئارەزووانەش تێرنەکات، لەبەرامبەردا بابەتە هەڵبژێردراوەکە پێویستە یارمەتیدەر بێت لەپشتیوانیلێکردنی ئاسوودەیی ناخ لای ئەو تاکە بەو پێیەی ئەو کەسە هاوبەشی لەرێکخستنی بەرگری خۆیدا، دەکات. بۆنموونە ئەو بابەتەی (ئەو کەسەی–وەرگێڕ) ئارەزووەکانی تاك لەسەرکێشییە سۆزدارییە سەرپێیەکاندا، تێردەکات، ئەوا لەوانەیە لەپەیوەندییە درێژخایەنەکاندا مەترسیدار بێت و لەسەر ئەو بناغەیەش دەشێت تاك لێی دووربکەوێتەوە.

چونکە لەپەیوەندییە درێژخایەنەکاندا، بەپێی ڕێسای تەقلیدیی، واپێویستدەکات پێکهێنانی پەیوەندی هاوسەرێتی ڕووبەڕووی قۆناغە ڕەخنەییەکان ببێتەوە، واتە پێکەوەژیان لەخۆشیی و ناخۆشیدا، لەبوون و نەبووندا.

لەم نێوکۆیەدا زۆر گوزارشت بۆ بەهانە هێنانەوەی ڕەتکردنەوەی ئەو هاوبەشە لەچێژە مەترسیدارو خراپەکاندا، بەکاردەهێنرێن،



بەتایبەتی ئەوانەی پەیوەندییان بەمەسەلە سێکسوالییەکانەوە هەیە، بەمشێوەیە بەناوی ڕێزو پێزانینەوە هەندێك گوزارشت و روخسار لەپەیوەندی هاوسەرێتی دووردەخرێنەوە، لەکاتێکدا یەکێك لەو دوو هاوبەشە یان هەردووکیان بەشێوەیەکی سەرپێیانەو بێئەوەی کاربکاتە سەر سروشتیی پەیوەندییەکەیان هەوڵدەدەن لە دەرەوەی چوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتیی گوزارشتی، لێبکەن.

لەکۆتاییدا دەشێت کۆئەندامی بەرگریکردنی تاکێتی تایبەت بەپەیوەندییە درێژخایەنەکان (واتە پەیوەندی هاوسەرێتی) میکانیزمێکی بەرگریکارانە دژی هێزی ئەو پەیوەندییە سۆزدارییە، لەخۆبگرێت، کە بۆ یەکێك لەو دوو هاوبەشە بەمەترسیدار دادەنرێت، هەروەها دەشێت ئەم بەرگریکردنە بەمشێوەیە ئاشکرا ببێت:

– یان لەڕێگەی هەڵوێستی نەستییەوە لەکاتی پێویستدا، وەك بایەخدان خستنەوەبەرفرمانی کەسێتیی لەدەرەوەی چوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتیی وەك کارو چالاکییە کۆمەڵایەتییەکان یان کولتوری فرەجۆر، ئەویش جۆرێك لەسەربەخۆبوونی تاکێتی زامندەکات لای ئەو کەسانەی لاوازو هەڕەشەلێکراون.

– یان لەڕێگەی پەرچەکرداری لاوەکییەوە، واتە پەرچەکردارێکی پڕکێشی یان داڕێژراو Elabores کە ئامانجی دروستکردنی دوورخستنەوەیەکی سایکۆلۆژییە لەڕێگەی هەندێك ڕێوشوینی جیاوازەوە.

– ئەنجامدانی چالاکییە فرەجۆرەکان: کاری چڕوپڕ، گەشت بۆ دەرەوە، هەڵبژاردنی پیشە، چالاکی زۆری کۆمەڵایەتیی، لێکۆڵینەوە، نوێکردنەوەی پەیوەندییە خێزانی یان هاوڕێیەتییە دێرینەکان.

**– سەرکێشییەکی سۆزداری لەگەڵ کەسێکی دیکە لەدەرەوەی چوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتیی کە یارمەتی دوورکەوتنەوە لەتوانەوەی دوانی لەگەڵ هاوبەشە بنەڕەتیەکە، دەدات.**

**– گەشەکردنی شەڕانگێزی لەلایەن یەکێکیانەوە دژی هاوبەشەکەی دیو بەشێوەیەك هەندێك بەهانە بۆ ئەو شەڕانگێزییەی دەدۆزێتەوە، بەتایبەتی لەو حاڵەتانەی کە تاك ئەو شەڕانگێزییە دەنوێنێت هەستبکات خۆشەویستیی و نزیکبوونەوەی بەهێزی لەهاوبەشەکەیەوە وەك هێرشێکی داگیرکاری invasion مەترسیدار وایە بۆسەر خودیو لەوانەیە باڵی بەسەردا بکێشێتو داگیری بکات، لەگەڵ دەرکەوتنی ئەو شەڕانگێزییە لەلایەن ئەو تاکەوە بەرامبەر هاوبەشەکەی، بەڵام هاوبەشەکەی هەر خۆی بەباشتر دەزانێتو بە بایەخدارییی دەمێنێتەوە.**

**– داواکردنی لەناکاوی تەڵاق (ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت تەڵاقەکە جێبەجێدەکات).**

**– تەقینەوەیەکی کاتیو سەرپێیانەی رقوکینە لەلایەن ئەو تاکەوە بەرامبەر هاوبەشەکەی، لەکاتێکدا پەیوەندیی لەگەڵیدا هەر بە بەهێزیی و چەسپاوی، دەمێنێتەوە.**

**گیروگرفتی دوورکەوتنەوەی سایکۆلۆژیی** distanciation **لەسەرەتای پەیوەندییدا روونادات، بەڵام لەوانەیە لەلایەن یەکێك لەو دوو هاوبەشەوە لەیەکەمین قۆناغی توانەوە** Fusionnelle **لەگەڵ هاوبەشی بەرامبەردا، رووبدات کە لەسەرەتای پەیوەندییەکەدا بەرهەڵستی لێکردووەو لەدواییدا دەستی بەپراکتیزەکردنی کردۆتەوە.**



**<u>پەراوێزەکانی وەرگێڕ:</u>**

١– سایکۆسس Psychosis جۆرێکە لەپشێوییە سایکۆلۆژییە توندەکان کەتووشی مرۆڤ دەبێت، ئەو کەسە ناتوانێت رەفتارو هەڵسوکەوتی خۆی کۆنترۆڵبکاتو لەگەڵ پێداویستییەکانی چواردەوریدا خۆی بگونجێنێت.

٢– کەسانی دەماریی (نیرۆتیك) Nevrotiques: ئەم کەسانە تووشی جۆرێك لە پشێوی ئەقڵی دەبن، هەندێك هەڵسوکەوتی تایبەتییان هەیە کە تەنیا بەشێکی سنوورداری چالاکییان دەگرێتەوە بێئەوەی لەرواڵەتدا وادیاربێت پەیوەندی بە پاڵنەرە غەریزییو کۆمەڵایەتییە ئاساییەکانەوە هەبێت کە تاك لەسەریان راهاتووە، لەمبارەدا تاك نازانێت ئامانجی چییە، بەڵام ئەم مۆرکە نادروست یان ناسروشتییەیی خۆی دەناسێتو ناتوانێت بە ویستیی خۆی لێی رزگاربێت.

٣– ئارەزوو یان مەیلی خۆڕووتکردنەوە Exhibtionism : جۆرێکە لەلادانی سێکسییو لەپیاواندا زیاترە، کەسی تووشبوو ئەندامی نێرینەی لەبەرچاوی کەسێك یان چەند کەسێك دەردەخاتو هیچی لەو کەسانەش ناوێت، بەدەگمەن نەبێت قسە ناکاتو هەوڵی نزیکبوونەوەش ناداتو دوای گەیشتنی تەواو بەلوتکەی چێژ، شوێنەکە بەجێدەهێڵێت.

٤– ئارەزوو یان مەیلی خۆماتدان Voyeurism خۆماتدانە لەکەسانی دیکەو ئارەزووی بینینیانە بەرووتی یان بینینی کەسانی دیکەیە لەکاتی خۆرووتکردنەوەدا، ئەو کەسەی تووشی ئەم لادانە دەبێت هەست بەچێژی سێکسی دەکات بەهۆی ئەو کارەیەوە، یان چێژ لەخۆماتدان و بینینی کەسانی دیکە دەبینێت لەکاتی ئەنجامدانی کرداری سێکسدا.

٥- Homosxuelles: (هـاوتوخم بـازی) مەبەسـت لـەو کەسـانەیە لەپەیوەندیـە سێکسییەکانیاندا حـەز بەتوخمەکـەی (رەگەزەکـەی) خۆیـان دەکەن.

٦- Heterosxuelles :(تـوخم بـازی جیـاواز) مەبەسـت لەپەیوەنـدی سروشتی نێوان دوو توخمەکەیە (نێر و مێ).



## بەشی دووەم

# هەڵبژاردنی هاوبەش
# دەرهاویشتەکانی شیکردنەوەی دەروونی

### دەستنیشانکردنی مۆدێل لەهەڵبژاردنی خۆشەویستیدا:

**ئـەو لێکۆڵینەوانـەی فرۆیـد دەربـارەی هەڵبـژاردنی بابەتگەراییانـە لەمنداڵدا ئەنجامیداون، راڤەکردنێکی تەواون سـەبارەت بەهەڵبـژاردنی بابەتگەرییانـە لای گـەورەو پێگەیـشتووان، (چـونکە ئـەو"مەبەسـت لـەمرۆڤ" لەرێگـەی پەیوەسـتبوونی بـەو فرمانـە زیندەییانـەوە کـە یارمـەتی مانـەوەی دەدەن لـەتێربوونی سێکـسوالییە ئیرۆسـییە تایبەتییەکانیدا دەژی، دەمیش ئەندامێکە بۆ تێرکردنـی غـەریزەکانی (پاراستنی مانەوە)و لەهەمانکاتدا ناوچەیەکی ئیرۆسییە Erotiqueو غەریزە سێکسوالییەکان کە خاوەنی مۆرکێکی زارەکینو پشتیان بە غـەریزەکانی پاراسـتنی مانـەوە بەسـتووە، دەیکەنـە پاڵپـشتی خۆیان)**[1].

**لەکاتێکـدا ئاشـکراکردنی ئـەم پـشتیوانیکردنە (مەبەسـت لـەدەم) لەرێگـەی ئـەم واقیعـەوە بـەردەوام دەبێـت، ئـەو کەسـانەی ئـەرکی خۆراکپێـدانی منـداڵ دەگرنەئەسـتۆو هۆیـەکانی چـاودێریکردنی بـۆ دابیندەکـەن، هـەر ئـەو کەسـانەن کـە دەبنـە بابەتـە سێکـسوالییە**

یەکەمینەکانیی و لەپێشەنگی ئەم کەسانەدا، دایك دێت یان ئەو کەسەی جێگەی دەگرێتەوە. کەواتە دەتوانین ئەو دەرەنجامەمان دەستبکەوێت، هەموو تاکێك هەوڵدەدات شێوازێك لەپەیوەندی لەگەڵ ئەو بابەتە یەکەمیەدا دووبارەبکاتەوە کە هێشتا هەندێك مۆدێلی جێگیریانی پاراستووە، ئەمەش جۆرێکە لەسۆزی گەڕانەوە بۆ رابردوو.

وێنەی خێزان (توخمی پێچەوانە یان دژ) کاردەکاتە سەر ئەم هەڵبژاردنە، بۆنموونە سەبارەت بە کوڕ وێنەی دایك دەبێتە مۆدێل و سەبارەت بە کچیش وێنەی باوك دەبێتە مۆدێل.

بەڵام لەسەر ئاستی پەیوەندی هاوسەرێتی ئەم هەڵبژاردنە لەوانەیە هەندێك گیروگرفت بێنێتە ئاراوە بەتایبەتی ئەگەر بەشێوەیەکی سنووردار پشتی بەوێنەی خێزان بەستبوو.

خاتوو L.N کچی هونەرمەندێکی بەناوبانگ بوو، هەر لەمنداڵییەوە بەکەسێتی باوکی سەرسام بوو. هیچ کەس بەلایەوە سەیرنەبوو کاتێك هاوسەرێتی لەگەڵ هونەرمەندێکی گەنجدا بەست. کەسێتی ئەم هونەرمەندەو خەسڵەتەکانی زۆر لەکەسێتی باوکی، دەچوون.

ماوەیەکی زۆر تێپەڕی نەکرد، لەڕووی ژیانی سێکسوالییەوە، خاتوو L.N گیروگرفتەکانی دەستپێکرد، لەسەرەتادا پەیوەندی سێکسوالی رەتدەکردەوە، بەڵام لەدوای ماوەیەك لەگەڵ هەندێك ناڕەزاییدا، رازی بوو، لەڕووی سێکسوالییەوە زۆر سارد بوو هەموو دەستپێشخەرییەك یان پەیوەندییەکی لەلایەن هاوسەرەکەی رەتدەکردەوە، چونکە دەیزانی ئەو دەستپێشخەریی و گەمەبازییانە



بەرەو کاری سێکسوالی دەچن، ئەویش لەمە دەسڵەمییەوە. مێردەکەی لەلایەن خۆیەوە بەرامبەر هەڵسوکەوتی ژنەکەی سەریسوڕما بوو، بیری لەوەدەکردەوە تا لێی جیابێتەوە.

ئەو ژنە هەمیشە وێنەی باوکی دەکردە پاڵپشتی خۆی و بەشێوەیەکی شەڕانگێزانە وەڵامی هەر نەرمیی و سۆزێکی هاوسەرەکەی دەدایەوە کە بەرامبەری دەینواند، هەروەها خۆی بەسروشتی دادەنا، وا خۆیپیشاندەدا کە هیچ بەرهەڵستکارییەکی سێکسوالی ناکات.

بەمشێوەیە بەهانەی بۆ رەفتاری خۆی دەهێنایەوەو دەیوت (ئایا لەهاوسەرێتیدا تەنیا پەیوەندی سێکسوالی هەیە؟ هاوسەرەکەم پێویستی بەچارەسەرکردنە، چونکە ئەو لەپەیوەندیی هاوسەرێتیدا جگە لەتێرکردنی ئارەزووەکانی بەرامبەر بە من چاوەڕوانی هیچی دیکە ناکات). ئەم کارانەی بەکاری ئاژەڵیانە دادەناو پێی وابوو لەگەڵ شوێن و پایەیدا ناگونجێن.

ئەمبارە ئەوە دەسەلمێنێت کە چۆن هەڵبژاردنی هاوبەشیی ژیان تا ئاستێکی بەرز وێنەی باوك و ئارەزووە ئۆدیبییە چەپێنراوەکانی کردۆتە پاڵپشتی خۆی، کە ئەو ئارەزووانە هێشتا بەچالاکیی و کارایی، ماونەتەوە.

لەم چوارچێوەیەدا تێبینی سێکس ساردی یان پەککەوتنی سێکسوالی دەکەین کە بەسنوورداری لەگەڵ کەسانی دیاریکراودا (بۆنموونە هاوبەشی ژیان)، دەمێنێتەوە، جگە لەو پەیوەندییە، لەبارەکانی دیکەدا ئەو کەسە سروشتییەو ئەگەر تاك نەیتوانی لەرێگەی هەڵبژاردنی هاوبەشێکی باش و گونجاو سەبارەت بەخۆی

لەئارەزووە تابۆکان خۆی بپارێزێت، ئەوا جۆرە ناکۆکییەك یان دژ بەیەکییەك لای ڕوودەدات و ئەمەش وایلێدەکات لەگەڵ هاوسەرەکەیدا، بەرهەڵستی بەدیهێنانی ئارەزووە سێکسوالییە سروشتیەکانی بکات (ئەو ناکۆکی یان دژایەتیە لەگەڵ بارە جەوهەریی و بنەڕەتیەکەدا ڕوودەدات، لەم بارەدا تاك ناتوانێت پەیوەندییە سروشتییەکانی نێوان ژن و پیاو لەچوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتیدا پراکتیزەبکات– وەرگێڕ).

–دانیشتن و پشکنینە کلینکییەکان جۆرێك لەهەڵبژاردن ئاشکرادەکەن کە تاك بەشێوەیەکی پێچەوانە یان دژی وێنەی باوکی کردۆتە پاڵپشت، بەڵام ئەم پشتبەستنە بە وێنەی باوك، لە نەخشەداڕشتنی باری هەستیدا (هۆشیاری) نێگەتیڤەو لەسەر ئاستی نەستییش (ئەودیو هۆشیاری) پۆزەتیڤە.

خاتوو C.M، قۆناغی مندالّی بەشێوەیەکی ئازاراویی و پڕ ئەشکەنجە لەناو خێزانێکی شێواودا بەسەربردووە، لەبەرئەوەی باوکی هەمیشە سەرخۆش بووەو بەتوندوتیژی مامەڵەی لەگەڵ کردووە.

ناچار بوو لەم کەش و دۆخە هەڵبێت، بەو هیوایەی ڕۆژێك کوڕێکی گەنج بناسێت، لەوێنەی باوکی بەتەواوی جیاواز بێت. لەدوای ماوەیەك هۆگری پیاوێکی سەرخۆشبوو، دواتر هاوسەرێتی لەگەڵ بەست، ماوەیەکی زۆر بەسەر هاوسەرێتییاندا تێپەڕی نەکرد، هاوسەرەکەی دەستی بە نواندنی توندوتیژی بەرامبەری کردو کەوتە لێدانیی. ئەم پەیوەندییە هێندە درێژەی نەکێشا، چونکە لەدوای تووشبوون بە بارێکی توندی خەمۆکی، ناچاربوو وازیلێبێنێت.



لەدوای ماوەیەك هۆگری پیاوێکی نەخۆش بوو کە گیروگرفتی دەروونیی و تەندروستی هەبوو، توانی یارمەتی ئەو پیاوە بدات و وایلێبکات بەشێوەیەکی لەسەرخۆ لەگەڵ ژیانی کۆمەڵایەتیدا خۆی بگونجێنێت. بەڵام ئەم پیاوە گۆشەگیرە دەستی بەخواردنەوە کردو هەموو شەوێك بەسەرخۆشی بۆماڵەوە دەگەڕایەوەو دەکەوتە لێدانی و بەشێویەکی توندوتیژ لەگەڵیدا دەجولایەوەو مامەڵەی لەگەڵدا دەکرد. ئەم ژنە دیسانەوە تووشی خەمۆکی بۆوەو لەدوای چارەسەرکردنێکی درێژخایەن لەو پیاوەش جیابۆوە.

لەدوای ماوەیەك دووبارە دەستی بە ئەزموونە شکستهاتووەکانی کردەوە، تا بە ناسینی پیاوێك کۆتاییهات کە ئارامی و حەوانەوەی پێبەخشی. ئەم پیاوە پێشتر لە سوپادا خزمەتی کردبوو، حەزی لەوەرزش (بۆکسێن و گۆدۆ)و سەیرکردنی فیلمی توندوتیژی، دەکرد.

لەڕووکەشدا ئەم پیاوە زۆر بەرێزو بەڕەوشت دیاربوو، وادەردەکەوت کە ژنەکەی زۆر بەدڵەو خۆشیدەوێت، بەشێوەیەکی تەواو ڕووخسارە سادیزمییەکانی لەکەسێتی خۆیدا کۆنترۆڵدەکردو تەنیا لەڕێگەی فەنتازیاوە Fantasmes نەبوایە گوزارشتی لێنەدەکردن، بەڵام ژنەکەی بوو بووە بابەتی فەنتازیای ئارەزووە سادیزمییەکانی، چونکە هەمیشە بەژنەکەی دەوت کە حەزدەکات پێش ئەنجامدانی کاری سێکسوالی لێی بدات، بەڵام بەشێوەی فیعلی ئەم کارەی نەدەکرد، C.M(ژنەکە) لەدوای ئەوەی لەرابردوودا بەدەست سێکس ساردییەکی تەواوەوە، دەینالاند، توانی لەگەڵ ئەو پیاوەدا هەست بەتێربوونی سێکسوالی بکات.

ئەمبارە ئەوە روونەدکاتەوە چۆن هەڵبژاردنی هاوبەش لەنەخشە دارشتنی هەستیدا بەشێوەیەکی نێگەتیڤ پشتی بە وێنەی باوك بەستووە، بەلام لەئاست هەڵسوکەوتە نەستییەکاندا پۆزەتیڤانە پشتی پێبەستووە. رەفتاری راستەقینە (کە نەست هانیداوە–وەرگێڕ) وای لەژنەکە کردووە پەیوەندی ببەستێت لەگەڵ ئەو پیاوانەدا کە بەسیفەتی سادی ناسراون، هەرچەندە لەکاتێکدا ئیرادەی وایخواستووە لەم جۆرە پیاوانە، دووربکەوێتەوە.

پاڵنەرەکان (کە دەرەنجامی بارودۆخی ناخۆشی منداڵیی و یەکەم پەیوەندی بوون لەگەڵ باوکیدا) لەبینینی رۆڵێکی کارا لەم ژنەدا، بەردەوامبوون، هەرچەندە خۆی بەرگری دژی ئەم ئارەزووانە نواندووە، بەلام پاڵنەری مازۆشی پارێزگاری لەبەهای ئیرۆسی کارای خۆی، کردووە.

ئەم حاڵەتە ئەو پرۆسە دوالیزم [١]–ییە ئاشکرادەکات کە بەندە بە بەستنەوەی یان پەیوەستکردنی ئارەزووە مازوشییەکانی ئەم ژنە لەگەڵ ئەو ئامادەگییە شاردراوانەی کەخۆی بەشێوەیەکی نەستی لای هاوبەشەکەی درکی پێدەکردن. ئەو ژنە دەیتوانی پاڵنەرە سادیستییە شاراوەکانی ئەو پیاوانە ئاشکرابکات، بێئەوەی خۆیان بیدۆزنەوە یان ئاشکرای بکەن.

–جۆرێکی دیکە لەهەڵبژاردن هەیە کەپشت بە وێنەی باوك لەهەمان توخمی خۆی دەبەستێت، هەر لەبەرئەوەیە کە زۆر کچی تەمەن منداڵ و پێنەگەیشتوو لەگەڵ پیاوێکی کامڵ و تەمەن سەروو خۆیان یان بەتەمەن، هاوسەرێتی دەکەن، چاوەڕوانی تێرکردنی زۆرترین هێند لەپێداویستییەکانیان لەو پیاوە دەکەن، ئەو کچانە



تەنیا چاوەڕێی پاراستن و نواندنی ئەو رێگرییانە لەهاوسەرەکانیان، ناکەن کە باوکیان نواندوویەتی، بەڵکو چاوەڕوانی ئەوەی لێدەکەن لەرووی سۆزدارییەوە بەتەواوەتی رۆڵی دایك ببینن، ئەو رۆڵەی کە دایك لەقۆناغە سەرەتاییەکانی ژیانی ئەماندا بینیویەتی، چاوەڕێی چاودێری تەواو و خۆشەویستی نموونەیی و قوڵ لەهاوسەرەکانیان دەکەن.

## هەڵبژاردنی هاوبەش و پاڵنەرە (پێش جێنیتالییەکان):

هەندێك لەتاکەکان پەیوەندیی لەگەڵ هاوبەشەکانیاندا وەك هۆکارێك بەکاردەهێنن بۆ پاراستنی خۆیان لەشێوە جیاوازەکانی پاڵنەرە ئەندەکییەکانیان[ب] Pulsions Partielles – دا.

فرۆید لای خۆیەوە ئاماژەی بەزۆربەی پاڵنەرە ئەندەکییەکان (پێش جێنیتالەکان pregenttale) [ج] – داوە، کە ملکەچی دەسەلاتی جێنیتاڵی Genital بوون، بەلام ئەم دەسەلاتە هەمیشە تێروتەواو و چەسپاو نابێت، چونکە گۆڕانەکانی پەرەسەندنی لیبیدی لەوانەیە پاڵنەرێکی دیاریکراوی چەپێنراو، فەرامۆشبکەن، چونکە پاڵنەرێکی وروژێنەر بووە.

هەندێجار وا روودەدات، ئەم روخسارە بەرهەڵستکارییە لای هەندێك کەس دەرکەوتووبێت (بەتایبەتی ئەو کەسانەی لەماوەی پەرەسەندنی ژیانی سۆزدارییاندا رووبەڕووی ئاستەنگ و گیروگرفت بوونەتەوە، زۆرکات ئەم جۆرە کەسانە هەڵبژاردنیان بۆ هاوسەرەکانیان بەمۆرکێکی نەخۆشی و سنووردار، وێناکراوە)[٢].

G.F پیاوێکە لەسییەکانی تەمەنیدایەو ئەندازیاری کارەباییە، هاوسەرێتی کردووەو دوو کوڕی هەیە، لەدوای ماوەیەك لەتووشبوونی بە پشێوی، ناچاربوو پەنا بۆ چارەسەرکردن بەرێت، ئەو پیاوە خۆی دەیوت لەئاکامی ئەو ململانێیەی ماوەیەکە هەستی پێدەکات، تووشی دڵەڕاوکێ بووە، ئەویش لەوکاتەوە کە هۆگری خۆشەویستی کچێکی گەنج بوو، پیاوەکە دەترسا ئەم پەیوەندییە ببێتە هۆی لەقبوونی پەیوەندیی لەگەڵ هاوسەرەکەیدا، چونکە بەلایەوە باشتر بوو پەیوەندی لەگەڵ ژنەکەیدا بەدروستی و خۆشەویستیی بمێنێتەوە.

ئەو کچەی کە ئەم پیاوە هۆگری خۆشەویستیەکەی بوو، کچێکی دیکەی دەهێنایەوە یادی کەپێش هاوسەرێتی ناسیبوویی و زۆری خۆشویستبوو.

G.F ئەوەشی باسکرد، بارودۆخی لە ئێستادا کە ئەو کچەی خۆشدەوێت تا ئاستێکی زۆر لەگەڵ بارودۆخی پێشوویدا کە ئەو کچەی دیکەی تێدا خۆشویستووە، زۆر لەیەکچووە. (هەردوو کچەکە ئەوەی یەکەم و دووەمیش یەکێك لەپەنجەکانی دەستیان نەبووە، ئەو هۆگربوون و خۆشەویستییەش بەشێوەیەکی بەهێزو کتوپڕ لەهەردوو بارەکەدا، دروستبوون). پیاوەکە هەستی بەهەڵچوونێکی زۆردەکردو هیچ کاتێکیش نەیدەزانی سەرچاوەکەی لەکوێوەیە.

شیکردنەوەی پەرەسەندنی سۆزداری قۆناغی منداڵی لەG.F دا ئاشکرایکرد، ئەم پیاوە تاقانەی دایکێکی ستەمدیدە بووەو هاوسەرەکەی بەجێهێشتووەو داوای دڵنەوایی لەو کوڕە تاقانەی کردووە. پیاوەکە دایکی بەژنێکی داماوو ئەشکەنجەدراوو بێبەخت،



وەسفدەکرد. زۆر بەکوڕەکەیەوە پەیوەست بوو بوو، سۆزو خۆشەویستیی زۆری پێبەخشیبوو، ئەم پەیوەندییە توندوئەستەمە G.F –ی بەرەو چەندەها پەیوەندی سەرپێیی لەقۆناغی هەرزەکاریدا بردوو، تا بە خۆشەویستی ئەو کچەوە هۆگر بوو، کە پەنجەیەکی لەدەستدابوو.

کاتێك لەبەردەم دایکیدا دانی بەوەدانا ئەو کچەی خۆشدەوێت، ئەو دایکە لەجێگەی خۆیەوە درکی بەتێکچوون و پشێویی کوڕەکەی کرد، دایکەکە دەستی بەقەناعەت پێکردنی کوڕەکەی کرد تا بەخێرایی وازی لێبێنێت، دەگریاو پێیدەوت: (هەستدەکەم وەك منت لێدێت، تەنیا ئەو ژنانە بەلای خۆیاندا راتدەکێشن کەشایستەی تۆ نین و ئەوانەی قەد بایەخت پێنادەن). ئەم رووداوە پیاوەکەی فێرکرد کە هەموو هێزو توانای خۆی بخاتەکار تا جارێکی دیکە نەکەوێتە سەرکێشییەکی لەمجۆرەوەو بەوپەڕی بەئاگاییەوە هاوسەری ئایندەی (ژنەکەی ئێستای) هەڵبژێرێت تا ئەو چارەنووسەی دایکی بینیویەتی نەیەتەوە رێگەی.

شیکارکردنەکە ئاشکرایکرد G.F بەهاوچەشنی Identifie (د) لەگەڵ دایکە سوکایەتیپێکراوەکەی لەڕووی کۆمەڵایەتیی و ئەخلاقییەوە، ماوەتەوە، چونکە بەئاگایی بەرهەڵستی ئەم جۆرە هاوچەشنییەی دەکرد، بەڵام لەقوڵایی نەستیدا پارێزگاری لەئارەزوویەکی چەپێنراوو زیندووی وێنەی دایکە سوکایەتیپێکراوەکەی دەکرد. ئەو دەرهاویشتە یان دەرئەنجامانەی لەکاتی شیکاریدا داڕێژرانەوە، ئاشکرایانکرد پەیوەندییەك لەنێوان پەڕینی پەنجەو سیفەتی خەساندندا Castration (ت) هەیە.

گواستنەوەی سیفەتی خەساندن بۆ سەر پەڕینی پەنجە لەرەهەندە ڕەمزییەکەیدا لەسەر ئاستی نەستی، بەپارێزگاریکراوی ماوەتەوە. لەدوای چەند دانیشتنێکی شیکاری G.F توانی لەو کچە (واتە دووەمیان)و هەموو ئەو کچانە دووربکەوێتەوە کە کەموکورتییان هەیە (یان کەمئەندامن).

ئەمبارە ئەوە ئاشکرادەکات چۆن لەقۆناغە سەرەتاییەکانی منداڵیدا، بارودۆخی کۆمەڵایەتییو خێزانی وادەکەن تێپەڕین لەگرێی ئۆدیبی ئەستەمو قورس بێتو چۆن هاوچەشنیکردنیشی لەگەڵ وێنەی باوکدا، شێواندووە.

ئەم بارودۆخانە بوونەتە ئاستەنگ لەبەردەم چەپاندنی تەواوی پاڵنەرە لیبیدییە ئاڕاستەکراوەکان بۆ دایك. ئەمەش بۆتە هۆی نەك تەنیا هاوچەشنی Identification لەگەڵ وێنەی دایك، بەڵکو بۆتە هۆی پاراستنی ئارەزووی لیبیدی بابەتەکە (پەیوەندی لەگەڵ دایك)، ئەو ئارەزووە بەشێوەیەکی لاوەکی بۆ بابەتی دیکە گوازراوەتەوە کە لەشێوەی خەساندندا وێناکراوە، کەواتە سیفەتی خەساندن بۆ ستیرۆتایپێکی فیزیایی درکپێکراو گوازراوەتەوە، هەرچەندە بەشێوەیەکی بنەڕەتی لەشێوەی (ڕەمزی) شدا بووە.

بێگومان ڕێکخستنەوەی بەرگرییەکان Les defenses لەمبارەدا کە G.F بەکاریهێناون، شایستەی تێبینیکردنن، چونکە بەرهەڵستیی هاوچەشنییکردن لەگەڵ بابەتی یەکەمدا، واتا هاوچەشنی لەگەڵ ڕوخساری خەسێنراوی مازوشی دایکیدا، کردووە. چونکە لەڕووی سۆزدارییەوە G.F توانی لەدوای چەند سەرکێشییەك ئەو ژنە هەڵبژێرێت کە ئێستا هاوسەرێتی، لەکاتێکدا ئەو ژنەکە سیفەتێکی



هێمایی بۆ خەساندن، نانوێنێت: پەنجەکانی ژنەکەی هیچ بریندارییەك (یان ئاسەواری پەڕینێك) یان پێوە دیارنییەو هیچ کارێکی دەستیش ناکاتو هیچ کەسێکیش ناتوانێت بۆ مەبەستی خۆی سوودی لێوەربگرێت، چونکە بە باشی دەتوانێت بەرگری لەخۆی بکات. بەپێی گوزارشتی G.F کە دەڵێت: (دوو دەستی جوانی هەیەو هەمیشە بایەخیان پێدەدات، بۆئەوەی زیان بەدەستەکانیشی نەگات گشت پێداویستییەکی نوێی ماڵم بۆ دابینکردووە). چارەسەرکردنو پشکنینی G.F بەپێی گوزارشتەکەی فرۆید، جیاکردنەوەی ئاسایی نێوان بابەتی پاڵپێوەنانو بابەتی خۆشەویستیی، ئاشکرادەکات. بابەتە ئەندەکییەکە Partiel کە پاڵنەری ئەندەکی دەنوێنێت، ئەو کچە نییە کە هۆگری بووە، بەڵکو پەنجە یان راستره بڵێین روخساری پەڕێنراوی پەنجەکەیە. ئەم هۆگربوونە مۆرکێکی بەرهەڵستکارییو ئیرۆسیی نالۆژیکیی هەیە کە لەسەر ئاستی هۆشیاری هیچ هۆکارێکی نییەو هیچ پەیوەندییەکی بەو کچەشەوە نییە کە خاوەنی ئەو پەنجە بڕاوەیە (واتە روخساری پەڕێنراوی پەنجەکەی هەڵگرتووە)، لەواقیعدا G.F نەکەوتووەتە خۆشەویستی کچە پەنجە بڕاوەکەوەو نموونە باڵاکەشی نەکەوتۆتە سەر ئەو کچەو هیچ کاتێکیش لەگەڵیدا هاوچەشنی نەنواندووە.

## دووکەرتبوونو ئایدیالیزەکردنو هەڵبژاردنی هاوبەش:

ژیانی خۆشەویستیی پەنابردن بۆ فرمانە دەروونییە دێرینەکان، دەسەپێنێت، چونکە پەرۆشبوون بۆ توانەوەیەکی جیانەبۆوەو

ئارەزووەكانی گەڕانەوەو پاڵنەرە پێش جێنتالییەكانو بەرهەڵستكارە دێرینەكانی قۆناغی پارانۆیدیی Paranoides و خەمۆكی Depressives لەوانەیە لەژیانی خۆشەویستییدا دەربكەون.

هەموو بوونەوەرێكی مرۆیی ئەم روخسارانە لە قۆناغە سەرەتاییەكانی منداڵییەوە لەخودی خۆیدا دەپارێزێتو لەشوێنێكدا پاڵی پێوەدەنرێت، یان رۆژێك لەرۆژان بەكاریان دەهێنێتەوە: ئەم كاریگەرییە بەخامۆشی دەمێنێتەوەو تەنیا لەحاڵەتی خۆشەویستیی و عەشقدا دەردەكەوێت.

میلانی كلاین M.Klein (٣) جەخت لەوەدەكاتەوە حاڵەتە شیزۆ-پارانۆید Schzo-Paranoides (ن) و خەمۆكییەكان Deprssive كە منداڵ پێیاندا تێدەپەڕێت، لەهەرزەكاری یان قۆناغی نەرزەبووندا پارێزگاری لەئەركێكی شاراوە دەكەن. ئەم حاڵەتانە سەرلەنوێ لەكاتی بەستنی پەیوەندی خۆشەویستیدا دەستدەكەنەوە بەدەركەوتن.

- لەقۆناغی شیزۆپارانۆیدیدا، لەتەمەنی (١-٧) مانگیدا: منداڵ بەدەست كەموكورتی لەرێكخستنو كەموكورتی دیاریكردنی خود یان (من- son moi)-وە دەناڵێنێت، ناتوانێت ئەوە جیابكاتەوە چی هی خۆیەتی (جەستە- دەم)و چی هی خۆی نییە (سنگ- دایك). بەهۆی سەرەتاكانی پرۆجێكشن-خستنەپاڵو ئینترۆجێكشن-پێكەوەنووسان Projection et introjection (ن) دەتوانێت یەكەمین پەیوەندی لەگەڵ سنگی دایكیدا ببەستێت. چونكە خۆشەویستی جۆرێكە لەپەیوەندی relationnel و ناتوانرێت هەستی پێبكرێت لەوكاتەدا نەبێت كە لەگەڵ بابەتێكدا بەرجەستە



دەبێتو لەگەڵ خوددا بەیەكەوە دەنووسێت.

دەتوانرێت بوترێت پەیوەندییەكە چۆتە ناو جیهانی فەنتازیی منداڵەوەو پێكەوەنووسانی لەگەڵدا كردووە، چونكە منداڵ لەم قۆناغەدا ناتوانێت خودی خۆی لەبابەتەكە، جیابكاتەوە.

پشكنینە كلینكییەكان ئاشكرایانكردووە منداڵی شیرەخۆرە دەتوانێت هەستبكاتو باش لەخراپ جیابكاتەوە لەپێش ئەوەی ئەوە جیابكاتەوە كە بەشێكە لەخۆییو ئەوە جیابكاتەوە كە بەشێكە لەوبابەتە (دایك). بەمشێوەیە ئەو دووكەرتبوون یان دابەشبوونەی Clivage(س) كە باس لە (من- moi)و بابەتە ئەندەكییەكە (سنگ) دەكات، رێگەدەدات بەمنداڵی شیرەخۆرە لەو دڵەراوكێیە رزگاری ببێت، كە رووبەڕووی بۆتەوە، چونكە هێشتا لاوازەو ناتوانێت بەرگری لەپاڵنەرە تێكشكێنەرەكانی ناو خودی خۆی، بكات.

منداڵ بەهۆی ئەم دابەشبوونەوە دەتوانێت ئەوە جیابكاتەوە كە تایبەتە بەبابەتی پەسەندو لەگەڵیدا هاوچەشنی Sidentifie، دەكات، ئەوەش كە تایبەتە بەبابەتی خراپ وازی لێبێنێتو لێی دووربكەوێتەوە، چونكە ئەو بابەتە ناپەسەندە یان خراپە هەڕەشە لەئارامبوونی خودیی ئەو منداڵە دەكاتو مەترسییەك لەسەر ئەو بابەتە پەسەندە دروستدەكات كە ئەم لەگەڵیدا هاوچەشنی دەكات.

منداڵ لەئارەزووە شەڕانگێزییو تێكشكێنەرەكان سڵدەكاتەوە، لەوە دەترسێت بابەتی خۆشەویستییە پێكەوەنووساوەكەی لەناو خودی خۆیدا كاری تێبكرێتو ئەو ئارەزووانە تێكیان بشكێنێت، ئەگەر چاندنی بابەتە خراپەكە لەناو (من- moi)دا یارمەتیدەر بوو لەوەی وایلێبكات خراپ بێتو تێكیبشكێنێت ئەوا ئەو منداڵە

لەرێگەی ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو مەترسییەوە بەرگریی لەخۆی دەکات.

لەسەر ئەم بناغەیە بەهۆی پرۆسەی پەرەسەندنی دابەشبوونەوە بەجێهێنانی کردارەکانی منداڵ لەم قۆناغەداو پشت بە سەرەتاکانی پرۆجێکشن-خستنەپاڵو ئینترۆجێکشن-پێکەوەنووسان Projection et introjection دەبەستێت، ئەویش بەهۆی ڕێگەیەکەوە کە بابەتە باشەکان لەبابەتە خراپەکان جیادەکاتەوە بەشێوەیەك بابەتە باشەکان بەخراپەکان کاریگەرنەبن، ئایدیالیزەکردنی idealisation [ش] بابەتی باش یان پەسەند (یان سنگی باش) ئەنجامدەدرێت، چونکە منداڵ بەبەردەوامی بێ ڕوودانی هیچ هەڵەیەك پێویستی بەبوونی قەڵغانێکە Protecteur بۆئەوەی یارمەتییدات لەدوورخستنەوە لەو هەڕەشانەی دەشێت تێکیبشکێنن.

ئەم ئایدیالیزەکردنە یارمەتی ڕەتکردنەوەی هەستەکانی زوڵملێکردن دەدەن کە منداڵ لێیان دەترسێت، لەوبارەدا ئەگەر واقیع (یان دایك) ئەو تێربوونە چاوەڕوانکراوانەی بەشێوەیەکی بەردەوام پێشکەشنەکرد، ئەوا لەمکاتەدا منداڵ دەتوانێت بە ئارەزووە تێکشکێنەرو شەڕانگێزەکانی کاربکاتە سەر بابەتە خراپەکە کە لەدایك یان (سنگی دەرەوە)دا خۆیدەنوێنێت.

منداڵ بەشێوەیەك دەتوانێت پرۆسەیەکی نیمچە وڕێنەیی بەکاربهێنێت کە ڕێگەبدات بە قەرەبووکردنەوەی ئەو سوودانەی کە لەوانەیە واقیع لێی بێبەش کردبێت. (بەمشێوەیە ئەم پرۆسانە یارمەتی دوورخستنەوەی ئەو دڵەراوکێ‌و شکستانە دەدات کە لەسەرچاوەی جیاوازەوە دێن‌و سنگە لەدەستچووەکەی دەرەوەش



دەتوانرێت بگەڕێنرێتەوەو بەم ڕێگەیەش سەرلەنوێ هەستکردن بەبوونی سنگێکی نموونەیی لەناو خود-دا، دەبوژێتەوە)[٤].

- لەقۆناغی خەمۆکیدا: تەمەنی (٨-١١ مانگ): دابەشبوون‌و ئایدیالیزەکردن Idealisation هێواشتر یان سوکتر دەبن، ڕوخسارە دووفاقییەکان Ambivalentes (خۆشەویستی‌و ڕق) بەرامبەر بابەتی خۆشەویستیی واتا دایك، سەرهەڵدەدەن، چونکە منداڵ بەشێوەیەکی تێروتەواو هەست بەدرکپێکردنی دایکی، دەکات، کە خاوەنی باشیی‌و خراپی خۆیەتی.

بێگومان لەم قۆناغەدا وازهێنان لەدابەشبوون یان دووکەرتبوون دەبێتە هۆی ئینترۆجێکشن-پێکەوەنووسانی Introjection بابەتە خراپەکان لەناو (من- moi) دا، لەمبارەدا منداڵ بەهۆی گەڕانەوەی ئارەزووە شەڕانگێزییەکانی بەرامبەر بەباتەکەو بەرامبەر بەخۆی، بەقۆناغێکی ئازاراویدا تێدەپەڕێت. لەمبارەدا پرۆسەیەکی بەدوایەکداهاتوو لەڕوخساری دووفاقیی‌و هەستکردن بەگوناهو چاکسازیی‌و ڕەتکردنەوە.. هتد، سەرهەڵدەدەن، لێرەدا وا پێویستدەکات منداڵ پەرە بەو بەرگریکردنانە بدات کە تایبەتن بە باری خەمۆکیی: دەستدەکات بەئەنجامدانی ماتەمینییەکی ڕاستەقینە travail de deuil بۆ بابەتەکە (پەیوەندی منداڵ بە دایکەوە)، ئەویش بە ڕازیبوونی ڕوخسارە ناشادیی بەخششەکان لەناو بابەتەکەدا.

ئەو کاری ماتەمینیە باس لەبابەتە ئایدیالیزکراوەکە Idealise دەکات، چونکە ئەو شتەی کە لەدەستی چووە بابەتە واقیعیی یان ڕاستەقینەکە نییە، بەڵکو ئەو بابەتە دەروونییە ناوەکییە کە

لەمنداڵەکەدا، دەژی. لێرەدا ئەم کاری ماتەمینیە پێویستی بە وزەو چالاکییەکی گەورە هەیە، چونکە کارەکە پەیوەندی بەوازهێنان لەدووکەرتبوون یان دابەشبوونی یەکەمیی و ئایدیالیزەکردنەوە هەیە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت منداڵ رازییە بەبوونی هەستی دووفاقی بەرامبەر بابەتەکەو ئاشکراکردنی ئارەزووە شەڕانگێزییەکان بەرامبەریی، هەروەها ئەمە ئاڕاستەکردنی شەڕانگێزی بەرامبەر بەخود، دەگەیەنێت، چونکە بابەتی پێکەوەنووساو ئینترۆجێکشن- Introjection بەشێك لەخود، پێکدێنێت.

ئەو منداڵانەی نەیانتوانیوە پەرە بە بەرگرییەکانی تایبەت بە خەمۆکی (واتە ماتەمینی) بدەن، هەروەها نەیانتوانیوە لێی تێپەڕبن ئەوا ئەم بارە بۆ قۆناغی یەکەم (واتە قۆناغی شیزۆ- پارانۆیدی) دەگەڕێتەوە کە دووکەرتبوون و ئایدیالیزەکردن تێیاندا روودەدات.

-لەوە دەچێت پرۆسەی ئایدیالیزەکردن Idealisation کە لەکاتی دروستبوونی پەیوەندی خۆشەویستیی لەقۆناغی نەرزەبووندا، روودەدات، سەرچاوە بنەڕەتییەکانی لەقۆناغی سەرەتایی ژیانی منداڵی شیرەخۆرەدا، بدۆزێتەوە، هەروەها گەڕان بەشوێن خۆشەویستیدا لەقۆناغی هەرزەکاری یان نەرزەبووندا هەمان پرۆسە، دووبارەدەکاتەوە، چونکە ئەو پەرەسەندن و پێگەیشتنەی بەسەر تاکدا دێن هیچ کاتێك نابنە رێگر لەبەردەم سۆزو پەرۆشی بۆ سنگێکی باش و بابەتێکی(دایکێکی) باش و بەستنی پەیوەندی خۆشەویستیی، کە بەهۆیەوە هەمان شێواز لەدووکەرتبوون و ئایدیالیزەکردن دەگەڕێنێتەوە، تەنانەت گەڕان بەشوێن بابەتێکی پەسەندیشدا کەتوانای بەخشینی، هەبێت و لەهەمانکاتدا پاداشتیش



بێت. بەمشێوەیە جیهانی خۆشەویستەکان بۆ بابەتێکی پەسەندی تایبەت بەتاك دابەشدەبێت و بەشەکەی دیکەی جیهان کە دەمێنێتەوە بابەتە ناپەسەندو زوڵملێکارەکانی تێدا دەردەکەوێت (کە دەبنە سەرچاوەی مەترسی بۆ تاك و بۆئەو بابەتەی پێکەوەنووسانی Introjection لەگەڵدا کردووە).

ستراتیژی خۆشەویستیی لەقۆناغی نەرزەبووندا، بەهۆی چالاکی فەنتازیاوە ستراتیژی قۆناغە سەرەتاییەکانی منداڵی دووبارەدەکاتەوە، لەوکاتەدا کە ئامانجی پاراستنی مۆرکی گشتی بابەتی باشە، لەگەڵ ئەگەری داماڵینی هەر شتێك کەوا دەردەکەوێت خراپە، چونکە تاك لەقۆناغی خۆشەویستی یەکەم نیگاوە لە(مانگی هەنگوینیدا) هەوڵدەدات هەموو هەڵوێستە خەوشدارەکان لابەرێت و بەهۆی ئینکاریکردنەوە Deni هەموو روخسارە خراپەکان رەتبکاتەوە.

بەمشێوەیە هەندێك کەس (لەبەر چەند هۆکارێکی نەخۆشی کە پەیوەندییان بەدڵەراوکێی هەستکردن بەزوڵملێکردنەوە، هەیە) لەرێگەی ئینکاریکردنەوە بەردەوام واقیعی ئازاربەخشی ناوەوەیان، رەتدەکەنەوە.

- بۆ درککردن بەم پرۆسانە ئەم چەمکە یارمەتیمان دەدات، بەتایبەتی لەکاتی دروستبوونی پەیوەندی خۆشەویستیدا، چونکە زۆرجار تێبینی هەرزەکاران دەکەین لەکاتی رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ خێزانەکانیاندا، کە هەموو رقی خۆیان ئاڕاستەی ئەوان دەکەن و هەموو هۆکاری ئەشکەنجەو شکستییەکیشیان بۆئەوان، دەگەڕێننەوە، بەمەش بەشێوەیەکی کوێرانە بەشوێن هاوبەشێکدا

دەگەڕێن کە لەنەوەی خۆیان بێت، تا هاوچەشنی لەگەڵیدا بنوێنن، بەمشێوەیە بەشێوەیەکی کاتی لەوێنەی رەتکراوەو بێزراوی خێزان، جیادەبنەوە. زۆرجار ئەم هەڵبژاردنە سیفەتی دووکەرتبوون (دابەشبوون)و ئایدیالیزەکردنی هەیە، بەشێوەیەك ئەو هاوبەشەی وادانراوە باشە لەو کەسانە جیادەکاتەوە کە وادادەنرێت بەشێوەیەکی هەمیشەیی زوڵمدەکەن. هەرچەندە لەقۆناغی هەرزەکاریدا ئەم جۆرە پەیوەندییانە دووبارە دەبنەوە، بەڵام بێگومان ئەوەش دەزانین ئەم پەیوەندییانە تەمەنیان کورتە.

زۆرجار لای هەندێك کەس ئەمجۆرە هەڵبژاردنە لەگەڵ شکستهێنانی چەند بارەبوونەوەی ئەزموونەکاندا دووبارەدەکەنەوە، ئەوەی لێرەدا جێگەی سەرنجە، نەتوانینی بەستنی پەیوەندییەکی خۆشەویستییە کەخاوەنی مۆرکێکی دووفاقی Ambivalent بێت بەرامبەر ئەو هاوبەشەو هەروەها رەتکردنەوەی تەواوی، لەکاتێکدا ئەو هاوبەشە کەموکورتییەك یان ناتەواوییەکی دیاریکراو لەو وێنەیەدا دەخاتەڕوو کە لای دروستبووە: یان ئەو بابەتە پەسەند دەبێت یان بەهیچ شێوەیەك پەسەند نابێت، چونکە لەباری دووەمدا دەبێتە بەشێك لەبابەتە ناپەسەندەکان کەپێویستە بەتەواوەتی و راستەوخۆ، رەتبکرێنەوە. مەسەلەکە لێرەدا پەیوەندی بەو کەسە لاوازانەوە هەیە کەناتوانن بەرگەی کارە سروشتییەکانی حاڵەتی خەمۆکی بەتایبەتی هەستکردن بەگوناە و ماتەمینی، بگرن [٥]. بەشێوەیەك ئەم جۆرە کەسانە لەقۆناغە سەرەتاییەکانی منداڵیدا بە دۆگمایی ماونەتەوە واتا (لەباری پارانۆیدیدا کە دابەشبوون و ئایدیالیزەکردن تێیدا زاڵە، بۆ حاڵەتی خەمۆکی تێنەپەڕیوە کە



دابەشبوون و ئایدیالیزەکردن تێیدا هێوردەبنەوەو روخسارە دووفاقییەکان "خۆشەویستیی و رق" بەرامبەر بابەتی خۆشەویستیی واتا دایك، دەردەکەون) [٦].

## دیاریکردنی پەیوەندیی و ئایدیالیزەکردنی بابەت:

پشکنینە کلینکییەکان لەسەر ئاستی ژیانی خۆشەویستیی، ئاماژەیان بە کێشبەندی (ماتەمینی) داوەو دەرکەوتووە زۆر کەس هەوڵدەدەن لەسەریەك روخسار ژیانی خۆشەویستی خۆیان دیاریبکەن، هەروەك بڵێی دەیانەوێت لەگەڵ هاوبەشەکانیاندا پارێزگاری لەپەیوەندییەکی ئایدیالیزەکراو، بکەن. ئەو کەسانە دووردەکەونەوە لەپەیوەندی درێژخایەن و دیاریکراو لەڕووی کات و چاوپێکەوتنی دووبارەبۆوە، چونکە لەوەدەترسن وێنە ئایدیالیزەکراوەکەیان لەدەستبچێت، بەمشێوەیە زۆرێك لەو کەسانە بەهۆی هۆکاری بونیادییەوە (لاوازی دەروونی کە هۆکارەکانی دیارینەکراون) یان بەهۆی ئەو هۆکارانەوە کە پەیوەندیان بەقۆناغە یەکەمییەکانی منداڵییەوە هەیە (کەموکورتی سۆزداری، لەدەستدانی دایك لەتەمەنێکی زوودا، ئاڵوگۆڕی دایەن لەقۆناغی خەمۆکیدا) نەیانتوانیوە پەیوەندییەکی دووفاقی Ambivalent و بەتین لەگەڵ بابەتێکی خۆشەویستیی جێگیردا ببەستن و رێگەیان پێبدات لەو ئازارەیان کەمبێتەوە کە بەهۆی ئەم هەستکردنە دووفاقیانەوە دروستبوون، بۆیە ئەو کەسانە وەڵامدانەوەیان بەو شێوەیە دەبێت.

هەندێك کەس پارێزگاری لەئارەزووی خەمۆکی جێگیر یان

دەوری(خولی) خۆیان دەکەن، هەندێکی دیکەشیان بەردەوام بەرهەڵستی ئەو ئارەزووانە دەکەن، ئەمەش لەڕێگەی میکانیزمەکانی ئایدیالیزەکردنەوە idealisation کە لەتوانایدایە روخسارێکی تایبەتیی و جیا بەکەسێتییان ببەخشێت بێئەوەی تێبینی هیچ شێوەیەکی یان روخسارێکی نەخۆشی Pathologique یان لەسەربکرێت.

هەرچەندە ئەم کەسانە هۆکاری بەرگری وەك ئایدیالیزەکردن و دیاریکردنی پەیوەندییەکان بەشێوەی ئایدیالیزەکراو Idealise واتا (بەنموونەیکردنی پەیوەندییەکانیان) بەکاردەهێنن، بەڵام زۆرکات ئەو بەرگریکردنانە توندوتۆڵ دەبن، ئەگەر بۆ رووبەڕووبوونەوەی ئارەزووی خەمۆکی یارمەتییان بدات ئەوا هەر بەسەرچاوەی ئازارو ئەندێشەکانیان دادەنرێت، کە دەبێتە رێگر لەبەردەم گونجاندنی کۆمەڵایەتیی و مەعنەوییاندا (لەبەرئەوە ئەم کەسانە زۆرکات ژیانیان لەپەراوێزدایەو ناتوانن لەگەڵ پێودانگە کۆمەڵایەتییەکاندا هەڵبکەن و بگونجێن، وێڕای ئەوەی ناتوانن پەیوەندی خۆشەویستیی جێگیرو شادیبەخش، ببەستن)[٧].

لەبارە سروشتییەکانداو دوور لەهەموو روخسارێکی نەخۆشی تێبینی دەکەین، بێ ئەم شێوە هەڵسەنگاندنەو بێ ئەم خۆشییە کە دڵەراوکێ و رەخنە بەرامبەر ئەوی دیکەو بەرامبەر خود، رەتدەکاتەوە، ناتوانرێت هیچ پەیوەندییەکی خۆشەویستیی، ببەسترێت.

بەڵام لەباری نەخۆشیدا تێبینی هەندێك حاڵەت دەکەین کە بەشێوەیەك رەتکردنەوەی شەڕانگێزیی و گیروگرفت و ئاستەنگییەکان، درێژە دەکێشێت و فراواندەبێت و بەرەو رەتکردنەوەی راستەقینەی



ئەو واقیعە دەچێت کە درك و هۆشیاری تاك دادەپۆشێت، لەمبارەدا هەموو واقیع و بەڵگەکان هەر چۆنێك بن ناتوانن وا لەتاك بکەن واز لەو بیروباوەڕەی بهێنێت کە بابەتی خۆشەویستییەکەی هەمیشە شادیبەخش و باشەو بۆ هەمیشەش هەروا دەمێنێتەوە.

بەپێی گوزارشتەکەی میلانی کلاین M.klein، ئەم ئایدیالیزەکردنە کە مۆرکێکی هەوەسmaniaque[٤] ـی هەیە، بەرهەڵستییەکی راستەقینە دەنوێنێت و دەبێتە هۆی دانەوەی خەمۆکیی و رەتکردنەوەی: (خۆشیی و ورەو چالاکی زۆرو پرۆژەو هەمیشە زیندوێتیی، هەستکردن بەگۆڕینی خودو جیهان، هەستکردن بە توانایەکی هەمەکی، هەموو ئەمانە لەڕێگەی خاوەندارێتیکردنی ئەو بابەتەوە دەبێت کە (خاوەن توانایەکی هەمەکییە)و لەهەمانکاتدا شادیبەخش و پارێزەرە)[٨]. لەدەستدانی توانای پەیوەندیکردن لەگەڵ واقیعی کۆمەڵایەتیی و ماددیدا ناتوانێت ئەم نۆرە هەوەسییە بگۆڕێت، تەنانەت ناشتوانێت بیروباوەڕی تاك بگۆڕێت، بەمشێوەیە بەرەتکردنەوەی هەموو دووفاقییەك، خەمۆکیەکە نامێنێت: چونکە بابەتەکە باشەو ئەو تاکە خۆیشی بە بابەتێکی (بابەت: مەبەست لە پەیوەندی ئەو کەسەیە بە هاوبەشەکەیەوە) باشیی دادەنێت.

لەوانەیە ئەم جۆرە بەرهەڵستیکردنە درێژەبکێشێت و رێگە لەپرۆسەکانی پەرەسەندنی ماتەمینی بگرێت، هەروەها رێگە لەهەموو دووفاقییەکی پێویست بۆ تێپەڕین لەم بارە خەمۆکیە، بگرێت.

کاتێك کاردانەوە هەوەسییەکان دەست بە لەناوچوون و نەمان دەکەن، سەرلەنوێ دووفاقیی دەستپێدەکاتەوەو ئەو تاکە لەوە دەترسێت هەڵەو خاڵە لاوازەکانی تایبەت بە بابەتی

خۆشەویستییەکەی یان هاوبەشەکەی ئاشکرابن، بۆیە بەشێوەیەکی تەواو، هاوبەشەکەی رەتدەکاتەوە، چونکە ئێستا بابەتەکەی بەلاوە بۆتە بابەتێکی خراپ و لێرەدا لەڕێگەی ئاوێزەیەکی پێچەوانەکراوەوە Prisme حوکم بەسەر هاوبەشەکەیدا دەدات و بە کەسێکی خیانەتکار تاوانباری دەکات، چونکە وێنەی هاوبەشەکەی لەگەڵ وێنە سەرەتایی و ئایدیالیزەکراودا کە وێنەیەکی خۆشەویست بوو، لەلای هاوجێنابێت. هەژموونی پرۆسەکانی دابەشبوون و ئایدیالیزەکردن لەباری پارانۆیدیدا و شکستهێنانی پرۆسەی بەرهەڵستیکردن لەباری خەمۆکیدا، لەوانەیە لەکاری ماتەمینیەکەدا ببنە رێگر، کە دەشێت یارمەتیدەر بێت لەهەڵبژاردنێکی هەمیشەیی و درێژخایەن لەچوارچێوەی ژیانی خۆشەویستیدا.

شکستهێنانی پرۆسەکانی بەرهەڵستیکردن لەباری خەمۆکیدا، لەوانەیە بەڕێگەی جیاواز سەرهەڵبدەن، چونکە هەندێك کەس هەوڵدەدەن رەهەندی زەمەن بەدووربگرن یان دووربخەنەوە، تا پارێزگاری لەئایدیالیزەکردنی بابەتە باشەکەیان بکەن (ئەو وێنەیەیی تاك لە خەیاڵی خۆیدا بەرامبەر هاوبەشەکەی هەیەتی–وەرگێڕ)، چونکە کات و چاوپێکەوتنی بەردەوام و پرۆژەی درێژخایەن لەوانەیە حەقیقەتی هاوبەشەکە ئاشکرابکەن و توانای ئایدیالیزەکراو وەك بابەتێکی باش لەناوبەرن، کەواتە واپێویستدەکات لەڕێگەی رەتکردنەوەی رەهەندی زەمەنەوە رێگە لەگەڕانەوە چەپێنراوەکان Le durefoule retour بگیرێت و پەیوەندی خۆشەویستیش واپێویستدەکات سەرپێیی و لە هەر ساتێکدا بەرێکەوتنی هەردوو لایەنەکە قابیلی هەڵوەشاندنەوە بێت، بەشێوەیەك لەڕووی مەبدەئەوە



ناکۆکی دروستنەکات.

هەندێك کەس بەمشێوەیە هەڵسوکەوت دەکەن –تا خۆیان لەکەوتنە ناو خەمۆکی بپارێزن– هەروەك بڵێی لەگرێدانی پەیوەندی قوڵی خۆشەویستیی و هەمیشەیی سڵدەکەنەوە.

R.L پیاوێکە تەمەنی سی و پێنج ساڵە، بەهۆی جیابوونەوەی دایك و باوکی لەیەکتر بەقۆناغێکی منداڵی ئەستەمدا تێپەڕیبوو. کاتێك تەمەنی گەیشتە ساڵێك، دایکی هەوڵی خۆکوشتن دەدات، چونکە نەیدەتوانی بایەخ بە کوڕەکەی بدات، لەبەرئەوە چەند دایەنێك ئەرکی پەروەردەکردنیان گرتبووە ئەستۆ. هەرزوو هۆگری هەر دایەنێك دەبوو کە چاودێری دەکرد، بەڵام هەوڵەکانی بۆ سۆزو خۆشەویستییەکی هەمیشەیی پچڕپچڕ بوون، توانای تەواوی بۆ روانین لەوێنەی سەرەکی دایك، نەبوو.

لەقۆناغی خوێندنی سەرەتاییدا منداڵێکی گۆشەگیرو دوورەپەرێز دەرچوو، بەهۆی زیندەخەون و وەهمەکانییەوە قەرەبووی ئەوانەی دەکردەوە کە لەژیانی واقعیدا لەدەستی چووبوون، لەقۆناغی هەرزەکاریدا خەمۆکیی زیادیکرد. لەدوای ژمارەیەك پەیوەندی خۆشەویستیی شکستهاتوو، بڕیاریدا واز لەو سەرکێشییانە بهێنێت و بەتەنیا بەپەیوەندی سەرپێیی و کاتییەوە هەڵوێستەبکات، ئەو پیاوە دەیوت:(ئەوەی لەخۆشەویستیدا گرنگە تەنیا سێکسە، بێ سێکس خۆشەویستی تەنیا قسەیەو لەمەودوا هەڵناخەڵەتێم) هەر کچێکی دەناسی، هەموو ئارەزووەکانی ئەنجامدانی سێکس بوو لەگەڵیداو بەخێراییش پەیوەندی لەگەڵدا دەپچڕی. جەختی لەوە دەکردەوە کە بڕوای بەخۆشەویستیی نییەو تەنیا رەفتاری

دووڕوویی و دۆن جوانی بەسە.

R.L لەسەر ئەم بارە مایەوە تا ژنێکی ناسی کە لە ژیانی هاوسەرێتیدا بوو، ئەم ژنە لەمۆڵەتێکی دوو هەفتەییدا لەشوێنێکی دیکە ژیانی دەبردەسەر واتە لەگەڵ هاوسەرو منداڵەکانیدا نەبوو.

ئەم ژنە هەر لەسەرەتاوە سنووری پەیوەندییەکەی بۆ دیاریکرد، چونکە دەویست بۆلای هاوسەرو منداڵەکانی بگەڕێتەوە، دوای تەواوبوونی مۆڵەتی ژنەکە، ناونیشانیان لەگەڵ یەکتریدا گۆڕیەوە، نامەیان بۆ یەکتری دەناردو یادی ئەو ڕۆژانەیان دەکردەوە کە پێکەوە بەسەریان بردبوو.

R.L لای خۆیەوە هەستی بەجۆرە سۆزێك بەرامبەر ئەو ژنە دەکرد، هەرچەندە هەمیشە ئەو قەناعەتی بەو ژنە دەکرد کە پەیوەندی درێژخایەن کارێکی پڕوپووچەو ئازادی سێکسوالی بەنەمرو زیندوو دادەنا. ژنەکە لای خۆیەوە بڕیاری کۆتایی بەو پەیوەندییە هێنا، ئەویش لەدوای ئەوەی بەهاوسەرەکەی ناساندو بەڵێنی پێدا ماوە ماوە چاوی پێبکەوێت بەمەرجێك پەیوەندییان لەچوارچێوەی ماڵەوەدا تێنەپەڕێت، واتا بەئامادەبوونی هاوسەرەکەی چاویان بەیەکتری بکەوێت، لەمکاتەدا R.L تێکشکاو هەستیدەکرد بێ ئەو ژنە، ناتوانێت بژی، هەرچەندە لێی دووربکەوتایەتەوە هەستی بەنائومێدیو خەمباری دەکردو سەرلەنوێ هەوڵی نزیکبوونەوەو پەیوەندیکردنی لەگەڵدا دەدایەوە.

بەهۆی چارەسەرکردنەوە R.L توانی درك بەو پرۆسانە بکات کە بەشێوەیەکی نەستی بەکاریدەهێنان، تا لەپەیوەندی خۆشەویستی جێگیرو هەمیشەیی دووربکەوێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو



پەیوەندییەی دواتر لەگەڵ ئەو ژنەدا کە پەیوەندییەکی ناتەواو بوو، لە هەر سەرکێشییەکی سێکسوالی بەدەربوو، بەڵام پەیوەندییەکە درێژەی کێشا و لەگەڵ بەردەوامبوونیشی پەیوەندییەکە بەهێزتر بوو، چونکە ژنەکە دەستپێشخەری لەدیاریکردنیدا کردبوو. ئەمبارە زۆر بەباشی ئەوە ئاشکرادەکات کە دیاریکردنی پەیوەندی نێوان دووهاوبەش یارمەتی بەهێزکردنی ئایدیالیزەکردن لای هەندێك کەس دەدات کە ناتوانن بەهۆی باری خەمۆکییانەوە، وازیلێبێنن.

پشکنینە کلینکییەکان ئاماژەیان بە نائومێدیو بەدواییەکداهاتنی شکستیی، داوە لای ئەو کەسانەی لەقۆناغی یەکەمی منداڵییاندا بەدەست کەموکورتی سۆزدارییەوە ناڵاندویانە:وەك ئامادەنەبوونی دایك یان دایکی نەخۆش یان خەمۆکاوی وادەکەن منداڵ وەڵامدانەوەی بۆ داوای خۆشەویستی هەموو وێنە ئەلتەرناتیڤەکانی دایك هەبێت، هەندێك لەمنداڵان بەتایبەتی ئەوانەی لەتەمەنێکی پێگەیشتوودان بەڕێگەگرتن و دووبارەنەکردنەوەی ئەو جۆرە نائومێدیانە، وەڵامدانەوەیان دەبێت، ئەو منداڵانەش کە بەدەست گۆڕینی دایەن یان بەخێوکەرەوە دەناڵێنن یان ئەوانەی لە ئەنجامی بەجێهێشتنی دایکیان دووچاری دڵەراوکێ بوون بەشێوەیەکی خەمساردانەو فەرامۆشکراو وەڵامدانەوەیان دەبێت بەرامبەر دایەنە تازەکانیان.

بەهەمان شێواز دەبینین هەندێك لەهەرزەکارو کەسانی پێگەیشتوو بەشێوەی ڕێگەگرتن و دووبارەنەبوونەوەی ئەم جۆرە پەیوەندیانە، وەڵامدانەوەیان دەبێت، چونکە بە لەدەستدانی خۆشەویستی سڵدەکەنەوە، ئەو کەسانە لەپەیوەندی خۆشەویستی شادیبەخش

خۆیان بەدووردەگرن لەترسی ئەوەی نەوەك بابەتی خۆشەویستییان لێدابماڵرێت، هەرچەندە پێویستی زۆریان بەسۆزو خۆشەویستییە، ئەوانە بەشێوەیەکی ساردووسڕو کەمتەرخەمو خۆپەرست دەمێننەوەو تەنیا بەشوێن تێرکردنی هەستیی و ماددیدا، دەگەڕێن.

ئەم کۆمەڵە کەسانە هەمیشە لە لەقبوونی هاوسەنگی کەسێتییان، سڵدەکەنەوە، چونکە هەمیشە بەرهەڵستییان بەرامبەر بەهەڵچوونەکان ڕێگەیان پێنادات هەستو درکپێکردنیان گەشە پێبدەن، ئەگەر ڕۆژێك لەرۆژان هەستیانکرد بەر شۆککەوتوون ئەوا ئەگەری خۆکوشتنیان زۆر زیاتر دەبێت، ئەگەر ڕۆژێك لەرۆژانیش توانیان پەیوەندییەکی خۆشەویستیی دروستو شادیبەخش دابمەزرێننو ئەو پەیوەندییە دووچاری هەڵوەشان یان لەقبوون بوو، ئەوا ئەگەری نەخۆشکەوتنو مردنیان گومانی تێدانابێت.

خاتوو L.L لای نەنکی و باپیری بەقۆناغێکی ناخۆشیی منداڵیدا تێپەڕیبوو، کە ئەوان بەخێوکردنیان گرتبووە ئەستۆ، چونکە خێزانەکەی سەرقاڵی بازرگانیی بوو، لەهەموو چوونەدەرەوەو چاوپێکەوتنی هاورێکانی بێبەشیان کردبوو، پێویستبوو بەو ئادابانە ڕازی بێت، چونکە پێیاندەوت لەماڵەوە کەلوپەلی یاریی و خۆراكو جلوبەرگو تەلەفزیۆن.. هتد هەیەو پێویست ناکات لەدەرەوە بەشوێن لەمانە زیاتردا بگەڕێیت، مەبەست لەمەش ئەوەبوو تا ئاکاری منداڵانی سەرشەقام کاری تێنەکەن. بەمشێوەیە دوور لەهەموو نموونەیەکی مرۆیی و هاوبەشیکردنێکی کۆمەڵایەتیی هەردوو قۆناغی منداڵیی و هەرزەکاری بەشێوەیەکی بێزارکارو ناخۆش بەسەربرد. خوێندنگا لای ئەو تەنیا ئامانجی بەدەستهێنانی



پێگەیەکی بەرز بوو کە بەهۆیەوە داراییەکی باشی چنگ بکەوێت، وێڕای سامانی خێزانەکەی، کە بەپێی بۆچوونی خێزانیL.L هاوسەرێتییەکی بەختیاری بۆ زامندەکات. قەدەغەبوو هەر ئارەزوو یان بەهرەیەکی هونەری هەبێت یان بەشداری هەر چالاکییەکی کۆمەڵایەتیی بکات گەر ئەم چالاکییانە دەستکەوتی دارایی پێویستی بۆ زامننەکات.

وا پێویستی دەکرد بەهیچ شتێك ئاشنا نەبێت، چونکە لەپێش ڕۆژی ئاهەنگگێڕانییەوە، جیازییەکەی ئامادەبوو. تەنیا شت کە بەسەربەخۆیی گوزارشتی لێکرد ئەوە بوو کوڕی هاوسێکەیانی ڕەتکردەوە کە بۆیان دەستنیشانکرد تا هاوسەرێتی لەگەڵدا، ببەستێت. دوای تێپەڕبوونی سێ ساڵ حەزی لەبەرپرسی کارەکەی کرد کە لەلای کاری دەکرد، ئەویش پاشئەوەی بەشێوەیەکی زیادەڕۆییانە کۆمەڵێك بەڵێنی پێدابوو، کچەکە لەو باوەڕەدا بوو کە دەیهێنێت، بەڵام دوایی بۆی دەرکەوت کە ئەو پیاوە ژنی هەیەو ئەو پەیوەندییە لای ئەو تەنیا بۆ یاریکردنو کات بەسەربردن بووە، لەدوای یەکەم هەوڵی بۆ خۆکوشتن شکستیهێناو لەیەکێك لەنەخۆشخانەکاندا چارەسەرکرا. ئەو کچە هەرچەندە ئارام بوو، بەڵام هیچ ئارەزووییەکی بۆ ژیان نەبوو. ژیان لای ئەم کچە جیهانێکی بێ بابەت بوو، لەبەرئەوە هەستی بە بۆشاییەك دەکرد لەناخییدا، ئەمەش تووشی تێکشکانی کردبوو، لەمنداڵیدا فێریان کردبوو هەموو ئارەزووەکانی بچەپێنێتو بیانسڕێتەوەو بەشداری هیچ کارێکی ڕۆشنبیریی یان کۆمەڵایەتیی نەکات، نەدۆستی هەبوو نەدوژمن، زۆر بەرەوشتو ڕێکوپێك بوو، بەڕێکوپێکی کاریدەکرد، تەماشای

تەلەفزیۆنی دەکرد یان هەندێك چیرۆکی دەخوێندەوە.

بە برێك دەرمانی دژە خەمۆکیو دانیشتنی شیکاریی لەنەخۆشخانە چارەسەرکرا، بەڵام پابەندی چارەسەرکردن نەبوو، ئەو دانیشتنانە هەر بەوێنەی بۆشایی ژیانی لەبۆشاییدا مانەوەو کاتی تەواوی نەبوو بۆ ئاشکراکردنی هەر گۆڕانێك لەناخیدا کە ڕێگەی کرانەوەو ئاشکراکردنی ژیانی پێببەخشن.

ڕۆژێك هەموو حەپە هێورکەرەوەکانی قوتداو مرد، خێزانەکەی لەڕوودانی ئەم کارەساتە سەریان سوڕماو تووشی شۆکبوونو لەهیچ تێنەگەیشتن، ئەوان لەو باوەڕەدابوون هەموو شتێکی ئەستەمیان بۆکردووە تا دڵخۆشو بەختیاربێت.

ئامانجی باڵا لەژیانی ئەم خێزانەداو لەپێناوی دەستکەوتی ماددیدا، کارکردنی بەردەوامبوو، چونکە لەهەژارییو داماوی دەترسان، خەونیان بەکڕینی ماڵێکی نوێو دابینکردنی پارەی پێویستەوە دەبینی، کەزامنی ئایندەی خۆیانو کچەکەیان بکات.

ئەم جۆرە بیرکردنەوانە بوونە هۆی فەرامۆشکردنی کچەکەیان لەڕووی سۆزدارییو پەروەردەییەوە، چونکە لەسۆزو ئاڕاستەکردنی پێویستو دروستبوونی نموونەیەکی مرۆیی بێبەشبوو، ئەمانە جۆرێك لە بۆشاییان لەناخیدا ناوەکییان بۆ کچەکە دروستکردبوو، نەیدەتوانی هاوچەشنی لەگەڵ وێنەی خێزانەکەیدا بنوێنێتو ئەمەش بوو بەهۆی دروستبوونی من-ێکی لاواز لەکەسێتیدا کە لەسۆزو پەروەردەی کەمبوو.

دابڕانی لەکەسانی دیکە وایکردبوو بەئاسانی ملکەچی پێودانگەکانی باوکی ببێتو قۆناغی هەرزەکاری بەبێ هیچ



گیروگرفتێك ببڕێت، هەمیشە بەرەوشتو سەنگین بوو، بەرامبەر هیچ سیستمێك ناڕەزایی دەرنەدەبڕی، کەبەسەریدا دەیانسەپاند.

باپیرەی پیاوێکی هیلاکی تلیاکخۆر بوو، هەرچی داپیرەشی بوو بێزارو ڕەشبین بوو نەیدەتوانی ئامێزی بۆ واڵا بکات، سیفەتە تایبەتییو کەسێتییەکانی بۆ بابەتییە سەرەتاییەکان کە تایبەت بوون بە ئاشکراکردنی مۆدێلەکانی باوانی، ڕێگەیان پێدا بۆ داڕشتنی بنەماکانی کەسێتی خۆی کە لەڕێگەی پرۆسەکانی هاوچەشنێتییەوە identification پشتی پێبەستبوون. خۆی دەخواردەوەو هەڵچوونو هەستەکانی دەچەپاندو هیچ بابەتێك یان وێنەیەکی باوانی نەبوو بیکاتە پاڵپشت بۆخۆی، چونکە خێزانەکەی لای نەبوونو باپیرو داپیرەشی کەمتەرخەمبوون، بارودۆخی یان شێوازی ژیانیشی ڕێگەیان پێنەدەدا مۆدێلی دیکە بدۆزێتەوە تا هاوچەشنی لەگەڵدا بنوێنێتو یارمەتی بدات بۆ ڕەتکردنەوەی ئەو کاریگەرییە خراپەی وێنەی خێزانو باپیرەو داپیرەی، دروستیانکردبوو.

دەتوانرێت بوترێت ئەلتەرناتیڤێکی بۆ وێنەی بنەماڵەکەی نەدۆزیوەتەوە تا وایلێبکات ئومێدی بۆ ژیانێکی نوێ هەبێتو یارمەتی بدات بۆ ئاشکراکردنی توانا ڕاستەقینییەکانی تا توانای ئومێدو ژیانی پێببەخشێت، هەروەها دەتوانرێت بوترێت بەهیچ ئەزموونێکدا تێنەپەڕیوە تا ڕێگەی پێبدات دڵەراوکێی بەرامبەر بابەتە خراپەکانی ناخی ڕەتبکاتەوە، ئەو بابەتە خراپانەی بەهۆی پێکەوەنووسان- ئینترۆجێکشن- Introjection لەگەڵ وێنەی خراپی خێزاندا، بەرهەمهاتوون.

ئەو کچە تەسلیمی فەنتازیا fantasmes و بابەتە

ستەملێکراوەکانی ناخی بوو: نەخستنەوەبەرفرمانی desinvestissement تەواوی بابەتەکان تەنیا هۆکار یان تاکە چەك بوون تائەو کاتەی گیانی لەدەستدا، L.L لەکۆمەڵگە دوورەپەرێز بوو، لەهەموو پەیوەندییەکی سۆزو خۆشەویستی دوور بوو لەکەشوهەوایەکدا بوو کە ئایدیۆلۆژیی بۆرژوازی بچووك و پێودانگەکانی، بەسەریدا زاڵبوون، بەتایبەتی ئەم کۆمەڵانە کە ئایدیۆلۆژی بۆرژوازی بچووك زاڵە بەسەریانداو لەبناغەدا بەهەژاری دروستبوون، بۆئەوەی لەم بارودۆخە هەڵبێن پێودانگەکانی چینە خواپێداوەکان بۆخۆیان پەیڕەودەکەن یان پێیانەوە پابەنددەبن. ئەوەی ئەو خێزانە بەشوێنیدا وێڵبوو گەڕان نەبوو بەشوێن بەختیاری یان کرانەوەی سۆزداریی یان سێکسوالی، بەڵکو ئەوان بەشوێن دامەزراوەیەکی هاوسەرێتییدا دەگەڕان کە روخسارێکی ئابووری بەهێز پاڵشتی کردبێت کە لەروانگەی ئەوانەوە تاکە هۆکارە بۆ راکردن لەئینتمابوون بۆ چینێکی هەژار.

لەڕووی سۆزدارییەوە کچەکەیان فەرامۆشکردبوو، لەو باوەڕەدابوون بەزامنکردنی ژیانێکی ماددی، ژیانێکی هەبووی بۆ دابیندەکەن کە ئەوان خۆیان لێی بێبەشبوون. ئەوەی لێرەدا ئایدیالیزەکراوە سیفەتە کەسێتییەکانی بابەتی خۆشەویستییەکە واتە (کچەکە) نەبووە، بەڵکو شێوازی ژیان و ئینتمای چینایەتیی و حاڵەتی ماددی بووە.



## هەڵبژاردنی هاوبەش وەك قەڵغانێك بەرامبەرهێزی خۆشەویستیی:

زۆرکەس جۆرێك لەدڵەراوکێ و ناڕەحەتی بەژیانی خۆشەویستیی و خێزانییانەوە دیارە، لەکاتێکدا ژیانی کۆمەڵایەتییان سەرکەوتوو گونجاوە: ئەوەی ئەمان سڵیلێدەکەنەوە خۆشەویستییەکی توندوتیژە کە لایان شتێکی ترسناکە. لەبەرئەوە بەشوێن ئەو پەیوەندییانەدا دەگەڕێن کە لەهەڵچوونەکان بەدەرن و لەسەر بناغەی دووفاقیەت دروستبووە یان لەگەڵ کەمێك لەرقوکینەدا تێکەڵن، چونکە ئەو پەیوەندییانە هیچ مەترسییەك لەسەریان دروستناکات و خۆیان پێیانوایە بەمشێوەیە پارێزراودەبن.

دەتوانین لەروانگەی ئەو پێناسانەوە کە وینیکۆت Winnicott [9] پێشکەشیکردوون لەچەمکی (دەستتێوەردان Empietement) تێبگەین کە لەچوارچێوەی پەیوەندییە سەرەتاییەکانی منداڵدا لەگەڵ جیهانی چواردەوریدا سنووردارییکردوون.

لەم چوارچێوەیەدا هەڵوێستەکانی دایك رۆڵێکی گەورە دەبینن، منداڵ توانای پێویستیی بۆ رووبەڕووبوونەوەیان نییە، چونکە هێشتا (من- moi )ی بەشێوەیەکی راست دروستنەبووە. کاتێك (ئەو دایکە باش) دەبێت و لەگەڵ ئارەزووەکانی منداڵە شیرەخۆرەکەو فەنتازیاو وەهمەکانیدا دەگونجێت، بەشێوەیەکی هەستی درك بەوکاتە گونجاوە دەکات کەپێویستە تێیدا شیر بەمنداڵەکەی بدات. لەمکاتەدا ئەم دایکە پێش (داواکاری) منداڵەکەی ناکەوێت یان خۆی

پێشبینی ناكات، بەڵام كاتێك ئەم (داواكاری)یە دەخرێتەڕوو لەتوانایدایە بۆی دابینبكات، ئەم دایكە منداڵەكە بەرەو ئەو وەهمە دەبات كە وا هەستبكات خاوەنی (توانایەكی هەمەكییە) Toute Puissante لەئارەزووەكەیدا، چونكە هەر كە ئەو ئارەزووەی خرایەڕوو، یەكسەر جێبەجێدەكرێت. لەم قۆناغەدا ئەم وەهمكردنە یان (هەستكردن بەم وەهمە) لای منداڵی شیرەخۆرە پێویستەو دەشتوانێت لەدوایدا وازیلێبێنێت.

لەبەرامبەردا ئەگەر وەڵامدانەوەكانی دایك یان ئەلتەرناتیڤی دایك بەشێوەیەكی تەواو لەگەڵ روخساری تایبەتی ناخی منداڵەكەدا نەگونجا، یان ئەو دایكە دایكێك بوو حەزی لەخاوەنداریێتی Possessive بوو، خاوەنی خۆشەویستییەكی لەرادەبەدەر بوو، زیادەرۆیی لەچاودێریكردنی منداڵە شیرخۆرەكەیدا دەكردو لەكاتێكدا خواردنی دەدایە كە منداڵەكە ئارەزووی نەدەكرد، ئەم شێوە مامەڵەكردنە زیان بەمنداڵەكە دەگەیەنێت و وایلێدەكات دژی ئەم دەستتێوەردانە، بەرگری لەخۆی بكات. ئەو منداڵە هەست بەمەترسی دەكات هەروەك بڵێی جیاكراوەتەوە یان هەروەك بڵێی ئەم پەیوەندیكردنە مشەخۆرییەی دایكی لەوانەیە تێكیبشكێنێت، ئەم رەفتارەی كە لەلایەن دایكەوە دەنوێنرێت جێگەی دڵنیایی نییەو رێگە بەمنداڵەكە نادات لەو تەمەنەدا بەباشترین شێوەی پەرەسەندن بگات.

لێرەدا بەشێوەیەكی ئاشكرا دەردەكەوێت زوو ملكەچبوون بۆ داواكاریی كەسانی دیكە دەبێتە هۆی دروستبوونی (منی ساختە) Faux-Self كە هەستكردن بەپڕوپووچیی و نەبوونی وجود لەگەڵیدا



هاوكات دەبێت، شیكارە دەروونناسەكان ئاماژەیانداوە بەوەی كە هەندێك تاك پابەندن بەرەچاوكردنی ژمارەیەك لەو رێوشوێنانەی كە یارمەتیاندەدات بۆ خۆپاراستن لەبایەخدان بەبابەتی خۆشەویستیی، ئەویش لەڕێگەی حەشاردان و هەڵهاتن لەپەیوەندیی خۆشەویستیی یان لەڕێگەی پەنابردن بۆ ئەو درۆیانەی كە هاوجێن لەگەڵ ئەو دەستەواژەیەی كە وینیكۆت Winnicott بەسەردەمی دوودڵی و سەرسامی لای منداڵ[١٠] وەسفیكردووە.

S.N بەپیاوێكی دروست و سەركەوتوو لەهەموو بوارەكاندا ناسراوە: خاوەن زیرەكییەكی باش و رۆشنبیرییەكی بەرزە، سەبارەت بەقۆناغی منداڵیش بە بارودۆخێكی شادیبەخش و حەواوەدا رۆیشتووە. باوكی لەتوێژێكی كۆمەڵایەتیی رۆشنبیر بوو، توانی باشترین مەرجە رۆشنبیریی و پەروەردەییەكان بۆ كوڕەكەی زامنبكات، هەرچی دایكیشی بوو خاوەنی هەستیارییەكی ناسك و دركپێكردنێكی ناوازە بوو، لەژیاندا بایەخێكی گەورەی بەروخسارە رۆشنبیرییەكان دەدا. ئەو ژنە لەكاتی دووگیانیدا بەهەموو هۆیەكانی تایبەت بەپەروەردەكردنی منداڵ ئاشنابوو. بەهۆی پشتبەستنی بەردەوامی بە ژمارەیەك پزیشكی گومانكارو توندوتیژ لەبارودۆخێكی زۆر توندو ورددا بۆ چاودێریكردنی منداڵەكەی بەرنامەیەكی توندوتۆڵی پەیڕەودەكرد:

خواردنی ژەمەكان لەكاتی دیاریكراودا، بەبڕی هەڵسەنگێنراوو سنووردار بە منداڵەكە دەدرا. وادەردەكەوێت ئەو منداڵە بەئاسانی ملكەچی ئەم جۆرە سیستەمە خۆراكییە بووبێت، لەو ماوەیەشدا دووچاری هیچ جۆرە ئەستەمییەك نەبوو كە شایانی باسكردن بێت.

پاشان لەدوای ئەو قۆناغە، خێزانەکە بایەخیان بەلایەنی رۆشنبیری منداڵەکە دا، S.N توانی گشت ئاستەنگەکان ببڕێت تا پۆستێکی گرنگی لەیەکێك لەشوێنە فەرمییەکان بەدەستهێنا، لەدوای ماوەیەك لەسەرکێشی سەرپێیی S.N کچێکی ناسی، چونکە بەلایەنە فیکریی و ئەخلاقییەکانی کچەکە سەرسام بوو، لەدوای ماوەیەك لەپەیوەندیکردن کچەکەی خواست.

دوای ماوەیەکی کورت لەو پەیوەندییە، S.N هەستی بە پشێوی دەروونی کرد، پزیشکی خێزانەکەیان پێیراگەیاند کە ئەو تێکچوونەی هەستی پێدەکات هیچ بناغەیەکی ئۆرگانی (ئەندامی) نییە، هەرچەندە پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئەو کچە قوڵبووایەتەوە، زیاتر هەستی بە پشێوی دەکرد، بەتایبەتی کاتێك چاوپێکەوتنەکانیان زیادی کردو باسی هاوسەرێتیان دەکرد، S.N هەمیشە لەکاتی باسکردنی ئەم بابەتانەدا داوای لەدەستگیرانەکەی دەکرد کە دوای بخات و لەئێستادا باسی نەکات.

بەلام سەرلەنوێ دڵەراوکێی سەریهەڵدایەوە، کاتێك دەستگیرانەکەی داوایلێکرد پێش گواستنەوە (زەماوەندکردن) بەشێوەیەکی سنووردار، سێکس بکەن، هەرچەندە S.N لەڕووی سێکسوالیەوە هیچ گرفتێکی نەبوو، بەلام جۆرەها بەهانەی دەهێنایەوەو داوای لەدەستگیرانەکەی دەکرد ئەم کارە بۆ دوای زەماوەند دوابخات، دوو رۆژ پێش کاتی دیاریکراوی زەماوەندەکەیان، S.N دووچاری نۆرەیەکی دەماری توندوتیژ بوو، لەوکاتەدا بەدەرمانە هێورکەرەوەکان چارەسەرکرا، بەتایبەتی لەشەوی زەماوەندا توانی خۆی لەپەیوەندی سێکسوال دەربازبکات،



ژنەکەی ئەم هەڵسوکەوتەی هاوسەرەکەی بەجۆرێك لەهەڵهاتن و ترس لەقەڵەمدا.

لەکۆتاییدا S.N ناچار بوو بەچارەسەرکردنی دەروونی رازی بێت، لەدوای ئەوەی بەرامبەر ئەو هەڵسوکەوتەی خۆی زۆر شەرمەزار بوو دانی بەوەدانا کە رەفتارەکەی سروشتی نییەو نەخۆشییە. زۆر هەستیار بوو بەرامبەر ئەو سۆزو نەرمیەی دەستگیرانەکەی دەینواند، ئەو دەیویست پەیوەندی نێوانیان بەخەرمانەیەك لەبەهاوو پێودانگە کۆمەڵایەتیی و فیکرییەکان گەمارۆبدرێت، چونکە بەو شێوەیە دەیتوانی دەسەڵاتی سۆزداریی و بارگە هەڵچوونییەکانی هێور یان سووکیان بکات، لەبەرئەوەی تا بارگە هەڵچوونییەکان هێور بوونایە ئەوەندە پەیوەندی نێوانیان باشتر دەبوو.

S.N دانی بەوەدانا بەهۆی سەرکەوتنە فیکریی و کۆمەڵایەتیی و پیشەییەکانییەوە تووشی پشێوی و شێواوی بووەو ئەمەش رێگەی پێداوە کە لەڕووی سۆزدارییەوە هەست بەهیچ لاوازییەکی سۆزداریی نەکات. هەستکردن بەرامبەر بەو هەڵوێستە، لەنەستیدا بەرەو راکردنی هەمیشەیی لەدەستگیرانەکەی، دەبرد.

لێرەدا دەگەینە ئەو ئەنجامەی هەرچەندە پەیوەندی خۆشەویستی قوڵتربێتەوە ئەوەندە هاوسەنگی سۆزداریی کەسەکە لەقدەبێت و دەجوڵێت و هەستکردن بەدڵەراوکێ زیاددەبێت، هەندێك کەس بۆئەوەی خۆیان لەهەستکردن بەهۆگربوونی خۆشەویستی بەدووربگرن، زۆر شت بۆخۆیان دەکەنە یەدەگ، بۆنموونە پەیوەندییەکانیان بەسەر چەند کەس و چالاکییەکدا دابەشدەکەن. پەیوەندییە ئەدەبیی و ئەخلاقییەکان، پەیوەندییە کۆمەڵایەتیی و

سیاسییەکان، پەیوەندییە سێکسوالیی یان وەرزشییەکان، بەمەش خۆیان لەپەیوەندییە قوڵ و سۆزدارییەکان، بەدووردەگرن.

هەروەها دڵەراوکێ لەپەیوەندییە خۆشەویستییە بەهێزەکاندا لەوانەیە لەسەر ئاستی پەیوەندی سێکسوالی نێوان دوو هاوبەشیشدا سەرهەڵبدات، لێرەدا تێبینی دوو هاوبەشەکە دەکەین، هیچ جۆرە پەککەوتنێکی سێکسوالی یان ساردیی سێکسواڵییان نییە، لەکاتێکدا کە یەکێکیان چارەسەردەکرێت ئەویدیکەیان شکستدەهێنێت، بەشێوەیەك پەیوەندی سێکسوالی نێوانیان ئەستەمدەبێت. (زۆربەی ئەو کەسانەی بەدەست ئەم دیاردەیەوە دەناڵێنن نیشانەکان Symptomes لەنێوانیاندا سروشتێکی لەیەکچوویان هەیە، کە لەوانەیە بەترسان لەتەسلیمبوونی تەواو بۆ تاکی بەرامبەر "لەکاتی پەیوەندی سێکسوالیدا") [11] گوزارشتی لێبکرێت.

لای هەندێك کەس، خۆشەویستی بەتین وەك سەرچاوەیەکی مەترسی درکی پێدەکرێت، زۆرکات ئەم درککردنە بەمەترسی هاوکاتە لەگەڵ کۆمەڵێك نیشانەدا کە لەوانەیە نیشانەی دەروونی بن وەك: دڵەراوکێ و نەبوونی ئارامیی سۆزداریی و روخسارە دەمارییە وەسواسییەکان. یان نیشانەکان جەستەیی دەبن وەك: پەککەوتنی سێکسواڵ و ساردیی سێکسواڵ و ئازاری جۆراوجۆرو سەریەشەو کرژبوونی گەدەو ئازاری رۆماتیزم.

ترسان لەداگیرکردن یان پەلاماردان بەهۆی پەیوەندییەکی خۆشەویستی بەتین لای ژمارەیەك لەو کەسانەی لەرووی دەروونییەوە لاوازن، بەمشێوەیە کورتدەکرێتەوە، لەبناغەدا



هەڵبژاردنی هاوبەش لای ئەم کەسانە وەك بەرهەڵستییەك بەهۆی خۆشەویستییەوە دژی ئەو پەلاماردانە سەرهەڵدەدات: ئەو کەسانە هەوڵدەدەن ئەو پەیوەندییانە دروستبکەن کە بەنزیکی لەهەموو پەیوەستییەکی هەڵچوونیی و سۆزداری بەدەربێت و ئەو هاوبەشانە لەژیانیاندا هەڵدەبژێرن کە سیفەتەکانیان لەسیفەتەکانی خۆیانەوە نزیکن تا لەسەر ئاستی ژیانی کۆمەڵایەتی یارمەتیان بدەن.

B.B کوڕی بازرگانێکی ئاسایی بوو، زۆر بەناخۆشی قۆناغی منداڵی بەسەربردبوو، سەرەتا پوری پەروەردەی کرد، لەدواییدا داپیرەیی و پاشان خزمەتکارێك ئەرکی چاودێریی و پەروەردەکردنی گرتەئەستۆ. هەر لەمنداڵییەوە وا راهاتبوو بەتەنیاو دوور لەخەڵك و کۆمەڵگا بژی، لەژێر گوشاری ئەو ناوەندەی تێیدا گەورە بوو توانی پیشەی کارمەندی هونەری لەیەکێك لەکارگەکاندا بەدەستبهێنێت. پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی تەنیا لەچوارچێوەی چەند کەسێکدا سنووردار بوو، لەبەرئەوە هەمیشە هەستی بەبێزاریی و تەنیایی دەکرد. بۆئەوەی لەو دۆخە بێزارە هەڵبێت بڕیاریدا ژن بهێنێت، هاوبەشی ژیانی بۆخۆی هەڵبژارد کەوەك خۆی کارمەندێکی هونەری بوو، ئەم کچە لەخێزانەکەی جیابووبۆوە دوور لەهەموو دنیا دەژیا، بەشێوەیەك کە هیچ فرسەتێکی بۆ ئەنجامدانی بچووکترین چالاکی فیکری یان کۆمەڵایەتی نەبوو. وێڕای ئەمە خاوەنی هیچ یەقینێك یان باوەڕێکی سیاسیی یان ئاینیی چەسپاو نەبوو.

ناخۆشیی و دژواری ئەم بارودۆخە زۆرکاری لەم ژن و پیاوە کردبوو، گیروگرفتەکانی ژیانیان یەك یەك کەڵەکە دەبوو تا لەکۆتاییدا ناچاربوون هەوڵی چارەسەرکردنی بدەن و ئەو بۆشاییە گەورەیان

ئاشکراکرد، کەتێیدا دەژیان. هەریەکەیان هیچ جۆرە هەستێکی ئارەزوو یان سەرنجراکێشانیان بەرامبەر ئەویدیکە نەبوو، وێڕای ئەوەی هیچ کامیان هەوڵینەدابوو بەشوێن بابەتێکی مەزن لەژیانی ئەویدیکەدا بگەڕێت، هەردووکیشیان سڵیان لەپەیوەندییە خۆشەویستییە بەتین و بەهێزەکان دەکردەوە. شیکردنەوەی دەروونی ئاشکرایکرد کە هەریەکەیان بونیادو سیفەتی لەیەکچووی لەبەرامبەرەکەیدا دۆزیوەتەوە وەك: نەبوونی سۆزداریی و ئاسوودەیی ناخ، لەوانەیە ئەم هەڵبژاردنە بۆ گەڕان بێت بەشوێن مەسەلەی هاوسەنگبوونی کەسێتیدا.

فرۆید لای خۆیەوە ئاماژەی بەروخساری دووفاقی داوە لەپەیوەندی خۆشەویستیدا، چونکە بابەتی باش (مەبەست لەو پەیوەندییەیە کە کەسەکە پێی ئاسودەیە) ئەگەر توانایەکی هەمەکی هەبێت و شادیبەخش بێت، لەوانەیە ببێتە بابەتێکی خراپ ئەگەر بەهۆی (منی لاواز)ەوە پێکەوەنووسانی لەگەڵدا کرا، ئەم بابەتە پێکەوەنووساوە بەمانایەکی شیکاریی لەوانەیە ببێتە خۆراکێك کە هەرس نەکرێت و(من- moi) هەوڵی دوورخستنەوەی بدات، لەمبارەدا لەچوارچێوەی مانۆڕەکانیدا (من- moi) هەوڵدەدات بەشێوەیەکی خۆپاریزی بەشوێن بابەتێکی ناکاریگەرو ناشادیبەخشدا بگەڕێت تا پارێزگاری لەیەکێتییەکەی بکات و لەمەترسی پەلاماردان بەهۆی ئەویدیکەوە بەدووربێت.



## هەڵبژاردنی لاوازیی:

زۆربەی پەیوەندییەکانی خۆشەویستیی بە پرۆسەیەکی باو جیادەکرێنەوە، ئەویش لە ڕێگەی نموونەکانی (من- moi) کە دەخرێنەپاڵ بابەتی خۆشەویستیی، ئەگەر وامانداناکەسێك لەبەدیهێنانی هەندێك هاوشێوەی نموونەکەیدا بەدەست کەموکورتییەوە دەناڵێنێت، ئەوا هاوبەشێك هەڵدەبژێرێت کە نموونەی خۆی Son ideal بنوێنێت و لەدوایدا دەبێتە ئەلتەرناتیڤی ئەو نموونەیە. بەمشێوەیە بەهۆی هاوچەشنی نارسیزمییەوە Identificion narcissique تاك لەهاوبەشەکەیدا دەتوانێت ئەو هەڵوێستە بدۆزێتەوە کە هاوجێیە لەگەڵ نموونەی خۆی.

بەڵام لەم چوارچێوەیەدا تێبینی ئەوەدەکەین هەندێك تاك لەوانەیە لەکاتی هەڵبژاردنی هاوبەشەکەیاندا کە هەڵگری سیفەتی نێگەتیڤن، جۆرێك لەسوودی نارسیزمی بەدەستبهێنن.

وینی (Wynne)[١٢] لەلێکۆڵینەوەیەکیدا دەربارەی ئاڵوگۆڕکردنی جیابوونەوەI,echange des dissociations تێبینی کرد، هەر هاوبەشێك (تاکێك) هەوڵدەدات هەندێك سیفەتی کەسێتی خۆی دووربخاتەوە کە بەلایەوە ناشرین و ترسناکن یان لەباری هەستدا، هەستکردن بەگوناه دەوروژێنن، بۆئەوەی لەم دوورخستنەوەیەدا سەرکەوێت (وەك ڕێگەیەکی بەرگری) جۆرێك لەشێوەی جیاکاری، بەکاردەهێنێت، کە بەهۆیەوە روخسارە ڕەتکراوەکانی کۆدەکاتەوەو بەڕێگەیەکی ناهۆشیاری (لەنەستدا) بەسەر هاوبەشەکەی بەرامبەریدا

دەبارێنێت (واتە دەخاتەپاڵی). بەمشێوەیە لەوانەیە هەڵبژاردنی ئەو هاوبەشە بەپێی پێداویستی خۆیی و بەپێی رەهەندی ململانێی ناخیی و روخسارەکانی کە لەناو خۆیدان و لەباری هەستدا رەتکراوەن، بەڕێوەبچێت یان بەدیبهێنرێت. ئەم کارە واپێویستدەکات کە هاوبەشێکی گونجاو هەبێت لەگەڵ ئەم خستنەپاڵانەدا بگونجێت و بەنۆبە ئاڵوگۆڕی بکەن.

ئەوەی لەم نێوکۆیەدا دیارو دەرکەوتووە ئەگەری هەڵبژاردن یان پاڵاوتنی خەسڵەت و سیفەتە نێگەتیڤەکانە لای هاوبەشەکەی بەرامبەر، ئەم روخسارانە لەوانەیە لای ئەو هاوبەشە پێشبینی بکرێن و جیابکرێنەوە، تاک بەڕێگەیەکی نەستی، لەهاوبەشەکەیدا "خۆئامادەکردنی شاراوە Disposition Latente" بەرامبەر ئەم لاوازییە تێبینی دەکات، بۆیە هەوڵدەدات لاوازی خودی خۆی رەتبکاتەوەو لەبواری هۆشیاری رایبماڵێت و هەوڵبدات بیخاتەپاڵ هاوبەشی بەرامبەری.

زۆرکات هەڵبژاردن لەمبارەدا بەهۆی ئەو لاوازییە شاراوەیەی ئەو هاوبەشەوەیە، ئەو کەسە لەلاوازی خودی خۆی دەترسێت و دەیخاتەپاڵ هاوبەشی بەرامبەر، بەمشێوەیە ئەم هەڵبژاردنە دەبێتە هۆی دروستکردنی پەیوەندییەکی خۆشەویستیی، بەوپێیەی کە ریچەر (Richter)[١٣] و وینی (Wynne) بەدەستەواژەی (منی نێگەتیڤ Le Moi negatife) باسیانکردووە کە دەخرێتەپاڵ هاوبەشەکەی دیکە.

ئەگەر وامانزانا هاوبەشی -A- بەرگەی درکپێکردنی هیچ روخسارێکی قێزەونی لەخودی خۆیدا نەگرت، لەوانەیە هەوڵبدات



بەشوێن هاوبەشێکی دیکە -B- دا بگەڕێت، کە ئەم رۆڵەی بخاتەپاڵ، بەمشێوەیە -B- بەرجەستەی لایەنی نێگەتیڤی -A- دەنوێنێت.

لەوانەیە ئەمجۆرە پەیوەندییە تێربوونی دەروونی بۆ هەردوو هاوبەشەکە، بەدیبهێنێت: لەلایەکەوە -B- واتە ئەکتەری راستەقینەی ئارەزووە لادراوەکان دەتوانێت لەڕێگەی خستەڕووی ئەم ئارەزووانەوە تێربوونێکی خودی لە -A- دا بەدیبهێنێت، هەروەها لەوانەیە هەندێك سوودی مازۆشی پێببەخشن و ئارەزووەکانی (سزادانی خود) لای -B- تێربکەن، بەتایبەتی کاتێك لەلایەن -A- ەوە سزادەدرێت، لەلایەکی دیکەوە -A- لەگەڵ -B- دا کە هەڵگری هەمان ئارەزووە، دەتوانێت لەچوارچێوەی هاوچەشنی نارسیزمدا identificion narcissique ، ئەو ئارەزووانە لەخودی خۆیدا بەندبکات و دوورەپەرێزیان بخات و بەمەش لەهەستکردن بەگوناه رزگاری دەبێت.

جۆرێکی دیکە لەپەیوەندی هەیە کەرۆڵی (منی نێگەتیڤ Le moi negatif) دەخاتەپاڵ هاوبەشی بەرامبەری و لەسەر بناغەی ئەم خستنەپاڵە ئەو پەیوەندییە دادەمەزرێت. پشکنینە کلینکییەکان لەهەندێك پەیوەندیدا هەندێك حاڵەتییان ئاشکراکردووە کە یەکێك لەدوو هاوبەشەکە خاوەنی خەسڵەتی پڕبەهان بەتایبەتی لەرووی چالاکیی و دڵسۆزیی و زیرەکی و ... هتد، لەکاتێکدا ئەو هاوبەشەی دی خۆی بەدەستەوەداوە، کەمتەرخەمەو بەدەست نیشانەکانی خەمۆکییەوە دەناڵێنێت و وەك بارقورساییەك بەسەر هاوبەشی یەکەمەوە دەژی. زۆرکات بنەماڵە یان ئەو کۆمەڵەی چواردەوری ئەو دوو هاوبەشە هاوبەشی دووەم بەبارقورسایی بەسەر هاوبەشی

یەکەمەوە دادەنێن، چونکە یەکەم بەهۆی ئامادەباشیی و دڵسۆزیی و تواناکانییەوە دەتوانێت هاوبەشی باشتر لەوەی دووەم هەڵبژێرێت، لەراستیدا ئەم جۆرە پەیوەندییە ئاڵۆزترە لەوەی هەستی پێدەکرێت، چونکە دەرکەوتووە لەهەندێك بارودۆخی وەك (شەڕو قەیرانە کۆمەڵایەتیی و ئابووریی و جیابوونەوە بەهۆی کێشەی هاوسەرێتییەوە) لەوانەیە ئەو هاوبەشە لاوازو خەمناکە، کۆمەڵێك خەسڵەت و سیفەتی تێدا دەربکەون کە پێشتر نەیخستوونەتەڕوو، بەڵام هاوبەشی یەکەم کە بەهێزو کارا دیاربوو تێکدەشکێت و سەبارەت بە هاوبەشی دووەمیش نێگەتیڤ دەبێت.

دەتوانرێت ئەم پەیوەندییە بەمشێوەیە لێکبدرێتەوە:

هاوبەشی یەکەم -A- کۆمەڵێك گیروگرفتی خودی هەیەو دەیەوێت رووبەڕووی هەندێك خاڵە لاوازەکانی ببێتەوە (وەك خەمۆکیی و قەتیسبوون، نێگەتیڤی) ئەم هاوبەشە هەست بەحەوانەوەی زۆردەکات، کاتێك هاوسەرێتی لەگەڵ هاوبەشی دووەم-B- دا دەکات، لەبەرئەوەی وێنەیەکی گاڵتەئامێزی ئەم دەنوێنێت و لەمیش زیاتر ئامادەباشی بۆ نەخۆشییەکانی (خەمۆکی، قەتیسبوون، نێگەتیڤی) پێوەدیارەو ئاشکرایاندەکات، بەمشێوەیە -A- تێربوونێکی بۆخۆی بەدیکرد، چونکە ئەو نیشانانەی کە ئەم بەدەستیانەوە دەناڵێنێت ئەگەر لەگەڵ نیشانەکانی هاوبەشەکەیدا بەراوردبکرێن، ئەوانەی ئەم ئەوەندە گرنگ نین. هەروەها هەمیشە ئامادەبوونی ئەم هاوبەشە دڵنەوایی پێدەبەخشێت و متمانەی بۆدەگەڕێنێتەوە. هاوبەشی دووەم -B- وێنەیەك لەنموونەی من ideal de moi لەهاوبەشی یەکەم -A-دا بەدیدەکات، چونکە



چالاکیی و سەربەخۆیی دەنوێنێت و هیچ نیشانەیەکی خەمۆکیی یان نێگەتیڤی پێوە دیار نییە. بەمشێوەیە-B- بەهۆی هاوچەشنی نارسیزمییەوە لەگەڵ -A-دا لەچوارچێوەی (چاکبوونەوە بەهۆی خۆشەویستییەوە) تێربوونەکانی بەدیدەهێنێت.

بەمشێوەیە هەر هاوبەشێك دەتوانێت تێربوونی تەواو لەسەر ئاستە جیاوازەکان بەهاوبەشەکەی بەرامبەری، ببەخشێت. ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەم جۆرە پەیوەندییانە بەدەگمەن بەجێگیریی دەمێننەوە، هەرچەندە هەندێك تێبینی ئەوەیان کردووە رێژەی جیاواز لەنێوان هاوبەشەکاندا هەیە.

لێرەدا پێویستە ئاماژەبەوەبدەین کە دابەشکردنی رۆڵەکان بەوشێوەیە لەمجۆرە پەیوەندییانەدا بەجێگیریی نامێننەوە، زۆرجار دابەشکردنی فرمانی رۆڵەکان بەشێوەیەکی نەرمونیان بەڕێوەدەچن، زۆرکات تێبینی دەکەین ئەو هاوبەشەی رۆڵی خراپ دەبینێت، لەبارودۆخێکی تایبەتیدا رۆڵی پۆزەتیڤ دەبینێت و ئەمەش وادەکات ئەو پەیوندییە پێکهاتەو بونیادێکی جێگیریی هەبێت.

زۆرکات ئەمجۆرە یان شێوازە لەپەیوەندی لە دەرەوەی پەیوەندییەکانی هاوسەرێتییدا روودەدەن، چونکە زۆر لەپەیوەندییەکانی هاوڕێیەتی کە دوو کەس بەیەکەوەدەبەستن، بەمشێوەیە رێکدەخرێت و دابەشبوون لەفرمانی رۆڵەکاندا روودەدات.

پشکنینە کلینکییەکان سەلماندویانە شێوەیەك لەنەخۆشی Pathologique ی دابەشکردنی رۆڵەکان لەچوارچێوەی ئەو پەیوەندییەدا هەیە، کەپێی دەوترێت (پەیوەندی جوڵاو یان لەقەلەقکەر) هەریەکە لەو دوو هاوبەشە ئارەزووی خەمۆکیی دەوریان

**Cyclique هەیەو بە نۆبە ڕۆڵەكانیان دەبینن یان ڕۆڵەكانیان دەگۆڕنەوە. بەمشێوەیە ئەو هاوبەشەی لەقۆناغی خەمۆكییەكی توندا دەژی، كاتێك دەبینێت هاوبەشەكەی بەرامبەری (كە ئەویش خەمۆكی هەیە) چاكدەبێتەوەو ئەو قۆناغە دەبڕێت و هەڵوێستێكی ئاسایی وەردەگرێت یان بەمتمانەوە خۆی ڕێكدەخاتەوەو دەبێتە دڵنەوایكارو پارێزەری هاوبەشەكەی كە بەخەمۆكیدا دەڕوات. بەڵام ئەم هاوبەشە لەوانەیە بگەڕێتەوە بۆ باری ئەو نەخۆشییەو واز لەهەڵوێستەكەی خۆی بهێنێت، ئەگەر ئەو هاوبەشە خەمۆكەی بەرامبەری توانی قۆناغی خەمۆكی ببڕێت و بۆ چالاكیی و دۆخی زیندەگی خۆی بگەڕێتەوە.**

**لەواقیعدا زۆرجار ئەم دیاردانە لەزۆربەی پەیوەندییەكانی هاوسەرێتیدا ڕوودەدەن و دووبارەدەبنەوە كەوامانلێدەكەن لەو بڕوایەدا بین ئەو هاوبەشانە كە هەریەكەیان نەخۆشی خەمۆكییان هەیە بەعەفوی یەكترییان هەڵبژاردووەو هەڵبژاردنەكەیان لەدەوری تەوەرەی خەمۆكی Pole depressif سوڕاوەتەوە.**



**پەراوێزەكانی وەرگێڕ:**

(ا) دوالیزمی – Dualism: دوانی، پێچەوانەكەی مۆنیزمە Monism

(ب) ئەندەكی: بەشی (جزئی)

(ج) پێش جێنتالەكان: پێش زاوزێییەكان

(د) هاوچەشنیكردن یان تەماهی Identification: لە شیكاركردنی دەروونیدا ئاماژەیە بۆ پرۆسەیەكی نەستیی و نابێت لەگەڵ لاسایكردنەوەی نەستیی یان هەستیدا تێكەڵی بكەین، لێرەدا تاك خۆی دەخاتە شوێنی كەسێكی دی، ئەو كەسە كێبڕكێكار یان دەستدرێژیكار یان بابەتی خۆشەویستییە لەبەر كۆمەڵێك هۆكار كە خۆی پێیان نائاشنایە، فرۆید یەكەمجار لە كتێبی لێكدانەوەی خەونەكاندا بەكاریهێناوە، دواتر ئەم چەمكە لە پرۆسەیەكی سایكۆلۆژی زۆر گرنگدا گشتگیركرا كە لەڕێگەیەوە خود فۆرمەڵە دەبێت.

(ت) خەساندن – Castration: لەلایەن فرۆیدەوە، سیفەتی خەساندن یان گرێی خەسان و ئەو دڵەڕاوكێیەیی دروستی دەكات، دانی پێدانراوە كە پەیوەندی بە قۆناغی چوكییەوە هەیە لە گەشەی لیبیدیی و سیستیماتیككردنی ئۆدیبیدا، فرۆید لەساڵی ١٩٢٣ ئەم مەسەلەیەی باسكردووە، بەم پێیە منداڵی كوڕ لەئەنجامی ئەو ئارەزووە سێكسوالەی بەرامبەر دایكی هەیەتی دەترسێت بەهۆی باوكییەوە تووشی خەسان بێت، منداڵی كچیش بەهۆی نەبوونی چووكەوە هەست بەو خەسانە دەكات و دەیەوێت قەرەبووی بكاتەوە.

(ر) شیزۆ–پارانۆید Schzo - paranoides: شێوەیەكە لەشێوەكانی شیزۆفرینیا گرنگترین نیشانەكانی بوونی وەهمی هەستكردن بە چەوساندنەوە

یان مەزنێتییە ( واتە هەستدەكات دەچەوسێنرێتەوە یان خۆی كەسێكی مەزنە).

(ژ) ئینترۆجێكشن– پێكەوەنووسان Introjectionو پرۆجێكشن–خستنەپاڵ Projection، ئینترۆجێكشن زاراوەیەكە دژ بە پرۆجێكشنە، س. فێرەنسزی S.Ferenczi هێناویەتییە ناو شیكردنەوەی دەرونییەوە. بەهۆی ئەم میكانیزمە دەروونییەوە تاك هەمواركردنو چاكسازیی لە "من–Ego" دا دەكاتو لەدروستكردنی" منی بالآ–Super Ego" بەكاریدەهێنێت بەپێی پێرڵ Perls یەكێكە لەبنەما كلاسیكییەكانی پشتدەبەستێت بەپێكەوەبەستنی فكر یان پرەنسیپی كەسانی دی، بێئەوەی گۆڕانیان بەسەردابێت تاك بەشێوەیەكی شەخسی وەریاندەگرێت بەم شێوەیە جیهانی دەرەوە باڵ بەسەر خود–دا دەكێشێت، بەگشتیی لەشیكردنەوەی دەروونیدا چەمكێكی نێگەتیڤی هەیە، بەلآم زانا جێشتالت وەك چەمكێكی پۆزەتیڤ لێیی دەڕوانێت. هەرچی پرۆجێكشنە هۆكارێكی سایكۆلۆژییە تاك لەباری هەستدا پەنای بۆ دەبات بۆ شاردنەوەی هەندێك پێكهاتەی نەستی، كە ئەو سیفەتانەی لەخۆیدا ئارەزووی ناكاتو وەرسی دەكەن بەسەر كەسێكی دیكەدا دەیسەپێنێت یان دەیخاتە پالی، واتە بەشە رەتكراوەكە لەخود دەخرێتەپاڵ دەرەوەی كەسەكە یان بۆ جیهانی دەرەوە فڕێ دەدرێت.

(س) دووكەرتبوون یان دابەشبوون Clivage:میكانیزمێكی سایكۆلۆژی سەرەتاییە میلانی كلاین بە وردی پێناسەی كردووەو بە یەكێك لەمیكانیزمە هەرە سەرەتاییەكانی داناوە بۆبەرگریكردن لەو دلەڕاوكێیەی بەندە بە شەڕانگێزیەوە.دابەشبوون ئامانجی چڕكردنەوەی خۆشەویستییە لەسەر خودو ئەو بابەتانەی لێوەی نزیكن لەگەڵ ئاراستەكردنی شەڕانگێزی



بەرەو دەرەوە كە هێرشبەرەو لەوانەیە خود تێكبشكێنێت، بۆ نموونە بۆ ئەوەی منداڵ لەو دلەڕاوكێیە رزگاری ببێت كە بەندە بەو شەڕانگێزییەوە كە بەرامبەر دایكیی هەیەتییو بۆئەوەی ئەو شەڕانگێزییە لەدایكی بەدوور بێت، شەڕانگێزی لەخۆشەویستیی، یان نەزوەی مردن لەنەزوەی ژیان جیادەكاتەوە، كە ئەمانە هەمیشە پێكەوە لەهەموو پەیوەندییەكاندا هەنو تێكەڵی یەكترین.

(ش) ئایدیالیزەكردن– Idealisation: چەمكێكی شیكارییە، فرۆید لەساڵی ١٩١٤ دا بەمشێوەیە پێناسەی كردووە: پرۆسەیەكە پەیوەندی بەو بابەتەوە هەیە كە تاك گەورەی دەكات، بێئەوەی سروشتیی ئەو بابەتە بگۆڕێت.

میلانی كلاینو زۆرێك لە نووسەرانی دیكەش پێیانوایە ئایدیالیزەكردن بەشێوەیەكی سەرەكی بەرگریكردنە دژی پڕكێشییە غەریزییە وێرانكەرەكانو پەیوەندی بە دووكەرتبوون یان دابەشكردنی بابەتە باشو خراپەكانەوە هەیە.

(ع) هەوەس– maniaque: ئەو رەفتارە توندوتیژەیە كە ناتوانرێت كۆنترۆڵبكرێت، ئەو كەسەی تووشی ئەم نەخۆشییە دەبێت، چالاكییو جوڵەو خرۆشانو پڕكێشییەكی زۆری هەیەو بەرهەڵستیی هەر هەوڵێك دەكات بۆ ئارامكردنەوە.

**پەراوێزەکان:**


1-Freuds., "Pour introduire le narcissisme". Tr fr. La sexuelle, Paris, P.U.F, 1969, PP.81-105.

2-LEMAIREJ-G; Lesconflits coniugaux,Paris, E.S.F, 1966, P.150.

3-KLEIN M,. Le deuil et ses rapports avec les etats maniaco-depressifs, in Essais de psychanalyes, Paris-Payot, 1969,PP. 125-140.

4-KLEIN M,. les developpements de la psychanalyse, paris, Gallimard, 1990, PP.190-198.

5-KLEIN M,. Lamour et la haine, paris, payot, 1968, PP. 90-96.

6-KLEIN M,. Envie et gratitudes et essais, paris, Gallimard, 1968, PP.120-136

7-LEMA IREJ-G, Le cuple: sa vie,sa mort,paris, payot, 1979,PP.232-253.

8-ibid, p.130

9-WINNICOTT D.W., De la pediatrie a la psychanalyse, paris, payot, 1975, PP.122-130.

10-BION W-R., Lattention et Linterpretation, tr fr, paris, payot, 1974, P.78.

11-PASCHE F., Apartir de freud, paris, payot, 1969, P.38.

12-WYNNE L., "Lechange des dissociation", in Psychotherapise familiales, Paris, P.U.F, PP. 1980.253-254

13-RICHTER H.E., Psychanalyse de la famille. Paris, Mercure de france,1971,  PP.52-60




## بەشی سێیەم

# نەستو ڕێکخستنی هاوسەرێتی

### قۆناغە سەرەتاییەکان:

لەقۆناغە سەرەتاییەکانی پەیوەندیی نێوان ژنو پیاودا ڕێکەوت زاڵە بەسەر هەڵبژاردندا کە لەخۆشەویستی یەکەم نیگادا coup de foudr دەردەکەوێت، ئەمجۆرە خۆشەویستییە بەشێوەیەکی کتوپڕو عەفەوی لەبارودۆخێکی چاوەڕواننەکراودا دەردەکەوێتو ملکەچی هیچ بیرکردنەوەو شیکارکردنێك نابێت، هەڵبژاردنی تەواوی ئەو هاوبەشە خۆشەویستە (کەسە هەڵبژێردراوەکە) بێئەوەی هیچ بیرکردنەوەیەك یان شیکارکردنێکی ڕەخنەییانەی بۆ بکرێت خۆی بەسەر هەستدا دەسەپێنێت، وشەی (بۆچی)و ئەو وشانەی بۆ دیاریکردنی دیاردەکان بەکاردەهێنرێن هیچ نین، ئەفسوونو سەرنجراکێشانو جوانییو شۆخی، تەنیا ئاماژەی سنووردارن بۆ کارتێکردنی ئەفسوناوییو سەرسوڕهێنەری ئارەزووە چاوەڕواننەکراوەکانو ئەوانەی لەدەرەوەی تاکەوە دەردەکەون.

ئاشکرایە لەخۆشەویستی یەکەم نیگادا داواکارییە دەروونییەکان ئەوکاتە دێنە ناو بابەتەکەوە کە کارلەکار دەترازێن، ئەم داوا دەروونیانە لەتوانایاندایە پاڵپشتی لەو هەڵبژاردنە بکەن یان

رەتیبکەنەوە، دەتوانرێت بوترێت ئەم ئارەزووە لەوەدایە کە بەشێوەیەکی عەفەوی هانی دوو هاوبەشەکە دەدات و تەنیا گوزارشتکردنێکە لەپاڵنەرە ئەندەکییەکان pulsion partilles کە لەنێوانیاندا پێکەوە یەکیاننەگرتووەو بەشێوەیەکی بەردەوام لەگۆڕاندان، چونکە کاتی پێویست بۆ دروستکردنی پەیوەندییەکی خۆشەویستی دروست، دابیننەکەن.

لەلایەکی دیکەوە لەوانەیە لەقوڵایی نەستدا ئەم ئارەزووە هەڵقوڵاوەی تاک لای بەرامبەر رووبەڕووی زایەڵەیەکی پۆزەتیڤانە ببێتەوە، هەروەها لەوانەیە ببێتە هۆی دروستکردنی پەیوەندییەکی خۆشەویستی دروست، وەك ئەو پەیوەندییەی بەدرێژایی مانگی هەنگوینی تێبینی دەکەین، لەو ماوەیەدا سنوورەکان لەنێوان (من – moi) و ئەوی بەرامبەردا نامێنن و هەست بە (ئێمەی کۆ) رێکدەخرێت و کاردەکات، هەروەها لەوانەیە خۆشەویستی یەکەم نیگا لای ئەو کەسانەش رووبدات کەهاوسەرێتییان کردووەو لەژیانێکی خێزانی بەختیاریشدا دەژین، وەك ئەو خۆشەویستییە سەرکێشییانەی لەدەرەوەی چوارچێوەی هاوسەرێتیدا روودەدەن.

## مانگی هەنگوینی و قۆناغی(پێش رەخنەیی):

لەدوای یەکترناسینی ئەو دوو هاوبەشە یان ئەو دووکەسەو بڕیاردانیان لەسەر هاوسەرێتی، قۆناغێکی نوێ لەپەیوەندی دەستپێدەکات کە هەریەکەیان هەوڵدەدات پەیوەندییەکی متمانەپێکراوو ناوازە لەگەڵ بەرامبەرەکەیدا رێکبخات، هەریەك لەو



دوو هاوبەشە هەستدەکات شتێکی تازە ڕوودەدات، گۆشەنیگایەکی نوێ لەدایك دەبێت بەرامبەر بە جیهان و بەرامبەر ئەو هاوبەشەی کەدەیەوێت پەیوەندیی هاوسەرێتی لەگەڵدا ببەستێت و تەنانەت بەرامبەر خودی خۆیشی.

ئەوەی زیاتر ئەم قۆناغە جیادەکاتەوە، هەریەکە لەو دوو هاوبەشە کاردەکەن بۆ تووڕدان و رەتکردنەوەی هەموو رەگەزێکی شەڕانگێزی بەرامبەر هاوبەشەکەی دی، هەروەها هەریەکەیان هەڵەکانی ئەویتر پشتگوێدەخات و بەمەش ناتوانێت هیچ بۆچوونێکی هەبێت دەربارەی هەر روانگەیەکی دژ بەو روانگە ئایدیالیزەکراوەی idealisee دەربارەی ئەو هاوبەشەی هەڵیبژاردووە، ئایدیالیزەکردن ideedisation دەگاتە ئاستێك کە واقیع و گۆڕانی روخساری راستەقینەی هاوبەشەکەی بەرامبەری رەتدەکاتەوە، لەچوارچێوەی ئەم پەیوەندییەدا هەر هاوبەشێك هەستدەکات لەگەڵ ئەویدیکەدا تواوەتەوە، هەروەك بڵێی بەشێك لەخودی خۆی پێکهێناوە، ئەم توانەوەیە fusion پلەیەکی پێشکەوتوو لەنەمانی سنوورەکانی(من– moi)و ئەویتردا دەنوێنێت، ئەم سنوورە هاوبەشەی نێوان هەردوو هاوبەشەکە لەهەموو جیهان جیایان دەکاتەوەو وایانلێدەکات هەستبکەن لەم جیهانەدا بەتەنیان.

ئەم توانەوە بەهێزوپێتەوە یارمەتی رێکخستن و توندوتۆڵکردنی پەیوەندی ئایندەی هەردووکیان دەدات، بەڵام مەترسی ئەم توانەوەیە (هەندێجار لە لەناوچوونی منی تاکێتیدا خۆی حەشاردەدات، ئەویش لەچوارچێوەی دەستتێکەڵاوکردنی نارسیزمی -collusion narcissique، چونکە هەریەك لەو دوو هاوبەشە هەوڵدەدەن

سنووره هاوبەشەکانی نێوانییان دیاریبکەن لەترسی ئەوەی نەك هەر هاوبەشێکیان منی تاکێتی خۆی لەدەست بچێت) [1]. لەم قۆناغەدا هەریەك لەو دوو هاوبەشە لەسەر ئاستی جەختلێکردنەوە لەنارسیزم assurrance narcissique تاکێتیو لەسەر ئاستی تێربوونی لیبیدی satisfation libidinale سوودی زۆر دەچنێتەوە یان وەردەگرێت.

لەم قۆناغەدا گۆڕانی دەرەکی ڕوودەدات، وەك ئەرکە کۆمەڵایەتیی و داواکارییە ئابوورییەکانو هی دیکە، کە سەرلەنوێ خۆیان بەسەر دوو هاوبەشەکەدا دەسەپێنن، لێرەدا ئەو دوو هاوبەشە ناچاردەبن بایەخ بەبابەتی دیکەی بەدەر لەخۆیان بدەن.

بەمشێوەیە تارادەیەك قۆناغێکی دوورودرێژ دەستپێدەکات، چونکە ئەو پەرچەکردارانە دەردەکەون کەدەتوانین ناویان لێبنێین پێش ڕەخنەیی pre-critique . لەوانەیە ئەم پەرچەکردارانە لەسەرئاستی پەیوەندیی هاوسەرێتیی ئەنجامی مەترسییداریان لێبکەوێتەوە ئەوەش لەو ڕووەوە ئەو دوو کەسە تاچەند بێ خۆئامادەکردن بۆ ڕێکخستنی پەیوەستنامەیەکی نوێ دەچنە ژیانی هاوسەرێتییەوە، چونکە هۆگربوون بە رابووردوو لەگەڵ یادگارییە سەیروسەمەرەکانیدا لەوانەیە ببنە ڕێگر لەبەردەم گونجاندنی دوو هاوبەشەکە لەو قۆناغە نوێییەدا.

لەم قۆناغەدا دیاردەی بەرچاوو دەرکەوتوو ئەوەیە کە ئەو دوو هاوبەشە بەشێوەیەکی نەستی هەوڵدەدەن پرۆسە گرنگەکانی بەرگری ڕێکبخەن، بۆئەوەی ڕووبەڕووی ئەو جیابوونەوەیە نەبنەوە کەهەڕەشە لە پەیوەندییەکەیان دەکات، بەمشێوەیە هەریەکەیان هەوڵدەدات



لەبواری بیرکردنەوەی خۆیدا هەر ڕوانگەیەکی نێگەتیڤ دووربخاتەوە کە لەوانەیە کاربکاتە سەر سروشتی پەیوەندییە ئایدیالیزەکراوەکە Idealisee.

هەرلەم قۆناغەدا ئەوەش ڕوودەدات کەهەریەك لەو دوو هاوبەشەکە لەڕێی دەستتێکەڵاوکردن Collusion لەگەڵ هاوبەشەکەی دیکەدا جیابوونەوەو نائومێدی ڕەتدەکەنەوەو پشتگوێی دەخەن، چونکە زۆرکەس کار بۆ پارێزگاریکردن لەسروشتی توانەوە fusionnel ی پەیوەندی لەگەڵ هاوبەشەکەیاندا دەکەن ئەویش لەڕێگەی بەیەکەوەنووسان – ئینترۆجێکشن Introjectionی هاوبەشەکەی بەرامبەر لەگەڵ خودی خۆیانداو ڕەتکردنەوەی سنوورەکانی نێوانییانو ئەگەری ڕەتکردنەوەی هەر بوونێکی تایبەتی یان سەربەخۆی هاوبەشەکەی لەگەڵیدایەو دوورخستنەوەی هەریەکێکی دی، ئەم پرۆسەیە بەدینایەت تەنیا بەو بڕە نەبێت کە لەگەڵ دەستتێکەڵاوکردنی Collusion نێوانیاندا هاوجێدەبێت.

هەندێجار ڕوودەدات پرۆسەکانی دووکەرتبوون (دابەشبوون) Clivage بەشێوەی زیاتر ڕێکخراو دەردەکەون، لەمبارەدا پێیدەوترێت دابەشبوونی دوالیزمی یان دووانی Bichotomie ئەم دابەشبوونە دووانیە لەڕێگەی پرۆسەکانی خستنەپاڵ projection ەوە ڕێگەدەدات بەجیاکردنەوەی دوو ڕوخسار لای ئەو دوو کەسە، ڕوخسارێکی گونجاوو دڵخۆشکەرو دڵنیاکەرەوە دەخرێتە پاڵ ئەو کەسە خۆی، لەگەڵ ڕوخسارێکی دیکەی شەڕانگێزو هیوابڕاوو کەموکورت، دەخرێتەپاڵ ئەو کەسانەی کە ئەو کەسە ملکەچییان بووە وەك خێزانو کارو بنەماڵەو هاوڕێکانی، بەمشێوەیە

ئایدیالیزەکردن تەنیا پشت بەبەشێك یان روخسارێکی باش دەبەستێت کە دەخرێتە پاڵ هاوبەشەکەو کەسەکەش هەرچی بەشە نێگەتیڤەکەیە دەیخاتە پاڵ کەسانی دی.

لەشوێنێکی دیکەدا تێبینی دەکەین روخساری وەهمیو دوالیزمی پەیوەندییەکە شێوەی جیاواز وەردەگرن لەمبارەدا جۆرێك ئەمانەتیFibdeltte ی راستەقینە دروستدەبێت نەك بۆ خودی ئەوکەسە خۆشەویستە خۆی، بەڵکو بۆ(وێنە پێکەوە نووساو)و خۆبەخۆ ئایدیالیزەکراوەکە، لێرەدا بابەتی پێکەوەنووساو لەنواندن Representation تێپەڕنابێتو ئەم نواندنەش لەگەڵ واقیعی دەرەوەدا تێکەڵدەبێت کەبەمەش دەبێتە هۆی پشتگوێخستنی راستەقینەی ئەویدیکە (هاوبەشەکەی دی).بەمشێوەیە پەیوەندیی پشت بە خاوەندارێتیی رەها دەبەستێت بەرامبەر وێنەی پێکەوەنووساوو گونجاو لەگەڵ جیهانی فەنتازیی ناوەوەدا، ئەو شتەی گرنگە لای ئەو کەسانەی لاوازن (واتە بەدەستنەبوونی دڵنەوایی و خەمۆکییەوە دەناڵێنن) بریتییە لەخاوەندارێتییەکی جەختلێکراوو کۆتایی بۆ ئەو وێنە پێکەوە نووساوە، لەگەڵ ئەگەری دوورخستنەوەی ئەو کەسەی لەقۆناغێکی دیاریکراودا پاڵپشتی ئەو وێنەیە بووە کەئێستا خۆی وەك خیانەتکارێك تەماشای ئەو وێنەیە دەکات، لەم چوارچێوەیەدا تێبینی دەکەین کەسی لاواز لەوانەیە خۆی دووچاری مەترسی مردن بکاتەوە ئەگەر هەستیکرد هاوبەشەکەی یان خۆشەویستەکەی لەو سۆزە بێبەشی دەکات کە چاوەڕوانی لێدەکات یان ئەگەر هەستیکرد ئەو کەسە بۆتە خیانەتکارێك بەرامبەر ئەو وێنەیەی کە لەلای ئەم دروستبووە.



### قەیرانو پەرەسەندن لەقۆناغی (دوای رەخنەیی)دا:

لەم قۆناغەدا سەرلەنوێ خستنەوەگەڕی یان سەرلەنوێ خستنەوەبەرفرمانی reinvestissement سۆزداریی رووەو جیهانی دەرەوە ئاراستەدەگرێت، هەروەها رووخسارە شەڕەنگێزییە ئاڵووگۆڕکراوەکان سەرلەنوێ دەگەڕێنەوە واتە دەردەکەونەوە کەپێشتر لەماوەی مانگی هەنگوینیدا رووبەڕووی جیهانی دەرەوە دەکران. لەمبارەدا پەرەسەندنی دوالیزمی (پەرەسەندن لای هەردوو هاوبەشەکە) ملکەچی هاوسەنگی هێزە نزیكو دوورەکان دەبێت، دەشێت لەناو چوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتیدا سێ توانا بۆ پەرەسەندن روویدات:

١- لەهەندێك حاڵەتدا، تێبینی دەکەین شەڕانگێزیی ئاڵۆوگۆڕکراوو نەخستنەوەبەرفرمانی سۆزداریی ئەو کەسە بەردەوام زیاددەبێتو وردەوردە دەبنە هۆی لەبەریەکهەڵوەشانی پەیوەندییەکەو نەمانی.

مەرج نییە نەمانی پەیوەندی، نەمانی شوێنەوارەکەی بگەیەنێت، لەبەرئەوەی زۆرکات ئەم شوێنەوارە رۆڵێکی گرنگ (بەشێوەی پۆزەتیف یان نێگەتیڤ) دەگێڕێت لەدروستکردنی پەیوەندی نوێ لەگەڵ هاوبەشێکی یان کەسێکی دیکەدا.

٢- لەهەندێك کاتی دیکەدا، تێبینی رێکخستنی ژمارەیەك پەرچەکرداری (پاش رەخنەیی) post- critique لەناو چوارچێوەی پەیوەندیی هاوسەرێتیدا، دەکەین، چونکە ئەو دوو هاوبەشە

بەشێوەیەك هەڵسوكەوت دەكەن هەروەك بڵێی دەیانەوێت خۆیان بەدووربگرن لە سەرچاوەی ئەگەری هەرناكۆكییەكی نوێ، لەوبارەدا كە نەیانتوانی دەستتێكەڵاوكردنێكی collusion نوێو خستنەوەبەرفرمانی investissement (*) ئاڵووگۆڕكراو ڕێكبخەنەوە، ئەوا بۆ پاراستنی پەیوەندییەكەیان، بەشێوەیەكی بەرتەسكو سنووردار لەڕێگەی دیاریكردنی خستنەوەبەرفرمانە دەرەكییەكانەوە كاردەكەن، بێگومان ئەم رەفتارەش كرانەوەی كەسێتییان پابەندو سنووردار دەكات.

زۆرجار دایكو باوك منداڵ وەك هۆكارێك بەكاردەهێنن بۆ چارەسەركردنی ئەو گیروگرفتانەی ڕووبەڕوویان دەبێتەوە، لەمبارەدا كۆمەڵێك كارتێكەر دەورووپشتی منداڵەكە دەگرێتەوە كە لەنێوان دایكو باوكیدا ئەم كارتێكەرانە بەشێوەیەكی ئازاد بەڕێوەناچن، هەندێجار پاراستنی پەیوەندیی بەشێوەیەكی ئاسودەو شادیبەخش پشتدەبەستێت بە رەتكردنەوەی هاوبەشی دایكو باوك بۆ منداڵە بێتاوانەكەیان، لەجیاتی ئەوەی ئەو شەڕانگێزییەیی دوو هاوبەشەكە هەیانە بەرامبەر یەك دەریببڕن، بەسەر منداڵەكەیاندا دادەبارێننو بەم كارەش دەبنە هۆكار بۆ ڕوودانی پشێوی زۆر گەورە لە دەروونی منداڵەكەو ڕێگر لەبەردەم گەشەی سروشتی منداڵەكەدا.

لەمبارەدا منداڵ بەشێوەیەكی نەستی وەك هۆكارێك بۆ پاراستنی پەیوندی نێوان دوو هاوبەش (دایكو باوك) بەكارهاتووە.

٣- لەزۆر حاڵەتدا، ئەو دووهاوبەشە هەوڵدەدەن سەرلەنوێ پەیوەندیی نێوانیان ڕێكبخەنەوە، چونكە ئەو گیروگرفتو قەیرانە جیاوازانەی كە لەماوەی ژیانیاندا ڕووبەڕوویان دەبنەوە وایانلێدەكەن



شارەزایی زۆرو ئەزموون پەیدابكەنو بەهۆیەوە پەیوەندی نێوانیان بەرەوباشتر بەرن، ئەم سەرلەنوێ ڕێكخستنەوەیە بەشێویەكی عەفەوی لەنێوان هاوسەرەكاندا ڕوودەدات، بەتایبەتی كاتێك ئاڵۆگۆڕكردنی ئامانجە هاوبەشەكانی نێوانیان بەشێوەیەكی ڕێكخراو زیاددەبێت، لەم چوارچێوەیەدا زۆرێك لەسایكۆلۆژیستەكان ئاماژە بەو قەیرانانە دەدەن كە ماوەماوە لەنێوان ژن وپیاودا ڕوودەدەنو كاریگەرییەكی دینامیكییو داهێنەرانەیان لەسەر ئاستی پەیوەندیی نێوانیان هەیە، تەنانەت ئەگەر وەك دیاردەیەكی هەرەسهێنەر لەو قەیرانەدا ژیابن یان بەسەرییان بردبێت، پێشتر هۆكارە كولتورییو میللییەكان بانگەشەی دووركەوتنەوەیان لەم قەیرانانەدا دەكرد، بەڵام سەلمێنراوە بەهۆی ئەم قەیرانانەوە ژنو پیاو دەتوانن پەیوەستنامەی نوێو دەستتێكەڵاوكردنی نوێ لەدوای خامۆشبوونی ئارەزوو وحەزە سەرەكییە ئاڵۆگۆڕكراوەكانی نێوانییان، دروستبكەن. هەر بەهۆی ئەم قەیرانانەوە ئایدیالیزەكردنێكی idealisation نوێی ئەو هاوبەشە دروستدەبێت كە لێكچووە لەگەڵ ئەو ئایدیالیزەكردنەدا كاتێك لەسەرەتای پەیوەندیی خۆشەویستی نێوانییاندا دروستبووە، بەمشێوەیە زنجیرەیەك لەنۆبەتداری (نۆبە بە نۆبە) بەشێوەیەك دەردەكەوێت لەدوای قۆناغەكانی دامەزراندنو سەرلەنوێ دروستبوونەوەی ئایدیالیزەكردن، قۆناغی رەخنەیی نوێ دێت، خودی ئەم قۆناغانەش سەرلەنوێكردنەوەی ڕێگەكانی پەیوەندیكردنو لەیەكگەیشتنی ئاڵۆگۆڕكراوی بەدوادادێت.

## ئەزموونی خۆشەویستی و کرداره ناوەکییە دەروونییەکان:

دەبێت ئاگاداری ئەوەبین کە ئەزموونی خۆشەویستی تاکە ئەزموونی ژیانە کە یارمەتی کامڵبوونی سایکۆلۆژی خود دەدات، ئەوە دەزانین کە زۆرکات پێگەیشتنی خود بەو شکستیی و بێبەشبوون و گیروگرفتانەوە بەندە کە تاک لەماوەی ژیانیدا رووبەڕوویان دەبێتەوە، تاك پشتبەستن بەم گیروگرفت و شکستییانە هەوڵی ڕێکخستنی ژیانی دەدات، لەبەرامبەردا هیچ کاتێك کامڵبوون لەقۆناغی مانگی هەنگوینیدا لەگەڵ سەرنەکەوتن و شکستیدا هاوکات نییە، بەڵکو لەدەوڵەمەندکردنی سایکۆلۆژی تاکدا یارمەتیدەر دەبێت.

لەسەر ئەم بناغەیە (دەتوانین وادابنێین کامڵبوون لەم قۆناغەدا بەندە بەئاسانکردنی خستنەوەبەرفرمانی لیبیدی investissement libidinale وقەرەبووکردنەوەی نارسیزم -comblement narcissique) [٢]. بوونی مرۆڤ یان مرۆڤ بەسروشتی خۆی بۆ قەرەبووکردنەوەی هەر کەموکورتییەکی بەمانەدا جیادەکرێتەوە:

راماڵین و سڕینەوەی شوێنەواری جیابوونەوە لەبابەتی یەکەم (دایك)، راماڵین و سڕینەوەی شوێنەواری لەدایکبوون، راماڵین و سڕینەوەی شوێنەواری زۆرێك لەشکستەکان، راماڵین و سڕینەوەی ئازارەکان، دەتوانین بڵێین گەڕانی نارسیزمیی بەردەوام کەبوونی مرۆیی پێجیادەکرێتەوە لەپەیوەندیی خۆشەویستیدا ئەوپەڕی تێربوونەکانی دەدۆزێتەوە.



بۆتێگەیشتن لەم پرۆسەیە دەتوانرێت پشت بەو وەسفانە ببەسترێت کە فرۆید پێشکەشیکردوون دەربارەی پەیوەندیی نوێ لەنێوان (من- moi)و (نموونەی من- idealde moi). لەسەر بنچینەی ئەم چەمکە ئەو هاوبەشەی هەڵبژێراوە دەبێتە پاڵپشتی سەرەکی خستنەپاڵەکانی projection (نموونەی من)و پشتبەستن بەم ڕێکخستنە ئەم هاوبەشە (ژن یان پیاو) دەخرێتە ناو(منی تاکێتی)یەوەو پێوەی دەنوسێنرێت، بەمشێوەیە جیاکردنەوە لەنێوان (من) و (نموونەی من)دا نامێنێت.

ئەم هاوبەشە دەبێتە پاڵپشتی سەرەکیش بۆ خستنەپاڵەکانی(منی باڵا- sur moi)، چونکە دڵەڕاوکێ بەرامبەر ئەو رەخنانە کەمدەکاتەوە کە (منی باڵا- sur moi) دەینوێنێت، ئەم هاوبەشە یارمەتی کەمکردنەوەی گرژی نێوان (من- moi)و (ئەو- leca)یش دەدات، چونکە لەو چەپاندنە کەمدەکاتەوە کە(منی باڵا- sur moi) لەسەر پاڵنەرە دەرچووەکان لە (ئەو)ەوە پراکتیزەی دەکات و بەمەش ئارەزووە نەستییەکان تێردەکرێن.

## پەرەسەندنی پەیوەستی لەنێوان پاڵنەرە جێنیتالیی و پێش جێنیتالییەکان:

چالاکی سێکسوال لەئاکامی دوو قۆناغی بەدوایەکداهاتوو پەرەدەستێنێت کەقۆناغێکی سەرپبوون دەکەوێتە نێوانییان. بەدەرچوون لەقۆناغی چووکیی و نەمانی ئۆدیب، پاڵنەرە سێکسوالییە جیاوازە سەرەتاییەکان (زارەکی و کۆمی) دەستپێدەکەن، ئەویش لەرێگەی هەژموونکردنی پاڵنەرە جێنیتالییەکانەوە، ئەم هەژموونە رێژەییە دوورخستنەوە یان نەمانی پاڵنەرە سەرەتاییەکان ناگەیەنێت، بەڵکو رێکخستن و پێکەوەنووسانی لەژێر هەژموونی پاڵنەرە جێنیتالییەکان genitales دایە.

سەرکوتکردنی پاڵنەرە پێش جێنیتالییەکان Pregenitales یارمەتی فۆرمەلەکردنی سیستمی بەرگریکردنە خودییەکان دەدات، بەڵام لەوانەیە ئەم بەرگریکردنانە ببنە هۆی ململانێی دەروونی هەمیشەیی. ئەوەی دەتوانرێت لەچوارچێوەی پەیوەندیی خۆشەویستیدا بەدیبهێنرێت، جۆرێکە لەکەمکردنەوەی ململانێی سایکۆلۆژیی. هەروەها توانایەکی زۆر بۆ لێبووردن لەلایەن پێکهاتە سەرکوتکەرەکانی(منی باڵا – sur moi)و بەکارهێنانی ئەم ئارەزووە دژانە کەلەکاتی خۆیدا پەیوەندییان بە گروپەوە (واتە کۆمەڵگە) نەبووە.

ئەگەر واماندانا کەسێکی نەرزەبوو سەرکەوتنی لەپێکەوەنووسانی ئارەزووە ئەندەکییە Partielles جیاوازەکانی لەگروپێکی



یەکگرتوودا، بەدەستهێنا، ئەوا ئەم پێکەوەنووسانە بۆماوەیەکی دوورودرێژ بەردەوام نابێت و هەر خێرا ئەم ئارەزووە ئەندەکییانە سەرلەنوێ دەردەکەونەوە، چونکە لەو گروپەدا بەشێوەیەکی باش بەیەکەوەنووسانییان نەکردووەو هەروەها پارێزگارییان لەوزەی لیبیدی کردووە کە لەتوانایدایە لەچوارچێوەی پرۆسە سەرەتاییەکاندا دەربکەوێت.

لەنموونە دیارەکانی لەسەر ئەم بابەتە بەدیدەکرێن، لەبەکارهێنانی مەیلە مازۆشییەکان Masochites دا تێبینی دەکەین، ئەم ئارەزووانە لەدەرەوەی چوارچێوەی پەیوەندیی خۆشەویستی بەشێکی گەورەی رووخساریان لەدەستدەدەن و لەشێوەی سزادانێکی خودییدا auto- punition دەردەکەون، بەتایبەتی لەحاڵەتی شکستهێناندا، بەڵام لەچوارچێوەی پەیوەندیی خۆشەویستیدا کۆی ئەم ئارەزووانە لەچوارچێوەیەکی سنووردارادا رووبەرووی بابەتەکە (هاوبەشەکە)دەکرێنەوە.

هەندێك لەخۆشەویستان دەتوانن بەهۆی بەرگریکردن لەخود مەیلە مازۆشییەکانیان سەرکوت بکەن، بەڵام ئەم مەیلانە سەرلەنوێ بەشێوەیەکی دینامیکیی و ئیرۆسی Erotique دەردەکەونەوەو بێ هیچ پەرچەکردارێك لەلایەن تاك سەرهەڵدەدەنەوە، چونکە لەپەیوەندیدا بەشێوەیەکی ئیرۆسی لەگەڵ بابەتی خۆشەویستییدا بەکاردەهێنرێت.

M.P ژنێکە تەمەنی بیست و پێنج ساڵە، دوای ئەوەی رووبەرووی کۆمەڵێك گیروگرفتی زۆر بووە لەسەر ئاستی پەیوەندیی هاوسەرێتی و بەتایبەتی پەیوەندی سێکسوالی لەگەڵ هاوسەرەکەیدا

ناچار بوو چارەسەری خۆی بکات، سەرەتا پەیوەندی نێوانیان بەهاوچەشنیکردنی Identification ئاڵۆگۆڕکراو جیادەکرایەوە، لەدوای ماوەیەك لەهاوسەرێتی ئەم هاوچەشنیکردنە یارمەتی هەریەکەیانی دەدا لەسوودی نارسیسزمدا، پیاوەکە مەیلە مازۆشییە دیاروئارەزووەکانی ژنەکەی ئاشکراکرد، ئەم ئارەزووانە ڕێگەیان بە ژنەکە نەدەدا مەیلە مازۆشییەکانی بەشێوەیەکی دروست بەکاربهێنێت. لەسەر ئاستی فەنتازیایش ژنەکە واهەستیدەکرد قوربانی دەستی ئەو پیاوەیە، ئەم فەنتازیایە Fantasme لای ژنەکە جۆرێك بوو لەقەرەبووکردنەوەی مازۆشییانە.

وێرای مەیلە مازۆشییەکان مەیلی ئەندەکی دیکە هەن کەپەیوەندییان بەپاڵنەرە پێش جێنیتالییەکانەوە هەیە، بۆ نموونە لەباری ئارەزووی خۆماتدان–خۆڕووتکردنەوە -Exhibitionniste voyeuristدا، زۆر فاکتەرو دیاردەی گرنگ دەوروژێت، هەروەها ئاستی بایەخ و ڕۆڵی(گۆشەنیگای ئیرۆسی)و بەڵگە لەسەر بوونی ئەم بایەخ و کاریگەرییە دەزانین، چونکە بەشێوەیەکی تایبەتی بەردەوام ئەدەبی کلاسیکیی و هاوچەرخ و سینەما بایەخ بەرۆڵی وروژاندنی سەرنج لای هاوبەشەکان (ژن و پیاو) دەدەن، هەریەك لەژن وپیاو هەوڵدەدەن بەشێوەیەکی بەردەوام بایەخپێدانی بەرامبەرەکەیان بوروژێنن و کاربکەنە سەر یەکتر، ئەویش لەڕێگەی داپۆشینی بەشێك لەجەستەیان و شاردنەوەی هەندێك لایەن و سیفەتە دەروونی یان هزرییەکان.

J.A لەدوای مردنی دایکی ببووە شوێنی ڕەزامەندیی و سەرسامی باوك و خوشك و براکانی، سەرکەوتنی تەواوی لەرەخساندنی دۆخێك



لەرازیبوون و خۆشی و بەختیاری بۆ هەموان بەدەستهێنابوو، نهێنی پارێز بوو، هەروەها بەشێوەیەکی ڕێژەیی کەسێکی داخراوو خۆخواردوو بوو لەناو خۆیدا، هەموان لێی رازیبوون و لەگەڵیدا باش بوون، لەسەر ئەمبارە مایەوە تا هاوسەرێتی لەگەڵ یەکێك لەهاوڕێکانیدا کرد، ماوەیەکی کەم بەسەر هاوسەرێتییەکەیدا تێنەپەڕی بەرامبەر هاوسەرەکەی ئومێدبڕاو بوو، چونکە چاوەڕوانی دەکرد ڕۆڵێکی ئەوپەڕی تێروتەواوو کەماڵ لەگەڵیدا بەسەربەرێت، واتە ئەو ڕۆڵە ببینێت کەباوك و خوشك و براکانی لەگەڵیدا بینیوویانە، وا چاوەڕوانی لەهاوسەرەکەی دەکرد هزرەکانی بخوێنێتەوە، مەیل و گۆڕانە دەروونیی و مەزاجییەکانی ئاشکرا بکات، بۆئەوەی زیاتر بیوروژاندایە هەمیشە پەنای دەبردە بەر بێدەنگی و قسەنەکردن و دەرنەبڕینی ئارەزووەکانی، وای لەپیاوەکە کردبوو جۆرەها هەڵوێست بگرێتەبەر کەبەهیچ شێوەیەك لەگەڵ ئارەزووە شاراوەکانی ژنەکەدا هاوجێنەدەبوون، پیاوەکە لەپێشبینیی و بۆچوونەکانی ژنەکە تێنەدەگەیشت.

J.A بەهیچ شێوەیەك لەکاتی مامەڵەکردنی لەگەڵ هاوسەرەکەیدا درکی بەرووخساری نێگەتیڤ و پڕداواکاریی و نارسیزمی خۆی، نەدەکرد، ئەمەش بووە هۆی وروژاندن و توڕەبوونی شەڕانگێزی لەپیاوەکەیدا. ژنەکە لەهەڵوێستی نێگەتیڤی خۆی رازیبوو، دەیویست هەر لەو پێگەیەدا بمێنێتەوە کەهەموان تەماشای بکەن و لێی بڕوانن و باشبن لەگەڵیدا، بۆئەوەی بەرۆڵی خۆیەوە پابەند بێت پەنایدەبردە بەر بێدەنگیی و قسەنەکردن کە بەشێوەیەکی سەراپاگیر یارمەتی دەدا لەشاردنەوەی ئارەزووەکانیدا.

**پەراوێزی وەرگێڕ:**

(*) خستنەوەبەرفرمان– investissement : تەوزیف

**پەراوێزەکان:**

(1)WILLIJ., " Le collusion Narcissique ", in dialogue, 1980, No.68, PP.40 -54
(2)DAID C., Letat amoureux, Paris, Payot, 1971, P.63



## بەشی چوارەم

# پەیوەندی هاوسەرێتیی‌و ململانیێ دژی مردن

### پەیوەندی هاوسەرێتیی‌و ململانێ دژی پاڵنەرە وێرانکارەکان:

ئەگەر فرمانی پەیوەندی هاوسەرێتیی پشت بە خستنەوەبەرفرمانی لیبیدی‌و جەختلێکردنەوە لەنارسیزم ببەستێت ئەوا ڕەهەندە شاراوەکەی پشت بە ململانێ دژی پاڵنەرەکانی مردن (شەڕانگێزیی وێرانکاریی) دەبەستێت. ئەم ڕەهەندە نایەتەدی تەنیا لەوکاتەدا نەبێت کەپاڵنەری ژیان (ئیرۆس– Eros) دەسەڵات بەسەر پاڵنەری مردندا (ساناتۆس– thanatos) دا[1] دەگرێت. ئەم دەسەڵاتە تەواو نابێت تەنیا لەو کاتانەدا نەبێت کە بابەتی خۆشەویستیی یان هاوبەشەکە ئایدیالیزە دەکرێت Idealise، بەمەش ئەو مۆرکە لەدەستدەدات کە دەبێتە هۆی دروستکردنی دڵەڕاوکێ بۆی .

(کەواتە ئیرۆسEros دەسەڵات بەسەر ساناتۆسدا Thanatos دەگرێت‌و هیچ بوارێك بۆ ترس لە هێزە وێرانکارەکان نامێنێتەوە کە ساناتۆس بەهەردوو روخسارە وێرانکارییەکەیەوە دژی تاك‌و دژی

بابەتی خۆشەویستی، دەینوێنێت)[٢]. بۆنمونە لەقۆناغی مانگی هەنگوینیدا، تێبینی دەکەین تاك دەتوانێت بەرگری پاڵنەری مردن (پاڵنەری داڕمانی خود، سزادانی خود، خەمۆکی) کە ئاڕاستەی خۆی دەبنەوە، بکات، هەروەها هەستدەکات پێویستی بەوە نییە ئەم پاڵنەرانە (شەڕانگێزیی و چەوسانەوە) بخاتە پاڵ هاوبەشەکەی دی (بەرامبەرەکەی). بەڵام وادەردەکەوێت پچڕاندنی ئەو پەیوەندی خۆشەویستییەی کە لەسەر ئەم بناغەیە بنیاتنرابێت، پێدەچێت ببێتە هۆی سەرلەنوێ دورکەوتنەوەی نیشانە خەمۆکیی و خۆکوژییەکان.

ئەگەر ستراکتۆری نەستی پەیوەندی خۆشەویستی، یارمەتی وەرگرتن و بەڕێکردنی پاڵنەرە مەترسیدارو کۆنترۆڵ نەکراوەکانی ناو خود بدات، ئەوا ئەم کردارە پارێزگارە لەهەندێك حاڵەتدا لەئاستی پێویستدا نابێت، بەتایبەتی لەو کەسانەدا کە بەدەست پشێوییەکی بەهێزی قۆناغی منداڵییەوە، ناڵاندویانە: تەنانەت ئەگەر ئەم جۆرە کەسانە هاوبەشەکەیان وەك هۆیەك بۆ زامنکردنی نارسیزمی و وەك بابەتیك بۆ تێرکردنی ئارەزووەکانی (منی باڵا –sur moi) یان (منی یاریدەدەر– moi auxiliaire)، بەکارهێنا، هەر بەشی ئەوەناکات لەتێکچون و نائارامی هاوسەنگی دەروونی بەدوریان بگرێت، هەروەها بەشی ئەوەناکات لەسایکۆسس pyschose دوریانبخاتەوە، ئیتر سایکۆسسی خەمۆکی یان سایکۆسسی پارانۆید[١]–ی بێت. لەزۆر حاڵەتدا، تێبینی دەکرێت بە هێمنی، نەخۆشی لای هەندێك کەس روودەدات، کەنەخۆشییەکەیان بۆماوەیەکی زەمەنی سنووردار لەچوارچێوەی پەیوەندییان لەگەڵ هاوبەشەکەیاندا، سنووربەند دەکەن، بۆنمونە پەرچەکردارەکانی دابڕان abandonniques



روودەدات و لەڕێگەی بانگەشەکردنی دووبارە بووەو هیوابڕاوەوە بۆئەوەی هاوبەشەکەی لەگەڵیدا بێت و پشتیوانی لێبکات، ئارەزووە خەمۆکییەکانی سنوربەند دەکات. ئەگەر ئەو کەسە نەیتوانی ئەم رۆڵە ببینێت یان لەوبارەدا کە پەیوەندی نێوانیان پچڕا ئەوا دەشێت خۆکوشتن، رووبدات.

پشکنینە کلینکییەکان ئاشکرایان کردووە زۆرێك لەو منداڵانەی لەقۆناغی یەکەمی منداڵییاندا بەدەست کەموکورتی سۆزدارییەوە ناڵاندویانە، لەدوایدا رووبەڕووی پشێویی نەخۆشی بونەتەوەو هەندێك ئارەزووی خۆکوژیی و خەمۆکیی لەسەریان، دەرکەتووە.

B.N ژنیکی گەنج و رۆشنبیرە، مامۆستایە، هاوسەرێتی لەگەڵ گەنجێکدا بەست کە لەکۆمپانیایەکی بازرگانی کاریدەکرد.

هەمیشە بە دەست گیروگرفت و ئەستەمییەوە لەسەرئاستی ژیانی سۆزداریی و سێکسوالەوە دەیناڵاند. لەسەرەتای پەیوەندییەکەدا هاوسەرەکەی ئەوکۆڵەکە سەرەکییە بوو کە یارمەتی دەدا بۆ بڕینی گیروگرفتە سۆزداریی و کۆمەڵایەتییەکان و تێپەڕکردنی ئارەزووە سێکسوالە شازەکانی، ئەم بارە هێندەی نەخایاند، چونکە دوای ماوەیەك هاوسەرەکەی بەڕێوەبردنی ئەو کۆمپانیایەی گرتەئەستۆ کە کاری لێدەکرد، ئەمەش وا پێویستی دەکرد بەرپرسیارێتی بەڕێوەبردن و کۆمەڵایەتی زیاتر بگرێتە ئەستۆی، کاتی پێویستی نەبوو بۆ ژنەکەی تەرخانبکات. پێویستی بەوە نەبوو ژنەکەی پشتی پێ ببەستێت. زیاتر لەهۆکارێك هەبوو پیاوەکە لەرێگەیەوە خودی خۆی پێ بەدەست بهێنێت. وێڕای ئەمانە فاکتەرێکی دیکە هەبوو کە دایکایەتی بوو، لەوکاتەدا ژنەکە بوو بە دایك هەستیدەکرد رۆڵی

دایکایەتی وەك ژنێك هەڕەشە لەپێگەی دەکات، کە بەشوێن کرانەوەی کەسێتیدا دەگەڕێت. ئەم فاکتەرە زۆرانە بوونەهۆی دروستکردنی جۆرێك لەپەشێویی و دڵەڕاوکێی هەمیشەیی لای کە وایلێکرد ناچاربێت داوای یارمەتی، بکات.

B.N لەمنداڵیدا لەدۆخێکی خێزانی زۆر ئاڵۆزدا دەژیا، لەگەڵ دایکیدا لەدێیەکی بچوك لەکەشێکی هەمیشە پڕ لەگێروگرفتدا ژیانی دەبردەسەر، لەبەرئەوە بە جۆرەها هۆکار دەیویست لەم دۆخە رزگاری ببێت، بۆیە بەخێرایی هاوسەرێتی کرد، بەڵام سەرنەکەوت.

باوکی پیاوێك بوو کەسێتییەکی لاوازی هەبوو بەمەش نەیدەتوانی ئارەزووەکانی ژنەکەی لەسەر هەموو ئاستەکان: سۆزداریی و کۆمەڵایەتیی و سێکسوالی، تێر بکات. ئەم بارە پاڵی بە دایکییەوە نا بۆ ئەنجامدانی هەندێك کرداری شاز، ئەوەش لەپێناو بەدیهێنانی ئارەزووەکانی خۆیی و دابینکردنی پارەی پێویست بۆ ژیانی خۆیی و کچەکەی.

B.N زۆر بچوك بوو کاتێك دایکی دەستی بەم رەفتارە لادراوە، کرد، ئەم رەفتارە بووە هۆی ئەوەی دۆخی دایکەکە بکەوێتە ژێر سانسۆری دادوەرییەوە، وێڕای واتەوات و قسەوقسەڵۆکی نێوان خەڵك، چونکە لەلادێیەکی بچوکدا دەژیان، بەمشێوەیە B.N لەقۆناغێکی منداڵی پڕ لەپشێویدا دەژیا، چونکە داپیرەی هەمیشە ئازاری دەدا لەترسی ئەوەی نەك هەمان ڕەفتاری دایکی بگرێت و وەك ئەو بکاتەوە، زۆر بە دڵڕەقی مامەڵەی لەگەڵدا دەکرد، لەدوای ماوەیەك B.N –ی خستە قوتابخانەیەکی ناوخۆ کە کاریگەرییەکی نێگەتیڤی لەسەر گەشەی سۆزداریی و رێزدانانی بۆ خۆیی و متمانە بەخۆی



هەبوو، چونکە هەموو هاوڕێکانی سەرکێشییەکانی دایکیان بیستبوو، لەرێگەی بیرخستنەوەو دانەوەی بە چاوو رویدا، کینەی خۆیان بەرامبەری دەردەبڕی.

ئەم کچە هەر لەمنداڵییەوە هەستی دەکرد خەڵك سڵی لێدەکەنەوەو چاوەڕوانی ئەوەی لێدەکەن رێڕەوی دایکی بگرێتەبەرو لەبەرئەوە پێشتر لۆمەی دەکەن، لەگەڵ ئەوەشدا خۆی دۆزییەوە لەگەڵ ئەو دایکە ریسواکراوو رەتکراوەدا، هاوچەشنی S'identifie دەکات .

ئەم هۆکارانە بوون کە هەر لەتەمەنی هەژدە ساڵییەوە پاڵیان پێوەنا هاوسەرێتیی لەگەڵ کوڕێکی گەنجدا بکات، کە بە باشی نەیدەناسی. هۆگری بوو، چونکە دەیویست بەهەر شێوەیەك بێت لەم ناوەندە خێزانییە ناخۆشە رزگاری بێت. ئەم هاوسەرێتییە ئەوەندە درێژەی نەکێشا، چونکە لەدوای تێپەربوونی دوو ساڵ بەسەر هاوسەرێتییەکەیدا، بۆی دەرکەوت هاوسەرەکەی لەگەڵ هیواو خۆزگە کۆمەڵایەتیی و رۆشنبیرییەکانی ئەودا هاوجێ نابن. لەبەرامبەردا پەیوەندییەکی زۆر گەرمی لەگەڵ کچێکی هاوڕێیدا هەبوو، چەند بەکاوەخۆ یان هێدی هێدی لەهاوسەرەکەی جیادەبووە وە، ئەوەندە پەیوەندی لەگەڵ ئەو هاوڕێیەیدا قوڵتر دەبووە وە، لەسەر ئەمبارە بەردەوام بوو، تا بەتەواوەتی لەهاوسەرەکەی جیابووە وە.

پچڕانی پەیوەندی نێوانیان لەماوەیەکی کورتداو بێ هیچ پشێوییەك کۆتایی هات، چونکە لەو ماوەیەدا سەرکێشییە سێکسواڵەکان لەگەڵ کچە هاوڕێکەیدا، قەرەبووی پچڕانی پەیوەندیی و جیابوونەوەی لەهاوسەرەکەی، بۆدەکردەوە. ئەم

ئەڤینداریيە هۆمۆسێکسواڵەییە Homosexuel بەشی ئەوەی نەدەکرد هەموو ئارەزووە سۆزداریی و هزریی و سێکسواڵەکانی پڕبکاتەوە، بەڵکو دووچاری جۆرێك لەشکستی دەکردو قەرەبووی ئارەزووە هیترۆسێکسوالەکانی Heterosexuels (ئارەزووی بۆ توخمە دژەکەی خۆی واتە پیاو) نەدەکرد. شایەنی تێبینییە ئەم کچە چەند پەیوەندیی دیاریکراوی بپچڕاندایە، ئەوەندە دووچاری دڵەڕاوکێ دەبووو هەرەسی دەهێنا، بەخێرایی هەوڵی بەستنی پەیوەندییەکی نوێی دەدا، لەسەر ئەمبارە بەردەوام بوو تا هاوسەری دووەمی ناسی.

شیکارەکان ئاشکرایان کرد B.N لەقۆناغی زارەکیدا oral کەموکورتی سۆزداریی هەبووە، ئەم کەموکورتییە لەشێوەی هۆگربوونێکی بەهێزدا لەگەڵ بابەتەکانی خۆشەویستییدا، دەردەکەوت. هەروەها لەشێوەی پێداویستییەکی زۆری بۆ پشتبەستن بە کەسانی دیکە: ئەم ڕەفتارەی کەدووبارەی دەکردەوە لەبناغەدا ئامانجی بەرهەڵستیکردن بوو دژی ئەو پاڵنەری مردنەی کە هەمیشە لەشێوەی (خۆکوژییەکی مۆراڵی) وەك خۆکوژییە مۆراڵییەکەی دایکی لەگەڵیدابوو. وردەوردە توانی بەرهەڵستی ئەو لێکچواندنە لەگەڵ دایکیدا بکات و بەمەش واز لەدووبارەکردنەوەی سەرکێشییە ئەڤینداریيە شکستهاتووەکانی بهێنێت. ئەوەی زانی کەپێشتر لەپەیوەندی لەگەڵ هاوسەرەکەی بەشوێن چیدا وێڵ بووە، لەو کاتەوە پێویستی بەوە نەبوو پشت بەکەسانی دیکە ببەستێت تا خودی خۆی بەدیبهێنێت.

حاڵەتی B.N یەکێك لەشێوازە بەرگرییەکان دەنوێنێت کە پەیوەندی خۆشەویستی بۆ بەرهەڵستیکردنی پاڵنەری مردن بەکاردەهێنێت. سایکۆلۆژیستەکان شێوازێکی دیکەیان بۆ بەرگریکردن ئاشکراکرد کە یارمەتی بەرهەڵستیکردنی پاڵنەری مردن دەدات، چونکە لەچوارچێوەی پەیوەندی (دایك – کوڕ)دا زۆرجار دایك خستنەوەبەرفرمانی لیبیدی لەپەیوەندیدا لەگەڵ هاوسەرەکەی بۆ پەیوەندیی لەگەڵ کوڕەکەی، دەگوێزێتەوە.

هەندێك لەدایکان کاتێك هەستدەکەن پەیوەندییان لەگەڵ هاوبەشەکانیاندا بەرەو لاوازبوون دەڕوات یان نەماوە، هەوڵدەدەن بایەخ و خۆشەویستیان بۆ منداڵەکانیان بگوێزنەوە: کەواتە لێرەدا ( کوڕ ) تەکلیفکراوە هەموو ئەوانە بە دایك ببەخشێت کە لەپەیوەندیی لەگەڵ هاوسەرەکەیدا لەدەستی چووە و ئەوانەش کە دەستی نەکەوتوون. منداڵیش لەمبارەدا بەشێوەیەکی هەستیی ئارەزووە نەستییەکانی دایکی درك پێدەکات، هەوڵدەدات ئارەزووە سەرەکیی و زیندەگییەکانی دایکی دابینبکات و تەنانەت هەندێجار واز لەکرانەوەی کەسێتی خۆی دەهێنێت لەپێناوی بەدیهێنانی ئارەزووەکانی دایکیدا.

هەروەها ئەوەش دەزانین کە تا چ ئاستێك سەرکەوتن لەخوێندندا بە ڕێچکەیەکی نەستییەوە، مەرجدارکراوە. لەم چوارچێوەیەداو لەمبارەدا دەتوانین پرسیار لەسنوری نێوان نەخۆشی و لادان، بکەین، بەرژەوەندی ئەو منداڵە لەچیدایە؟ کرانەوە کەسێتییەکەی لەچیدا خۆی حەشارداوە؟ ئەم پرسیارانە زۆرجار بێ وەڵامێکی ئاشکرا دەمێننەوە، چونکە منداڵ لەم قۆناغەدا بچوکەو نموونە ideux باڵاکەشی لەقۆناغی دروستبووندایە.

A.H گەنجێکی تەمەن نۆزدە ساڵە، بەهۆی ئالوودەبونی توندییەوە لەسەر مادده بێهۆشکەرەکان و توشبوونی بە خەمۆکی، ناچار بوو، پەنا بۆچارەسەرکردن بەرێت. ئەو کوڕە هەرزەکارێکی پشێوو نموونەیی بوو، لەسایەی کۆمەڵگەیەکی دامەزراوو لەسەر کێبڕکێ و شەڕانگێزی، لەبەردەم بەدیهێنانی پڕۆژە کۆمەڵایەتییەکانیدا دووچاری شکستی، بوو بوو.

A.H لەگەڵ براگەورەکەیدا لەناوەندێکی خێزانی ناوازەدا دەژیان، دایکی پەیوەندییەکی پشێوی لەگەڵ باوکیدا هەبوو کە باوکی کەسێکی هیوابڕاو بوو لەژیانیدا. رۆڵی باوك تەنیا لەدابینکردنی سامان و ئاڕاستەکردنی لۆمەو سزاداندا، سنووردار کرابوو. لەم دۆخە هیوابڕاوەدا گیروگرفتێکی وائاشکرا دیار نەبوو، بەڵام A.H تێبینی دەکرد پەیوەندی نێوان دایك و باوکی لەسەر بناغەی گونجاندن و خۆشەویستی دانەمەزراوە، هەستی بەو پشێوییە کرد کە دایکی بەدەستییەوە دەیناڵاند، هەروەها ئەو هیوابڕانەی دایکیشی رەتکردەوە کە بەهۆی پەیوەندییەوە لەگەڵ باوکیدا توشی بوو بوو، لەبەرئەوە ئارەزوویەکی بەهێزی هەبوو کە ئەو ببێتە بابەتی سەرسامکردن و رەزامەندی دایکی تاوەکو قەرەبووی هیوا بڕانەکەی لەگەڵ باوکیدا بۆبکاتەوە بەشێوەیەکی نەستی رۆڵی باوکی دەبینی و تواناکانی بۆ خوێندن پەرە پێدەداو هەوڵیدەدا بەشێوەیەکی هەمیشەیی سەرکەوتوو بێت و هەموو بەهرەمەندیی و شارەزاییە زانستیی و پراکتیکییەکان بەدەستبهێنێت کەوایلێبکەن لەڕوانگەی دایکییەوە ببێت بە کەسێکی باش و نزیك بێت لێیەوە.

دواجار وایلێهات رەفتارەکانی زیاتر لەگەڵ ئارەزووەکانی دایکیدا



هاوجێدەبوون وەك لەگەڵ ئارەزووە تایبەتییەکانی خۆی، کاتێك بوو بەهەرزەکار لەدوای قۆناغی یەکەم لەخۆگونجاندن confornisme [ب] جۆرێك لەیاخیبوونی توندی لەسەر دەرکەوت و بەدوایدا دابڕانێکی کتوپڕ لەگەڵ ژینگە کۆمەڵایەتییەکەی چواردەوریدا، ڕوویدا.

بەڵام لەرووبەڕووبوونەوەی ئەم بارودۆخە ئەستەمانەداو لەدوای شکستهێنانی لەبەدیهێنانی ئەو پڕۆژەیەدا، تووشی داڕمان و تێکشکان بوو، دەستیکرد بە بیرکردنەوە لەخۆکوشتن. لەهەوڵدانێکدا بۆ راکردن لەم بارودۆخە دەستی بەوەرگرتنی مادده بێهۆشکەرەکان کرد بەو هیوایەی ئارەزووی بۆ ژیان بگەڕێتەوە، بەڵام بارودۆخی خراپتر بوو، نەیدەتوانی چیدی رووبەڕووی ئەو واقیعە ببێتەوە کە تێیدا دەژیا.

لەچوارچێوەی چارەسەرکردنی خێزانیدا، دەرکەوت چۆن دایك ئەو پێشبینی و ئومێدانەی کە لەهاوسەرەکەی چاوەڕێی کرد بۆ کوڕەکەی گواستەوە، ئەو ژنە توانی چەند ساڵێك بەهۆی ئەو تێرکردن و قەرەبووکردنەوە نارسیزمییەوە کە کوڕەکەی بۆی دابینەدەکرد، ژیان بەرێتە سەر. لەو ماوەیەشدا کە ئەو کوڕەی یاخیبوو بوو، نیشانەی خەمۆکی توند لەسەری دەرکەوتبوو، لەگەڵ ئەوەشدا هەر چاوەڕێی گەڕانەوەی کوڕە خۆشەویستەکەی دەکرد کە وەك ڕابردوو هەموو ئارەزوو خۆزگە چاوەڕوانکراوەکانی بۆ بەدیبهێنێت. پێویستە ئەو ژنە ئەوە بزانێت کە ئەستەمە لەسەر ئەم شێوازە لەپەیوەندی پشتبەستوو بە هۆگربوونی پاشکۆیەتی بەکوڕەکەیەوە، بەردەوام بێت، هەروەها واپێویست دەکات لەسەری سەرلەنوێ بەشێوەیەك کەسێتی خۆی ڕێکبخاتەوە کە تەنیا پشت بە

خۆی، ببەستێت.

پشکنینە کلینکییەکان سەلماندویانە ئەم دیاردەیە لەزۆر حاڵەتدا ڕوودەدات کاتێك تاك ناتوانێت بەرهەڵستی پاڵنەری مردن بکات یان بەردەوام بێت لەژیان تەنیا لەچوارچێوی ئەو بارەدا نەبێت کە ڕێگەی پێدەدات خۆشەویست بێت و هەمیشە بە (بابەتی دروستکردنی کاریگەری پۆزەتیڤانە) بۆ بەرامبەرەکەی بمێنێتەوە (واتە هەمیشە لەبارێکدا بێت کە کاریگەری پۆزەتیڤی بۆ بەرامبەرەکەی هەبێت). لەهەمانکاتیشدا ئەو کەسە پشتیوانی لەوە بکات کە ئەم (واتە ئەو تاکە) توانای بەخشینی بەردەوامی هەیە. لێرەدا پێویستە باسی ئەوە بکرێت ئەم ڕەفتارە بەرگریکارییە بە شێوازی جیاواز دەردەکەون، لەوانەیە هەندێك کەس بەشێوەیەکی بەردەوام پەنا بۆ ڕۆڵی تەفرەدان بەرن، بەشێوەیەك ئەو کەسانە وا لەخۆیان دەکەن هەمیشە ببنە بابەتی بایەخدان یان کارتێکردن لەلایەن هەموانەوەو ئەمەش لای زۆربەی هسترییەکان [ج] تێبینی دەکەین. هەندێکی دیکە بایەخ بەوە دەدەن کە تەنیا ببنە بابەتی بایەخ و خۆشەویستی هاوبەشەکەی خۆیان. لەسەر ئەم بناغەیە گۆڕینەوەی هاوسەرێکی شکستە (هیوابڕاو لێی) بە دۆست یان منداڵ دەبێتە یەکێك لەو شێوازانەی کە یارمەتی هێشتنەوەی حاڵەتی خۆشەویستیی لای ئەو کەسە دەدەن.



## هۆگربوونی خۆشەویستیی و ململانێ دژی خەمۆکی:

هەندێك کەس پێویستیان بەوەیە پەیوەندی ناوازە لەگەڵ بابەتە ئایدیالیزەکراوەکانیاندا دروستبکەن تا بتوانن بەرهەڵستی مەیلە خەمۆکییە شاراوەکانیان، بکەن. پێکەوەنووسان– ئینترۆجێکشن introjection لەگەڵ بابەتە نوێیەکاندا یارمەتی پشتیوانیلێکردنی (من–moi)ی لاواز لەبناغە منداڵییەکەیدا، دەدات.

ئەم کۆمەڵە کەسانە (لەخۆڕێکخستنی بەرگریکاریانەدان دژی پاڵنەری مردن) پشت بە بابەتی باش و بەهێز دەبەستن، ئەمەش وەك کۆڵەکەیەك بۆ ڕزگاربوون لەخۆکوشتن. پەیوەندی ئەم کەسانە بەم بابەتە پارێزگاریکەرەوە پێویستەو دەبێت هەرچۆنێك بێت پارێزگاریشی لێبکرێت، چونکە لەدەستدانی بابەتەکە بە شێوەیەکی مەترسیدار، کاردەکاتە سەر هاوسەنگی کەسێتییان. ئەو کەسانە بەردەوام پێویستیان بە ئایدیالیزەکردنی idealisation پەیوەندییەکانیان لەگەڵ بابەتی خۆشەویستییەکانیاندا، هەیە.

لەڕوانگەی شیکارییەوە ناکرێت، (پەنابردن بۆ ئامرازی شیزۆ–پارانۆیدی schizo–paranoide)[٣] بە بارێکی پاسۆلۆژی نەخۆشی pathologique، دابنرێت، بەڵام ئەوەی بە نەخۆشی دادەنرێت ئەو حاڵەتەیە کە ئەو کەسە هەمیشە لەهەڵسوکەوتدا شکست بێنێت و لەجێبەجێکردندا تەنیا پشت بە شێوازە کۆنەکە، ببەستێت: چونکە پەنا بردن بۆ دابەشبوون و ئایدیالیزە کردن – لەکاتی دروستکردنی پەیوەندی خۆشەویستیدا – ناتوانرێت بە نەخۆشی دابنرێت، بەڵام دەبێتە نەخۆشی، ئەگەر لەدوایدا نەیتوانی

ئامرازی جیاواز بەکاربێنێت، لەگەڵ سەلماندنی واقیعو تێپەڕبوونی کاتدا – کەللەڕەقیی dein ڕێگە لەبڕیاردان یان تەسلیمبوونی تاك دەگرێت تا بڕوا بەوە بهێنێت کە ئەو هاوبەشە خاوەنی بوونێکی تایبەتییە. بەمشێوەیە بەهۆی دابەشبوونو ئینکاریکردنێکی زۆرەوە ئایدیالیزەکردنی وێنەکە (وێنەی بابەتەکە) کە هەر لەسەرەتاوە دروستبووە، پاڵپشتی لێدەکرێت. وێڕای ئەوەی ئەو تاکە ئەگەر بۆ ساتێکیش بێت، ئەستەمە واز لەتێربوونە نارسیزمییەکانی بهێنێت یان لەدیاریکردنی پەیوەندی لەگەڵ هاوبەشەکەیدا تەنیا پشت بەو رووخسارانە ببەستێت کە سوودو پاداشتی پێدەبەخشن.

جێبەجێکردنی دروست پشت بە پێچەوانەی ئەمە دەبەستێت، واتە گەڕانەوەی پاڵنەرە شەڕانگێزییەکان بەرامبەر هاوبەشەکە، ئەمەش مەرجی سەرەکییە کە ڕێگە بە گەڕانەوەی پەیوەندی دوو فاقی(خۆشەویستیو رق) دەداتو بڕیاردان لەسەر سەربەخۆیی بۆ هاوبەشەکە یان بابەتی خۆشەویستییەکە بەڕێوەدەچێت بێ دیاریکردنی ئەو پەیوەندییە بەوشێوەیەی پشت ببەستێت بە فرمانی بەخشینی سوودو پاداشت بە تاك.

کەواتە کێشبەندی لەوەدا لای کەسانی لاواز یان خەمۆکەکان ڕوودەدات کە ناتوانن بە پەیوەندییەکی دووفاقی ambiralent، بگەن، چونکە ئەو تاکە بە شێوەیەکی تەواو لەناو خۆیدا هەمیشە هەوڵی پارێزگاریکردنی وێنەیەکی گونجاوو باش، دەدات، هەروەها ئینکاریکردنی هەر لایەنێکی خراپ لەهاوبەشەکەیداو هەمیشە ئەو کەسە لایەنە خراپەکان بۆ کاریگەری ئەوانی دیکە (کەسوکارو دراوسێ) دەگەڕێنێتەوە، ئەم پشتیوانیلێکردنە یارمەتی تاك دەدات



بۆ دەرپەڕاندنی شەڕانگێزیو ئاڕاستەکردنی بەرامبەر ئەوانی دیکە تابتوانێت پارێزگاری لەپەیوەندییە ئایدیالیزەکراوەکەی idealisee بکاتو دوور لەکاریگەری ئەوانی دیکە بیهێڵێتەوەو لەشەڕانگێزیی خۆیشی بە دووری بگرێت: لەلایەکەوە ئەم ئاڕاستەکردنە بۆ شەڕانگێزی بە دووکەرتبوونو دابەشبوونەوە پەیوەستە، لەلایەکی دیکەوە بە ئەستەمی بڕیاردان لەسەربوونی هەر شەڕانگێزییەکی ئاڕاستەکراو دژی هاوبەشەکەی لەناو خود–دا، کەواتە ئەوەی بە نەخۆشی دەردەکەوێت بریتییە لەسەلماندنی ئینکاریکردنی هەمیشەیی واقیع، ئەوەش وەك هەوڵدانێك بۆ فەرامۆشکردنی پاڵنەری مردن بە هەردوو روخسارەکەیەوە، روخساری رمێنەر بۆ خودو بۆ ئەوی دیکەش.

لەپێناو ئینکاریکردنی پاڵنەری مردن لەخود– دا، پاساوە جیاوازەکانی ڕەفتاری شەڕانگێزی لەکەسی لاوازدا وەك دەرئەنجامێك بۆ ئەم پێداویستییە ڕەهایە، دەردەکەوێت، هەروەك بڵێی ئەو کەسە هەست بە گوناهێکی بەهێز دەکاتو بەرگەی ناگرێت کاتێك درك بەبوونی یەك تۆزقاڵ لەرق بەرامبەر بە بابەتی خۆشەویستییەکەی، دەکات.

ئەو ئەستەمییە لێرەدا لەوەدا نییە یان لەوەدا کۆنەبووەتەوە ئەو تاکە چەندە درك بە هاوبەشەکەی بەرامبەری وەك بابەتێکی خراپ دەکات، بەڵکو ئەو هاوبەشەی بەرامبەری بەو هێندە دەبێتە بابەتی خۆشەویستیی کە لەڕێگەی پرۆسەی خۆشەویستییەوە لەلایەن ئەو کەسەوە وەرگیراوەو لەگەڵیدا پێکەوەنووساوە (واتە ئینترۆجێکشنی لەگەڵدا کردووە). کارەکە بەو شێوەیە ڕوودەدات هەروەك بڵێی ئەو

بابەتەی کە تاك لەگەڵیدا یەکیگرتووەو لەرێگەی پرۆسەی خۆشەویستییەوە پێوەی نووساوە، بۆتە بابەتێکی خراپ و دەستدرێژی دەکاتە سەر ئەو کەسە خۆی یان تێکیدەدات (ئەویش لەچوارچێوەی کارکردنێکی لێکچوو لەگەڵ کارکردنی قۆناغە سەرەتاییەکانی شیزۆ- پارانویدی کە ئەو کەسە بەهۆی کرداری دووکەرتبوون یان دابەشبوونەوە بایەخ بە پلاندانان دەدات بۆ بەکارهێنانی سەرەتاکانی خستنەپاڵ و پێکەوەنووسان projection et introjection، (ئەویش بە رێگەیەك کە بابەتە باش و بابەتە خراپەکان بە شێوەیەکی ئاشکرا لەیەکجیادەکاتەوە) [٤].

ئەگەر بابەتە خراپە پێکەوەنووساوەکە کە لەناو (من-moi) دایە یارمەتیدەر بوو لەوەی کەسەکە خراپ و وێرانی بکات ئەوا ئەو تاکە دژی ئەو مەترسییە بەرگری لەخۆی دەکات.

سەلمێنراوەکانی واقیع ئەو مەترسییە بە دووردەگرن، کە ئەوەش لەرێگەی پشتیوانیکردن لەئایدیالیزەکردنێکی بەهێزی هاوبەشەکەوە، هەروەها گۆڕانی بۆ وێنەیەکی هاوجێیی خودی خۆی، دەبێت.

- باسی ئەوەمانکرد پەیوەندی نێوان ژن و پیاو لەمانگی هەنگوینیدا هاوکاتە لەگەڵ ئایدیالیزەکردنی هاوبەش و فەرامۆشکردنی هەموو لایەنە خراپ و کەموکورتییەکانی: چونکە تاك لەم حاڵەتەدا دەتوانێت درك بە واقیع بکات ئەگەر ناچار بوو، بەڵام بەشێوەیەك هەڵسوکەوت دەکات هەروەك بڵێی هیچ ئاگادار نییە، تاك لەمبارەدا کار بۆ گۆڕینی ئەو بابەتە بە بابەتێکی دیکە ناکات، بەڵکو کار بۆ پشتیوانی لێکردنی (وەهمی حاڵەتی ئەو خۆشەویستییە)



دەکات: لەوانەیە ئەو وەهمە لەگەڵیدا بمێنێتەوەو تا دوای پچڕاندنی پەیوەندی یان تەڵاقیش هەر بەردەوام بێت .

X.P پیاوێك بوو بۆ ماوەی چەند ساڵێك ناچار بوو لەدوای جیابوونەوەی لەهاوسەرەکەی، خۆی چارەسەربکات. نەیدەزانی بەرامبەر هاوسەرەکەی لەدوای جیابوونەوە لێی چ هەڵوێستێك وەربگرێت. لەواقیعدا X.P پێش ئەوەی لەژنەکەی جیاببێتەوە دابڕانێك کەوتبووە نێوانیانەوە ئەو هەر هەوڵی دواخستنی تەڵاقی دەدا، بەڵام لەدوای چەند ساڵێك لەجیابوونەوەیان کە لەو ماوەیەدا هیچ چاوی بە ژنەکەی نەکەوتبوو، وای بیردەکردەوە کە ژنەکەی بیر لەگەڕانەوە دەکات بۆ لایی و دەیەوێت وەك جاران پەیوەندی لەگەڵ ببەستێتەوە. کاتێك ژنەکەی پێیوت: کە دەیەوێت شێوازی ژیانی بگۆڕێت ئەم وایلێکدایەوە کە ئەمە تاقیکردنەوەیەکی قۆناغییەو ئامانجی پەرەسەندنی پەیوەندییەکەیانە لەئایندەدا. لەوکاتەدا کە ژنەکەی بڕیاری تەڵاق و هاوسەرێتیکردنی لەگەڵ پیاوێکی دیکەدا، X.P بڕوای بەم بڕیارەی ژنەکەی نەکردو وایلێکدایەوە کە جۆرێکە لەتاقیکردنەوە، لێکدانەوەکانی تا ئاستی پارانۆید نەڕۆیشت، بەڵام گریمانەکانی خۆشی بەدوور نەگرت و ڕەتینەدەکردنەوە، بەو هیوایەی پەیوەندیی لەگەڵ ژنەکەیدا نوێبکاتەوەو خۆی لەدارمان بپارێزێت. هەروەها تەنانەت دوای ئەوەی ژنەکەی لێی جیابووەوەو لەگەڵ کەسێکی دیکەدا هاوسەرێتی کرد ئەم هەر هیوای هەبوو کە ڕۆژێك دێت دەگەڕێتەوە بۆ لای، بەڵام بە درێژبوونەوەی ماوەی جیابوونەوەیان دووچاری پشێوی بوو، لەخۆی دەپرسی بڕوا بە چی بکات و پێویستە چی بکات؟.

زۆر حاڵەت هەیە هاوبەشەکان (ژن و پیاو) بە مەبەست پشتیوانی لە (وەهمی حاڵەتی خۆشەویستی )[٥] دەکەن. ئەو کەسانە لەپارێزگاریکردنی حاڵەتێکی سایکۆلۆژی ڕەزامەندکراودا سەرکەوتن بە دەستدەهێنن کە ئەمە لەتووشبوون بە خەمۆکی دووریان دەخاتەوە، ئەم دۆخە لەگەڵ ئەو دۆخانەدا لێکچووە کە ئەو دوو هاوبەشە – لەکاتی قەیرانەکاندا – دەتوانن بە دانبەخۆداگرتوو بن بەو هیوایەی لەکاتێکی گونجاودا بتوانن پەیوەندی نێوانیان بەشێوەیەکی دروست بینابکەنەوە، ئەو هاوبەشانە لەتوانایاندایە بەرگەی قەیرانی زۆر توندو ناخۆش بگرن، ئەویش بەهۆی بڕوا هێنانیانەوە بەوەی کە ئەو قەیرانانە کاتین و هەریەکەیان لەو باوەڕەدایە کە هاوبەشەکەی زۆر لەوە باشترە کە دەردەکەوێت یان خۆی وادەردەخات، کەواتە دەتوانین بڵێین وەهمی خۆشەویستی لەرێکخستنی پەیوەندی نێوان دوو هاوبەشدا (ژن و پیاو) سودی خۆی هەیە.



## پەیوەندییەکانی چەوساندنەوە:

ئەگەر پەیوەندی هاوسەرێتیی لەسەر بناغەی بەردەوامی و پێکەوە ژیان، دروست بوو بێت، ئەوا ئەو دوو هاوبەشە ناچارن چاوەڕێی گیروگرفت لەپەیوەندی نێوانیاندا، بکەن. پەیوەندی هاوسەرێتی بەشێوەیەك ڕێکدەخرێت تا یارمەتیدەر بێت لەئاڵوگۆڕکردنی خستنەپاڵ لەگەڵ یەکتریدا، (واتە هەریەکەیان کۆمەڵێك شتی دیکە دەخاتە پاڵ ئەوی دیکە)، ئەویش لەرێگەی بەتاڵکردنەوەی ئەو (بەشانەی) لەترسی پاڵنەری مردن تاك ناتوانێت بەرگەیان بگرێت، ئەو بەتاڵکردنەوەیەش لەسەر کەسانی دیکە یان لەسەر هاوبەشی بەرامبەر، دەبێت تا ئەو کەسە بتوانێت خۆی پارێزگاری لەبابەتێکی باش (لەناو خود)دا بکات: هەموو هاوبەشێك کاردەکات بۆ پێکەوەنووسان لەگەڵ بەشێکی(باش)ی بەرامبەرەکەیدا یان بەشێکی (خراپ)ی خۆی دەخاتەپاڵ هاوبەشەکەی بەرامبەری، بەمشێوەیە بەهۆی کارەکانی پێکەوەنووسان و خستنەپاڵ introgection and progection تاك دەتوانێت ڕووبەڕووی پاڵنەری مردن ببێتەوە، (ئەمەش لەرێگەی ئەو هاوبەشەی بەرامبەرییەوە دەبێت وەك کۆڵەکەیەکی یان پاڵپشتێکی دەرەکی بۆ بابەتە (باش)و (خراپ)ەکان هەردووکیان وەك یەك)[٦].

کەواتە وادەردەکەوێت بەستنی پەیوەندی هاوسەرێتی هۆکارێکە بۆ بەتاڵکردنەوەی شوێنەواری ئەو ئارەزووانەی کە تاك بە ئەستەم دەتوانێت وەریانبگرێت، بە تایبەتی ئارەزووە هەرە دێرین و ئەوانەی

زیاتر پەرت بوون و زیاتر ئەشکەنجەی خود دەدەن، ئەوانەی شێوەی نەخۆشی وەرناگرن، هەروەها بەستنی پەیوەندی هۆکارێکە بۆ رزگاربوون لەوەرگرتنی شوێنەوارە شاراوەکانی ئارەزووی پارانۆیدیی– چەوساندنەوە یان خەمۆکییەکان بۆ هەریەک لەدوو هاوبەشەکە (ژن و پیاو). بوونی کەسی بەرامبەر زامنکەرێکە بۆ پڕکردنەوەی ئەم ڕۆڵە لەپرۆسەی پشتیوانکردن و خستنە پاڵ– پرۆجێکشن projection– دا: ئێمە بەرامبەرەکەمان (واتە ئەو کەسەی پەیوەندی لەگەڵ دەبەستین)خۆش دەوێت و دڵنیاشین لەوەی ئێمەش لای ئەو خۆشەویستین، ئەمەش لەبەرئەوەیە کە لەکاتی پێویستدا بەرگەی رق و چەوساندنەوەمان بگرێت یان ئێمە لەچەوساندنەوەی ئەو کەسەی بەرامبەرمان بێدەنگ بین. بوونی کەسێکی باش بۆ ئێمە بە وەرگرتنی رق و کینەی ناوەوەی ئێمە رازی ببێت و بە هەموو فەنتازیاکانی ستەم و شەڕانگێزیمان رەزامەندبێت، زۆر یارمەتیدەرمان دەبێت لەبەتاڵکردنەوەی لایەنە خراپەکان لەناو خودماندا، بۆئەوەی ئەو لایەنە خراپانە بخەینە پاڵ ئەو، هەندێك کەس لەژیانی هاوسەرێتییدا رووبەڕووی گیروگرفتی زۆر دەبنەوەو بەشێوەیەك هەڵسوکەوت دەکەن هەر وەك بڵێی پێویستیان بەهاوبەشێکە رقییان لێی بێت. ئەم کەسانە لەو حاڵەتەدا کەئەم جۆرە هاوبەشەیان دەست نەکەوێت لەناو پشێویدا نقوم دەبن، بەتایبەتی لەپشێوی پارانۆیدی چەوساندنەوە delire de persecution یان لەئەزموونی چەوساندنەوەی ئەشکەنجەداندا دەژین.

ئەم شێوازە لەپەیوەندی ناتوانرێت وەك حاڵەتێکی جیاکراوە دابنرێت و تەنیا ئەو کەسانە بگرێتەوە کە نەخۆشن، بەڵکو دەتوانرێت



لەزوربەی پەیوەندییەکانی هاوسەرێتیدا بەدیبکرێت، بەشێوەیەك ئەو پاڵنەری ستەمکارییە لەسەرەتای پەیوەندیدا داپۆشراو دەبێت، بەڵام هەر زوو لەقۆناغەکانی داهاتوودا، دەردەکەوێت و ئاشکرا دەبێت. ئەو دوو فاقییەیی کە پەیوەندی سۆزداری دیاریدەکات لەسەرەتای پەیوەندییەکەدا چەپێنراوە، چونکە ئەو هاوبەشە دژی گەڕانەوەی ئەم دووفاقییەو روخساری شەڕانگێزو شکستهاتوو یان چەوساندنەوەیە، پارێزراوە. لەم حاڵەتەدا پارێزگاریکردنەکەی پشت بەڕەگەزی دەرەکی دەبەستێت: (دووکەرتبوون یان دابەشکردنی دوالیزمی) یان (دابەشبوون) لەسەرەتادا پشت بە ئارەزووە شەڕانگێزییەکان دەبەستێت بەرامبەر بە کەسانی دیکە یان ئەو دوژمنانەی کە پەیوەندییان بە هاوبەشەکەوە هەیە، وەك (ئەو ناوەندەی تێیدا دەژی ،خێزانەکەی)و ئەو کارتێکەرانەی کە ملکەچی بووەو هەروەها بارودۆخە بایۆلۆژیی و سۆسیۆلۆژییەکانیش، بەڵام هاوبەشەکە (واتە ئەو کەسە) لەوانەیە ببێتە کەسێکی تۆمەتبار، چونکە دەبێتە ئەو هۆکارەی یان ئەو پردی پەیوەندییەی کە ئازار لای ئەوی دیکە، واتە بەرامبەرکەی دروستدەکات. بەمشێوەیە ئارەزووە شەڕانگێزییەکان بەرامبەر هاوبەشەکەی دیکە دەگوێزرێتەوە، ئەویش بەهۆی شکستهێنانی میکانیزمەکانی بەرگریکردن و دابەشبوونی سەرەتایی کە ئەو کەسەی لەبێدارکردنەوەی پاڵنەرە شەڕانگێزییەکان دەپاراست.

ئەو بارودۆخانەی یارمەتی فۆرمەلەکردنی ئەم دیاردەیە دەدەن، دەتوانرێت بەمشێوەیە کورت بکرێنەوە:

١– هەندێك کەس بەشێوەیەکی خویی جۆرێك لەئامادەباشییان بۆ

تووشبوون بەهەندێك حاڵەتی نەخۆشی تێدایە کەلەوانەیە ئەم ئامادە باشییە دەرئەنجامی ئەزموونی لەبەریەکهەڵوەشاو dissociativesی ئەندەکی و دیاریکراو بێت و لەوانەشە دەرئەنجامی جڵەوگرتنی منداڵی بێت بەتایبەتی لەو منداڵانەدا کە بەدەست بێبەشبونێکی توندی سۆزدارییەوە ناڵاندوییانە.

٢- هەندێك کەس پێویستی یان ئارەزوویەکی تایبەییان هەیە بۆ پاراستنی جۆرێك لەپەیوەندی ناوازە لەگەڵ کەسانی دیکە وەك خوشك و برا یان هاوتاکانیان، ئەم کەسە ناوازانە وا پێویست دەکات لەچوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتییدا ئاسودە بن. بۆ نموونە تاکێك بەرگری لەرقوکینەی نەستی بەرامبەر بە باوکی دەکات، (هەستکردن بەگوناهێکی چەپێنراو بەرامبەری) هەموو شتە باشەکان دەخاتە پاڵ باوکی ئەویش لەرێگەی کرداری (فۆرمەلە بوونی پێچەوانەییەوە) Formation reactionnelle. ئەم کردارە کار بۆ بەرگرتن لەو شەڕانگێزییە دەکات بەرامبەر باوکی هەیەتی و ئەو شەڕانگێزییە لەجیاتی ئەوەی ئاراستەی باوکی بکات ئاراستەی هاوبەشەکەی دەکات و رقوکینە نەستییەکەی دەخاتە پاڵ ئەو.

پشکنینە کلینکییەکان ئاشکرایانکردووە ئەم روخسارە لەپەیوەندی، نابێتە هۆی پچڕانی پەیوەندی نێوان دوو هاوبەشەکە (ژن و پیاو): هەموو شتەکان وا روودەدەن هەر وەك بڵێی ئەو تاکە پێویستی بە هاوبەشێکی دیکەیە تا رقوکینەی خۆی تیادا بەتاڵبکاتەوە، چونکە ناچارە بابەتە ناوازەکەی لەم رقوکینە بەدەربکات یان دووربخاتەوە.

ئەم کارتێکەرە یان پاڵنەرە رمێنەرانە بەشێوەیەکی جێگیرو



بەردەوام سەرهەڵنادەن، زۆرکات بەشێوەیەکی پچڕپچڕو گۆڕاو دەردەکەون: رەفتارێکی شەڕانگێزی روودەدات و بەدوایدا هەستکردن بەگوناه دێت کە هاوکات دەبێت لەگەڵ هەستکردن بە دڵسۆزیی و شکۆیی بەرامبەر هاوبەشەکەی دی و ئەمەش رێگە خۆشکەر دەبێت بۆ ئەو کەسە خۆی (واتە ئەو هاوبەشەی رقە شاراوەکەی تێدایە) هێزو توانای خۆی بگەڕێنێتەوەو پێگەی خۆی تۆندوتۆڵ بکاتەوە .

ئەزموونەکان سەلماندویانە پەیوەندییەکانی هاوسەرێتی لەوانەیە بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ بەرهەڵستی تەقینەوەی رقوکینەو چەوسانەوە بگرن، ئەویش لەبەرئەوەیە زۆرجار هاوبەشە چەوسێنراوەکە لێبووردنی بەرامبەر هاوبەشە چەوسێنەرەکە دەبێت، چونکە هاوبەشە چەوسێنراوەکە خۆی ئارەزووی خەمۆکی و سزادانی خود دەکات و مۆرکێکی مازۆشی هەیە لەبەرئەوە پێویستی بەکەسێك یان هاوبەشێك هەیە چەوساندنەوەی بەرامبەر بنوێنێت و رۆڵی (منی باڵا- sur moi) یان (یاسا) بەرامبەری ببینێت.

ستێرلن Stierlin[٧] و ریچەر Richter[٨] توانییان ئەم مەسەلەیە روون بکەنەوە کاتێك لەچوارچێوەی پەیوەندی خێزانیدا سەرنجیان لەبایەخی نواندنی(ڕۆڵ)ەکان- دا: لەوانەیە هەریەك لەدوو هاوبەشەکە (ژن و پیاو) بەوە رازی بن ڕۆڵێکی دیاریکراو ببینن تا هەریەکەیان لەو کرژبوونە دەروونییەی خۆی رزگاری ببێت کەلە ناخییدایە، ئەم کرژبوونە دەروونییە بەشێوەیەکی خودی لەناو کەسەکەدا نامێنێتەوە، بەڵکو رۆدەچێتە Introduit ناو چوارچێوەی پەیوەندییەکی دوالیزمی لەگەڵ هاوبەشەکەی دیکەداو رێگە بەو هاوبەشە دەدات (واتە ئەوەی کرژبوونە دەروونییەکەی هەیە)، ئەم

کرژبوونە دەروونییە وەك بابەتێکی ئەلتەرناتیڤ objetsubstituf بۆ هاوبەشی بەرامبەری بگوازرێتەوە، چونکە ئەو هاوبەشە وەك درێژبوونەوەیەکی نارسیزم وایە بۆ هاوبەشی یەکەم کە کرژبوونی دەروونی هەیە، بەمشێوەیە دەتوانین لەچوارچێوەی ئەم تێکچڕژانە گونجاوە لە(ڕۆڵ)ەکاندا لەم جۆرە پەیوەندییە تێبگەین، بۆ نموونە ئەو هاوبەشەی ڕۆڵی قوربانی دەبینێت زۆرکات ئەو کەسەی کە دەیچەوسێنێتەوە وەك (نمونەی بالاَ) هەڵدەبژێرێت، ئەوەی لێ چاوەڕواندەکات کە هاوبەشی بەرامبەر ڕۆڵی(منی بالاَ– sur moi ) ببینێت، بەو مانایەی ئەو هاوبەشە کە ڕۆڵی منی بالاَ دەبینێت بەشێوەیەکی توند لۆمەی بکات و لەبەرامبەر پێشێلکاری فەنتازیای تابۆکاندا (قەدەغەکراوەکاندا) سزای بدات، لەمبارەدا ئەو هاوبەشەی چەوساندنەوە دەنوێنێت ئەرکی نواندنی یاسای پێدەسپێردرێت (واتە ئەو ئەرکەی پێدراوە کە وەك یاسا دەور ببینێت و سزای بەرامبەری بدات کەپێشێلکاری کردووە– وەرگێڕ).

لەسەر ئەم بناغە ئەو هاوبەشەی چەوسێنراوەتەوە یان ئەو قوربانییە رازییە بە رقو ستەمی هاوبەشی بەرامبەرو هەست بەهیچ مەترسییەك بۆ سەر بوونی فیزیکیی یان مەعنەویی ناکات، ئەو دوو هاوبەشە سودی زۆر بۆ خۆیان بەدیدەهێنن لەرێگەی فۆرمەلەکردنی ئەم جۆرە پەیوەندییەوە یان ئەگەر وردتر بڵێین لەرێگەی دەستتێکەڵاوکردنی هاوسەرێتییەوە، هەر هاوبەشێك ئەم دەستتێکەڵاوکردنە Collusion بەکاردەهێنێت تا کرداری دابەشبوون لەلای بەشێوەیەکی باشتر بەڕێوە بەرێت:

١– هەر هاوبەشێك بەهۆی کرداری هاوچەشنیکردنی



خستنەپاڵییەوە Identification projection (د) چەندە روخسارەکانی (منی بالاَ– sur moi)، یان تەنانەت روخسارەکانی چەوساندنەوە بخاتە پاڵ هاوبەشەکەی دی، ئەوەندە ئاسانتر بەشە لیبیدییەکەی (من)ی ناوەوەی خۆی قبوڵدەکات و بەمەش لەروخسارەکانی (منی بالاَ– sur moi ) رزگاری دەبێت، ئەویش لەو رێگەیەوە هەموو ئەو شتانەی پەیوەندی بەمنی بالاوە هەیە دەیخاتە پاڵ هاوبەشەکەی بەرامبەری، بۆنمونە: لەکاتێکدا هاوبەشی یەکەم کاری سەرەڕۆیانەو لادراو دەکات، هاوبەشەکەی دی ڕۆڵی نکۆڵیکەر یان نمایندەی یاسا دەبینێت.

٢– ئەو هاوبەشە بەهۆی پاساوهێنانەوەی ئاشکراوە دەتوانێت هەندێك لەشەڕانگێزیی و رقی خۆی دژی هاوبەشەکەی دی کاربکات، کە ئەو هاوبەشە ئامادەیە بۆ وەرگرتنی ئەم روخسارە (واتە ڕۆڵی منی بالاَ)ی ڕێگرو تابۆکار (قەدەغەکراو)، ئەم بەتاڵکردنەوە شەرانگێزییە تاك دەحەوێنێتەوەو لەئارەزووە رمێنەرەکانی رزگاری دەکات.

٣– لەسەر ئاستێکی دی، هەر هاوبەشێك ئەو بەشانەی کە لەخودی خۆیدا رەتیدەکاتەوەو ناتوانێت بەبێ دەستتێکەڵاوکردنی هاوسەرێتی collusion رووبەڕوویان بێتەوە، دەیخاتەپاڵ هاوبەشی بەرامبەری، بەمشێوەیەو بەهۆی پەیوەندی هاوسەرێتییەوە ئەو لایەنە رەتکراوەی خۆی دەداتە پاڵ ئەو هاوبەشەی کەزۆر بە وردی هەڵیبژاردووە تا بەرگەی ئەم لایەنە رەتکراوەی (من–moi) لەناو خۆیدا، بگرێت.

سوودمەندییەکان لەم ئاستەدا، زۆرن:

١- لەلایەکەوە، هەر هاوبەشێك بەهۆی ئەم خستنەپاڵەوە – پرۆجێکشن projection بەئاسانی لەو روخسارانە دوورەکەوێتەوە کە ناتوانێت لەخودی خۆیدا بەرگەیان بگرێت.

٢- لەلایەکی دیکەوە، ئەم کارە پاساوی ئەو شەڕانگێزییو رەخنەیەش دەداتەوە کە تاك لەسەر هاوبەشەکەی بەرامبەری پراکتیزەی دەکات، واتە ئەو هاوبەشەی کەلایەنە لیبیدییە خراپەکەی (من- moi) دەخاتە پاڵی، بۆ نموونە هەندێك ئارەزووی سەرەڕۆییو خواردنەوەی کهولو روخسارە سادی – مازۆشییەکان، کە تاك خۆی ئەوە رەتدەکاتەوە لەناو خودی خۆیدا ئاشکرایان بکات، لەوانەیە زۆر بەئاسانی بیخاتە پاڵ هاوبەشەکەی بەرامبەری بە تایبەتی بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە هەڵبژێردراوە.

ئەمە رێگە لەسەرلەنوێ ژیاندنەوەی ئەو ئارەزووە رەتکراوانە ناگرێت لەرێگەی هاوچەشنیکردن- تەماهی- لەگەڵ بەرامبەرو سوود وەرگرتن لەتێربوونە فەنتازییەکان.

ئەم دوو هاوبەشە لەهەڵوێستێکی دیکەداو بەهۆی ئەم دەستتێکەڵاوکردنە ئاڵوگۆڕکراوەوە دەتوانن بەها بەو وێنە خودییەی خۆیان ببەخشن کە بۆ ژینگەی کۆمەڵایەتیی چوار دەورییانی دەخەنەڕوو، بەمشێوەیە هەریەکەیان لەرێگەی ئەوی دیکەیانەوە پشتیوانی لەفۆرمی ئەو کەسێتییە دەکەن کە دروستیانکردووەو رێکیانخستووەو هەروەها داواو بانگەشەی کەسانی دیو کۆمەڵگەش پڕدەکاتەوە.

لەم نێوکۆیەدا تێبینی دەکەین هەندێك پەیوەندی هاوسەرێتی



هەمیشە گرژیو نەگونجانی پێوە دیارە بەشێوەیەك تێگەیشتن لەسروشتی ئەو پەیوەستییەی دوو هاوبەشەکە کۆدەکاتەوە، ئەستەمە. ئەم شێوازە لەپەیوەندی تەنیا (سادی- مازۆشی) نییە، بەڵکو کەموکورتییەکی لەئارەزووە ئیرۆسییەکانی تێدایە، وێڕای شکستیو تێرنەبوونی ئاڵوگۆڕکراو. ئەوەی لێرەدا شایەنی تێبینیکردنە هەر هاوبەشێك لەمبارەدا چارەسەرکردنو پێشکەوتنی هاوبەشەکەی، رەتدەکاتەوە، هەر وەك بڵێی هەمیشە هەوڵی خاوەندارێتیکردنی هاوبەشەکەی دەدات بۆ ئەوەی بیچەوسێنێتەوەو رقوکینەی خۆی تێدا بەتاڵبکاتەوە، هەروەها تێبینی ئەوەش دەکەین ئەم کەسانە پەیوەندی گونجاوو هاوسەنگ لەگەڵ کەسانی دیکەدا دەبەستن، بەڵام لەچوارچێوەی ژیانی هاوسەرێتیاندا ژیانیان بەشلەژاوییو پڕ هەراوزەنا دەمێنێتەوە.

M.F کچێك بوو قۆناغێکی منداڵی پڕ ئەشکەنجەو پشێوی لەناو کەشێکی خێزانی هەمیشە بارگاوی بە گژبوونو ئاژاوە بردبووە سەر. دایکی ئەوەی رەتدەکردەوە گوێ بۆ گلەییو گازندەکانی شلبکات، هەرچی باوکیشی بوو هەمیشە لەگەڵ دایکیدا ناکۆكو ئاژاوەیان لەنێواندا بوو، بەدەگمەن نەبوایە بۆ ماڵەوە نەدەگەڕایەوە، کاتێك بڕوانامەی قۆناغی یەکەمی خوێندنی بەدەستهێنا ناردی بۆ کارکردن لەیەکێك لەکارگەکاندا، لەوێ رووبەڕووی زۆرێك لەناڕەحەتییو بەرهەڵستی بۆوەو لەدوای ماوەیەکی کەم تووشی نەخۆشی سیل بوو، ناچار بوو واز لەکارکردن بێنێتو لەماڵەوە بمێنێتەوە کە پڕ بوو لەگیروگرفتی مادییو دەروونی، لەهەمانکاتدا بۆ کوڕێکی گەنج خوازبێنی کرا کەدڵی پیایدا چوو بوو، بەڵام لەدوای دوو مانگ

دەستگیرانی (پێش چونە کەژاوەی ژیان) لەکاتی ئەنجامدانی خزمەتی سەربازیدا کوڕەکە کۆچی دوایی کرد. لێرەوە وردەوردە لاتەریك بوو،هەستیدەکرد لەلایەن هەمووانەوە رەتکراوەتەوە، ئەمە وایلێکردبوو لەهەموو خەڵك بێزار بێت. لەم بارودۆخانەدا بوو دەستی بەگەڕان کرد بۆ دۆزینەوەی هاوبەشێك لەژیانیدا، لەکۆتاییدا ئەو کەسەی دەستکەوت کەبەشوێنیدا دەگەڕا، ئەو پیاوە بە بیست ساڵ لەخۆی گەورەتر بوو، پێی رازی بوو، چونکە بەلای ئەوەوە ئەو پیاوەش وەك خۆی قوربانییەکی ئەم کۆمەڵگە شەڕانگێزەیە، پێشتر ئەوەی دەزانی ئەو پیاوە گیروگرفتی لەگەڵ دەسەلاتدا هەیەو لەلایەن هەمووانەوە رەتکراوەتەوە. پێشتر ئەم پیاوە لەیەکێك لەحیزبە چەپە توندڕەوەکاندا شۆڕشگێڕ بوو، ئەو کەسانەی دەچەوساندەوە کە سەرۆکایەتیی دەکردن‌و زۆر بە رەقی‌و توندی مامەڵەی لەگەڵدا دەکردن، لەبەر ئەم هۆکارە کەسێکی خۆشەویست نەبوو، هەروەها رەتکراوە بوو. کچەکە بە باشی لەهەستەکانی تێدەگەیشت، لەگەڵ ئەوەشدا لەم هەستانەیدا هاوبەشی دەکرد.

ماوەیەکی زۆر (ئەوەندە) بەسەر ئەم هاوسەرێتیەدا تێنەپەڕی بوو کە پیاوەکە دەستی بە سەپاندنی یاساکانیی خۆی کردو شەڕانگێزی خۆی بەرامبەر بەژنەکە ئاشکرا کردو لەهەمانکاتدا لەتێربوونی سێکسوالی بێبەشی دەکردو پاساویشی بۆ ئەم رەفتارەی ئەوە بوو گوایە دەیەوێت سزای بدات (واتە سزای ژنەکەی).

M.F دووچاری پشێوی بوو، هەستی بە شکستیی‌و نائومێدی دەکردو لەدوای ماوەیەك لەدوودڵی بڕیاریدا خۆی چارەسەری کێشەکە بکات. ئەم چارەسەرکردنە کاتییەی کەمێك یارمەتیدا بۆ



باشکردنی پەیوەندی لەگەڵ هاوبەشەکەیدا، بەڵام رقلێبونەوەی ئالۆگۆڕکراو لەنێوانیاندا بەردەوام بوو: هەر یەکێکیان سزای هاوبەشەکەی بەرامبەری دەداو لەهەمانکاتدا سزای خۆیشی دەدا. بەمشێوەیەو لەگەڵ ئەو رق‌و رقلێبوونە ئالۆگۆڕکراوەی نێوانیشیاندا پەیوەندییەکەیان هەر بە بەردەوامی مایەوە، چونکە هەریەك لەو دوو هاوبەشە دەیانویست شەڕانگێزی خۆیان لەیەکتریدا بەتاڵبکەنەوە. لەدوای تێپەڕبوونی هەشت ساڵ بەسەر ئەو هاوسەرێتییەدا پیاوەکە تووشی نەخۆشییەکی خراپ بوو کە بەهۆیەوە گیانی لەدەستدا. لەدەستدانی پیاوەکە کاریگەرییەکی بەهێزی لەسەر دەروونی ژنەکە بەجێهێشت، سەرلەنوێ دووچاری پشێوی بۆوەو هەستیدەکرد هەمووان رقییان لێیەتی‌و رەتیانکردۆتەوە: گومانی لەدراوسێکانی دەکردو بەوە تۆمەتباری دەکردن، گوایە بۆنی ناخۆشی بۆ دەنێرن‌و بێزاری دەکەن‌و رووناکی‌و تیشکی تێدەگرن تا خەوی لێ تێکبدەن. چاودێری هەموو جوڵەیەکی دەکردو بیرۆکە شاراوەکانی مێشکی بە وتن (واتە لەرێگەی قسەکردنەوە) دووبارە دەکردەوە. گەیشتە ئەوەی سکالانامەی لای پۆلیس پێشکەشکرد، پۆلیس هاتە ناو کێشەکەوە، بەڵام راستیی‌و دروستی هیچ کام لەوتەو قسەکانی نەسەلمێنرا، لەدوای ماوەیەك شکاتی لەپۆلیسیش لای دادگای باڵا تۆمارکردو دواتریش شکاتنامەی دژی لێکۆڵەرەوەی گشتیی تۆمارکرد کە سزای پۆلیسی نەداوە. لەسەر ئەمبارە مایەوەو تا تووشی جۆرێك لە (پارانویدی چەوساندنەوە) بوو. بەتەواوەتی بڕوای بەو قسانە بوو کە دەیکردن‌و لەمێشکیدا بوون‌و هیچ کاتێك هەوڵی سەلماندنی دروستیی قسەکانی خۆی نەدەدا.دوای تێپەڕ بوونی ماوەیەك رازی بوو بە چارەسەرکردنی کیمیایی، چارەسەری بۆ بکرێت. ئەم

چارەسەرە یەکەم لەهێورکردنەوەی مێشکیی و نەهێشتنی خەیاڵە بیستراوو بۆنییەکان و دووەمیش لەهێواشکردنەوەی وڕێنەکانی سەرکەوتنی بەدەستهێنا. مێشکی کەمێك هێورو ئارام بۆوە، بەڵام هێشتا بڕوای تەواوی بەوە هەبوو کە هیچ کەسێك ناتوانێت جێگەی هاوبەشەکەی (واتە پیاوەکەی) بگرێتەوە، چونکە هێشتا باسی ئەوەی دەکرد چۆن هاوسەرەکەی چەوساندویەتییەوەو دەیوت: (لەمەودا ناتوانم بەرهەڵستی بکەم و توڕە ببم لێی، گوناهە ئەو مردووە).

– هەمیشە پێویستە کەسێك هەبێت بۆئەوەی تاك رقی خۆی تێدا بڕەوێنێتەوە، هەروەها دەبێت ئەو کەسە ئامڕازێکی شیاو بێت بۆ رەواندنەوەی ئەم رقەو ئەمەش وا پێویست دەکات ئەو هاوبەشە رۆڵی بە باشی ببینێت و نابێت نەمێنێت یان رابکات، پێویستە ئەو هاوبەشە واتە ئەوەی رقی تێدا دەڕەوێنرێتەوە لەلایەن هاوبەشەکەی بەرامبەرییەوە کە کاری رەواندنەوەکە دەکات خاوەنداریێتی بکرێت و بە پەیوەندییەکی پاشکۆیەتی پێوەی پەیوەست بێت. رقوکینە لەمبارەدا بەئاسانی پاساوی بۆ دەهێنرێتەوە، چونکە ئەو هاوبەشە هیچ کاتێك لەگەڵ بۆچوونە ئایدیالیزەکراوەکانی لەسەرەتادا چاوەڕوانی کردووە لێی، ناگونجێت.

لەم حاڵەتەدا تێبینی دەکەین ئەم هاوبەشە (ڕۆڵی قوربانی)[٩] دەبینێت. ئەم قوربانییە واپێویستدەکات هەمیشە ئامادە بێت و بە بەردەوامی بەکاربهێنرێت، بەمشێوەیە تاك دەتوانێت هاوبەشەکەی بە شکستیی و هەڵە تۆمەتبار بکات و هەرچییەك کەخۆی لەناو خودیدا ناتوانێت بەرگەی بگرێت لەودا بەتاڵبکاتەوەو بەمەش رقی لێی بێت و رقوکینەی لێهەڵبگرێت، ئەو کەسە هەمیشە پێویستی بە هاوبەشێکە



رقی لێی بێتەوە، لەبەر ئەم هۆیە پێویستە هەمیشە بە بەردەوامی ئەم هاوبەشە ئامادەبوونی هەبێت تا خۆبەتاڵکردنەوەی ئەو قبوڵبکات. ئەم شێوازە لەپەیوەندی پێویستی بە جۆرێك لەهاوچەشنی ئاڵوگۆڕکراو لەنێوان دوو هاوبەشەکەدا هەیە، بەشێوەیەك سنورەکانی نێوان (مـن–moi)و ئەوی دیکە(بەرامبەر) رەتدەکرێتەوەو تاك وایلێدێت لەتوانایدا بێت روخسارە رەتکراوەکانی ناو خودی خۆی بخاتە پاڵ هاوبەشەکەی بەرامبەری و لەبەرامبەردا ئەو هاوبەشەش هەمان کرداری خستنەپاڵ بەدیدەهێنێت، کەواتە لێرەوە دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی ئالودەبوونی نێوان هاوبەشەکان لەنەستدا روودەدات، ئەویش لەرێگەی دابەشکردنی رقوکینەی ئاڵوگۆڕکراو لەنێوانیاندا.

لەم چوارچێوەیەدا، دەتوانین لەهەندێك هەڵسوکەوتی تۆڵەئامێز تێبگەین کە لەدوای تەڵاق و جیابوونەوە روودەدەن. لەمبارەدا تاك لەوانەیە رقی خۆی ئاڕاستەی منداڵەکەی بکات، لەبەرئەوەی ئەو منداڵە گوزارشت لەئەزموونێك دەکات کە لەگەڵ ئەوی دیکەدا، واتە لەگەڵ هاوبەشەکەیداو بەتایبەتی لەو بارەدا ئەگەر منداڵەکە لەو هاوبەشە بچێت، یان لەوبارەدا کە منداڵەکە جۆرێك لەفەرامۆشکردن بەرامبەر بە گیروگرفتەکانی نێوان دایك و باوکی دەرخستبێت، بۆ نموونە Medee پیاوێك بوو Jason ی ژنی بە کوشتنی ئەو منداڵانە سزادا، کەلێی بووبوون. هەندێجار تەڵاق یان جیابوونەوە ناتوانێت سنوور بۆ ئەو رقوکینەیە دابنێت کە ئەو دوو هاوبەشە دەوروژێنێت، چونکە هەندێك کەس ناتوانن لەدوای جیابونەوەیان لەهاوبەشەکانیان ئارەزووەکانی چەوساندنەوەو ئەشکەنجەدان بەتاڵبکەنەوە، لەمبارەدا ئەم ئارەزووانە لەسەر خود رەنگدەدەنەوە تا شێوەیەکی پارانۆیدی گەورە وەك پارانۆیدی چەوساندنەوە، وەردەگرن.

## پەیوەندی خۆشەویستی بە کینەوە:

خۆشەویستی بەمانا گشتییەکەی تێکەڵەیەکە لەهەستی پۆزەتیڤ و نێگەتیڤ (رقوکینە). ئەم دوو روخسارەی هەست لەوانەیە لەحاڵەتی خۆشەویستی دووفاقیAmbivalent دا پێکەوە هەبن (چونکە بەپێی گوزارشتی فرۆید، لەوانەیە رق لەپێش خۆشەویستیدا ئاشکرا ببێت)[10]: لەرێگەی رقەوە دەتوانین شتەکان لەیەکتری جیابکەینەوە، هەر لەرێگەی رقەوە دەتوانین هەرشتێك خراپەو رەتکراوەو هەڕەشەیە بۆمان بیخەینە پاڵ کەسێکی دیکە. لەرێگەی رقەوە دەتوانین ئەو لایەنە خراپەی لەخودی خۆماندایە رەتیکەینەوە، بیخەینە پاڵ ئەویدی. لەبەرئەوە رق پێویستەو بەجۆرێك لەجۆرەکان سودمەندیشە. وا پێویست دەکات بەشێوەیەکی چەسپاو هەمیشە کەسێك بۆ ئەم رقە هەبێت، ئەویش بۆئەوەی بەرگەی ئەو بەشە خراپە بگرێت کە لەخودی خۆماندا رەتیدەکەینەوەو دەیخەینە پاڵ ئەویدی.

خۆشەویستی رۆمیۆو جوڵێت لەم رێسایە دەرنەچووەو گیروگرفتی رۆژانەی زوربەی هاوبەشەکانیش (ژن و پیاوەکانی هاوسەری یەکترین) بەشێوەیەکی هەمیشەیی بریتییە لەدۆزینەوەی هۆکارێك بۆ رەواندنەوەی یان بەتاڵکردنەوە یان وەرگرتنی رقی تێکەڵ بوو بە خۆشەویستی تەرخانکراو بۆ بابەتەکە (واتە پەیوەندی نێوانیان–وەرگێڕ)، ئەو هۆکارەی کە لەم بوارەدا زیاتر بەکاردەهێنرێت کرداری دووکەرتبوون یان دابەشبوونە، لایەنی باش بەهێز دەکرێت یان دەخرێتە پاڵ بابەتی خۆشەویستییەکە، چونکە



نموونەی (من– moi) دەنوێنێت. هەرچی لایەنە خراپەکەشە بەشی پێویست ناکات و کەموکورتی تێدایە، لەوکاتەدا ئارەزووە دوو فاقیەکان (خۆشەویستی و رقوکینە) بەرامبەر بابەتەکە دەبن بەیەك، پشکنینە کلینکییەکان لەمبارەدا ئاشکرایانکردووە هەندێك هەوڵی شێواو بۆ چەسپاندنی ئایدیالیزەکردن و دابەشبوون دەردەکەون، هەروەها بۆ رەتکردنەوە یان دواخستنی کرداری ماتەمینی.

لەنێو ئەم هەوڵانەدا، جۆرێك لەکرداری خودپارێزی لای هەندێك لەژن و پیاو (هاوسەرەکان) دەردەکەوێت، بەتایبەتی لەو کەسانەدا کە بە(کەسێتییەکی یەك لایەنە)[11] Border line، دەناسرێت. بەشێوەیەك شەڕانگێزی ئاڵوگۆڕکراو و ئاژاوەو گازەندەکردنی دووبارەبۆوە یان جێگیر دەردەکەون وێڕای چەوساندنەوەو رقلێبوونەوە بێئەوەی کارەکان بگاتە ئاستی شەکەتبوونی لەرادەبەدەر، چونکە ئەم جۆرە پەیوەندییانە هیچ کاتێك لەبەریەکهەڵناوەشێن. هەریەك لەو دوو هاوبەشە بەهۆی بابەتە ناوەکییە خراپەکانی خۆیانەوە کە دەرئەنجامی بارودۆخێکی ژیانی منداڵیی و خێزانین ماندوو شەکەتن و دەیانەوێت بابەتە نموونەییەکانیان لەشەڕانگێزیی بپارێزن، لەبەرئەوە دووچاری ئەستەمی دەبنەوە لەبەتاڵکردنەوەی رقوکینەدا، بۆیە هەریەکێکیان پێویستی بە بابەتێکی جێگیرەو ناوبەناو هاوبەشەکەی بەکاردەهێنێت تا رقوکینەی خۆی تێدا بەتاڵبکاتەوە، لەبەرئەوە واپێویست دەکات بە بەردەوامی ئەم هاوبەشە لەپەیوەندییەکەیدا لەلایەن هاوبەشەکەی دیکەوە کەرقی خۆی تێدا بەتاڵدەکاتەوە، نیمچە خاوەندارێتیەکی تەواوبکرێت. لەسەر ئەم بناغەیە ئەو دوو هاوبەشە لەیەکتری

**جیانابنەوە، چونکە هەریەکەیان پێویستیی زۆری بەوی دیکەیە بۆ بەکارهێنانی بە دوو شێوە وەك (من بۆ رقلێبونەوە Moi-Poubelle )[12] یان بۆ نواندنی چەوساندنەوە بەرامبەر یەکدی، کەواتە تێبینی دەکەین بوونی ئەو هاوبەشە پێویستە بۆئەوەی وەك پاڵپشتێك بەکاربهێنرێت لەکاتی کرداری خستنەپاڵی ئەو بابەتانەی خراپن و پێکەوەنووسانیان Interiorise لەگەڵدا کراوە، لەمبارەدا بەهۆی کارلێکردنی توندوتۆڵ و تیژەوە پرۆسەکانی هاوچەشنی خستنەپاڵ Projective Identification ی لایەنە خراپەکان لەنێوان دوو هاوبەشەکەدا جومگاندن دەکەن.**

**دواجار دەتوانین بڵێین، لەسنوری پارانۆیدی و بەتایبەتی لەبارە توندەکاندا ئەم پەیوەستییە لەلایەن خودەوە ئاشکراو پارێزراوەو، لەنێوان خۆشەویستیی و رقدا وێنادەبێت، ئەم دوو توخمە بنەماییە لەچوارچێوەی پەیوەندییەکی خۆشەویستییدا دەمێننەوە. زۆرجار ئەو دووهاوبەشە بێئەوەی ئەوە ئاشکرابکەن بە رقوکینەیان بۆیەکتری سەرکەوتن بەدەستدەهێنن لەوەی کە بەڕێگەیەکی تایبەتی یەکترییان خۆش بوێت، ئەگەر ئارەزووی دروستکردنی خۆشەویستیشیان کرد ئەوا لەکەسانی دیکە زیاتر پێویستییان بە دروستکردنی رقوکینە دەبێت.**



## پەراوێزەکانی وەرگێڕ:

(ا) سایکۆسیسی خەمۆکیی- Depressive-psychosis و سایکۆسیسی پارانۆیدی- Paranoid psychosis ، سایکۆسیسی خەمۆکیی جۆرێکە لەتێکچوونی ئەقڵی، نەخۆش ماوەماوە بە دۆخێکدا تێپەڕدەبێت ئەویش دۆخی هەوەسی و وروژاندن لەگەڵ دۆخی چونەوەیەکو خەمۆکی کە لەنێوان ئەم ماوانەدا دەشێت نەخۆش بە دۆخی هێمنیی و ویقاردا بڕوات. هەرچی سایکۆسیسی پارانۆیدی–یە پشێوی یان تێکچونێکی ئەقڵیی و ئاوەزییە، نەخۆش وەهمی ئەوە دەکات تووشی حاڵەتێکی عەشق یان گەورەیی یان غیرە یان چەوساندنەوە، بووە. هەندێجار وڕێنەشی لەگەڵدایە، ئەم نەخۆشییە وردە وردە پەرەدەستێنێت تا وەك سیستمێکی وڕێنەیی هەمیشەیی و جێگیر خۆی دەچەسپێنێت و نەخۆش بەتەواوی پارێزگاری لەئاشکرایی و رێکخستن لەفکرو ئیرادەو کرداردا دەکات.

(ب) خۆگونجاندن- conformisme: واتە خۆگونجاندنی تاك و کارەکانی بەپێی بیرکردنەوەی کەسانی دیکە یاخود ملکەچبوونی خود بۆ خۆنواندن و خۆگونجاندن بەپێی بۆچوون و ئارەزووی کەسانی دیکە یان ئەو کەسەی کەخۆی مەبەستییەتی. هەروەها ئاماژەیە بۆ رازیبوونی تاك بۆ گۆشەنیگاو رای زۆرینە، ئەم رازیبوونە دەشێت بە ئاشکرا یان شاراوە بێت.

(ج) هسترییەکان- Hysteria: کەسی هستری کە تووشی هستریا بووە بە هەندێك سیفەتی دیار دەناسرێت، وەك: توانایەکی زۆر بۆ ئیحاو گۆڕان و هەڵگەڕانەوەی هەڵچوونی و لاوازی بارگەی ویژدانی و لێکهەڵوەشانی ناوەڕۆکی هەست کە لەئەنجامی ململانێی نێوان خودی بەئاگاو ئارەزووە نەستییە

چەپێنراوەکاندا روودەدات. ئەم چەپاندنە دەبێتە هۆی دەرکەوتنی هەندێك نیشانە بۆ قەرەبووکردنەوە کە بە رێگەیەکی رەمزی ئارەزووە نەستییەکان رازی دەکات.

(د) هاوچەشنیکردنی خستنەپاڵ یان هاوچەشنی خستنەپاڵ– Identification projectiv: میکانیزمێکی خستنەپاڵییە، تاك بەشێوەیەکی ئەندەکی یان هەمەکی دەڕواتە ناو جەستەی کەسێکی دیکەوە. میلانی کلاین ئەم گوزارشتەی بۆ وەسفکردنی جۆرێك لەپەیوەندی شەڕانگێزی بەکارهێناوە کە دەشێت لەنێوان دایكو منداڵدا هەبێت.



**پەراوێزەکان:**


1- LAPLACHEJLA pulsion de mort. Paris,P.U.F ,1989,PP 19-21.

2- FREUDS"Les pulsions et leurs destines", tr fr. In Metapsychologie, Paris, Gallimard, 1952, p p. 25-66.

3- SEGAL H. Introduction a I'oeuvre de Melanie Klein, Paris, P.U.F , 1965, P,52.

4- KLEIN M., "Quelques conclusions theoriques au sujet de La via sentimentale des bebes". in les developpements de La psychanalyse , Paris , P.U.F, P.191 .

5- WINNICOTT D.W.,De la pediatrie a la psychanalyse, Paris, Payot , 1975, pp. 122-130.

6- LEMAIRE J-G, le couple: sa vie , sa mort , paris .payot, 1979, pp. 232-253.

7- RICHTER H.E., Parents enfantset nevrose. Tr fr, paris Mercure de France, 1972, p. 145.

8- STIERLIN H., Le premier entretion familial, te fr, paris, Delarge, 1979,p p.65-75.

9- RICHTER H.F., Psychanalyse de la famille, paris, Mercure de France, 1971, pp. 42-50.

10- FREUD S., Au-dela du principe de plaisir, in Essais de psychanalyse, paris, payot , 1920, pp. 210-216.

11- BERGERET J., La face cache de la famille: violence fondamentale primaire, in Dialogue 1982, No. 78,p p.52-60.

12- LEMAIRE J –G., Aux confines de la passio et de la psychose, in Dialogue, 1987. No 96 p. 23.

## بەشی پێنجەم

# قەیرانو دورکەوتنەوە لەبابەت

### هەڵلوشین بەهۆی بابەتی خۆشەویستییەوە:

لەچوارچێوەی پەیوەندی خۆشەویستیدا کێشبەندییەکی ئاڵۆز هەیە بەشێوەیەکی هەمەکی لەگەڵ واقیعی ئەڤینداریدا هاوجێ نابێت، ئەو کێشبەندییەش خۆی لەهەڵلوشین Absorbtion لەبابەتی خۆشەویستیدا، دەنوێنێت. پشکنینە کلینکییەکان لەم روخسارە وردبوونەتەوە کە تاك بەشێوەیەکی هەمەکی خۆی بەوی دیکە دەبەخشێت تا ئاستی فەنابوون lepuisement لەناو ئەوی دیکەدا، هەروەك بڵێی تاك هاوبەشەکەی لەخۆی پێ باشترە، بەهۆی خۆشەویستییەوە ئەوەی کە بەخۆی نابەخشێت بەو دەبەخشێت.

لەوە دەچێت ئەمجۆرە هەڵسوکەوتە دەگمەن نەبێتو لەچوارچێوەی قسەکانیشماندا سەبارەت بە کێشبەندی[1] خەمۆکی ئاماژەمان پێدا. لەهەندێك حاڵەتەکاندا زۆرێك لەتاکەکان هەستێکی نادیارو پەنهان باڵیان بەسەردا دەکێشێت، بەو شێوەیەی ستێرلن Stirlin[1] باسیکردووە ئەو کەسانە هەستدەکەن، بەرەسمی راسپێردراون کە بەها بە کەسانی دیکە ببەخشن، تەنانەت ئەگەر لەسەر حیسابی خۆشیان بێتو خۆیان وادەربخەن کە لەبەسەربردنی



ژیاندا بە تەنیاو بێ ئەوانی دیکە شکستدەهێنن، لەرێگەی ئەو یارمەتییەوە کە هاوبەشەکەیان پێیان دەبەخشێت لەگەڵ ئەو هاوبەشەدا بەرەو زیاتری"هەڵسەنگاندنی خود" رێدەکەن.

کەواتە ئەو سەرەتاو پرۆسانە چین کە لەم چوارچێوەیەدا بەکاردەهێنرێن؟

عەشق la passion وەك سەرەتایەکی زیاتر منداڵانەو دێرینتر بەکاردەهێنرێت، کە گشت ئارەزووەکانی تاكو روکارە سایکۆلۆژییەکان دەبزوێنێتو لەهەمانکاتدا بەها بە بابەتەکە دەدات: چونکە عەشق کە بەهای بابەتەکە بەرزدەکاتەوە لەهەمانکاتدا بەها بەتاك دەبەخشێتو، پەیوەندیی نارسیزمیی بەشێوەیەکی تایبەتی وێنادەکات. چەندە بابەتەکە (مەبەست لەبابەتی پەیوەندی نێوان دوو تاکەکەیە) گەشە بکاتو گەورە ببێت ئەوەندە ئەو تاکەش گەورە دەبێتو خۆی بەمەزن دەزانێت. چونکە لەسەرەتادا خۆی کردووە بەبابەتێك بۆ بابەتەکەی خۆی یان راستره بڵێین لەسەرەتادا بەهۆی بابەتەکەیەوەو بەتایبەتیش لەناو قوڵایی ئەو بابەتەوە بابەتێکی دروستکردووە.

لەدوای ئەوەی خۆی دەکاتە بابەتێك بۆ خۆشەویستیو بابەتێك بۆخستنەوەبەرفرمان Investissement دەتوانێت خودی خۆی وەك تاکێکی مرۆیی بەدیبهێنێت: هیچ کەسێك ناتوانێت بژی کە لەسەرەتادا خۆشەویست نەبێت یان نەبێتە بابەتێك بۆ خستنەوەبەرفرمان یان بایەخپێدانو سەرنجی سایکۆلۆژی لەلایەن کەسانی دیکەوە. هیچ کەسێك ناتوانێت کرانەوە لەژیانی سایکۆلۆژیدا بەدەستبهێنێت ئەگەر لەسەرەتادا خۆشەویستو

ناچیزو شیاو (ماقولْ) Pensable نەبێت (لەلایەن دایکەوە) یان دەبێت بەهۆی کەسێکی دیکەوە لەو بارودۆخانەدا ژیابێت. دەڵێین رق، چونکە رقلێبوون لەگەڵ ئەو خستنەوەبەرفرمانی خۆشەویستییەدا هاوکات دەبێت کە بونەوەری بایۆلۆژی بەهۆیەوە خودە مرۆییو تاکگەراییەکەی بەدیدەهێنێت.

بەمشێوەیە دەتوانین لەعەشق بڕوانین وەك هۆکارێك بۆ دانانی بەشێك لەخودی خۆمان کە رەتیدەکەینەوەو بەخراپی دادەنێین لەناو ئەو کەسەداو بەمەش لەزۆرێك لەرقوکینە رزگارمان دەبێت. بەڵام بەپێچەوانەوە دەشتوانین باشترین بەشی ناو خودی خۆمان لەناو ئەوی دیکەدا دابنێین: ئەمەش لەوکاتەدا کە دەترسین ئەو بەشە باشەمان لەدەستبچێت، لەبەرئەوە دەیدەین بەکەسێکی دیکە کە لەخۆمان زیاتر جێگەی متمانە بێتو زیاتر جەخت لەو بەشە باشەمان بکات، ئەو کەسە کە بەشە باشەکەمانی هەڵگرتووە وەك بابەتێکی نمونەیی دەژی لەگەڵ خستنەوەبەرفرمانێکی نارسیزمی بەهێزدا بۆی.

کارەکان وا بەڕێوەدەچن هەروەك بڵێی لای هەندێك کەس وەرگرتنی پاڵنەری مردن بەدینەیەت تەنیا لەرێگەی جۆرێك لەپەیوەندی دڵدارییەوە نەبێت کە لەرێگەیەوە تاك هەوڵدەدات بۆ ئەو مردنەی خۆی بۆ ئامادەدەکات بەهۆی دانانی باشترینو خۆشەویستترین بەشی خۆی لەناو ئەوی دیکەدا، بەهۆی ئەو پەیوەندیەوە بەشێوەیەکی رۆمانسییانە خۆی دەوڵەمەند دەکاتو درێژبوونەوەی نارسیزمی خۆی تێدا دەبینێتەوە: ئەمە پرۆسەیەکی هاوچەشنیکردنی خستنە پاڵییە Identification projective کە



تێیدا جوانترین بەشی خۆی بەبابەتی خۆشەویستییەکەی دەبەخشێتو ئەو بەشەش ئەوەیە کە لە دەستیدەدات، بەڵام لەبەرامبەردا وادەزانێت ئەو بەشەی پاراستووەو بەرگری لێکردووە.

کەواتە ئەمە سیفەتەکانی خۆشەویستییە کە تاك بتوانێت هەموو پرۆسە دێرینەکانی نەست بەکاربهێنێت بەتایبەتی ئەوانەی پەیوەندییان بە پاڵنەری مردنەوە هەیە. شاعیرو سۆفیستەکان گۆرانییان بۆ ئەم دیاردەیە چڕیووە کە ئەوانەی لەحاڵەتی خۆشەویستیدان بە شێوەیەکی نەستی لەدیاردەکەدا دەژین: "پێویستە ئەو گەشە بکاتو من بچوك ببمەوە یان کەم ببمەوە" ئەم هەستە لەخۆشەویستی باوانەوە نزیکە، چونکە بەشێوەیەکی رێژەیی بۆ دایكو باوك ئاسانە دەستبەرداری بەشێکی خۆیان بن لەپێناوی منداڵەکەیان کە لەرێگەی ئەوەوە ئەمان لەژیان بەردەوام دەبن. لێرەدا دەتوانین ئەوە بڵێین مۆدێلی یەکەمی پەیوەندی رۆمانسی نێوان گەورەکان لەو پەیوەندییەدایە کە لەبەرەبەیانی مرۆڤایەتییەوە دایکی بە منداڵەکەیەوە بەستۆتەوە.

توێژەرەوەکان لەکاتی قسەکردنییان لەسەر ئەو پەیوەندییە دوالیزمییەی کە دایكو منداڵ پێکەوە کۆدەکاتەوەو تێیدا فۆرمێکی تایبەتی لەبەخشینی نارسیزمی کە لەدایکەوە دەردەچێتو بۆ ژیانی منداڵەکە پێویستە، ئاماژەیان بەم شێوازە لەپەیوەندی داوە."

لەوەدەچێت لەهەندێککاتدا قوربانیدانی دایك لەپێناوی کرداری بەردەوامبوونی منداڵ لەژیاندا، پێویست بێت، هەروەك بڵێی بەم بەخشینە نارسیزمییەی چارەسەری نەبوونی توانای نارسیزمیی منداڵەکەی بکات"(٢).

بەپێی وینیکۆت winnicott [٣] دایکی باش ئەو دایکەیە کە بەشێوەیەکی نیگانمایی [ب]درك بەو کاتە گونجاوە بکات کە پێویستە چ کاتێك خۆراك بە منداڵەکەی بداتو چ کاتێکیش پێویستە خواردنی پێنەدات. ئەو دایکە پێش ئەوکاتە نەکەوێت کە منداڵ داوادەکات، واتە پێشبینی داوای منداڵ نەکات، بەڵام کاتێك منداڵ داواکەی دەخاتەڕوو ئامادە بێت بۆ بەجێهێنانی، ئەم دایکە منداڵ بەرەو ئەو وەهمکردنە دەبات کە خاوەن ئارەزوویەکی "توانا هەمەکییە" چونکە کاتێك ئەو منداڵە ئارەزووەکەی ئاشکرادەکات راستەوخۆ جێبەجێدەکرێت.

ئەم نواندنە ساکارە ئاماژە بەو بارە دەدات کە تاك لەدواییدا بەشێوەیەکی نەستی لەناویدا دەژی بەتایبەتی لەکاتی پەیوەندی هاوسەرێتیدا: واتە تاك هاوبەشێك بدۆزێتەوەو لێی تێبگاتو پێشبینی هەموو ئارەزووەکانی بکاتو بۆی جێبەجێبکات، ئەم هاوبەشە تەنیا رەزامەندییو تێربوون بۆئەو تاکە بەدینەهێنێت، بەڵکو جۆرێك لە"سەرسوڕمان"یش بەدیبهێنێت، بەمشێوەیە تاك دەتوانێت لەحاڵەتی هەستکردن بە "توانای هەمەکی" خۆیدا بژیو هەستبکات بەخۆشەویستییەکی "توانا هەمەکیی" دەورە دراوو لەئامێزگیراوە، بەمەش جیاکردنەوە distinction وندەبێتو جۆرێك لەئەزموونی سەرەتایی دووبارە دەبێتەوە. کە جۆرێکە لەپەیوەندی نێوان ناوەڕۆك ئامێز- ناوەڕۆك contenant–contenu [ج] کە سنوری نێوان دوو هاوبەشەکە نامێننو بەمەش ئەستەمە ئەوە جیابکرێتەوە کە کێ ناوەڕۆك ئامێز وکێ ناوەڕۆك دەنوێنێت، چونکە هەردووکیان بەنۆبە ئەم دوو رۆڵە دەبینن.



تێبینی دەکەین جۆرێك لەجیانەکردنەوە indistinction ی ڕێژەیی (من- moi) هەردوو هاوبەشەکە پێکەوە گرێدەدات هەروەك بڵێی بوارێکی خواستراو privilegie espace لەنێوانیاندا دروستبووە. ئەم بوارە گونجاوە بەتایبەتی تەرخانە بە خۆیان بیّ هیچ کەسێکی دیکەو دەتوانرێت بەبواری گواستنەوە transitionnel بچوێنرێت کە وینیکۆت winnicott [٤] قسەی لەسەرکردووە، ئەم بوارەش بەشێوەیەکە ئەستەمە (من-moi) لە (بەدەر لەمن- moi son from non moi)جیابکرێتەوە ئەم توانەوەیە fusion لەگەڵ ئیرۆسییەتێکی قوڵدا هاوکاتە، چونکە لەدەستدانی (من-moi) لەناو ئەوی دیکەدا نابێتە هۆی دروستکردنی دڵەڕاوکێو تاك دەتوانێت بژی هەروەك حاڵەتی لەدەستدانی ئەوی دیکە لەناو خودی خۆماندا. ئەم جۆرە توانەوەیە یان جیانەکردنەوەیە indistinction لەنێوان دوو هاوبەشەکەدا ئەو ئەزموونە دەنوێنێت کە هەردوو هاوبەشەکە لەکاتی ئۆرگازمی سێکسیدا orgasme دەژین.

ئەم هەڵوێستانە تەنیا چەند ساتێکی ناوازەنو لەگەڵ هەموو ئەزموونەکانی خۆشەویستیدا رێکناکەون، ئەم ساتانە بەشێوەیەکی نەستی ئەو عاشقانە تێیدا دەژین کە لەژێرساباتی غەریزەکانیاندا دەژین ئەویش لەڕێگەی ئەو یەکگرتنەیانەوە کە زوربەی ئاستەکانی بوونییان هاوبەش دەبن، ئەو ئاستانەی زیاتر لەجەستەییو سێکسوالەوە نزیکترن وەك لەو ئاستانەی لەژیانی ئەقڵییو کۆمەڵایەتییو رۆحیدا خۆیان دەنوێنن. ئەم ئەزموونە لەوانەیە هەندێجار لەچوارچێوەی ژیانی هاوسەرێتیدا لەکاتی یەکگرتنی (جووتبوونی) ژنو پیاودا تێبینی بکەین، کە ئەم ئەزموونە سۆزێك بۆ

یەکگرتنی کۆتایی دەنوێنێت ئەو یەکگرتنەی هەموو ئاستەکانی بوون دەسەلمێنێت‌و بۆ لای خۆی پەلکێشیان دەکات. ئەم یەکگرتنە یان جیانەکردنەوەیە Indistinction لەگەڵ ئەو هەموو تێربوونانەدا کە لەسەرەتادا لەوانەیە بۆ ئەو دووکەسەی دەستەبەر بکات، بەڵام لەدواییدا لەوانەیە ببێتە حاڵەتی نەخۆشیی‌و ئەمەش زۆرجار لەچوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتیدا دەیبینین.

## دڵەڕاوکێ بەرامبەر توانەوەی جیانەکراوە:

پێشتر روخسارە زیاتر باو و زیاتر ئیرۆسییەکانی مەسەلەی هەڵلوشینمان Absorbtion مان بەهۆی بابەت یان توانەوەی جیانەکراوە indistiction fusionnelle وە باسکرد. بەڵام لێرەدا دەرئەنجامە نێگەتیڤەکانی ئەم ئەزموونەی تاك تێیدا دەژی دەخەینە ڕوو. چونکە قەیرانە دوبارەبووەکان لەچوارچێوەی پەیوەندی خۆشەویستیدا لەوانەیە تاکەکان بەرەو هەوڵدان بۆ دیاریکردنی (من-moi) لای هەریەکەیان بەرێت‌و، هەروەها بەرەو هێندێك لەسەربەخۆبوونیش. ئەم ئەزموونە هاوژیانییە Symbiotique یان توانەوەیە تەنیا لەو سنورەدا بایەخی ئیرۆسی Erotique گەورەی هەیە کە تاکەکان دەتوانن بەرگەی بگرن‌و بەتایبەتیش لەسەرەتای پەیوەندییدا دەبێت.

زۆرکەس لەوانەی خاوەن بونیادێکی سایکۆلۆژیی لاوازن، ناتوانن بۆ عەدەم‌و ونبوون لەناو ئەوی دیکەدا بگەڕێنەوەو بەتایبەتیش لەکاتی ئۆرگازمی سێکسوالدا، چونکە ئەم حاڵەتە پێویستی بە



تەسلیمبوون بەوی دیکەو وازهێنان لەخود هەیە.

گەڕاندنەوە(گەڕانەوە) Regression [د] لەسەرەتای پەیوەندییدا دەشێت ڕووبدات‌و ئاسانیشە، بەڵام پەرەسەندنی ژیانی هاوسەرێتی‌و گیروگرفتەکانی لەوانەیە کاربکەنە سەر بەهێزکردنی کەشی دڵنیایی لەرووی نارسیزمییەوە، چونکە توانەوە دەبێتە مایەی دڵەڕاوکێ: هەڵلوشین Absorbtion بەهۆی ئەوی دیکەوە یان ونبوون لەوی دیکەدا دەشێت ڕووبدات تا ئەو کاتەی ئەویدی هاوجێیە لەگەڵ خود-دا، بەڵام کاتێك ئەویدی بەهۆی ئەزموونی ژیان نامۆ دەبێت بەوهاوبەشە، ئەوکاتە ئەوی دی دژی خود دەبێت‌و دڵەڕاوکێ دروستدەکات. کارەکە وا ڕوودەدات هەروەك بڵێی چی دیکە ئەم هاوبەشە ئەو پاڵپشتە نانوێنێت بۆ خستنەپاڵی-پرۆجێکشن projection ئەو بابەتە باشەی کە لەگەڵ خود-دا پێکەوەنوساوە، وایلێدێت هەروەك بڵێی دەبێتە پاڵپشت بۆ خستنەپاڵی بابەتی خراپی هەڵلوشراو Absorbtion چونکە (من-moi) دەترسێت بەهۆی ئەم بابەتەوە هەڵبلوشرێت لەبەرئەوە هەوڵدەدات دژی ئەم هەڵلوشینە بەرگری لەخۆی بکات .

ئەگەر مەترسی هەڵلوشین Absorbtion بەهۆی بابەتی خۆشەویستیەوە گەورە بوو، ئەو تاکەی هەست بەم مەترسییە دەکات سەر کێشییەکانی لەئەزموونێکی خۆشەویستیی بێ مەترسیدا، سنوردار دەکات، واتە ئەو ئەزموونانەی کە تاك دەتوانێت بەخێرایی سنورییان بۆ دابنێت لەمبارەدا ئەزموونەکانی لەپەیوەندییە سەرپێیەکاندا کورتدەکاتەوە. پێشتر ئەم کێشبەندییەمان لەکاتی هەڵبژاردنیی هاوسەرێتیدا باسکرد. هەندێك کەس خۆیان دەهاوێژنە

ناو سەرکێشی خۆشەویستییەکی قوڵو درێژخایەنەوە، بەڵام کاتێك بابەتەکە هەڵیدەڵوشێتو هەرەشە لەسەربەخۆیی (من– moi) لەو کەسانەدا دەکات ئەوا هەوڵی خۆقوتارکردنو بەرگریکردن لەخۆیان دەدەن بەشێوەیەك (من– moi) بەرێگەیەکی شەرانگێزییانە وەڵامدانەوەی دەبێت کە ئامانجی دورکەوتنەوە دەبێت لەبابەتەکە. ئەو کەسانە شەرانگێزییان بەرامبەر هاوبەشەکانیان ئاشکرادەکەن، لەرێگەی جیابوونەوە لەگەڵیاندا پەیوەندییان لەگەڵ وێنەی پێکەوەنوساوی هاوبەشەکەیان دەپچڕن، چونکە بابەتی خۆشەویستیی لەلایان بۆتە مەترسیی و لەوە دەترسن هەڵبلوشرێن. جیابوونەوە یان دورکەوتنەوە لەبابەتەکە (بابەت: خۆشەویستیی) لەرێگەی جیابوونەوە لەم بابەتەو لەرێگەی پاراستنی سەربەخۆبوونی (خود)وە دەبێت، هەروەها ئەو هاوبەشە ئامانجی ئازادبوون نییە لەبونیادی پەیوەندیی خۆشەویستیی و توندییەکەی. ئەمە جۆرێکە لەخۆرێکخستن و پلاندانان بۆ پاراستنی خۆی لەو پەیوەندییەو لەو هاوبەشە، چونکە ئەمەی دواییان وەك نمایندەیەکی سەرەکی ئەو پەیوەندییە دەردەکەوێت کە پەیوەندییەکە فشاری خستۆتەسەریی و داپۆشیوە یان ناڕەحەتیکردووە.

پشکنینە کلینکییەکان سەرنجی ئەو رۆڵە جیاوازانەیان داوە کە لەوانەیە وێنەی (هاوبەش)[٥] بیبینێت. ئەم وێنەی هاوبەشەکە لەوانەیە ببێتە پاڵپشت بۆ خستنەپاڵە شەرانگێزییەکانی تاك کە بەهۆیانەوە دەتوانێت بەرگری لەخۆی بکات. لەمبارەدا کارەکە لەوانەیە پەیوەندی بەو کارتێکەرە هەڵچوونییانەوە هەبێت کە پەیوەندییان بە بابەتە سەرەتاییەکانی (واتە باوان) تاکەوە هەبێتو



ئەو بابەتانەی کە پەیوەندییان بەو بارانەوە هەیە دەیخاتە پاڵ هاوبەشەکەی، یان دەیگوازێتەوە بۆی .

کەواتە ئەم هاوبەشە وەك "مەقاشی سوتانگە" بەکاردێت بۆ وەرگرتنی Recevoir خستنەپاڵە شەرانگێزییەکان. چونکە پەیوەندی لەگەڵ ئەم هاوبەشەدا مەترسیدار بووەو ناڕەزاییەك دژی ئەو هەڕەشەیەیی ئەم پەیوەندییە دەینوێنێت، روودەدات کە لەبناغەدا ئەو هەڕەشەیە لێکچووە لەگەڵ ئەو هەڕەشەیەی لەلایەن ئەو دایکەوە دەردەچێت کە خاوەنی توانایەکی هەمەکییە. بەدڵنیاییی ئەم ناڕەزاییە شێوەیەك لەبەتاڵکردنەوەی شەرانگێزی دژی ئەو هاوبەشە لەخۆیدەگرێت کە نمایندیەکی دەرکەوتووە لەپەیوەندییەکەداو ئەو هاوبەشەش کە هەست بە مەترسی دەکات، ئەوەیان یەکەمجار بۆ چارەسەرکردن دەڕوات و گلەیی لەدەست گۆڕانی خراپی هاوبەشەکەی دەکات و دەیەوێت بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا بەو شتانەوە پەیوەست بێت کە لەسەرەتای پەیوەندییەکەدا گونجاو بووەو نایەوێت درك بەهیچ نیشانەیەکی گۆڕان بکات کە لەوانەیە تووشی دڵەڕاوکێو ناڕەحەتی، بکەن.

F.N پیاوێك بوو تەمەنی چل ساڵ، ناچار بوو پەنا بۆ چارەسەرکردن بەرێت لەدوای ئەوەی بۆ ماوەیەکی دورودرێژ تووشی ئەکزیمای پێست بووبوو، ماوە ماوە لێی هەڵدەدایەوە، دواجار لەدوای نائومێدبوونیی لەچارەسەرکردنی ئەو ئەکزیمایە بڕوای بەوەهێنا کە نەخۆشییەکەی بۆ هۆکاری سایکۆلۆژیی دەگەڕێتەوە.

ئەو پیاوە خۆی دەیووت کە پەیوەندیی لەگەڵ ژنەکەیدا زۆر سروشتییەو، هەمیشە لەگەڵیدا تەبایە، بەڵام گلەیی ئەوەی لێی هەبوو

که ژنەکەی زۆر گرنگی دەدات بەوردبینی یان پێداچوونەوە بەهەموو شتێکداو دڵنیابوون لێی، واتە مەبەستی ئەوە بوو ژنەکەی لەشێوازی وەسوەسییەکانە.

شیکارەکان ئاشکرایان کرد F.N تووشی دڵەڕاوکێی هەمیشەیی بووە، هەروەها جۆرێك لەخەمۆکی پەنهان یان شاراوەشییان لەژنەکەیدا دۆزییەوە کە پیاوەکە لەسەریشی راهاتبوو. قۆناغی منداڵی F.N بەجۆرێك لەدژواریی و ئەشکەنجەدان جیادەکرایەوە، چونکە لەسەر دەستی دایکێکی هیلاك و دیکتاتۆردا پەروەردە بوو بوو، لەهەموو خوشك و براکانی بچوکتر بوو، لەبەرئەوە نازدار نەبوو.. وێڕای ئەوەی دایکی سیستمێکی پەروەردەیی توندوتیژی بەسەردا سەپاندبوو کە تا ئەوکاتە یادگارییە ئازاراوییەکانی ئەو مامەڵەیەی دایکی لای مابۆوە.

لەم کەشە بارگاوییەدا زیاتر لەجارێك هەوڵی خۆقوتارکردنیدا لەناوەندی خێزانیی و وازی لەقوتابخانە هێنا، دەستیکرد بەگەڕان بەشوێن کارێکداو لەدوای ماوەیەك توانی ژیانی خۆی رێکبخات و پیشەیەکی رێزدار بدۆزێتەوەو کچێکی گەنجیشی (ژنەکەی ئێستای) ناسی. ئەم کچە بەزیندوێتیی و خەسڵەتە مۆڕالییەکان ناسرابوو، بەڵام ئەویش بەدەست قۆناغێکی منداڵی لەبەریەکهەڵوەشاو دەیناڵاند، چونکە باوکی رقی لێی بوو، دایکیشی بەشێوەیەکی هەمیشەیی کەسێکی شەکەت و ونبوو.

پەیوەندی نێوانیان (واتە F.N و ژنەکەی) لەسەرەتادا، بە لەیەکگەیشتن و تەبایی هەمیشەیی ناسرابوو. ژنەکە بەشێوەیەکی بەردەوام لەماڵەوە کاریدەکرد، کاتێك هاوسەرەکەی لەکارەکەی



دەگەڕایەوە ژنەکە داوای لێدەکرد هەندێك ئیش و کار جێبەجێبکات، ئەویش بەوپەڕی رەزامەندی و گوێڕایەڵییەوە دەیکرد، بەڵام لەدوای تێپەڕینی ماوەیەك بەسەر پەیوەندییەکەیاندا، F.N وردە وردە لەداواکارییەکانی ژنەکەی رایدەکرد کە داواکارییەکانی بەئەستەم تەحەمول دەکران. پیاوەکە چی دیکە بەرگەی نەرم و نیانی ژنەکەی نەدەگرت، بەتایبەتی کاتێك هەستیکرد ئەم نەرم و نیانییە، مۆرکێکی خەمۆکی و ئومێدبڕاویی پێوەدیارە، هەستیدەکرد کە ژنەکەی زۆر پێوەی پابەندەو ئەمەش دڵەڕاوکێیەکی خۆیی بۆ دروستدەکرد. هەرچەندە ژنەکە زیاتر هۆگرو ئالودەی بوایە ئەو ئەوەندە زیاتر ئەکزیماکەی زیاد دەبوو تەشەنەی دەکرد.

لەسایەی ئەم بارودۆخەدا F.N نەیتوانی هیچ رێگە چارەیەك بۆ گیروگرفتەکەی بدۆزێتەوە: بەشێوەیەکی یەکلاییکەرەوە جیابوونەوەی لەژنەکەی رەتدەکردەوە کە زۆر ئالودەی بوو. لەدوای ماوەیەك لەشیکارکردنی، دەستی بە بەرەوپێشچوون کردو رای خۆی گۆڕی و وردەوردە رەخنەی لەداواکارییەکانی ژنەکەی دەگرت.

– بێگومان مەسەلەی هەڵلوشین بەهۆی بابەتی پێکەوەنوساو کێشبەندی سەرەکی بوونی مرۆیی دروستدەکات و ئارەزووکردنی توانەوەش چەند شێوەیەك وەردەگرێت: ئارەزووکردنی یەکگرتنی هەمەکی لەگەڵ کردگارو گەڕانەوە بۆ گشت یان عەدەم، بۆ نیرڤانا nirvana (ت)، قوربانیدان بەخود لەپێناوی خزمەت و سودی مرۆڤایەتیدا، ئەمانە باوترین فۆرمن لەم توانەوەیەدا کە لەچوارچێوەی پەیوەندی خۆشەویستیدا دەردەکەون.

ئارەزووکردنی توانەوە، هێزێکی بەرگریکار بەرامبەری

دەوەستێتەوە کە هەوڵی بەرگریکردن لەخود یان بەشێوەیەکی وردەکاری بەرگری لەنارسیزمی ئەو کەسە، دەکات. لەمبارەدا بەپێی گوزارشتەکەی پاچ pasche [٦] بزوتنەوەیەکی دیالکتیکی هەیە: لەلایەك تاك ئارەزوویییەکی هەیە بەرەو هەڵلوشین Absorbtion لەناو گشت یان عەدەمدا، دەبیات لەلایەکی دیکەوە ئارەزوویییەکی ئیروسی خودی یان نارسیزمی هەیە کە ئامانجی پارێزگاریکردنە لەژیان. کەواتە دەتوانین بڵێین لەقوڵایی پاڵنەرە مرۆییەکاندا جۆرێك لەیەکسانکردنی پێویست هەیە لەنێوان (نارسیزم و دژە نارسیزم) دا یان (ئەنتی نارسیزم– Narcissique et antinarcissique). ئەم بزوتنەوە دیالەکتیکییە زۆرجار لەچوارچێوەی پەیوەندی خۆشەویستیدا دەردەکەوێت، بەشێوەیەك تاك ئالودەبوون و پاشکۆیەتی تەواوی بۆ هاوبەشەکەی دەردەبڕێت و لەهەمانکاتدا هەوڵدەدات خۆی لێبپارێزێت و بەشێوەیەکی ئەندەکی سەربەخۆ بێت لێی .

بە روون و ئاشکرایی لەکاتی پشکنینە کلینکییەکاندا دژبەیەکی دیالکتیکی لەنێوان نارسیزم و ئەنتی نارسیزمدا تێبینی دەکرێت، چونکە تێبینی دەرکەوتنی جۆرێك لەبەرگریکردن لەلایەن تاکەوە دەکرێت کە ئامانجی رووبەڕووبوونەوەی توانەوە یان هەڵلوشینە بەهۆی بابەتەوە و گەڕانە بە شوێن شێوازێکی نوێ لەپەیوەندی کەرێگە بدات بە هێورکردنەوەی دووفاقی ئاڵۆوگۆڕکراو کە پەیوەستە بە خستنەوەبەرفرمانی لیبیدی ئاڵوگۆڕکراوەوە. گەیشتن بە رێگەچارەیەکی گونجاو کە هەردوو هاوبەشەکە پێی رازی بن: پێویستی بە گوزارشتکردنە (بەشێوەیەکی بێ زیان و ئازار)



لەشەڕانگێزی شاراوەی هەردوو هاوبەشەکەو دۆزینەوەی فرسەتێکە بۆ دورکەوتنەوە Distinciation لەیەکتری (وەك چالاکییەکانی دەرەوەو ئارەزوو پەیوەندییە سێکسوالەکانی دەرەوەی هاوسەرێتی) ئەمانە بەشی ئەوە دەکەن تاك لەدڵەڕاوکێ دامالن و پەیوەندییە دوانییەکەش (واتە پەیوەندی نێوان ژن و پیاوەکە) رووبەڕووی مەترسی نەبێتەوە.

لەچوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتیدا هەندێك دیاردەی گرنگ هەن کە شایەنی سەرنجدانن، بۆ نموونە تێبینی دەکرێت لەگەڵ بوونی رێککەوتن و پەیوەندیکردنی باشی نێوان دوو هاوبەشەکەو، هەروەها لەگەڵ ئەوەشدا کە هیچ جۆرە دیاردەیەکی نەخۆشی Pathologique لای هەریەك لەو دوو هاوبەشە، بەدیناکرێت، بەڵام شێوازی پەیوەستی نێوانیان بە شێوەیەکی بەهێز پشت بە هاوچەشنیکردنێکی چڕو توند، دەبەستێت: لەهەندێککاتدا کارەکان بەشێوەیەك بەڕێوەدەچن هەروەك بڵێی هەریەکە لەدوو هاوبەشەکە دەستبەرداری بوون و خودی خۆی دەبێت و خۆی دەبینێتەوە ناچارە ببێت بەوی دیکە یان ببێت بە بەشێك لێی. ئەمە جۆرێکە لەباڵبەسەرداکێشان Invasion یان دەرکەوتن لە ناو ئەوی دیکەدا، کە لاسەنگی و سەرکەوتنی ئەوی دیکە بەسەر (من–moi) دا، دەبەخشێت، یان بەگوزارشتێکی دیکە، ئەوی دیکە جێگەی (من–moi) دەگرێتەوە. لەنێوان ئەوەی کە "خۆت بیت" یان ببیت "بەوی دیکە"، ئەفزەلییەت بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە ببیت "بەوی دیکە".

ئاندریەو ماری هاوسەرێتییان کردووەو دوو منداڵییان هەیە، پەیوەندی نێوانییان هەر لەسەرەتاوە بەخۆشەویستی و رێککەوتن و

گۆڕینەوەی بیروڕای فەلسەفیی و سیاسی، ناسرابوو، هەریەکەیان هەستیدەکرد لەهەست و هەڵویستی بەرامبەرەکەی تێدەگات و، لەگەڵ ئەم هەموو مەرجانەدا لەسەر ئاستی سێکسوال بە دەست کۆمەڵێك گیروگرفتەوە دەیانناڵاند، ئەم گیروگرفتانە بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ بە هۆکار نادیاری مانەوەو بوو بووە سەرچاوەیەك بۆ دروستکردنی نارەحەتی و دڵەڕاوکێ بۆیان.

ماری هۆکای شکستهێنانی سێکسوالی نێوانیانی بۆ خۆی دەگەڕاندەوە، لەسەرئەوە راهاتبوو بەشێوەیەکی گریمانەیی Apriori هۆکاری هەموو شکستییەکان لەسەر ئاستی پەیوەندی هاوسەرێتی بۆ خۆی بگەڕێنێتەوە، هەر لەسەرەتاوە شەیدای هەستی سەرکەوتن و کبریای هاوسەرەکەی بوو، بەردەوام ئەم هەستانەی نەمردەکردو پایەی هاوسەرەکەی بەرزدەکردەوە.

هاوسەرەکەی لەلایەن خۆیەوە بە دەست گرێی خەسان Complex de castration دەیناڵاند و هۆکاری سەرەکی تێرنەبوونی سێکسوالی پیاوەکە، ئەم گرێیە بوو. هەرچەندە ماری هۆکاری نەخۆشی هاوسەرەکەی دەزانی، بەڵام بەشێوەیەکی نەستیی ئەمەی فەرامۆش دەکرد و هۆکارەکەی بۆ خۆی دەگەڕاندەوە. لەدوای ماوەیەك لەچارەسەرکردن پەیوەندی سێکسوالی نێوانیان وردەوردە بەرەو باشبوون چوو. ماری بە پێچەوانەی نەریتی خۆی لەکرداری سێکسوالیدا دەستپێشخەری دەکرد. بەڵام لەدوای ماوەیەك و بەشێوەیەکی کتوپڕ ئەم دەسپێشخەرییانەی وەستان، چونکە دەترسا لەروخساری ئاندریەدا هێمای لاوازی و شکستی بخوێنێتەوەو بە بڕوای خۆی ئەمە بارودۆخی سێکسوالی ئاندریە



خراپتر دەکات و وادەکات بکەوێتە بارێکی نێگەتیڤەوە.

شیکارکردن ئاشکرایکرد کە ماری هێشتا بەشێوەیەکی بەهێز لەگەڵ ئاندریەی هاوسەری هاوچەشنی Idetifiee دەکات و ئەو دەترسا لەوەی ئاندریە درك بەوەبکات کە ئەم خۆی هەستی پێدەکات، واتە هەستکردن بەنەبوونی وەڵامدانەوەی ورەی هاوبەشەکەی کە دەزانێت ئەو شکستەو ئەم بەتواناترە لەو (مەبەست لە شکستی پیاوەکەیە بەرامبەر بە باری سروشتی ژنەکە لەکرداری سێکسوالدا کە لەو سەرکەوتووترە). لەسایەی ئەم بارودۆخە دژوارو توانەوەیەدا Fusionnel، ژنەکە هەر زوو پێشتر هەستی بەو دڵەڕاوکێیە دەکرد کە بۆ هاوسەرەکەی دروستدەکات واتە (ئەگەر بە سروشتی لەکاتی پەیوەندی سێکسوالدا دەربکەوێت دەترسێت لەوەی ئاندریەیی هاوسەریی تووشی دڵەڕاوکێ ببێت- وەرگێڕ)، هەربۆیە بڕیاریدا لەو هەموو دڵەڕاوکێیە ببیەخشێت و واز لەهەموو دەستپێشخەرییەك بهێنێت. لەبەرئەوە بۆئەوەی لەهەر شکست بوونێك کە لەوانەیە روبدات خۆی بەدووربگرێت هەموو ئارەزووە خودییەکانی خۆی چەپاند. لەشیکارکردنەکەدا دەرکەوت کە درککردنی ماری بۆ ئەندریە ماوەی چەند ساڵێکە بە هیچ شێوەیەك، نەگۆڕاوەو، هەر ئەو شتانە دەخاتە پاڵی کە لەرۆژگارێکی دورودرێژەوە خستوونیەتە پاڵی. لەواقیعدا ئەندریە دڵەڕاوکێی بەوشێوەیە نەبووکە ماری دەیزانی، چونکە ئەو توانیبووی لە"گرێی خەسان" دەربچێت. بەڵام ماری هەر دڵەڕاوکێکەی خۆی دەخستە پاڵی و ئەمەش بوو بووە هۆی وەستاندنی دەستپێشخەرییەکانی لەپەیوەندی لەگەڵ ئەندریەدا.

ئەگەر شیکارکردنی کەسێتیی بۆ ئەندریەو ماری یارمەتی دابن بۆ بڕینی ئەو دڵەڕاوکێیەو بەتایبەتی "دڵە ڕاوکێی خەسان" لەپیاوەکەدا ئەوا لەئاستی پێویستدا نەبوو یان بەشی ئەوەی نەکرد ئەو بۆچوونەی کە هەریەکەیان بەرامبەر ئەوی بەرامبەری هەیەتی و هەڵیگرتووە، بیگۆڕێت. خستنەپاڵەکان– پرۆجێکشن Projections –ی ماری بۆ ئەندریە هەمان شتی دووبارە دەکردەوە هەر لەسەرەتای پەیوەندییەکەیانەوە، چونکە بۆچوونەکانی پێشووی بەرامبەر ئەندریە هیچ نەگۆڕابوون و پارێزگاری لەو رۆڵە دەکرد کە هەر لەسەرەتاوە پشتی پێبەستبوو: ماری زۆرکات مەیلی ئەوەی دەکرد هاوچەشنی لەگەڵ هاوسەرەکەیدا لەو دڵەڕاوکێ و شکستییەی کە هەستی پێدەکرد، بکات لەواقیعدا لەگەڵ هاوسەرەکەیدا هاوچەشنی ئەو دڵەڕاوکێیەی دەکرد کە هەڕەشەی خەسان و ئازاری لێدەکرد: بە مانایەکی دیکە دەتوانین بڵێین ماری خۆی لەدڵەڕاوکێ و نائارامی رزگارکردووەو خستوویەتییە پاڵ هاوسەرەکەی، پاشان جارێکی دیکە گەڕاوەتەوەو سەرلەنوێ هاوچەشنی لەگەڵدا کردۆتەوە.

لەواقیعدا زۆرێك لەو پەیوەندییانە هەن کە لەپەیوەندی نێوان ئەندریەو ماری دەچن و لەگەڵ بوونی رێککەوتن و تێگەیشتنی تەواو لەنێوانیاندا دەبینین هەوڵی جیابوونەوە لەگەڵ یەکتریدا دەدەن نەك بەهۆی "تێرنەبوونی نارسیزمییەوە" بەڵکو بەهۆی شکستهێنانییان لەگۆڕینی ئەو بۆچوونانەی هەریەکەیان دەیخەنە پاڵ ئەوی دیکەیان.



## دورکەوتنەوە لەبابەت وەك هۆکارێکی بەرگری:

یەکێك لەو روخسارانەی حاڵەتی ئەندریەو ماری ئاشکرایدەکەن و بەشێوەیەك لەشێوەکان لەزۆرێك لەپەیوەندییەکانی هاوسەرێتیدا بەدیدەکەین، بریتییە لەئەنجامدانی دورکەوتنەوەیەکی Distanciation ناوەکی لەنێوان دووهاوبەشەکەداو ئەویش لەئەنجامی هاوچەشنیی خستنەپاڵە Identifications projectives بەهێزو ئاڵوگۆڕکراوەکانی نێوانییان. زۆربەی کردارەکانی ئەم قەیرانە وەك چەند هەوڵێك دەردەکەون بۆ بە ئەنجامگەیاندنی ئەم دورکەوتنەوەیە کە بۆمانەوەو بەردەوامبوونی ژیانی سایکۆلۆژی دوو هاوبەشەکە، پێویستن: چونکە پەیوەندی هاوسەرێتیی و لەڕێگەی ئەو تێربوونانەوە کە بۆ هەریەك لەدوو هاوبەشەکە زامنی دەکات، تا ئاستێك ژن و پیاو بەشێوەیەك تیایدا دەژین کە هەڕەشەیە بۆسەر ناسنامەی خودی هەریەکەیان، بەتایبەتی لەو کەسانەدا کە لەرووی سایکۆلۆژییەوە لاوازن. لەمبارەدا کردارەکانی ئەم قەیرانە لەشێوەی هەوڵ و کۆششی هەریەکە لەو دوو هاوبەشە بۆ پاراستنی ناسنامەی خودی خۆیان دەردەکەوێت، ئەمەش بۆ رووبەڕووبوونەوەی ئەوەی هەستی پێدەکەن لەپەیوەندییەکەدا، وەك هەستکردن بەوەی کە هاوبەشی بەرامبەر باڵی بەسەر داکێشاوەو داگیریکردووە یان وریابوونەوەو راچەنین بەرامبەر ئەو باڵبەسەرداکێشانەی تاك بەرامبەر هاوبەشەکەی هەستی پێدەکات.

هەوڵەکانی دورکەوتنەوە لەوانەیە زۆرجار بەشێوەو نیشانەی جیاواز گوزارشتیان لێبکرێت، وەك: پەرچەکرداری هەڵچوونی توندوتیژ، بەتاڵکردنەوەی شەڕانگێزی لەناکاو، راکردن‌و سەرکێشییەکانی دەرەوەی چوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتیی، هەروەها زۆرکات شکستهێنان لەسەر ئاستێکی تایبەتی پەیوەندی دەردەکەوێت بەتایبەتی لەسەر ئاستی ژیانی سێکسوال.

ئەم نیشانانە لەزۆربەی پەیوەندییەکاندا دەردەکەون بێئەوەی هیچ کام لەو دوو هاوبەشە نەخۆشییەکی تایبەتییان هەبێت، کارەکە لێرەدا بەندە بە رێکخستنی تایبەتییەوە لەپەیوەندییەکەدا، چونکە توندوتۆڵی‌و بەهێزی پەیوەندی کە ئەو دوو هاوبەشە بەشێوەیەکی زیادەڕۆییانە هەستی پێدەکەن، دەبێتە هۆی سنوردارکردنی پەیوەندییەکە لەم ئاستەدا، واتە لەرێگەی دەرکەوتنی ئەم نیشانانەوە Symptomes کە ئاماژەمان پێدان.

پشکنینە کلینکییەکان ئاماژەیان بە گرژی ئەم کێشبەندییانە داوە تەنانەت لەچوارچێوەی ئەو پەیوەندییانەشدا کە بە دروست دادەنرێن کاتێك بەشێوەیەکی تایبەتی کردارەکانی هاوچەشنی خستنەپاڵ هەژموون بەسەر ئەو پەیوەندییانەدا دەگرن. ئامانج لەو خۆرێکخستنەی کە کەسی لاواز بەهۆی دورکەوتنەوە لەبابەتەکەوە: (واتە دوورکەوتنەوە لەبابەتی خۆشەویستی یان پەیوەندییەکە– وەرگێڕ) دەیگرێتەبەر، پارێزگاریکردنی سەربەخۆیی‌و یەکێتییەکەیەتی لەچوارچێوەی پەیوەندی بەتینی هاوسەرێتیدا، وەك: سەرکێشییە ئەڤینداریی‌و سێکسوالەکانی هەندێك کەس کە لەدەرەوەی پەیوەندی هاوسەرێتی، پەنای بۆ دەبەن، نابێت ئەمانە



بەشێوەیەك لێکبدرێنەوە کە هاوبەشە بنەڕەتییەکەی ئەو کەسە لاواز بووە یان بایەخی خۆی لەدەستداوە. بەڵکو ئەو کەسە لەم پەیوەندییانەدا ئامانجی خۆ قوتارکردنە لەداگیرکردن‌و باڵ بەسەرداکێشان لەلایەن ئەو هاوبەشە بنەڕەتییەی خۆیەوە، هەروەها پەیوەندی نوێی ئەو کەسە بەهەر کەسێکی دیکەوە بەسنورداری دەمێنێتەوە، چونکە ئەو کەسە لەلایەکەوە دەترسێت ئەم پەیوەندییە نوێیە بەرەو هەمان مەترسییەکانی ببات کە لەپەیوەندییە سەرەکییەکەی خۆیدا هەستی پێکردووە (لەوانەیە ئەو پەیوەندییە دەرەکییە هەندێجار ببێتە هۆی پوچەڵکردنەوەی پەیوەندی بنەڕەتیی‌و بەستنی پەیوەندی دووەم)، بەڵام ئەو هاوبەشە سەرکێشە ئەگەر بەشێوەیەکی ئەندەکیش بێت پەیوەندی لەگەڵ هاوبەشی بنەڕەتیی دەهێڵێتەوە ئەویش لەترسی ئەوەی نەك بەهۆی ئەو کەسە دەرەکییەوە (پەیوەندییە نوێیەکە) هەڵبلوشرێت. لەلایەکی دیکەشەوە دەیەوێت پارێزگاری لەنزمترین ئاستی پەیوەندییەکانی لەگەڵ هاوبەشی سەرەکیی یان بنەڕەتیدا بکات.

دەتوانین ئەم دیاردەیە لەگۆشەنیگای شیکارییەوەو پشتبەستن بە پەیوەندی نێوان ( دایك–منداڵ) رونبکەینەوە: منداڵ لەتوانایدا نییە رووبەڕووی مامەڵەی مشەخۆری دایکی‌و دەستێوەردانی لەکاروبارەکانیدا ببێتەوە، لەبەرئەوە بە جۆرەها رێگە وەڵامدانەوەی بەرامبەر بە دایکی دەبێت، وەك لەدەستدانی ئارەزووی نانخواردن یان رەتکردنەوەی خۆراك، بۆئەوەی بەرگری لەخۆی بکات، ئەوە رەتدەکاتەوە کە زۆر پێویستی پێیەتی، دەتوانین لەچوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتیشدا تێبینی ئەم دیاردەیە بکەین: کاتێك یەکێك

لەو دوو هاوبەشە (واتە ژن و پیاو) هەستدەکات هاوبەشەکەی بەرامبەری مشەخۆری دەکات لەسەریی و دەست لەهەموو کاروبارەکانی وەردەدا بەشێوەیەکی نەستی لەرێگەی راکردنەوە یان وەستاندنی مەیلی ئیرۆسی بەرامبەری، وەلامدانەوەی بۆی دەبێت. ئەم سەرەتایە دورکەوتنەوەیەکی هەلاواردەیی سێکسوال لەخۆدەگرێت (واتە تەنیا لە هاوبەشەکەی دوردەکەوێتەوە یان مەیلی نابێت بۆی). دورکەوتنەوەی سێکسوال لەوانەیە لەشێوەی سێکس ساردی Frigidite لە ژنداو پەککەوتنی سێکسی Impuissance لەپیاودا دەربکەوێت، کەواتە ئەم دورکەوتنەوەیە بۆ سروشتی پەیوەندی دوالیزمی نێوان ئەو دوو هاوبەشە دەگەڕێتەوە، بەتایبەتی ئەگەر یەکێك لەو دوو هاوبەشە هەستیکرد هاوبەشەکەی بەرامبەری لەچوارچێوەی کرداری ئالوگۆڕکردنی هاوچەشنی خستنەپاڵدا، داگیریدەکات و هەڵیدەلوشێت. وازهێنانی سێکسوال لەمبارەدا گوزارشت لەچوون بەرەو قەیرانی پەیوەندییەکە و هەوڵدانێکی نێگەتیڤ و ناسەرکەوتوو دەکات، لەپێناوی ئەنجامدانی دورکەوتنەوەی پێویست بۆ پارێزگارکردنی خود لەپەیوەندییەکی خۆشەویستی خنکێنەردا.

– لەوەدەچێت نەوەی نوێ درکییان بەم روانگەیە کردبێت و هەوڵیان دابێت بەباشی چارەسەری بکەن و لەبەرئەم هۆیەش زۆربەی گەنجەکانی ئەم سەردەمە سڵ لەپەیوەندی هاوسەرێتی درێژخایەن و مەترسییان بۆسەر ئازادی ناخی خۆیان، دەکەن. لەبەرئەوە هەوڵی بەستنی پەیوەندی ئازاد دەدەن کە ئامانجییان گۆڕینی شێوەی ئاشکراو یاسایی پەیوەندییەو ئەمەش یارمەتییان دەدات بۆ راکردن



لەگیروگرفتە قوڵەکانی کە هاوکاتن لەگەڵ گرێبەستی هاوسەرێتی یاساییدا، یان هەوڵی بەستنی ئەو پەیوەندییانە دەدەن کە بە ئاسانی بە تەلاق کۆتاییان پێدێت، بەمشێوەیە هەندێك لەئازادی خۆیان بەدەستدەهێنن کە لەپەیوەستبوونی قوڵ و ئەوەی هەڕەشە لەناسنامەی خودێتییان دەکات، رزگارییان دەبێت، لەکاتێکدا ئەو پەیوەندییە لەوانەیە بەو بابەتەوە بیانبەستێتەوە کە هەڵلوشەر و هەڕەشە ئامێزە.

## پەراوێزەکانی وەرگێڕ:

(ا) کێشبەندی: ئیشکالییەت

(ب) نیگانمایی: حدسی

(ج) ناوەڕۆك ئامێز: واتە ئەو بەشەی کە ناوەڕۆکەکەی هەڵگرتووە، یان تێیدایە.

(د) گەڕانەوە یان گەڕاندنەوە regression: (نکوص) گەڕانەوە بۆ قۆناغە زووەکانی گەشە دەگەیەنێت، لەکەسانی بەتەمەندا جۆرێك لە رەفتاری سەرەتاییو منداڵانە دەردەکەوێت، کاتێك تووشی ئەم حاڵەتە دەبن.

(ت) نیرڤانا nirvana: ئەوپەڕی سنورەکانی بەختەوەرییە لە رێگەی کوشتنی شەهوەتەکانی دەروونەوە.



## پەراوێزەکان:

1-LEMAIREJ-G.Aux confins de lapassion et de la psychose in Dialogue, 1987, No.96,p.23.
2-LEBOVICIS.," La theorie psychanalytique de la famille", in Lenfant dans la famille, Tomel, paris, 1970, pp. 5-11.
3-Ibid., p.123.
4-WINNICOTT D.W., Les processus de maturation chez lenfant, tr fr. Paris,payot, 1974, pp.40-60.
5-LEMAIREJ-G.,Les therapies de la couple.- paris, payot, 1970,pp.60-90.
6-PASCHEF.,"L antinarcissisme", in rev. france. psychoanal, 1965,T.XXIX,No.5-6,pp.503-518.

## بەشی شەشەم

# ئاوابوونی خۆشەویستی، نائومێدی، ماتەمینی دەروونی

### وەستانی ئایدیالیزەکردن و دووکەرتبوون:

گەڕانەوەی پاڵنەرە شەڕانگێزییەکان لەپەیوەندی لەگەڵ هاوبەشی ژیانـدا، لەبناغـەدا بـۆ پـچڕان و لەکاروەسـتانی ئایـدیالیزەکردن و دابەشـبوون، دەگەڕێتـەوە. چـونکە کاتێـك ئـەو هاوبەشـە خـۆی لاوازو ئومێـدبڕاو دەبێـت "قۆنـاغێکی ڕەخنـە"یـی نـوێ سـەرهەڵدەدات بـەو مانایـەی دابەشـبوونی تـەواو لـەنێوان بـاش و خراپـدا، نامێنێـت. ئـەم روخسارانە لەگەڵ گەڕانەوەی مەیلە دووفاقییەکانـدا (خۆشەویستی و ڕق) بەرامبەر بابەتەکە هاوکاتن.

دەتوانرێت ئەم "قۆناغە ڕەخنە"ییە لەگەڵ ئەو قۆناغـەدا، بـەراورد بکرێـت کەمنـداڵی شیرەخۆرە لـەباری خەمۆکیـدا، تێـی دەکـەوێت. لـەم قۆناغەداو لەژێر کاریگەریی کردارەکـانی پێکەوەلکانـدا integration منداڵ دەست بەدرککردنی دایك دەکات وەك کەسێکی تـەواو. ئـەویش لەرێگـــەی کۆکردنـــەوەی هـــەموو روخـــسارە ئەندەکییـــەکان، ئـــەم کۆکردنەوەیە ئالودەبوونێکی ڕاستەقینە لەنێوان خۆشەویستی و ڕقدا دەســـەپێنێت. بۆئـــەوەی ئەمـــەش رووبـــدات پێویـــستە بابـــەتی



خۆشەویـستیی شـادیبەخش بێـت، تـا هەڵـچوونە نوێیـەکانی دۆخـی خـەمۆکی لەدەوروپـشتی چـڕببنەوە، هـەروەها ئاشـکراکردنی مەیلـە دووفاقییەکان بەرامبەر بابەتەکە لـەمبارەدا شیاوە و ئەگـەری ڕوودانـی دەبێت.

کاتێـك منـداڵی شـیرەخۆرە بەشـێوەیەکی تـەواو دایکـی دەناسـێت مانـای وایـە (کەسـێکی ناسـیوە ژیـانی تایبـەتی خـۆیی و پەیوەنـدی تایبـەتی لەگـەڵ کەسانی دیکە هەیـەو لەوانەیـە ئەم کەسـە لەشـێوەی دڵەڕاوکێیـــەکی خەمۆکیـــدا لەدەســـتبدات، لەدەســـتدانی بابەتەکـــە مۆرکێکی هەمـەکی وەردەگرێت، چونکە منـداڵی شیرەخۆرە بەرامبـەر ئـــەم لەدەســـتدانە بەشـــێوەیەکی هـــاوجێی شـــعور بـــە هەســـتی دووفاقی "خۆشەویستی و ڕق" دەکات)[1].

لێــرەدا تێبــینی دەکــەین لێکــچوونێکی گــەورە لــەنێوان ئــەم ڕووداوانـەو ئـەو ڕووداوانـەدا هەیـە کـە لـەکاتی قۆنـاغی "ڕەخنـەیی" دوای قۆنـاغی مـانگی هەنگوینیـدا ڕوودەدەن، بەتایبـەتی لەکاتێکـدا یـــەکێك لـــەو دوو هاوبەشـــە بـــیر لـــەوازهێنان و دەســـتبەرداربوون لەئایـــدیالیزەکردنی بابەتەکـــە، دەکاتـــەوە یـــان تـــاکی بەرامبـــەری بەشـێوەیەك وەردەگرێـت کـەبوونێکی تایبـەت بـەخۆیی و سـەربەخۆیی خـۆی، هەیـە. بوژاندنـەوەی مەیلـە دووفاقییـەکان بەرامبـەر هاوبەشـی ژیان هەمیشە لەگـەڵ لەکاروەسـتانی "ئایـدیالیزەکردنی سـەرەتایی"دا هاوکـــات نابێـــت، ئـــەویش لەبەرئەوەیـــە فێڵـــە نەســـتییەکان Stratagemes کاردەکـــەن بـــۆ دەســـتبەردارنەبوون لـــەم ئایدیالیزەکردنـەدا. ئەگـەر مەیلـە دووفاقییـەکان بەرامبـەر هاوبەشـی بەرامبـەر ئـازارێکی خـۆیی بـۆ ئـەو هاوبەشـە دروسـتبکات، ئـەوا خـۆ

رزگارکردن لەم ئازارە لەرێگەی پشتگوێخستنی واقیعی یان حەقیقەتی ئەو هاوبەشەی بەرامبەرییەوە دەبێتو هەروەها هەموو سیفەتە باشەکانیش دەکاتە پاڵپشتی، ئەمەش مانای وایە "هاوبەشەکە" هەر بەباشی دەمێنێتەوە تەنانەت ئەگەر دانیشماننا بەو راستییەدا کە لەئاستی پێویستدا نییەو کەموکورتیی و هەڵەی خۆی، هەیە.

هەوڵە رێگەپێدراو یان شیاوەکان بۆ خۆبەدوورگرتن لە"لەدەستدانی ئایدیالیزەکردن" لەپزیشکی کلینکییدا چەندەها شێوە وەردەگرن، وەك:

١– دەتوانرێت روخسارە شەڕانگێزییە ئاراستەکراوەکان دژی یەك لایەنی هاوبەشەکە ئاراستە بکرێت. ئەو کەسە بۆئەوەی لەپەیوەندییەکی گونجاوو باشدا لەگەڵ هاوبەشەکەیدا بمێنێتەوە، هەمیشە تاك هەوڵدەدات دوو روخسار جیابکاتەوە: روخسارێکی گونجاو کە هەمیشە هەوڵدەدات پاڵپشتی بکاتو هەموو سیفەتە باشەکان بخاتە پاڵیی و روخسارێکی شەڕانگێزیی و ئومێدبڕاو کە ناخرێتەپاڵ هەمان هاوبەش. بەهۆی ئەم دابەشبوونە دوانییەوە dichotomie تاك هەموو مەیلە دووفاقییەکان بەرامبەر هاوبەشەکەی خۆی پشتگوێ، دەخات.

زۆرجار گوێمان لەهەندێك کەس دەبێت کە دەڵێن: "هاوبەشەکەم لەجەوهەردا زۆر باشە، بەڵام بۆ بەدبەختی تەنیا یەك کەموکورتی هەیە ئەویش هەڵەی خۆی نییە" یان دەوترێت "زۆر باش دەزانم خۆشی دەوێم، بەڵام لەهەندێك کاتدا زۆر هیلاکە، خەتای خۆی نییە، بەڵکو بەهۆی ئەو نۆرانەوەیە کە لەگەڵیدایە"، یان ئەوەش دەوترێت



"ئەو خۆی خراپ نییە، بەڵام مۆرك و سروشتی خۆی وایە، ئاگام لێی دەبێتو بایەخی پێدەدەم تا وەك جارانی لێدێتەوە". ئەم وتانە جەخت لەوە دەکەنەوە لای تاك هێشتا ئارەزوویەکی بەهێز بۆ پاراستنی ئەو "وێنە" باشە دەربارەی هاوبەشەکەی، هەیە لەگەڵ ئەگەری خستنەپاڵی بەرپرسیارێتی قەڵسکردنو نائومێدی بۆ لای فاکتەرە دەرەکییە گریمانەیی و ناڕاستەقینەکان.

لەناو ئەم چوارچێوەیەدا دەتوانین دوو کۆمەڵەی بەجۆرێك جیاواز دیاریبکەین: لەهەندێك حاڵەتدا بەشە خراپەکەی بابەتە لکێنراوەکە دەخرێتە پاڵ کردارە دەرەکییەکان. واتە تاك هیچ پەیوەندییەکی پێوە نامێنێت، چونکە زۆرێك لەهاوسەرەکان بەهانە بۆ ئەم دابەشبوونە دوالیزمییە دەهێننەوە ئەویش لەو رێگەیەوە کە رۆڵە خراپەکان دەخرێنە پاڵ خەسوو یان هەر کەسێکی دیکەی دەرەکی کە کاریگەریی لەسەر پەیوەندی هاوسەرێتی ئەو دوو هاوبەشە هەبێت: "ژنەکەم زۆر باشو نەرمو نیانە، بەڵام کێشەکە لای خەسوومە، هەمیشە دەستدەخاتە هەموو کاروبارێکییەوەو کاردەکاتە سەر هەڵسوکەوتی" خستنەڕووی ئەم جۆرە دابەشبوونە ئاسانە کە پشتدەبەستێت بە نکۆڵیکردنی پەیوەندی نێوان هاوبەشەکەو خێزانەکەی یان ئەو کەسانەی بەشێوەیەکی سەرەکی لە نەگونجاندنیان بەرپرسیارن.

– "هاوسەرەکەم پیاوێکی باشەو کارمەندێکی شارەزایشە، ئەو هەموو پێداویستییەکانی خێزانەکەمان دابیندەکاتو هیچ گلەییم لێی نەبووە، تەنیا یەك کێشە هەیە ئەویش، مەی خواردنەوەکەیەتی" لێرەدا ئاشکرایە کە ئەو فاکتەرە دەرەکییە (مەی)ـەو بەشێوەیەك

حیسابی بۆکراوە کەپەیوەست نییە بە خودی هاوبەشەکەوە.

- "من هیچ کاتێك بۆ هیچ شتێك لۆمەی هاوسەرەکەم ناکەم، ئەو زۆر بەباشی بایەخ بەمنداڵەکان دەدات.. تەنیا یەك شتی هەیە، ئەویش پیس و پۆخلییە، ئێوەش دەزانن هەموو خەڵك لەشاری خۆیاندا پیس و پۆخڵن". لێرە ئەو کەموکورتییەی لۆمەی لەسەردەکرێت بۆ فاکتەری دەرەکی واتە -ئینتمای رەچەڵەك- گەڕێندراوەتەوە، بەشێوەیەك حیسابی بۆکراوە کە لەدەرەوەی کاریگەری هاوسەرەکەیین. لێرەدا تێبینی دەکەین چۆن بەم رێگە تایبەتییە لەدابەشبوون جیاکردنەوەی دەمارگیریی شاراوە پاڵپشتێکی ناوەکی بۆخۆی دۆزیوەتەوە. ئەم جیاکردنەوەیە لەوانەیە بەشێوەیەکی توندوتیژ دەربکەوێت تەنانەت لەو کەسانەشدا کە بەوە رازیبوون یان ویستوویانە هاوبەشی ژیانیان لەکۆمەڵێکی رەچەڵەك جیاواز لە کۆمەڵەکەی خۆیان هەڵبژێرن. هەروەها بێ قسەکردن لەسەر کاریگەری رەچەڵەکیی یان کولتووریی، دەشێت ئەم جیاکردنەوەیە تەنانەت لەناو گروپە لەیەکچووەکانیشداو لەهەمان رەچەڵەکیشدا، روویدات.

ویڕای ئەم فاکتەرانە، لەوانەیە ئەو دوو هاوسەرە هەندێجار پەنا ببنە بەر منداڵەکانیان و رۆڵی خراپ بدەنە پاڵ ئەوان، لەوانەیە یەکێك لەو دوو هاوبەشە شەڕانگێزیی خۆی ئاراستەی منداڵەکانی بکات، ئەویش لەپێناوی پاراستنی پەیوەندی توندوتۆڵیی، بە هاوسەرەکەیەوە.

- P.G لەهەوڵدانیدا بۆ بەهانەهێنانەوەی رەتکردنەوەی چارەسەرکردن و پشتگوێخستنی ئاژاوەکانی پەیوەندیی هاوسەرێتی،



وتی: "ئێمە کە بەتەنیا دەبین هیچ کاتێك شەڕناکەین، کەمنداڵەکان لەقوتابخانە دەبن ئێمە زۆر باش لەیەکتری تێدەگەین و جوانترین کاتی خۆمان بەسەردەبەین، من لەسەر هیچ شتێك لۆمەی ناکەم تەنیا یەك گیروگرفتمان هەیە: ئەویش منداڵەکانە کەمێشکی دەوروژێنن".

شەڕانگێزی بەرامبەر منداڵ لەرێگەی خستنەپاڵی Projection قەڵس و ناچیز -ەوە، بەشێوەیەکی بارگاویکراو دەمێنێتەوە، ئەم شەڕانگێزییە لەوانەیە بەحاڵەتی کێبڕکێوە پەیوەست بێت و ببێتە هۆی گەڕانەوەی دۆخی ئۆدیبی.

- لەهەندێککاتدا دابەشکردنی دوالیزمی لەسەر ئەو خەسڵەتانەی کە تایبەتن بەهاوبەشەکە چڕدەبێتەوە، بۆنموونە یەکێك لەدوو هاوبەشەکە، نائومێدییەك دەخاتە پاڵ تەندروستی هاوبەشەکەی و ئەویش لەپێناوی پاراستنی وێنە ئایدیالیزەکراوەکەی idealise خۆیدا، زۆرجار بانگەشەی ئەوە دەکات کە هۆکاری نائومێدییەکە بۆ ئەو خەمۆکییە یان نەخۆشییە بایۆلۆژییە دەگەڕێتەوە کە تووشی هاوبەشەکەی بووە بێئەوەی ئەم هۆکارانە بەخودی هاوبەشەکەیەوە پەیوەست بکات. ئەو کەسە دەیەوێت لەهاوبەشەکەیدا روخسارێکی باش و روخسارێکی خراپ جیابکاتەوە، لەزۆربەی حاڵەتەکاندا یەکێك لەدوو هاوبەشەکە ئەوە رەتدەکاتەوە کە هاوبەشەکەی بۆ لای پزیشك بەرێت هەرچەندە نائومێدبوونەکەشی بۆ هۆکاری تەندروستی دەگەڕێنێتەوە، بەمەش هۆکاری سەرەکی بەدحاڵیبوونیان لەیەکتری، پشتگوێدەخات.

٢- هەندێجار کردارەکانی "دابەشکردنی دووالیزمی" لەوانەیە ببنە هۆی گرتنەبەری رەفتارێکی خاوەنداریێتی توندوتیژ لای ئەو

هاوبەشە، لەبناغەدا ئەم رەفتاری خاوەندارێتییە ئامانجی دانانی ئەو هاوبەشەیە بەشێوەیەکی یان لەبارێکی فەنتازیادا بێ باسکردنو کاریگەریی کەسانی دیکە، چونکە کاتێك یەکێك لەدوو هاوبەشەکە هەستدەکات هاوبەشەکەی شکستییەك دەخاتەروو یان شکستییەکی پێوەدیار دەبێت، هەوڵدەدات لەهەموو ئەو شتانە جیابکاتەوە کە لەوانەیە لەقەڵسبوونی بەرپرس بن: جیاکردنەوەی لەخێزانەکەیی و لەمنداڵەکانیی، یان لەو کەسانەی کە کاریگەری خراپیان بۆ سەر پەیوەندی هاوسەرێتیی نێوانیان، هەیە.

ئەوەش روودەدات، یەکێك لەدوو هاوبەشەکە تەسلیمی ئارەزووەکانی هاوبەشەکەی بەرامبەری دەبێت: تێبینی دابەشکردنی رۆڵەکان لەنێوان هاوبەشەکاندا بیرۆکەیەکی ئاشکرامان دەربارەی ئەو هاوبەشە پێدەبەخشێت کەرۆڵی کۆنترۆڵو خاوەندارێتیکردن، دەبینێت، چونکە رۆڵی ئاراستە نیشاندەر دەبینێت بۆ هاوبەشی بەرامبەر کە لە خۆی لاوازترە: ئەو هەوڵدەدات هاوبەشەکەی ملکەچببێتو ئەویش راکانی خۆی بەسەردا بسەپێنێتو لەهەمانکاتدا کاریش دەکات بۆ بەهێزکردنی ئایدیالیزەکردن، ئەو هەمیشە هەوڵدەدات خراپەی خێزانو هاورێکانی بۆ ئاشکرابکات. بە تێپەربوونی کات ئەو هاوبەشەی بەرامبەر، ملکەچدەبێتو رەفتاری خاوەندارێتیی ئەمیش زیاددەبێت.

٣- هەوڵدان بۆ پاراستنی وێنەیەکی گونجاوی ئەو هاوبەشە لەناو خود-دا لەوانەیە لەهەندێککاتدا شێوەی بەتاڵکردنەوەیەکی شەرانگێزی بەتایبەتی بەرامبەر ئەو هاوبەشە وەربگرێت، بەلام ئەم بەتاڵکردنەوە شەرانگێزییە دەشێت بەو شێوەیە خوێندنەوەی بۆ



بکرێت کە ئامانجی چەوساندنەوەی ئەو هاوبەشە نییە، بەڵکو ئامانجی رۆشنبیرکردنیی و راستکردنەوەی رەفتارەکانییەتی و بۆئەوەی ئەم هاوبەشە بەباشو شیاوی بمێنێتەوە پێویستە بەشێوەیەکی ریشەیی هەڵەکانی بۆ راستبکرێتەوە. لەمبارەدا ئەوەندە بەس نییە ئەم هاوبەشە لەهەر شتێك دووربخرێتەوە کە پێی قەڵس دەبێت، بەڵکو پێویستە هەموو سیفەتو لایەنێکی خراپیشی رەتبکرێتەوە (روخسارو رەفتارو رێگەی قسەکردنو شێوازی مامەڵەکردنی، لەگەڵ کەسانی دیکە).

گرتنەبەری ئەم جۆرە رەفتارە کە رەفتارێکی رێککەرەوەی پەردەپۆشکراوە لەزۆربەی حاڵەتەکاندا لای هەردوو هاوبەشەکە فۆرمێکی خۆپارێزی وەردەگرێت: لەوانەیە یەکێك لەو دوو هاوبەشە بەشوێن مەیلە لادراوەکانی هاوبەشەکەی بەرامبەریدا، بگەرێتو هەوڵی راستکردنەوەیان بدات. ئەم هاوبەشە هەستدەکات ئەو مەیلانە زۆرباش لەخۆیدا دەچەپێنێت کاتێك لە هاوبەشەکەیدا ئاشکرایدەکاتو هەوڵدەدات بەو مەیلە لادراوانە تۆمەتباری بکات. بەمشێوەیە ئەو روخسارە خراپە رەتکراوانەی ناو خودی خۆی دەخاتە پاڵ هاوبەشەکەی.

## وەستانی جەختلێکردنەوەی ئاڵوگۆڕکراو:

لەچوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتیدا روخساری نەخۆشیهێن- پاسۆلۆژی- pathlogiques هەیە، تایبەتە بەهاندانی ئاڵوگۆڕکراو Induction Mutuelle کە لەهەندێك لە پەیوەندییەکاندا

دەردەکەوێت، بەتایبەتی لەو پەیوەندییانەدا کەجۆرێك لەهاوچەشنی ئالوگۆڕاوو تیژو متمانەپێکراو تێیدا پەرەدەسەنێت. لەم جۆرە پەیوەندییانەدا شێوەیەك لەپەیوەندیکردن تێیدا روودەدات کەجۆرێك لە رقلێبوونەوەی دووانیdoubles contraintes لەخۆدەگرێت و زۆرجار بەمشێوەیە دەبێت: "من ئازار دەچێژم لەبەرئەوەی تۆ ئازار دەچێژیت". بەرامبەر بەمە ئەو کەسە وەلامدەداتەوە: "من بەو شتانە ئازاردەچێژم کەئەو ئازارییان بەدەستەوە دەچێژێت".. هتد لەهەندێك حالەتدا کێشە لەپەیوەندیکردندا نییە، بەڵکو لەهاوبەشیکردن لەئازار یان توانەوەی راستەقینەدایە کە کردارەکانی هاوچەشنی خستنەپاڵ و پێکەوەنووسان یەکدەگرن. لەم جۆرە حالەتانەداو سەبارەت بەم دۆخی نەخۆشییانە جۆرێك لە "خۆپەرستی" لای یەکێك لەو دوو هاوبەشە فۆرمەلە دەبێت کە بەهۆیەوە دەتوانێت بەتەنیا لەم زیندانە بێتە دەرەوەو لەم هاوچەشنییە کوشندەیە، رزگاری بێت کە هاوبەشەکەی بەرامبەری دروستییکردووە: ئەم خۆپەرستییە رێگە بەیەکێك لەو دوو هاوبەشە دەدات بەدەر لەهاوبەشەکەی دی، لەبارێکی ئاسوودەدا بێت بەمەش هاوبەشی بەرامبەر بەدڵخۆشی دەیبینێت و لەمکاتەشدا هاوبەشە ئاسوودەکە دەستبەرداری ئەو بیرکردنەوەیە دەبێت کە خۆی تۆمەتباربکات بەوەی هۆکاری ئازارەکانی هاوبەشەکەیەتی. ئەم گیروگرفتانە لەوانەیە بەو حالەتانە بەراوردبکرێن کەپێشتر باسمانکردن، کاتێك (من-moi) بەهۆی بابەتەکەوە (واتە بابەتی خۆشەویستی یان پەیوەندییەکە) هەڵدەلوشرێت و سەربەخۆبوونی دوو هاوبەشەکە گەمارۆ دەدرێت یان بە"منی هاوبەش" دەورە دەدرێت، بەشێوەیەك



(من-moi) لەهەموو بەشەکانی "منی تاکێتی" لەهەر هاوبەشێکیاندا جیادەکرێتەوە.

لێکۆڵینەوەی کردارەکانی ئەم قەیرانە یارمەتیدەر دەبن لەدرکپێکردنی جەوهەری بزاوتی خۆشەویستییداو ئەوانەش کە ئەم خۆشەویستییە بۆ تاك لەخۆیدەگرێت. پێشتر ئاماژەماندا بەو سوودە نارسیزمییانەی کە لەوانەیە پەیوەندی خۆشەویستیی بۆ تاکی دەستەبەربکات. بێگومان "جەختلێکردنەوەی ئالووگۆڕکراو" confirmation mutuelle لەسەر بناغەی ئەم سوودانە رێکدەخرێت: کاتێك تاك هەستدەکات بۆتە بابەتی خۆشەویستیی کەسێکی دیکە یان لەلایەن کەسێکی دیکەوە خۆشویستراوە ئەوا لەوانەیە ئەمە جەخت لەبەهای خودێتیەکەی بکات و بۆئەوەی ئەم جەختلێکردنەوەیە تێرو تەواو بێت، پێویستە ئەوی بەرامبەر خۆی ببێتە بابەتی بەهاکەو ئەمیش پشتی پێ ببەستێت و لەوەش زیاتر خۆشویستراو بێت و حیسابی بۆبکرێت.

ئەو شتەی لەکاتی قەیراندا روودەدات جۆرێکە لەگومانی قووڵ و هەمیشەیی دەربارەی بەهای بابەتگەراییانەی ئەوی بەرامبەر کە تەکلیفکراوە بەزامنکردنی جەختلێکردنەوەی خود بەشێوەیەکی تەواوو هەمیشەیی و لەمبارەدا دەترسێت جەختلێکردنەوەی ئالوگۆڕکراو disconfirmation mutuelle لەکارکردن بوەستێت.

N.B بەوپەڕی رێککەوتنەوە لەگەڵ ژنەکەیدا دەژیاو پێکەوە چالاکییە رۆشنبیریی و کۆمەلایەتییەکانیان پراکتیزە دەکردو لەگەڵ ئەو گیروگرفتانەشدا کە رووبەڕوویان دەبۆوە، پەیوەندی نێوانیان بەچەسپاوی و توندوتۆڵی مایەوە.

N.B لەگەڵ کۆمەڵێك کچی گەنجی هەرزەکاردا کاریدەکرد. لەم دۆخە وروژێنەرەدا ویستی پەیوەندییەکی سێکسوالی لەگەڵ یەکێکیاندا ببەستێت، ئارەزووکردنی بۆ بەستنی ئەو پەیوەندییە لەبناغەدا بۆ گیروگرفتی تایبەتی قۆناغی منداڵی دەگەڕایەوە کە پەیوەندی بە "گرێی خەسان" ـەوە هەبوو، ئەمە پاڵی پێوەنا لەتوانای خۆی بکۆڵێتەوەو لێی دڵنیابێت، سەرەتا بەوروژاندنو کارتێکردنی ئەو کچە کە سەراسام بێت پێیو خۆشی بوێت دواتریش دەیویست پیاوەتی خۆی بسەلمێنێت. ئەو پێی وابوو ئەم پەیوەندییە لەچوارچێوە بەرتەسکەکەیدا بەسنوورداری دەمێنێتەوەو کارناکاتە سەر پەیوەندیی هاوسەرێتیی لەگەڵ ژنەکەیدا. ئارەزووی دەکرد پەیوەندی ببەستێت، بەڵام دەترسا پەیوەندی بەتینی لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بلەقێت. لەدوای ماوەیەك ئەم مەسەلەیەی بەژنەکەی وت. ژنەکە لەلای خۆیەوە هیچ هەڵوێستێکی شەڕانگێزی بەرامبەری دەرنەبڕی، لەبەرئەوە بەتاڵکردنەوەی ئەو شەڕانگێزییە بۆخۆی گەڕایەوەو بوو بەهۆی تووشبوونی بەحاڵەتێکی خەمۆکی توند.

ئەو پەیوەندییە بەتینەی کەپشتی بەهاوچەشنی بەستبوو پاڵینا بەپیاوەکەوە وابیربکاتەوە کە لەهەرەسهێنانی هاوسەرەکەی بەرپرسە، ئەم بیرکردنەوەیە وردە وردە بەرەو خەمۆکی برد، پیاوەکە هەرەسیهێنا، چونکە ئەوی بەهەرەسهێنراوی بینی یان بەمانایەکی دی، هەستیکرد کە ئەو لەهەرەسهێنانی هاوسەرەکەی بەرپرسە.

دانپێدانانی پیاوەکە واتە N.B بەگوناهەکەیدا، کەمێك یارمەتی ژنەکەیدا کە لەو دۆخە خەمۆکییە رزگاری ببێت: دەستیکرد بە بایەخدان بەپیاوەکەییو قەناعەت پێهێنانی کە ئەو گوناهبار نییەو



ئەمەش لەپێناوی گەڕانەوەی متمانەکردن بەخۆی. بەڵام ئەم واقیعە زۆر درێژەی نەکێشا، چونکە ژنەکە سەرلەنوێ هەرەسیهێنایەوە.

شیکارەکان ئاشکرایانکرد کە ئەو ژنە چیدی ناتوانێت پشت بەکەسێکی لاوازو راڕا ببەستێت، کە ئەو کەسە بەهیچ شێوەیەك لەگەڵ ئەو وێنە پێکەوەنووساوەدا interiorisee واتە وێنەی کەسێکی بەهێزو ئارامو جێگیر هاوجێ نابێت.

هەرچی پیاوەکەشە لەلایەن خۆیەوە دڵنیانەبوو لەتوانای بۆ خۆشەویستی، چونکە خۆی بە بەرپرسی هەرەسهێنانی ژنەکەی دەزانی، شیکارەکە لەدواییدا ئاشکرایکرد کە هەڵبژاردنی هەریەکەیان بۆئەوی دی لەسەرەتادا پشتی بەکێشبەندی "ململانێ دژی خەمۆکی" بەستووە، چونکە هەریەکێکیان لەوی دیکەدا پاڵپشتێکی دۆزیوەتەوە یارمەتیبدات بۆ بەرگریکردن بەرامبەر ئەم ململانێیەو هەریەکەیان هەستی بەبەهای خودێتی خۆیکردووە، چونکە خۆشەویستراو بووەو توانای خۆشەویستیی هەبووە.

هەڵسوکەوتی پیاوەکە لەمبارەدا لەوانەیە مانای جیاوازی هەبێت: بۆنموونە لەڕووبەڕووبوونەوەی کێشەبەندی خەساندا توانی سەرلەنوێ جەخت لەخودی خۆی بکاتەوە، هەروەها ئەو پەیوەندییەی لەدەرەوەی پەیوەندی هاوسەرێتی هەیبوو، ڕێگەی پێدا لەتوانای بۆ سەرسامکردنی کەسانی دیو بەدەستهێنانی خۆشەویستییان دڵنیابێتو لەدەرەوەی چوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتییشدا خۆشویستراوبێت، ژنەکە لەبەرامبەر ئەم هەڵسوکەوتەی پیاوەکەیدا لەباری لەدەستدانی بەهاو لاوازی مەعنەویدا، ژیا (واتە هەستی بە لاوازی مەعنەویو لەدەستدانی

بەهای خۆی لای هاوسەرەکەی دەکرد– وەرگێر).

– دەتوانرێت بە بەکارهێنانی گوزارشتی رۆڵ یان ئەرك، کردارەکانی processus ئەم پەیوەندییە لێکبدرێنەوە. هەروەك بڵێی لەهەڵبژاردنی ئاڵوگۆڕکراوی ئەو دوو هاوبەشەدا ئەرکێکی شاراوە یان "گرێبەستێکی نەنوسراو"[٢] هەیە، بەهۆی ئەرکێکی مۆرالی تایبەتییەوە پاڵ بەهەریەکە لەو دوو هاوبەشەوە دەنێت دڵنەوایی بەرامبەرەکەی بکات، ئەویش لەرێگەی ئەوەوە ئەو هەستەی پێببەخشێت کە بابەتی خۆشەویستیی و رێزە لەلای.

ئەم حاڵەتە ئەو پەیوەندییە دەسەلمێنێت کە لەنێوان ژیانی خۆشەویستیی یان شێوازی پەیوەندی هاوسەرێتیی و ململانێ دژی پاڵنەری مردندا، هەیە. تێبینیکردنی وردی زۆربەی پەیوەندییەکان کرژی ئەم جۆرە لەوەستانی یان لەکارکەوتنی جەختلێکردنی ئاڵوگۆڕکراو ئاشکرادەکات. گوزارشتکردن لەم "لەکار وەستانی جەختلێکردنەوەیە" هەندێجار بە پەردەپۆشکراوی دەمێنێتەوە یان بەهۆی کۆمەڵێك پاساوو هزری وەرگیراو لەکرۆکی ژیانی رۆژانەوە یان بەهۆی رێکخستنی کولتورییەوە دەمامکپۆشکراوە. تێکچڕژانی پاساوەکان دەبنە هۆی روودانی کرداری نادیارو شێواو کە رێگە لەدوو هاوبەشەکە دەگرن لەشێوازی کارلێکردنی نێوانیان و ئەگەری دەرچوون یان خلیسکان لەو پەیوەندییە، تێبگەن.

لەحاڵەتی هەڵوەشاندنەوەی پەیوەندیدا، بەشێوەیەکی هێواش و هێدی هێدی جەختلێکردنەوەی ئاڵوگۆڕکراو لای هەندێك کەس لەکاردەکەوێت و پەیوەندیکردن بچووك دەبێتەوەو ئاڵوگۆڕکردنی سۆزداری دەوەستێت. هاوسەنگی لەنێوان دوو هاوبەشدا بەدینایەت



تەنیا لەسەر حیسابی جۆرێك لەکەمتەرخەمی نەبێت بەرامبەر بەیەکتری. بەمشێوەیە تەنانەت ئەگەر ئەم هاوسەنگییە رێژەییە بەجۆرێکیش بەردەوام بێت، پەیوەندییەکە هەر وردە وردە خامۆش دەبێت و هەست بەئارەزوویەکی ئاڵوگۆڕکراو بۆ جیابوونەوە دەکەن، چونکە چیدی بەرگەی ژیانی هاوبەش ناگرن.

– هەندێجار تێبینی دەکرێت سەرکێشی سۆزداری کەیەکێك لەو دوو هاوبەشە لەدەرەوەی پەیوەندی هاوسەرێتیدا، دەیکات لەوانەیە کاریگەریی پۆزەتیڤی لەسەر بەردەوامبوونی پەیوەندی نێوانیان، هەبێت. چونکە ئەو کەسە نامۆیەی دەرەوەی ئەو پەیوەندییە لەوانەیە جەختلێکردنەوە لەنارسیزم بۆ ئەو کەسە زامن بکات کە لەدەرەوەی هاوسەرێتی پەیوەندی دەبەستێت، لەکاتێکدا کە هاوبەشەکەی خۆی ناتوانێت ئەوەی بۆبکات. ئەو هاوبەشەی خیانەت دەکات لەرێگەی ئەم سەرکێشییەوە بڕوای بەخۆی و توانای خۆی بۆ کێشکردنی ئارەزووی خۆشەویستیی هەیە، لەوەش دڵنیادەبێت کە کەسێکی خۆشویستراوو ئایدیالیزەکراوە idealise ئەمەش بەهۆی ئەو کەسە نامۆیەی دەرەوەی پەیوەندی هاوسەرێتیی. بەمشێوەیە دڵخۆش دەبێت و دەتوانێت هاوبەشەکەی خۆی رازیبکات و یارمەتیبدات، لەمبارەدا جەختلێکردنەوەی ئاڵوگۆڕکراو لەنێوان دوو هاوبەشەکەدا دەگەڕێتەوە.

دواجار"وەستانی جەختلێکردنەوەی ئاڵووگۆڕکراو" کە بەهۆی قەیرانێکی دیاریکراوەوە روودەدات وەك حاڵەتێکی سەرەکی لەناو پەیوەندیدا نەك رووداوێکی نەخۆشی (پاسۆلۆژی) یان حاڵەتێکی شاز، سەرهەڵدەدات زۆرکات بەشێوەیەکی نەرم

ڕوودەدات‌و هەردوو هاوبەشەکە دەتوانن بەشێوەیەکی هێدی هێدی سەرلەنوێ پەیوەستی نێوانیان سیستماتیک بکەنەوەو هەندێجاریش بەشێوەیەکی نۆرەیی، ڕوودەدات: یەکێك لەدوو هاوبەشەکە پشت بەهاوبەشەکەی دی دەبەستێت تا قۆناغی خەمۆکی دەبڕێت‌و ئەو ماتەمینی دەروونییە، بەڕێوەدەبات. لەهەندێك حاڵەتیشدا بەشێوەیەکی توند جەختلێکردنەوەی ئاڵوگۆڕکراو دەوەستێت، لەگەڵ تێپەڕینی ڕۆژگاردا دۆگما دەبێت‌و سنوورێك بۆ بەردەوامبوونی ئەو پەیوەندییە بەئازارو بێزراوە بۆ هەردووکیان، دادەنێت.

## نائومێدی، لاوازیی‌و شکستی پێشبینییەکان:

قەیران لەپەیوەندیدا کاتێك دەستپێدەکات کەیەکێك لەدوو هاوبەشەکە هەست بەنائومێدی دەکات بەرامبەر ئەو ڕۆڵەی کەدەبوو هاوبەشەکەی بەرامبەری ببینێت. ئەم مەسەلەیە پێویستی بەهەندێك ڕوونکردنەوەیە: بێگومان ئەوە مەسەلەیەکی بابەتگەراییانە نییە، بەڵکو دیاردەیەکی (خود)ی یان دەروونی ناوەکییە. نائومێدی سەرهەڵدەدات کاتێك وادەردەکەوێت بابەتەکە (واتە بابەتی خۆشەویستی) بەشێوەیەکی تەواو لەگەڵ ئارەزووەکانی تاکدا وەڵامدانەوەی نابێت: یەکێك لەو دوو هاوبەشە هەڵەدەکات‌و ئەو داوایانەش دابیننەکات کە لێی چاوەڕوانکراوە، ئەم هاوبەشە هەڵوێستی بابەتگەریانەی نەگۆڕاوە، بەڵام لەوەدەچێت ئەو وێنە پێکەوەنووساوەی interiorisee لەبەردەم دابینکردنی ئارەزووەکانی تاك‌و پێشبینییەکانیدا، شکستی هێنابێت. لەکاتێکدا



ئەم پێشبینییە Attente دەشێت فراوان‌و بێسنوور بێت وەك لەسەرەتای ئەو پەیوەندییەدا ڕوویداوە. بەمشێوەیە ئەو سیفەتە باش‌و لایەنە باشانەی بەهۆی کردارەکانی دابەشبوون‌و ئایدیالیزەکردنەوە خستوویەتیە پاڵ هاوبەشەکەی‌و ئەوانەش کە بەشێوەی فەنتازیا چاوەڕێی ئەوەی لێکردوون توانا هەمەکی بن یان سەرچاوەی تێربوون بن، لەمڕۆوە ترسی ئەوەیان لێدەکرێت شوێنی پرسیاربن. بێگومان تاك دژی ئەم کودەتایە یان شێواوییە بەرگری لەخۆی دەکات تا کرداری ئایدیالیزەکردن درێژە پێبدات‌و پشتیوانیان لێبکات، لەوانەشە پەنا بۆ نکوڵیکردنی ڕاستەقینەی واقیع بەرێت تا ئەم ئایدیالیزەکردنە دابینبکات وەك لەماوەی مانگی هەنگوینیدا تێبینیمان کرد، بەڵام گرتنەبەری یان پشتبەستن بەو ڕێوشوێنانە بەردەوام نابێت‌و کۆتاییان هەیەو ئەوکاتە دێت کە بەهێزکردنی کردارەکانی ئایدیالیزەکردن نەشیاو دەبێت‌و بەدینایەت.

کەواتە ئەوەی گۆڕاوە یان گۆڕانی بەسەرداهاتووە واقیعی سایکۆلۆژی کەسەکەیە نەك واقیعی بابەتگەرییانەی پەیوەندییەکە. بەڵام هەندێجار تێبینی هاوجێبوونێك دەکەین لەنێوان گۆڕانە بابەتگەرییەکان‌و گۆڕانەکانی "واقیعی سایکۆلۆژی" تاکدا. ناتوانین باس لەپەیوەستی نێوان هەستکردن بەخەمۆکیی‌و شکستهێنانی بابەتی دەرەکی یان هاوبەشەکە بکەین، بەبێ لەبەرچاوگرتنی پێشبینییەکان بەرامبەر ئەو هاوبەشەو ئەو ئایدیالیزەکردنەی پەیوەستە پێوەی، هەرچەندە پێشبینییەکان بەرامبەر هاوبەشەکە فراوانبێت ئەوەندە ئەو نائومێدییە ئاسان دەبێت، هەندێجار ئەوەندە

بەس دەبێت ئەو هاوبەشە شکستییەك یان لاوازییەکی ساکارو بێبایەخ دەرببڕێت تا هەستکردن بە نائومێدی لای تاکی بەرامبەر، دروستبێت. ڕوودانی هەر گۆڕانێك تەنانەت ئەگەر سادەش بێت لە کۆئەندامی درکپێکردن یان جیاکردنەوەی تاکدا، ڕووبدات بەشی ئەوەدەکات بارودۆخی ئەو هاوبەشە بگۆڕێت: بۆنموونە هاوبەش یان بابەتی دەرەکی کە پشتیوانی لەخستنەپاڵەکانی بابەتی ناوەکیی دەکات هەمیشە لەگەڵ کەسانی دی بەراورد دەکرێت، ئەمەش تاك بەرەو ڕاستکردنەوەی ئەو وێنە نەخشێنراوە دەبات کە لەسەرەتادا لای دروستبووە: کەواتە شکستهێنانی ئەم وێنە نەخشێنراوە بۆ یەکەمین نائومێدی شیاودەبێت، ئەمەش بێئەوەی ئەو هاوبەشەی بەرامبەر هیچ شکستییەکی ڕووکەشی یان واقیعی ساکار بخاتەڕوو یا ئاشکرابکات.

لەهەندێك حاڵەتدا ئەوە ڕوودەدات کە ئەو هاوبەشە خۆی گۆڕانی بەسەردا هاتووەو گۆڕاوە ئەمەش دەبێتە هۆی ڕوودانی گۆڕان لەدرکپێکردنی تاكو هەستکردن بە نائومێدی. واتە بۆنموونە هەر گۆڕانێکی بایۆلۆژی لەوانەیە ببنە ڕێگر لەبەردەم زامنکردنی ئەو تێربوونانەی کە تاك لەسەرەتای پەیوەندیدا بەخشیویەتی بە هاوبەشی بەرامبەری بەتایبەتی لەکاتێکدا شێوەی فیزیکیی گۆڕانی بەسەردادێت، کاتێك توانای سێکسوالی یان یەکێك لەتوانستە بنەڕەتییەکانی کەمدەبنەوە، هەروەها ئەم نائومێدییە لەوانەشە لەکاتێکدا سەرهەڵبدات کە ئەو هاوبەشە کەموکورتییەك لە "بەهای کۆمەڵایەتییدا" ئاشکرابکات یا بخاتەڕوو، ئەم هاوبەشە کە هەڵبژێردراوە بۆئەوەی بتوانێتو ئامادەبێت پاراستن بۆ تاکی



بەرامبەری فەراهەم بکات، هاوبەشی بەرامبەری ئومێدبڕاو دەکات، کاتێك ئەوە ئاشکرادەکات لەبینینی ڕۆڵی خۆیدا شکستیهێناوە. لەمبارەدا پەرەسەندنی بابەتی ناوەکی لەوانەیە لەگەڵ پەرەسەندنی بابەتە دەرەکییەکەدا هاوتەریب بێتو لەنێوان ئەم دوو پەرەسەندنەدا هەمیشە ڕەهەندی کۆمەڵایەتی- کولتووری دیاریدەکرێت، کەشوێنەواری هەندێك"بەها"ی بەخشراو بەهاوبەشەکە، دیاریدەکات.

بەراوردکردنی ئەم هاوبەشە لەگەڵ کەسانی دیکە زۆرکات هۆکاری ئەم جۆرە درکپێکردنەیە کەتاك هەست بەشکستی هاوبەشی بەرامبەری دەکات، چونکە ئەو هاوبەشەی لەسەرەتادا وەك (قەلغانێك) پارێزەرێك هەڵبژێردراوە لەوانەیە بڕواتە ئاستێکی نزمتر ئەگەر لەگەڵ کەسانی دیکەدا بەراوردکرا، چونکە ئەو کەسە هەستدەکات هاوبەشەکەی جوانترو بەهێزترو زیرەکتر.. هتد، نییە لەکەسانی دیکە، بەگوزارشتێکی سەراپاگیرتر، لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە هاوبەشەکەی جێبەجێکارو کارا نییەو ئەوەی ئەو چاوەڕێی لێدەکرد وەك توانای پاراستنی لەلایەن هاوبەشەکەیەوە ئێستا جێگەی پرسیارە: هەموو ئەمانە لەوانەیە ڕووبدەن بێئەوەی ئەو هاوبەشە خۆی گۆڕانی بەسەرداهاتبێت، ئەم هاوبەشە وەك بەربەستو نائومێدێك دەژی بەرامبەر پێشبینییە بنەڕەتییەکانی هاوبەشەکەی.

هەندێك کات، تاك خەسڵەتە مادییەکان وەك پاڵپشتێك بۆ شکستهێنان لای هاوبەشەکەی بەکاردەهێنێت، ئەویش لەبەرامبەر ئەو پێشبینیانەی کە بەشێوەیەکی ڕوکەش لەو هاوبەشەی چاوەڕێی کردووە، بۆنموونە وەك توانستی پیشەیی یان دەستکەوتی دارایی کە لەئاستێکی نزمتردا دەردەکەون وەك لەوەی پێشتر چاوەڕێی

کردووە لەهاوبەشەکەی، ئەم بابەتانە بەزمانێك گوزارشتیان لێدەکرێت کە هێماکانی بە نێوکۆی کۆمەڵایەتی و کولتورییەوە پەیوەستن: ئەم رووداوانە دەتوانرێت لەگەڵ ئەو کردارە شکستییانەدا بەراوردبکرێن کە تووشی هەرزەکاران دەبن لەسەرەتای یەکترناسیندا: بۆنموونە کچێك لەوانەیە بەکوڕێکی دیاریکراو سەرسام بێت لەبەرئەوەی ئۆتۆمبێلێکی جوان لێدەخوڕێت یان لەبەرئەوەی لە ناوەندێکی کۆمەڵایەتیی دەوڵەمەندە، واتە بەهۆی ئەو شتانەوە پێی سەرسام دەبێت نەك لەسەر بنەمای کەسێتی ئەو کەسە خۆی، بەڵام هەرزوو ئەوە ئاشکرادەکات ئەو ئۆتۆمبێلە، ئۆتۆمبێلی خۆی نییەو ئەو کوڕەش ئەو گەنجە دەوڵەمەندە نییە، کە ئەم وایدەزانی. زۆرباش ئەوە دەزانین چۆن دروشمەکانی پلەوپایەو هێز لەوانەیە لای گەنجانی هەرزەکار لەسەر پێودانگە دەرەکییەکان (ئابووریی و کۆمەڵایەتیی و کولتوری) چڕدەبنەوە زیاتر لەوەی کە لەسەر پێودانگی کەسێتی یان مەعنەوییەکان چڕدەبنەوە.

لەچوارچێوەی پەیوەندیی هاوسەرێتیدا تێبینی کرداری لێکچوو دەکرێت و بەتایبەتی لەکاتی روودانی قەیران لەنێوان ئەو دوو هاوبەشەدا تەنانەت لەو کاتانەشدا کەپێشبینییەکانی هاوبەشەکە (بۆنموونە ژنەکە) تەنیا لەسەر پێودانگەکانی کەسێتیی چڕبۆتەوەو مۆڵگەی بەستووە.

M.P لەدوای ئەوەی لەکارەکەی پێشووی فەسڵکرا دووچاری پشێوی بوو، هەستیدەکرد ژنەکەی رقی لێیەتی، چونکە ناتوانێت پارەی پێویستی بۆ دابینبکات، بەردەوام گومانی هەبوو تەنانەت دوای ئەوەش کەپیشەیەکی تازەی گرتەدەست، گومانی لەبەهای



خودێتیی خۆی هەبوو، هەمیشە بە بەهای بەرهەمهێنانەوە دەیبەستەوە، هەروەها گومانی لەخۆشەویستی ژنەکەی هەبوو، بەهەڵچوونەوە گوزارشتی لەو گومانەی دەکردو دەیوت: "خۆشت دەوێم لەبەر خۆم یان لەبەر سەرکەوتنم لەکارەکەم؟" ئەم قسانە کاریگەرییەکی ناخۆش و خراپی لەسەر دەروونی ژنەکەی، هەبوو.

شکستهێنانی پێشبینییەکان دەبنە هۆی تەشەنەسەندنی قەیرانی نێوان دوو هاوبەش. ئەم شکستهێنانە بۆ ئەم هۆکارانە دەگەڕێتەوە: لەلایەکەوە ئەو هاوبەشەی کەچاوەڕوانی ئەوەی لێدەکرێت ڕۆڵێکی دیاریکراو ببینێت، نازانێت ئەو هاوبەشەی بەرامبەری چاوەڕێی چیلێدەکات (چونکە ئەمەی دواییان بەهاوبەشەکەی ناڵێت پێویستە چیبکات و هیچیشی پێناڵێت، چاوەڕێی ئەوەی لێدەکات خۆی پێشبینی بۆچوونەکانی بکات) لەلایەکی دیکەوە ئەو هاوبەشەی کە نازانێت چی بکات یان نازانێت چ ڕۆڵێکی لێ چاوەڕوان دەکرێت، لەوانەیە نەزانێت پێویستە وەڵامدانەوەی چۆن بێت یاخود ئامادە نەبێت بۆ ئەنجامدانی ئەو ڕۆڵە بەوشێوەیەی کە هاوبەشەکەی بەرامبەری دەیەوێت:

– (ئالبێر) پیاوێك بوو چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد هەمیشە ژنەکەی دڵنەوایی بکات، بەهۆی سروشتی کارەکەیەوە کەزۆر کارێکی هیلاککەر بوو، بەهیوابوو ژنەکەی هانی بدات و ڕێز لە هەوڵ و کۆششی بگرێت و لەبەرامبەردا پێویستی خۆی بۆ ئەو ڕێزدانان و دڵنەواییەی ژنەکەی، نەدەدرکاند یان بۆچوونەکانی خۆی کە دەویست ژنەکەی چۆن بێت، باسنەدەکرد، چونکە ئەمەی بەسوکایەتیپێکردن و لاوازی دادەنا.

ژنەکەی لەلایەن خۆیەوە نەیدەزانی چۆن دڵنەوایی بکاتەوە، چونکە بە پیاوێکی بەهێزو توندوتۆڵی دادەناو هەڵسوکەوتیشی بەرامبەر ئەو دۆخە، تەواو جیاوازبوو: ژنەکە سەرقاڵی دەکردو سەرنج و بایەخدانی بۆ لای بابەتی دیکە، رادەکێشاو پێی دەوت: "پێویستە هیلاکی و ئازارت لەبیربچێتەوە" ئەم هەڵسوکەوتەی ژنەکە هیچ کاتێك هاوسەرەکەی رازی نەدەکرد. هەمیشە بەوروژاندن و شەڕانگێزیی وەڵامی ئەو هەڵسوکەوتانەی ژنەکەی، دەدایەوە، هەرچی ژنەکەشە هەمیشە بەعینادی و رەقی وەڵامیدەدایەوەو لەگەڵ تێپەڕبوونی کات پیاوەکە وردە وردە دوورەپەرێزو گۆشەگیر بوو، ژنەکەش بەردەوام دەگریاو بێزاربوونی خۆی بەرامبەر هاوسەرەکەی، دەردەبڕی، بۆماوەیەکی دوورو درێژ ئەمبارە بەردەوام بەمشێوەیە مایەوە، بەڵام بیریان لەجیابوونەوە نەکردەوە، چونکە یەکتریان خۆشدەویست.

دەیانویست ئاشت ببنەوەو پێکەوە رێکبکەونەوە، بەڵام هەر بەدوورەپەرێزی لەیەکتریی مانەوە، چونکە هیچ کامیان نەیدەتوانی ئەو دەستپێشخەرییە ئەنجامبدات، ژنەکە وایدادەنا ئەگەر ئەو دەستپێشخەری بکات لەوانەیە وەك دانپیادانانێك وابێت کە ئەو هەڵە بووە (ئەمەش دۆخێك بوو ژنەکە بەرگەی نەدەگرت، واتە بەرگەی ئەوەی نەدەگرت وابزانێت کە ئەو هەڵە بووە). هەرچی (ئەلبێر)یشە دەترسا لەوەی دەستپێشخەرییەکەی رەتبکرێتەوە (ئەمەش ئەوە بوو کە لێی دەترسا)، هەریەکە لەو دوو هاوبەشە چاوەڕێی ئەوەیان دەکرد بەرامبەرەکەی لێی نزیك بکەوێتەوە بیگرێتە ئامێزو دیالۆگی لەگەڵ بکات و بەهانە بۆ رەفتارەکانی بهێنێتەوەو بڵێ (تەواو... مەسەلەکە



تەواو).

بوونی کەسی سێیەم لەماڵدا: ئەم کەسە (خەسوو یان هاوڕێ) بێت لەوانەیە زیاتر ببێتە هۆی گرژبوونی پەیوەندی نێوان دوو هاوبەش بەتایبەتی لەکاتێکدا ئەو کەسە لە دژی یەکێك لەو دوو هاوبەشە لەگەڵ ئەوی دیکەیاندا هاوپەیمانی ببەستێت.

لەزۆر حاڵەتدا لەوانەیە زاواو خەسوو (لەو بارەدا ئەگەر ئەو خەسووە لەگەڵ دوو هاوبەشەکەدا ژیا) رێکەوتن یان تێگەیشتنیان لەگەڵ یەکدا هەبێت، بەڵام بووك و خەسوو ناتوانن رێکەوتن و تێگەیشتنیان لەگەڵ یەکتریدا هەبێت ئەویش لەبەر ئەم هۆکارانەی خوارەوە:

– ئەو دووانە هەمیشە لە بەرپرسیارێتیی بەڕێوەبردنی ماڵدا ناکۆکن (خەسوو هەمیشە هەوڵدەدات رۆڵی چاودێر ببینێت).

– هەریەکەیان هەوڵدەدات بەئارەزووو پێداویستییەکانی سەرگەورە یان پیاوی ماڵەکە ئاشنابێت (کە لێرەدا مەبەست لەهاوسەری بووکەکەو کوڕی خەسووەکەیە).

– هەریەکەیان، داوای پشکی گەورەتر لەبایەخدان و سۆز لەلایەن پیاوەکە دەکەن و ئەمەش بەرەو غیرەیان دەبات.

– کاتێك بارودۆخەکە زیاتر تەشەنەدەکات، هەریەکەیان دەچێت بۆ لای پیاوەکەو پێی دەڵێن: ( دەبێت یا من یا ئەو هەڵبژێریت) بەمەش ئەو پیاوە دووچاری هەڵوێستێکی شەرمندەیی دەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا کە هەمیشە هەوڵیداوە ناکۆکی و ئاژاوە لە نێوان ژنەکەیی و دایکیدا روونەدات.

## ماتەمینی دەروونی:

رابوونی پاڵنەرە شەڕانگێزییەکان بەرامبەر بابەت دەبێتە هۆی لاوازکردنی ئایدیالیزە سەرەتاییەکان idealization initiale و هەندێجار نەهێشتنیشیان. بەمشێوەیە کاتێک لەبارودۆخێکی گونجاودا (ماتەمینی دەروونی) روودەدات ئەو کەسە بەشێوەیەکی کاوەخۆیی خۆی رێکدەخاتەوەو وردە وردە ئایدیالیزەکردن نامێنێت و بەشێوەیەکی گشتیی تەنیا چەند بەشێکی دەمێنێتەوە، چونکە ئەو بەشە کەمانەی یارمەتی تاک دەدەن بۆ سەرلەنوێ گەڕانەوەی بڕیارو توانا رەخنەییەکانی، یارمەتیدەریش دەبن لەئەنجامدانی بەراوردکارییەک لە نێوان وێنەی پێکەوەنووساوی هاوبەشەکەی لەگەڵ واقیعی هاوبەشەکە وەک لەرووالەتدا دەردەکەوێت.

بەمشێوەیە تاک دەتوانێت درک بەجیاوازی نێوان ئەو وێنە واقیعی و وێنە خەیاڵیی imagine ـە بکات (واتە ئەو وێنەیەی خۆی لەخەیاڵدا دروستیکردووە) کە بەهۆی کاری خستنەپاڵە خودییەکانی خۆیەوە دروستبووە، (ماتەمینی دەروونی) Travial Psychique de deuil یارمەتی باشکردنی رێگەکانی پەیوەندیکردن لەنێوان دوو هاوبەشەکەدا دەدات، چونکە یارمەتی هەر تاکێکیان دەدات لەمەبەست و خۆزگە شاراوەکانی Latentes ئەوی بەرامبەرەکەی تێبگات و ئەوانەش کە لەگەڵ مەبەست و خۆزگە تایبەتییەکانی خۆیدا ناکۆکن و هاوجێ نابن.



رابوونی پاڵنەرە شەڕانگێزییەکانی پەیوەست بە(کاری ماتەمینییەوە) Travial de deuil بەگۆڕانی وێنەی بابەتەکە یان هاوبەشەکە پەرژین بەند نابن، بەڵکو لەوانەیە لەهەندێک کاتدا گیروگرفت لەسەر ئاستی خود بۆ تاکەکان دروستبکەن: ئەگەر بابەتەکەت (واتە بابەتی خۆشەویستیەکە یان هاوبەشەکەت) خۆشویست واتە خودی خۆتت خۆشدەوێت یان باشترین بەشی خودی واقیعی یان خەیاڵی خۆتت خۆشدەوێت و بەتایبەتی ئەگەر هەڵبژاردنی بابەتەکە پەیوەست بوو بە "ئایدیالیزەکراوی من- ideal de moi" ـەوە.

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت رابوونی پاڵنەرە شەڕانگێزییەکان بەرامبەر ئەم بابەتە لەوانەیە رێژەی سوودو تێربوونە نارسیزمییەکان هێواش و کەمبکەنەوە کەتاک لەسەرەتای پەیوەندیی خۆشەویستیدا دەستی دەکەون. هەروەها رەخنە یان هێرشکردن بۆ سەر بابەتی پێکەوەنووساو، رەخنەو هێرشکردن بۆسەر خود دەگەیەنێت.

هەندێک پێیانوایە ئەم پەرەسەندنە لەرەخنەو هێرشکردنە سەر خود لەهەندێک حاڵەتدا دەبێتە هۆی سەرلەنوێ گەڕانەوەی هەستی رەخنەیی و بابەتی رەخنەیی خود، ئەمەش یارمەتیدەر دەبێت لەپێگەیشتن و کامڵبوونی تاکدا. بەڵام ئەم پەرەسەندنە لەهەندێک حاڵەتی دیکەدا لەوانەیە ببێتە هۆی گەشەکردنی هەستێکی توندوتیژ بۆ وێرانکردنی خودو هێرشکردنە سەری و لەدەرئەنجامە روون و ئاشکراکانیشی، خۆکوشتنە. ئەمەش لەنێو هەندێک لەهەرزەکاراندا یان ئەو کەسانەی پێنەگەیشتوون و کامڵ نین، تێبینی دەکەین لەوکاتەدا کە پەیوەندیی خۆشەویستییان لەگەڵ

خۆشەویستەکانیاندا لەبەریەك هەڵدەوەشێت.

کۆمەڵێك کەس هەن ناتوانن (ماتەمینی دەروونی) Travail de deuil تەواوبکەن، تەنیا لەوکاتەدا نەبێت کە بەدەست قەیرانێك یان چەند قەیرانێکی توندوتیژەوە، دەناڵێنن کە هەندێجار بەهەوڵدان بۆ خۆکوشتن گوزارشتی، لێدەکەن.

زۆرکات تەواونەکردنی (ماتەمینی دەروونی) دەبێتە هۆی ڕوودانی خەمۆکی ئاشکرا. پشکنینە کلینکییەکان ئاماژەیانداوە بەجیاوازی ئاشکرای نێوان ئەو (پەرچەکردارە خەمۆکی)یەی بەدوای مردنی بابەت یان هاوبەشەکەدا دێت، لەگەڵ لەدەستدانی ڕێژەیی بابەت یان هاوبەشەکە لەقۆناغی ڕەخنەیی پەیوەندیی خۆشەویستیدا: مردنی خۆشەویست ئازاری توندوتیژ بەسەر تاکدا دەسەپێنێت کە بەندە بە ناچاری وازهێنان لەبابەتی لەدەستچوو. ئەگەر پێکهاتە فەنتازیی و وڕێنەییەکانی oniriques کە لەنەستەوە دەردەچن گەواهی نکوڵیکردنیان لەم سەلمێنراوە واقیعییە کرد، ئەم واقیعە هەر خۆی دەسەپێنێت و تاك ناچاردەکات بەشێوەیەکی کۆتایی دەستبەرداری ئەو بابەتە لەدەستچووە ببێت، ئەویش لەڕێگەی لابردنی خستنەوەبەرفرمانی نارسیزمی بابەتەکە.

– لەقەیرانەکانی پەیوەندی هاوسەرێتییدا تێبینی دەکرێت، تەواوکردنی کاری ماتەمینیی لەسەر ئاستی دەروونیی لەبەرچەند هۆکارێك بەدیهاتنی ئەستەم دەبێت:

١– ئەستەمی یەکەم لەتەواونەکردنی ماتەمینیی دەروونیدا بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەو هاوبەشە هێشتا لەژیانی تاکدا ئامادەبوونی هەیەو ئەو تاکەش بەردەوام هەوڵدەدات پەنا بۆ "ئایدیالیزەکردنی



سەرەتایی" بەرێت تا لەو ئەشکەنجەیە ڕزگاری بێت کە بەدەستیەوە دەناڵێنێت، پەنابردنی بەردەوامیش بۆ ئایدیالیزەکردن بەشێوەیەکی تەواو دەبێتە ڕێگر لەبەردەم بەڕێوەچوون یا تەواوبوونی ماتەمینیدا.

٢– بەشێوەیەکی گشتیی ئەم ماتەمینە ئەندەکییە Partiel، تەنیا هەندێك ڕوخساری پەیوەندیی یان هەندێك ڕوخساری هاوبەشەکە، دەگرێتەوە، ئەمە لەوکاتەدا ئەگەر هەندێك لەڕوخساری ئایدیالیزەکراو idealises هێشتا مابوونەوە.

٣– لەهەندێك حاڵەتی دیکەدا تێبینی دەکەین شکستهێنانی ئەم کردارە واتە (کاری ماتەمینی) بۆئەوە دەگەڕێتەوە کە تاك لەتوانایدایە بڕی پێویست لە ڕق و شەڕانگێزیی ئاڕاستەی هاوبەشەکەی بکات، بەشێوەیەك ڕێگەدەدات بە ئامادەنەبوونی ڕەخنەی خود Auto-critique و دوورکەوتنەوە لەشەڕانگێزیی ئاراستەکراو بەرەو خود Auto-agressivite، لەکاتی ڕوودانی قەیرانی خۆشەویستییدا دەتوانین یان ڕقمان لەخودی خۆمان بێت، چونکە بەرامبەر هاوبەشەکەمان خراپ بووین و لەدەستمانداوە یان ڕقمان لەهاوبەشەکەمان بێت، چونکە خراپ بووە لەگەڵماندا. ئەم دووجوڵەیە لەوانەیە بەشێوەیەك بەنۆبە دەربکەون کە ڕێگە بە تاك بدەن بەشێوەی دروست لەتەواوکردنی (ماتەمینی دەروونی) رابکات، ئەمەش لای زۆرترین ژمارەی ئەو کەسانە تێبینی دەکەین کە نەیانتوانیوە لەگرتنی ماتەمینی تەواو بۆ ئەو هاوبەشەی کە لەوەوپێش بەماوەیەکی دوورودرێژ وازی لێهێناون، سەرکەوتن بەدەستبهێنن، چونکە بچووکترین ئاماژە بۆ ئەگەری بوونی یان ئامادەبوونی ئەو هاوبەشە بەسە بۆ دواکەوتنی گێڕانی ئەو ماتەمینییە (واتا

دانپێدانانی تەواو بە پچڕاندنی پەیوەندی لەگەڵ ئەو کەسەدا – وەرگێر)، هەروەها تێبینی دەکەین هەندێك لەحاڵەتەکانی تەڵاق بە ئامادەبوونی شاراوەی Latent هاوبەشەکەی پێشوو دەناسرێت، یان جیادەکرێتەوە، تاکیش لەمبارەدا هیچ پاساوێکی وای چنگ ناکەوێت بەشێوەیەکی کۆتایی لەهاوبەشەکەی جیابێتەوە ئاسایی وەك لەکاتی گرتنی ئەو ماتەمینیەدا روودەدات کە بەدوای مردندا دێت.

بەمشێوەیە (گرتنی ماتەمینی دەروونی) لەکاتی قەیرانی خۆشەویستیدا لەزۆرکاتدا بەسنوورداری دەمێنێتەوە، بەش بەشکراوو بەدینەهاتوو دەبێتو لەوانەشە بۆ ماوەی چەند ساڵێك درێژەبکێشێت.

٤– ئەم مۆرکە بەش بەشکراوو بەدینەهاتووە لە (گومانی ماتەمینی دەروونیدا) لەچوارچێوەی پەیوەندی خۆشەویستییدا لێکدانەوەیەکی کلینکیی تایبەتی هەیە، چونکە لەم چوارچێوەیەدا ئەنجامدانی یارییەکی بە نۆبە، لەبەستنی (گرتنی) ئەو ماتەمینیەدا لای هەریەك لەدوو هاوبەشەکە رێکدەخرێت، لەبەرئەوەی هەریەکە لەو دوو هاوبەشە لەسەر ئیقاعێکی جیاواز لەکرداری ئەو ماتەمینیەدا، دەژی: بۆنموونە تێبینی دەکەین هاوبەشی یەکەم دان بەهەڵەکانیدا دەنێتو هەست بەگوناه دەکات، لەبەرئەوەی خۆی بە بەرپرس دەزانێت لەبەرامبەر بریندارکردنو لەدەستدانی هاوبەشەکەیدا کە ئازار دەچێژێت. هاوبەشی دووەم، یەکەم تاوانباردەکات بەوەی کە بەرپرسە لەئەشکەنجەو ئازارەکانیو بەمەش هیچ هەست بەگوناه ناکات. ئەم دابەشکردنە لەرۆڵەکاندا لەپەیوەندی هاوسەرێتیدا تێبینی دەکرێت، ئەویش بەهۆی کردارە خستنەپاڵە



تایبەتییەکانەوە: یەکەم خۆی تۆمەتبار دەکاتو تاوانباریشە، دووەمیش، یەکەم تۆمەتبار دەکات بێئەوەی خۆی هەست بەگوناه بکات.

٥– ئەوەی بۆماوەیەکی دوورودرێژ دوو هاوبەشەکە بەرگری لەبەرامبەریدا، دەکەن هەڵدەگەڕێتەوەو گۆڕانی بەسەردادێت، ئەویش بەهۆی بەکارهێنانی ئەو فێڵو رێوشوێنانەی کە هەندێجار گاڵتەئامێزیشن بۆئەوەی خۆیان لەتەواوکردنی ئەو ماتەمینییە، بەدووربگرن.

ئەمەش پێویستە بۆ پێگەیشتنو کامڵبوونی دوو هاوسەرەکەو دیاریکردنی پەیوەستی نێوانیان لەپێش کرداری سەرلەنوێ سیستماتیکردنی پەیوەندییەکەیان کە رۆژگارو سوڕی ژیانی خێزانیی یان هەندێك بارودۆخی ناخۆش (بایۆلۆژییو ئابووریی و کۆمەڵایەتی) بەسەریاندا دەسەپێنێت.

## ئاوابوونی خۆشەویستی:

پشکنینە کلینکییەکان ئاشکرایانکردووە هەندێك لەو هاوسەرانەی کە پەیوەندی هاوسەرێتییان هەڵوەشاندۆتەوەو لەیەکتری جیابوونەتەوە، بەشێوەیەکی نێگەتیڤو پێچەوانە لەهەمان ئەو زنجیرە رووداوە دەروونیانەدا دەژین کە لەحاڵەتی خۆشەویستییدا تاقییانکردۆتەوە.

– ئەم جۆرە کەسانە میکانیزمەکانی بەرگری کە لەحاڵەتی خۆشەویستیدا بەکاریانهێناوە پەرەپێدەدەن، ئەو میکانیزمانەش

وەك: دابەشكردن و ئايدياليزەكردن و نكوڵيكردن (بەڵام ئەم ميكانيزمانە بەڕێگەيەكى پێچەوانەو نێگەتيڤ بەكاردەهێنرێن واتە بەشێوەيەك ئامانجى لەبەريەكهەڵوەشانى جەستەو دەروون بێت و دوورخستنەوەيان بێت لەيەكترى)[٣].

– لەم حاڵەتەدا چالاكييەكى دەروونى توندوتيژ بەسەر ئەو كەسەدا دەسەپێنرێت كەپەيوەندى بەو هاوبەشەوە (ئەو هاوبەشەى لەپێشتردا خۆشەويستى بووە) هەيە، هەروەها كاردەكات بۆ لابردنى خستنەوەبەرفرمانى ليبيدى desinvestissement libidinale لەهاوبەشەكەيدا. (ئەم چالاكيە كە كار بۆ ئاوابوونى خۆشەويستى دەكات دەبێتە هۆى دروستكردنى ئازاريى دەروونى لاى ئەو هاوبەشەى كە جێهێڵراوە ئەمەش واپێويست دەكات لەسەرى، گێڕانى ماتەمينييەكى ئەستەمو دوورو درێژ، ئەنجامبدات)[٤].

## فاكتەرەكانى لێكترازان يان تەڵاق بەپێى داتا كۆمەڵايەتييەكان:

تائێستا لەوڵاتى ئێمەدا هيچ ئامارێك دەربارەى رێژەى حاڵەتەكانى تەڵاق لەبەردەستدا نييەو تەنانەت هيچ توێژينەوەيەكى كۆمەڵايەتيش سەبارەت بەفاكتەرەكانى لێكترازانى پەيوەنديى هاوسەرێتى، ئەنجامنەدراوە، بەڵام لەئەوروپاو بەتايبەتى لەفەرەنسا، ئامارەكان ئاشكرايانكردووە، رێژەى تەڵاق گەيشتۆتە ئاستێك يەك حاڵەتى تەڵاق بەرامبەر دوو حاڵەتى هاوسەرێتييە، واتە بەتێكڕاى نيوە، زۆربەى زانا سۆسيۆلۆژييەكانيش بەرزبوونەوەى ئەم رێژەيە بۆ



ئاسانكارىو كەمتەرخەمى كۆمەڵگەى ئەوروپى بەرامبەر ئەو بابەتە دەگەڕێننەوە: جۆرێك لە (ئاوابوونى هەستكردن بەگوناه) يان (بێتاوانى) بەرامبەر مەسەلەى تەڵاق روويداوە. چيدى بەئاشكرا پەنجە بۆ ئەو كەسەى تەڵاقدراوە يان بۆ منداڵەكانى راناكێشرێت يان گاڵتەيان پێناكرێت، بەپێى داتاكان دەتوانين ئەم فاكتەرانە لەسێ خاڵدا كورتبكەينەوە:

١– هۆكارى لێكترازانى پەيوەنديى هاوسەرێتى لەپلەى يەكەمدا بۆ خيانەتى هاوسەرێتى infidelite (وەك ناسراوە بە زينا) دەگەڕێتەوە كە وردە وردە پەيوەندى هاوسەرێتى دادەڕمێنێت.

٢–بەكاربردن usure و پەرتبوونى Erosion ئارەزووو چێژ لەگەڵ هەمان ئەو هاوبەشەدا، چونكە كاتێك ئەو بەكاربردنە يان لاوازبوونە سروشتى دەبێت: ئارەزووى سێكسوالى پێويستى بە سەرلەنوێ بوژاندنەوەو وزەپێدان دەبێت لەرێگەى ئەزموونى نوێى خوڵقێنەرو ئەفرێنەرەوە.

٣–خستنەوەبەرفرمانى خۆشەويستى Investissement amoureux كەسێكى ديكە، ئەم خستنەوەبەرفرمانە دەرئەنجامێكى سروشتى دابەزينى بەهاى هاوبەشەكەى ئێستايە (واتە ئەوهاوبەشەى ئێستا لەگەڵ كەسەكەدا دەژى).

دواجار راپۆرتەكان لەئێستادا گرژبوونێكى گەورەيان لەژمارەى حاڵەتەكانى جيابوونەوە يان تەڵاقدا سەلماندووە (كە دەگاتە نزيكەى نيوە) كە ئەو جيابوونەوانە پێكەوە بەرەزامەندىى و رێككەوتنى هەردوو هاوبەشەكە بەڕێوەدەچن: دوو هاوبەشەكە لەسەر ئەوە كۆك دەبن كەناتوانن چيدى يەكتريان خۆش بوێت.

## ئــاوابوونيى خۆشەويــستى و ئــەو ئــازارەى بەهۆيــەوە دروستدەبێت:

زۆربەى چارەسەركارە خێزانييەكان لەكاتى پشكنينى كلينكييانـدا بۆ ئەو كەسانەى كە جيابوونەتەوە يان ئارەزووى جيابوونەوە دەكـەن، تێبـينى دەركـەوتنى جـۆرە گوزارشـتێكى نوێيـان لاى ئـەم كەسـانە كردووە، بۆنموونە كە دەڵێن: چيدى يەكتريمان خۆش ناوێت، ئێمـە هـيچ كاتێـك يـەكتريمان خۆشنەويـستووە ناچـاربووين لـەپێناوى منداڵەكانمانـدا پێكـەوە بمێنينـەوە، يـان (لـەپێناوى منداڵەكانمانـدا لەيـەكترى جيابووينـەوە، هەريەكـەمان بڕياريـدا سـەرلەنوێ وێنـاى ژيانى بكاتەوەو ئەمەش بۆ منداڵەكان باشترن).

كەواتــە ئــەوەى دەبيــسترێت ئەوەيــە (خۆشەويــستى ئــاوابووەو نــەماوە)، بــەڵام ئــەوەى لــەم پــشكنين و دانيــشتنانەدا نوێيــە، ئــەو گفتوگۆيەيــە كــە هەنــدێك لەهاوســەرەكان دەربــارەى ئــاوابوونيى خۆشەويــستييان بەشــێوەيەكى كتــوپڕ، دەيگێڕنــەوە: (كارەكــە بەكتوپڕى روويدا، لەو رۆژەدا هەستمانكرد هەموو شتێك تەواو بووە، هــەروەك بڵێــى شــتێك بەســەر ســەرماندا كــەوتووە، شــتێك بــوو لەهەورەبروســكە دەچــوو). يــان (تێنەگەيــشتين چــى روويــدا؟، لەســەرەتادا زۆر يــەكتريمان خۆشدەويــست و بۆمــاوەى پێــنج ســاڵ لەسەر ئەمبارە بەردەوام بووين، بەڵام دواى ئەوە كتوپڕ، گۆڕاين).

ئــەو دوو هاوبەشــە هەســت بەســوكايەتيى و سەرشــۆڕى دەكــەن، چــونكە هەڵخەڵــەتاون بــە بڕواهێنانيــان بەخۆشەويــستييەكى



هەميشەيى، هەست بـەزامێكى نارسـيزمى قوڵدەكـەن، زامێكـى تـاك و هاوبـەش، ئـەو زامـە زامێكـى بەشكراوو ئاڵوگۆڕكراوە، هـەروەها ئـەوە دەبيـسترێت ئـەو ئـازارە ئەسـتەمە گوزارشـتى لێبكرێت و بەتـەنيا لـەو نارســـيزمييە برينـــدارەوە دروســـتنەبووە، بـــەڵكو لەئـــەنجامى برينـداربوونى ئـەو بابەتـە(واتـە بابـەتى خۆشەويـستيەكە- وەرگێـڕ) شـــەوە كـــە لەناخـــەوە برينـــداركراوە (چـــونكە هـــەروەك دەزانـــين خۆشەويـــستى لەپێكهاتـــەى نارســـيزمى و دژە نارســـيزمى (Antinarcissique)[٥] پێكدێت. ئەم ئازارە دەبێت بەرێگەى جياواز وەربگێڕێت يان گوزارشتى لێبكرێت:

١- راكــردن، ئــەويش لەرێگــەى خــستنەوەبەرفرمانى خێــراى خۆشەويــستى، زۆركــات ئــەم خــستنەوەبەرفرمانە چــەندجارەو دووبارەبۆوە، دەبێت.

٢- مانــەوە يــان رۆچــوون لــەگێڕانى ماتەمينيــدا بــەديهێنانى ئەســتەمە، لەبەرئــەوەى ماتــەمينى لەپەيوەنــدى خۆشەويــستييدا ئازاراويى و هەندێجاريش مەحاڵە.

٣- دەركەوتنى پشێوى سايكۆلۆژى-جەستەيى يان خەمۆكى، كە ئاماژەكانى بەشێوەيەكى سەرەكى لەرێگەى خامۆشبوونى فەنتازياوە دەردەكـــەون هـــەروەها لەرێگـــەى ئـــەو تێكـــچوونەوە كەدووچـــارى بـەجێهێنانى قسەكردنى پـێش هەسـتى Preconscient دەبێتـەوەو بـەم شـێوەيە گوزارشـتى لێدەكرێت: (هـيچ بابـەتێك لـەلام يـان لـەلامان نەماوە لەگەڵيدا قسەى لەسـەربكەم، لەسـەرئەوە راهـاتووين هـيچ قسە نەكەين، نمايندەيى قسەكردن لامان چيدى فۆرمەلە نابێت).

٤- هەنـدێجار بەشـێوەيەكى زيادەڕۆييانـە پـەنابردن بـۆ دەرمانـە

هێورکەرەوەکان.

٥- دواجار دەتوانین بڵێین هەندێك کەس دەتوانن ئەم گیروگرفتە تێپەڕێنن بەتایبەتی ئەو کەسانەی سەرکەوتن بەدەستدەهێنن لەسەرلەنوێ دروستکردنەوەی پەیوەندی نوێداو جۆرێك لەهاوسەنگی نوێ بەدیدەهێنن یان ئەوانەی توانایان هەیە بەرەو شکۆبوون Sublimationی خۆڕسك یان وەرگیراو بڕۆن، ئەویش لەرێگەی ئەفراندنی هزریی یان هونەریی یان کۆمەڵایەتییەوە.

## کرداری "ئاوابوونی خۆشەویستی"

خۆشەویستی مۆدێلێك لەسایکۆسس Psychose پێکدێنێت، چونکە پشت بەمیکانیزمەکانی وەك دابەشبوونو ئایدیالیزەکردنو نکوڵیکردن دەبەستێت،دووکەرتبوون یان دابەشکردن واتا جیاکردنەوە لەنێوان بابەتی باشو بابەتی خراپدا، نکوڵیکردن لەبابەتی خراپ (واتە بەشە خراپەکان لەبابەتەکەدا)و ئایدیالیزەکردنی بابەتی باش لەبابەتە دابەشکراوەکە clive.

حاڵەتی خۆشەویستی لەپەرەسەندنە سروشتییەکەیدا بەشێوەیەکی کاوەخۆ ئاوابوونی یان "نەمانی ئایدیالیزەکردن" لای ئەو هاوبەشە desidealistion لەخۆدەگرێت، هەروەها شیبوونەوەی ئەومیکانیزمانەش کە یارمەتی ناسینی ئەوی بەرامبەر دەدات وەك کەسێکی هەمەکی باشو خراپ لەیەککاتدا، بەڵام ئەزموونی خۆشەویستی بەپێی گوزارشتی فرۆید بریتییە لە "تێکەڵەیەك لەسۆزو شەهوانییەت"، ئەم ئەزموونە لەو بارەدا دەمێنێتەوە کە قوتی خۆی لەسوودە ماددی یان جەستەییەکانو ئاڵوگۆڕکردنی



سۆزداریی و ئەڤینداریی سێکسوالی ئاڵوگۆڕکراو تەنیا لەگەڵ هاوبەشە خۆشەویستەکەدا وەردەگرێت.

- ئاوابوونی یان نەمانی خۆشەویستی، گەڕانەوە بۆ ماتەمینیی یان عەدەم، ناگەیەنێت، چونکە ماتەمینی لەنەستدا بوونی نییە، ماتەمینی گەڕانەوە بۆ "شێتی خۆشەویستی" یان عەشق passion دەنوێنێت، بەڵام بەشێوە نێگەتیڤەکەی ennegatif. لەحاڵەتی ئاوابوونی خۆشەویستیدا "دەرەنجامێکی هزری" خۆی بەسەر کۆئەندامی سایکۆلۆژیدا دەسەپێنێتو ناچاریدەکات هۆکاری بەرگریکردن بۆ گەڕانەوە بەکاربێنێت، ئەم شێوازە لەجێبەجێکردنی کرداردا پاڵ بەتاکەوە دەنێت لەهاوبەشەکەی، جیابێتەوە هەروەك بڵێی ئەم جیابوونەوەیە واقیعێکە دەربازبوون لێی، مەحاڵە. لەمبارەدا گوزارشتی زۆر دەبیستریێن، وەك: "ئەمە واقیعەو ناتوانین هیچی بەرامبەر بکەین، هیچ ئومێدێك لێی بەدیناکرێت، ناتوانین هیچ بکەین تەنیا هەڵهێنجانی دەرەنجامەکان نەبێت، ئێمە یەکتریمان خۆش ناوێت، ئەمە ئەو قەدەرەیە پێویستە ملکەچ بین بۆ ئیرادەکەی".

دەتوانین لێرەدا بەهەموو خەسڵەتەکانی عەشقێکی خراپ ئاشنابین، ئایدیالیزەکردن دەبێتە ئایدیالیزەکردنی پێچەوانە contre idealization و بەهای هاوبەشی بەرامبەر لەڕووی سایکۆلۆژیی و شەهوانییەوە دادەبەزێت یان کەمدەبێتەوە، تاك لەم دۆخەدا دەژی هەروەك بڵێی تاك خودی بنەڕەتی خۆی بەدەستدەهێنێتەوە کە لەکرداری خۆشەویستییدا لێی زەوتکراوە. ئەم ئایدیالیزە پێچەوانەیە بۆ سەرشۆڕکردنی ئەویدیکە کاردەکاتو کەمکردنەوەی بەهای خودو قسەو رەفتارو نەریتەکانیو هەندێجاریش نزیك لەحاڵەتی بەئاگایی، مردنی بۆ دەخوازێت. ئەم ئایدیالیزە پێچەوانەیە دەرەنجامی

گەڕانەوەی دابەشکردنەکەیە "هەمووی باشە – هەمووی خراپە" بەشێوەیەك نکوڵی لەهەموو بەشە باشەکانی هاوبەشەکە دەکرێت و بەشە خراپەکان هەژموون بەسەر سەرتاپای هاوبەشەکەدا دەگرن. تاك هەستدەکات لەناخیدا هاوبەشەکەی وەك چەوسێنەرێك دەژی کە لەخەونەکانیدا دێت بۆئەوەی قەڵس و ناڕەحەتی بکات "من هیچ کاتێك خۆشم نەویستووە نازانم بۆ لەخەونەکانمدا دێتەوەو دەیبینم".

## ئەودیو زامی نارسیزمی:

ئاوابوونی خۆشەویستی هاوکاتە لەگەڵ کردارێکی سایکۆلۆژی گرنگدا، چونکە تێبینی دەرکەوتنی هەندێك میکانیزمی لاوەکی دەکرێت وەك: هەستکردن بەگوناه بەرامبەر ئەو هاوبەشەی جێهێڵدراوە، هەستکردن بەگوناه بەرامبەر بەمنداڵ، هەروەها گەڕان بەشوێن خستنەوەبەرفرمانی لیبیدی هاوبەشێکی نوێ. دەتوانرێت ئەوە بوترێت هەموو هاوبەشێك لەکاتی ئاوابوونی خۆشەویستیی و بڕیاردان لەسەر جیابوونەوە هەستدەکات زامێکی قووڵ ناخی بریندارکردووە. ئەمەو لەودیو ئەو زامە نارسیزمییەوە تووشی ئەو کەسە دەبێت، گلەیی و گازەندە بەمشێوەیە سەرهەڵدەدەن: "چۆن تا ئەم ئاستە بەهاوسەرێتیی یان بەجێهێشتنی هەڵخەڵەتاوم"، جۆرێکی دیکە لە گازەندە پەیوەندی بەو بابەتەوە هەیە، ئەویش ئەو زامەیە تووشی دژە نارسیزمی یان ئەنتی نارسیزمی antinarcissique دەبێت، ئەمەو لەپشت غیرەو هەستکردن بەگوناه، ئەم جۆرە گازەندەیە دەبیسترێت، وەك: (لەپەیوەندیی و لەبۆچوونمدا بۆ



پەیوەندیی و نموونەیی پەیوەندییەکە، پێکراوم).

زۆربەی چارەسەرەکارە کلینیکییەکان تێبینیان کردووە زۆری ئەو کەسانەی جیابوونەتەوە داوای ئەوەدەکەن بزانن چی روویداوە: "من پێویستم بەوەیە بزانم یان ئێمە پێویستمان بەوەیە بزانین چی روویداوە .. جیابوونەوەمان بەشێوەیەك روویدا هەروەك بڵێی لەدەرەوەی ئیرادەی خۆمانەوە بوو.. هێزێکی دەرەکی بۆ جیابوونەوە پاڵی پێوەناوین".

لێرەدا زۆر کەس لەوانەی جیابوونەتەوە باسی مەسەلەی دەردوبەڵای کۆمەڵایەتی، کاریگەری خێزان، بۆماوەو حەتمیەتە شوومەکانی دیکە دەکەن: "هێزێکی شاراوە هەبوو هەژموونی بەسەردا دەگرتین و کاریدەکرد بۆ کەمکردنەوەی بەهای پەیوەندیی و بێزرانی پەیوەندی نێوانمان" ئەو دوو هاوبەشە لەکۆتاییدا هەستدەکەن مەیلێکی بەهێز بۆ سەرلەنوێ گەڕانەوەیان بۆلای یەکتری رایاندەکێشێت لەدوای ئەو جیابوونەوەیەی لەدەرەوەی ویستی خۆیان روویداوە.

## نیورۆسسی ئاوابوونی خۆشەویستی:

هەندێك لەو کەسانەی جیادەبنەوە یان ئەوانەی بەدەست ئاوابوونی خۆشەویستییەوە ناڵاندوویانە، بەدەست کێشبەندییەکی نوێی دیکەوە دەناڵێنن کەخۆی دەنوێنێت لەنەبوونی توانا بۆ سەرلەنوێ خۆشەویستیکردن، وەك: (ناتوانم چی دیکە خۆشەویستی بکەم). ئەم جۆرە کەسانە گوزارشت لەحاڵەتێك لەئاوابوونی خۆشەویستی دەکەن کە لەناو خودییاندا روویداوەو لەم حاڵەتەدا

دەژین هەروەك بڵێی ڕێگرییەكی ئەقڵییە لەژیانیاندا یان وەك شێوەیەك لەشێوەكانی زەوتكردنی خود تیایدا دەژین، لەڕوانگەی ئەوانەوە ژیان ئەو تامو مانایەی، لەدەستداوە.

كێشەكە لای ئەو كەسانە لەوەدا نییە كەخۆشەویستی لەكەسانی دیكەوە وەرناگرن (ئەوان بەردەوام خۆشەویستی وەردەگرن) بەڵكو كێشەكە لەبەخشین یان پێدانی خۆشەویستییە بۆ كەسانی دیكە، بە مانایەكی دی توانای خۆشەویستی كەسانی دیكەیان نییە.

ئەم حاڵەتە نیورۆسسیە (واتە نیورۆسسی ئاوابوونی خۆشەویستی) هەروەك ئەی. ڕۆفیۆت A.Ruffiot ناویناوە تا ئاستێك لەگەڵ خەمۆكی سەرەكیدا لێكچووە، بەڵام ئەوەی ئەم حاڵەتە لەخەمۆكی جیادەكاتەوە بەردەوامبوونی جۆرێكە لەچالاكی خەون onrique لای ئەم كۆمەڵە كەسانە، چونكە خەون ئاشكراكارێكی تایبەتی كاری نەستییە خۆی بەسەر كۆئەندامی سایكۆلۆژیدا دەسەپێنێتو لای ئەو كەسانەی جیابوونەتەوە، لەكاتێكدا ئەم كارە نەستییە لەوانەیە بە درێژایی ژیان بەردەوام بێت.



# تەڵاقو قەیرانە سایكۆلۆژییە ناوەكییەكان

ئەو كەسەی كەخۆی تەڵاقی هەڵبژاردووە یان ناچاربووە ملكەچی تەڵاق بێت بەدەست كۆمەڵێك كێشەی سایكۆلۆژی زۆرەوە، دەناڵێنێت وەك هەستكردن بەگوناه یان هەستكردن بەوێرانبوون، وێڕای ئازارو زامە نارسیزمییەكان.

پەرچەكرداری تاكەكان بەرامبەر بەجۆری ئەو تەڵاقەی ڕووبەڕووی دەبنەوە، جیاوازە: چونكە ئەو تەڵاقەی كە تاك خۆی بەمەبەستی دروستكردنی پەیوەندییەكی نوێ هەڵیدەبژێرێت زۆر جیاوازە لەو تەڵاقەی كەبەناچاری لەئەنجامی بڕیارێكی چاوەڕوانكراوی هاوبەشەكەیەوە ملكەچدەبێت یان پێی ڕازی دەبێت.

تەڵاق دەبێتە هۆی "گەڕانەوەی چەپێنراو retour du refoule" بەمەش ڕێكخستنەكانی بەرگری (من – moi) لاوازدەبێتو بوار دەڕەخسێت بۆ سەرهەڵدانی ئارەزووی نادیار لای تاك (ئارەزووی ئیرۆسی یان شەڕانگێزی) بەمشێوەیە ئەو تاكە دووچاری پشێوی دەبێتو دركپێكردنی بۆ خودی خۆیو كەسانی چواردەوری گۆڕانیان بەسەردا دێت، تێكچوونی بەرگرییەكانی (من–moi) دەبێتە هۆی هەستكردن بەشێواویو دابڕانو فشەڵبوونی ناخ كە تاك توانای بۆ كۆنترۆڵكردنی خۆی لەدەستدەداتو ترسی دابڕانو پەرتبوون لای

دەبوژێنەوە، هەستی لەدەستدان و بەجێهێشتن کە دەرەنجامی لەدەستدانی هاوبەشەکەن، دەبنە هۆی سەرلەنوێ بوژاندنەوەی ترسە سەرەتاییەکان لەلایی و ئەو ترسانەی پەیوەستن بەیەکەمین ئامادەنەبوونی دایکییەوە، کە کاریگەرییەکی ئەوتۆیان لەسەر دەروونی جێهێشتووە و هەر لەڕوودانی کارەساتێك دەچێت.

## خەمۆکی و کرداری خستنەپاڵ لای ژنی تەڵاقدراو:

لای زۆربەی ژنانی تەڵاقدراو بە ئاشکرا ئەو ئارەزووە دەردەکەوێت کە کەموکورتی دەخەنە پاڵ پیاوەکانیان، وا دەردەکەوێت ئەم خستنەپاڵە وەك ڕێوشوێنێکی بەرگری دژی تووشبوون بەخەمۆکی بەکاردەهێنن، ئەو ژنەی تەڵاقدراوە دەیەوێت ڕکبەرایەتی پیاوەکەی بکات، بۆئەوەی لەخەمۆکی بەدوور بێت و هەست بەوە نەکات کە خۆی بابەتە ڕەتکراوەکەیە، هەوڵدەدات بۆ دۆزینەوەی بابەتێك تا ڕەتیبکاتەوە: (درککردن بەتەڵاق زامێکی نارسیزمی بۆ ژن دروستدەکات، ئەویش لەو بارەدا ئەگەر هەستیکرد خۆی بووە بە بابەتی خۆشەویستییەکی ڕەتکراوە، ئەمەش لەوانەیە لەبەهای تایبەتی خۆی دابماڵێت، لەبەرئەوە ئەم داماڵینە دەداتەوەو دەیخاتەپاڵ پیاو)[٦].

ژن لەمبارەدا کاردەکات بۆئەوەی بایەخی خۆشەویستیی پێشووی ڕەتبکاتەوە، ئەویش لەڕێگەی ڕقلێبوونەوەو ڕەخنەگرتن لەهەڵسوکەوتی پیاوەکەی، هەروەها کاردەکات بۆ دەرکەوتنی خۆی بەشێوەیەك کە وایدەربخات خۆی خاوەنی "توانایەکی هەمەکییە"



ئەویش لەڕێگەی نکوڵیکردن لەپاشکۆبوونی بە پیاوەکەیەوە.

ئەو شەڕانگێزییەی ژنی تەڵاقدراو ڕووبەڕووی پیاوەکەی دەکات بەندە بەشەڕانگێزیی قۆناغی منداڵییەوە کە لەدۆخی خەمۆکیدا depressive position دژی بابەت (پەیوەندی منداڵ بە دایکەوە) ئاڕاستە کراوە، هەروەها بەندە بە نوشوستیی بابەتەکەوە بەهۆی ئەو سەرکەوتنەی خودی منداڵەکە لەو قۆناغەدا بەدیهێناوە. دابەزاندنی بەهای هاوبەشی بەرامبەر ڕقلێبوونەوە لێی ئامانجی بەدیهێنانی سەرکەوتنە بەسەریدا، سەرکەوتنێك کە لەوانەیە هەستی خەمۆکیی دووربخاتەوە، (وەك لەسۆزی منداڵ بۆ دایکی ڕوودەدات، کاتێك ئازار بۆ لەدەستدانی دایکی دەچێژێت)[٧] ئەم شەڕانگێزییە ئاڕاستەکراوە دژی جیابوونەوە یارمەتیدەرە لەنکوڵیکردن لەو دڵەراوکێ خەمۆکییەی هاوکاتە لەگەڵ هەستکردن بە گوناهدا.

پێشتر باسمانکرد پەیوەندی ئەڤینداری یارمەتی تاکی لاواز دەدات، نارسیزمیی و خۆشەویستی بۆخودی خۆی بەدەستبهێنێتەوە، بەڵام هەر کەجیابوونەوە ڕوویدا ئەو تاکە سەرلەنوێ ئەو نارسیزمییە لەدەستدەدات و هەست بەبۆشایی لەدەستدان دەکات و نائومێدی جێگەی خۆشی دەگرێتەوە: لەکاتی تەڵاقدا تاك ئەو بابەتە لەدەستدەدات کە ئەو پاڵنەرانەی تێیدا بەتاڵدەکردەوە کە لەناو خودی خۆیدا بەرگەی نەدەگرتن وەك پاڵنەرەکانی مردن. ژن لەوبارەدا بێ ئامادەنەبوونی پیاو ناتوانێت جەخت لەناسنامەی خۆی وەك مێ بکاتەوەو بەمەش ئەو خەسڵەت و پاڵپشتانە لەدەستدەدات کەپێشتر پاڵی پێوەدەدان.

هەندێك لەژنان خەون بەوەوە دەبینن کە لەدوای تەڵاق ئازادو

بەختەوەتر دەبن، بەڵام لەوکاتەدا کە تەڵاق ڕوودەدات هەست بەهیوابڕاوی دەکەن بەهۆی ئەو بۆچوونانەوە کەپێشتر بەرامبەر بەقۆناغی (دوای تەڵاقی هێمن)[٨] واتە تەڵاقی نموونەیی و بەدەر لەململانێ، هەیانبوو. لێرەدا بەتایبەتی ئەو وەهمە دروستدەبێت کەخەمۆکی لایان بەهێزدەکات.

## چاککردنەوە سایکۆلۆژیی و کۆمەڵایەتییەکانی دوای تەڵاق:

تەڵاق دەبێتە هۆی دارمانی چوارچێوەی تایبەتی ژیانی دوو هاوبەش، وێڕای لەبەریەکهەڵوەشانی تۆڕی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیی و خێزانییەکانی پێشتر دروستبووبوون: بەشێوەیەکی کاوەخۆ وێنەی منداڵ و شێوازی نیشتەجێبوون دەگۆڕێت، ئەوکاتە خێزان بۆ چەند بەشێکی جیابۆوە لەیەکتری دەگۆڕێت و ئەو تاکەماڵە بۆ دوو ماڵ دابەشدەبێت و ئەو شتە ئاساییانەی کە بەدرێژای ژیانیان پێکەوە بەدەستیانهێناوە بەپێی ئەو مافانەی کە یاسا دەیسەپێنێت لەنێوانیاندا دابەشدەبێت. هەندێك کەس وای بەباش دەزانن هەموو شتێك بۆئەویدی بەجێبهێڵن لەجیاتی ئەوەی تێکیبدەن یان بیفرۆشن، هەروەها ئەو شێوازە لەژیان کە لە باری هۆشیاری یان ئەودیو هۆشیاریی بابەتی ئاڵوگۆڕکراوی نێوانیان بوو، ئاوادەبێت و نامێنێت لەسەر حیسابی شێوازێکی نوێی ژیان، کە ئەو ژیانە نوێیە یان ژیانی تەنیایی دەبێت یان ژیانێك دەبێت لەگەڵ منداڵ یان هاوبەشێکی نوێ و خێزانێکی نوێدا.



ئەو هەڵسوکەوتە تەنگژانەی هەندێك لەو کەسانە دەینوێنن کە لەیەکتری جیادەبنەوەو تەڵاق لەنێوانیاندا ڕوودەدات، دەربارەی ماڵ و سامان و منداڵ یان بەدەر لەمنداڵ، پێویستە تێگەیشتن بەرامبەریان بەو شێوەیە نەبێت کە ئەمانە ململانێیەکن تایبەت بەو هاوبەشە (بەڵکو ئەوانە ململانێن لەپێناوی مانەوەدا، چونکە هەرەشە لەسەر بەردەوامبوونی ژیانیان هەیە)[٩].

ئەو هاوبەشانەی تەڵاق لەنێوانیاندا ڕوودەدات لەماوەی دابڕانەدا پێویستییان بەپەیوەستنامەی سۆزداری هەمیشەیی و ئەو شوێنانە هەیە ئەگەر بەشێوەیەکی سەرپێییش بێت بیانگرێتەخۆ، ئەوانە پێویستیان بە خەسڵەتێکە تا یارمەتیان بدات بۆ تێپەڕبوون لەهەستی دڵەراوکێی دابڕان، لەبەر ئەم هۆکارە زۆربەی ئەو کەسانە هەوڵدەدەن پەیوەستبوونیان لەگەڵ منداڵ و کەسوکاریاندا بەهێزبکەن و بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانیان پەنا بۆ یاسا یان چارەسەری سایکۆلۆژی دەبن:

١-**خێزانی بنەڕەتی**: هەندێجار دەشێت ئەم خێزانە وەك پەناگە یان یارمەتیدەرێکی ڕاستەوخۆ، بەکەڵك بێت بۆ تێپەڕین لەو قەیرانەی لەئەنجامی لەدەستدان و تەنیایی ئەو کەسەوە ڕویداوە، هەروەها دەشێت سۆزو دڵنەوایی لەدەستچوو زامنبکات و ئارامبوونێکی کاتی ببەخشێت.

لەوانەیە لەم نێوکۆیەدا تێبینی ئەوە بکرێت خێزان وەك مەقاشی سوتانگە بەکاربهێنرێت لەو حاڵەتەدا کە بەرپرسە لەهەموو شتێك هەر لەسەرەتای پەیوەندییەکەوە تا شکستهێنانی، لەوانەشە خێزان بەرامبەر ئەو کوڕەی یان ئەو کچەی تووشی تەڵاق دەبێت

کەمتەرخەمی بنوێنێت، لەبەرئەوەی هەر لەسەرەتاوە سەبارەت بەو پەیوەندییە، گوێیان لەڕای کەسوکار نەگرتووە.

**٢-منداڵ:** منداڵان سۆزێکی تایبەتیان پێدەبەخشرێت، چونکە بەڵگەی بەپێیتی باوان دەنوێنن لەماوەی ژیانی هاوبەشیاندا پێکەوە، ئەو منداڵانەی بۆ ماوەیەك لەکات لەبیرکرابوون بەهۆی ئەو دڵەراوکێو هیوابڕاویەی لەگەڵ قۆناغی بڕیاردان لەسەر تەڵاق هاوکات بوون: لەدوای تەڵاق ئەو دوو هاوبەشە بەرامبەر ئەو منداڵانە هەست بەگوناه دەکەن، چونکە فەرامۆشیان کردوونو کاردەکەن بۆ راستکردنەوەو چاککردنەوەی مەسەلەکان لەرێگەی نزیکبوونەوە لێیانو بەخشینی سۆزی پێویست پێیان، ئەم نزیکبوونەوەیە لەگەڵ منداڵدا هەندێجار لەسەر حیسابی داماڵینی هاوبەشی بەرامبەر دەبێت لەتواناو شوێنی لەلای منداڵ. لەمبارەدا ململانێیەکی بەهێز روودەدات، چونکە خۆشەویستیی منداڵ لەگەڵ ئارەزووکردن بۆ هێشتنەوەو پاراستنی لای خودو جیاکردنەوەی لەهاوبەشی بەرامبەر تێکەڵدەبن.

لەمبارەدا منداڵ وەك پاڵپشتێکی کاتی بۆ بڕینو تێپەڕینی ئەو قەیرانە بەکاردێتو ئەوەی پارادۆکسی[*] لەخۆدەگرێت ئەو سەرسامیەیە کەتووشی یەکێك لەباوان (بەزۆری ژن) دەبێت کە لەمنداڵەکانی جیاکراوەتەوە، کاتێك ئەوەی بۆ ئاشکرادەبێت چۆن منداڵەکانی هۆگری باوکیان بوون: هەریەك لەو دوو هاوبەشە ئارەزوودەکەن رۆڵی خۆیان لای منداڵەکە بەهێزبکەن، دەتوانن بەهۆی ئەم رۆڵەوە لەسەر کۆمەڵێك رێسای نادیار درێژە بە پەیوەندی نێوانیان بدەن (هەندێجار لەوانەیە بۆ پێشکەوتنی منداڵەکەیان لەژیاندا کارەکان لەنێوان خۆیاندا دابەشبکەن ئەویش لەرێگەی ئەو



پرۆگرامە پەروەردەییانەوە کەیارمەتی کرانەوەی منداڵ دەدەن)[١٠].

هەروەها سامانیش دەچێتە ناو پەیوەندی نێوان منداڵو ئەو دوو باوانەی کە جیابوونەتەوە لەیەکدی، ئەم دەستێوەردانە لەرێگەی دابینکردنی نەفەقەی بژێوی بۆ منداڵو توانای ماددی هاوبەشەکەی دی دەردەکەوێت (کە ماف ئەوەی نییە منداڵەکەی لا بمێنێتەوە) ئەویش لەرێگەی ماف سەردانیکردنی ماوە ماوەی منداڵەکەو سەرپەرشتیکردنی.

بەپێچەوانەشەوە، هەندێجار تێبینی دەکەین ئەو هاوبەشە یان ئەو باوانەی ماف بەخێوکردنو چاودێریکردنی منداڵەکەی هەیە کاردەکات بۆ رێگەگرتن لەهاوبەشەکەی دی کەپەیوەندی بە منداڵەکەوە هەبێت، لەبەرئەوە هەر یارمەتییەکی ماددی لەلایەن ئەو باوانەی دیکەوە، رەتدەکاتەوەو تەنانەت لەچاوپێکەوتنی منداڵەکەش بێبەشی دەکاتو منداڵەکە ئەو هەستەی لادروست دەبێت، باوانەکەی دیکە (واتە دایك یان باوك کە لەگەڵیدا ناژی) بایەخی پێنادات.

لەم نێوکۆیەدا زۆربەی ئەو پیاوانەی لەدوای تەڵاق خۆیان چاودێری منداڵەکانیان دەکەن هەموو یارمەتییەکی دارایی لەلایەن دایکەوە رەتدەکەنەوە تا دایکەکە لەژیانی منداڵەکە دووربخەنەوە.

هەندێك لەپیاوان سامان وەك هۆکارێك بەکاردەهێنن بۆ خۆدەربازکردن لەپەروەردەکردنی منداڵ، ماوە ماوە سەردانی منداڵەکە دەکەنو دیاری زۆری بۆ دەکڕن، چونکە لەقسەکردن لەگەڵیدا خۆیان بەدووردەگرن. یارمەتی داراییان لەمکاتەدا تەنیا هۆکارێکە بۆ هێورکردنەوەی هەستکردن بەگوناهیان کە بەهۆی پشتگوێخستنی منداڵەکانییانەوە، تووشی دەبن.

**٣- چارەسەری سایکۆلۆژی**: ئەو کەسەی دووچاری تەڵاق بووە پەنا دەباتە بەر چارەسەری سایکۆلۆژی کاتێك هەستدەکات بەلێشاوێك لەکارتێکەرە پاڵنەرییەکان هەڕەشەی لێدەکرێت، لەبەرئەوە بەشوێن چارەسەرێکدا دەگەڕێت بۆ بەتاڵکردنەوەیان بەڕێگەیەك، خودی خۆی یان ئەوی دیکە لە ئازارپێگەیاندن بەدووربگرێت. قسەکردن لەگەڵ کەسێکی دیکە لەوانەیە کاریگەریی پۆزەتیڤی هەبێت تەنانەت ئەگەر هیچ ئەنجامێکی واشی نەبوو کە ئەو کەسە رازیبکات: دۆزینەوەی بوارێك بۆ پەیوندی یان بوارێکی کۆمەڵایەتی گونجاو لەوانەیە یارمەتی ئەو تاکە بدات کە کرژبوونە ناوەکییەکانی هێوربنەوەو بارودۆخێکی دڵنەوایی بۆ زامنبکەن، هەروەها لەوانەیە ئەو کەسە یان ئەو بوارە رێگەی لێبگرێت لەوەی پەنا بۆ کاری تۆڵەسەندنەوە بەرێت. دەتوانین بڵێین پەیوەندیەکی پۆزتیڤ بە مەبەستی چارەسەرکردن، یارمەتی ئەو کەسە دەدات کە تووشی تەڵاق بووە بۆ تێپەڕینی ئەو لەدەستچوونە (واتە لەدەستدانی هاوبەشەکەی)و سنووردارکردنی دڵەراوکێو دۆزینەوەی رێگەچارە بۆ رووبەڕووبوونەوەی پشێویی دەروونییو بنیاتنانی دوارۆژی خۆی.

**٤-پەنابردن بۆ یاسا**: هەندێك لەو کەسانەی تووشی تەڵاق بوونو رووبەڕووی قەیرانی سایکۆلۆژی توندوتیژ بوونەتەوە، زۆر پێویستییان بەوەیە پشت بە یاسا ببەستن: "شێت دەبم" "دەست لەمافی شەرعی خۆم هەڵناگرم" هەندێك لەو کەسانە ئەم جۆرە دەستەواژانە دەڵێنەوە کە ئاماژە بەپشتیوانی یاسایی دەدەن، چونکە دەترسن لەهەندێك لەمافەکانیان دابماڵدرێن وەك مافی چاودێریکردنی



منداڵ.

یاسا گەڕانەوەی متمانەو رزگاربوون لەتەنیایی زامندەکات. چونکە یاسا داننانێت بەبوونی فەوزاو مەترسی ململانێی سایۆکۆلۆژییە ناوەکییەکان یان ئەنگێزەی پەیوەندییەکان. پەنابردن بۆ یاسا شۆڕشی ئارەزووەکان بۆ تۆڵەکردنەوە خامۆشدەکات، سنوورێك بۆ هەستکردن بەگوناه دادەنێت، کاتێك بڕیار لەسەر مافی هەر تاکێك لەژیاندا دەدات.

ترس لەیاسا یان رەتکردنەوەی لەوانەیە پەیوەست بێت بەدانپیادانان بە بەهای یاسادا: چونکە دەستێوەردانی یاسا کارەکان روونو ئاشکرا دەکاتو گیروگرفتەکان یەکلایی دەکاتەوە بێئەوەی رەچاوی ئەو ئازارە بکات کە بۆ ئەو تاکە دروستیدەکات.

دواجار یاسا بایەخێکی سیمبولی مەزنی هەیە، چونکە مافی هەر هاوبەشێك لەدوای تەڵاق زامندەکات، سەبارەت بە منداڵیش، یاسا پشتنابەستێت بەئارەزووی دوو هاوبەشەکە بۆ چاودێریکردنیان، بەڵکو پشتدەبەستێت بە بەرژەوەندی منداڵ کە لەگەڵ کام لەباوانیان باشترە ژیان ببەنەسەر: "ئازادنیت لەهەڵسوکەوتکردن بە ئارەزووی خۆت لەگەڵ منداڵەکانت".

"ئەگەر منداڵەکەت منداڵی خۆتە لەهەمانکاتدا منداڵی هاوبەشەکەشتە، ناتوانیت دەستبەداری ببیت یان بەئارەزووی خۆت دەست بگریت بەسەریدا، ئەگەر بەتەنیا ژیایت یان لەچوارچێوەی پەیوەندییەکی هاوسەری نوێدا ژیایت تۆ وەك باوك یان دایك هەردەبێت ملکەچی ئەرکەکانی خۆت بیت".

**پەراوێزی وەرگێڕ:**

* پارادۆکسی– Paradox: مفارقة

**پەراوێزەکان:**


1-SEGAL H., introduction a L`oeuve de Melanie Klein, paris. P.U.E. 1965, P.52

2-RICHTER H.E., Parents, enfants et nverose, trfr Paris, Mercure de France.1972. P45

3-AULAGNIER P., Les destines du de Plaisiy, Paris, P.U.E, 1979, PP,169-171

4-RUFFIONA., "Lapassion du desamour", in Dialogue, 1987, No. 96, P.65

5-PASCHE F., "Realites psychiques et realite materille" in Nov.rev. Psychanal. 1976 No12.PP. 189-197

6-MISSENARD R., "Narclssism et rupture" in crise, rupture et depassement, paris, Dunod, 1979.

7-KLEIN M;Le edeuil et ses rapports avec les etats maniaco-depressifs. In Essais de psychanalyse, paris, Payot, 1969

8-LESOURD J., La depresepression post-divorce In dialogue, 1984, No 86, P.24

9-KAES R et COLL; Crise, rupture et depassment, paris Dunod, 1979. PP. 12-25

10-COLIN M., "Le temps du divorce", in Dialogue, No. 86, 1984, P.12.




## بەشی حەوتەم

# گەڕانەوەی چەپێنراو

ئەگەر یاسای حەرامکردنی زینا لەنێو ئەندامانی خێزاندا هەژموون بەسەر سەرجەم ژیانی سۆزداریدا بگرێت، ئەوا پێویستە تێبینی شوێنەواری ئەو حەرامکردنە لە هەموو ساتێکی بووندا دەستنیشانبکەین، لەدوای ئەوەی تێبینی رۆڵی حەرامکرنی زینامان کرد لەکاتی هەڵبژاردنی هاوبەشی ژیاندا. بۆیە بۆ راکردن لەم یاسایە ئەوەندە بەس نییە هاوبەشێك هەڵبژێرێت کە لە رووی بایۆلۆژی یان سایکۆلۆژییەوە لەکەسوکارو خێزان جیاوازبێت، چونکە ئەم یاسایە هەر بەهەژموونداریی و چەپاندنیش هەر بەکارایی دەمێنێتەوە، ئەویش بەهۆی نەبڕینی پەیوەندی ئۆدیبەوە (واتە دەرنەچوون یان تێنەپەڕین لەئۆدیب).

### گەڕانەوەی"ئۆدیب":

کاتێك لەنێوان دووهاوبەشدا قەیران سەرهەڵدەدات کە تاك لەسەر بناغەی پاراستنی خود یان پاراستنی هەندێك مەیل و ئارەزووی دیاریکراو، هاوبەشەکەی هەڵدەبژێرێت، بەلاّم لەرووی سایکۆلۆژییەوە لەدوای هاوسەرێتیی، پەرەدەسێنێت، تا ئەو ئاستەی هەوڵدەدات

سەرلەنوێ هەمان ئەو ئارەزوو مەیلانەی تێربکات.

هەروەها لەوانەیە ئەو قەیرانە بتەقێتەوە، کاتێك کامڵبوونی یەکێك لەدوو هاوبەشەکە دەبێتە هۆی قەناعەتنەکردن بەو سیفەتانەی کە لەسەرەتای پەیوەندییەکەیاندا ئارەزووی کردووە لەهاوبەشەکەیدا هەبێت، بۆنمونە تاك لەسەرەتای پەیوەندیدا بە شوێن ئەو سیفەتو خەسڵەتانەدا دەگەڕێت کە بە تەواوەتی لەوێنەی باوك جیاوازن، بەڵام ئەو جیاوازییەی کە ئەو تاکە بە شوێنیدا دەگەڕا لەچوارچێوەی بزوتنەوەیەکی بەرگریکارانەدا دژی وێنەی باوك دەبێتە جیاوازییەکی بێسود بەتایبەتی ئەگەر کامڵبوونی تاك بووە هۆی ئەنجامدانی بەراوردکردن لەنێوان وێنەی هاوبەشەکەو وێنەی باوکدا. لەمحاڵەتەدا وێنەی باوك کە پێشتر رەتکراوە بوو دەبێتە وێنەیەکی پێویست بۆ سەرلەنوێ رێکخستنەوەی خود.

ئەوەی شایەنی تێبینیکردنە هەڵبژاردنی هاوبەش لەسەرەتای پەیوەندیی هاوسەرێتییدا لەوانەیە رۆڵێکی یەکلایکەرەوە بنوێنێت لەپشتیوانیکردنو بەهێزکردنی چەپاندندا. بەڵام هەندێجار وا رودەدات کە کامڵبوونی یەکێك لەو دوو هاوبەشە یان پەرەسەندنیی کامڵبوونیان، دەبێتە هۆی گۆڕینی رەفتارو بیرو بۆچونەکانی بەرامبەر هاوبەشەکەی دی. ئەو هاوبەشەش سەری سوڕدەمێنێت کاتێك لۆمەو تۆمەتباریی ئاڕاستە دەکرێتو پرسیار دەکات بۆچی لەرابووردوودا بەهۆی سەرشێتیو گاڵتەو یارییەکانیەوە، خواستراوبووە، بەڵام ئەمڕۆ بەهۆی سەنگینیو سووربوونییەوە، سزا دەدرێت.

– بەهۆی سەنگینییەکەیەوە خۆشەویست بوو، بەڵام ئەمڕۆ



لۆمەدەکرێت، چونکە یاریو گاڵتە نازانێت.

– بەهۆی نەرمونیانییەکەیەوە خۆشەویست بوو، بەڵام ئەمڕۆ پێویستە جددییو توندوتیژ بێت.

خاتوو B و هاوسەرەکەی پێنج ساڵە هاوسەرێتییان کردووە، دوو کوڕیان هەیەو پەیوەندی نێوانیان هەر لەسەرەتاوە بە خۆشەویستییو لێکتێگەیشتن ناسرا بوو، بەڵام خاتوو B لەو ماوەیەی دواییدا دەستیکرد بە گلەییکردن لەهەڵەو کەمتەرخەمی هاوسەرەکەییو تۆمەتباری دەکرد کە بە شێوەیەکی تەواو بەرپرسیارێتییەکانی ناگرێتە ئەستۆ وەك منداڵ رەفتاردەکات. ژنەکە هیوای دەخواست هاوسەرەکەی ئەرکی هاوسەرێتیی بەرامبەر بە خۆیو باوکایەتیی بەرامبەر منداڵەکانی جێبەجێبکات. لەرابووردوودا باوکی خاتوو B بە تەواوی پێچەوانەی هاوسەری ئەو خاتوونە رەفتاری دەکرد. باوکی خاوەنی بڕیار بوو لەماڵدا، خاتوو B غیرەی لەدەسەڵاتو پێگەی باوکی دەکردو هەموو شتێکی دەکرد کە لەم دەسەڵاتە کەمبکاتەوە یان دژی ئەم دەسەڵاتە بوەستێتەوە .

لەم نێوکۆیەدا بە خێرایی هاوسەرێتیی لەگەڵ ئەو پیاوەدا بەست کە ئێستا هاوسەرێتییو ئەو پیاوە وەك هونەرمەندێکی سەرشێت، کاریدەکرد. ئەم پیاوە هونەرمەندە بە هێزوتواناو کەسێتی ژنەکەی زۆر سەرسام بوو، هیچ رێزێکی بۆ هەڵسوکەوتی خەزوری دانەدەنا.

بەشێوەیەکی شاراوە ئەو دەرئەنجامەی هەڵهێنجاند، کە نابێت رەوتی رەفتاری خەزوری بگرێت کە خۆیو ژنەکەشی رقییان لەو رەفتارانەی دەبۆوە. لەسەر ئەم بناغەیە پیشەی هونەریی هەڵبژارد، چونکە بایەخ بە پلەو پایە کۆمەڵایەتییەکان نادات. تاکە خەمی ئەوە

بوو بە ڕێککەوتن و بە بەختیاری لەگەڵ ژنەکەیدا ژیان ببەنەسەر ، لەدوای ماوەیەك سەریسوڕما کاتێك ڕووبەڕووی لۆمەو گازاندەی هاوسەرەکەی بۆوەو پرسیاری لەخۆی دەکرد بۆچی ژنەکەم گۆڕاوە؟. ئەم ژنە لەسەرەتادا ڕۆح سوك و قسەخۆش بوو، بەڵام ئەمڕۆ هەموو ڕەفتارێك ڕەتدەکاتەوە کە لەگەڵ ڕەفتاری باوکیدا هاوجێ نەبێت، دەیەوێت بە تەواوەتی ڕەفتاری هاوسەرەکەی لەگەڵ ڕەفتاری باوکیدا هاوجێ بکات و، داوای لەهاوسەرەکەی دەکرد هەڵوێستەکانی خۆی بگۆڕێت و دەیویست هاوسەرەکەی ڕەفتاری پیاوێکی کامڵ و توندوتۆڵ بگرێتەبەر.

## گەڕانەوەی مەیلە هۆمۆسێکسوالییەکان:

گەڕانەوەی چەپێنراو تەنیا ئارەزووە ئۆدیبییەکان ناگرێتەوە، چونکە ئارەزووە "پێش جینیتالییەکان Pregenitale و ئارەزووە هۆمۆسێکسوالییەکان homosexuels" لەوانەیە لەچوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتییدا سەرهەڵبدەنەوەو لێرەوە ببنە دەروازەیەك بۆ زۆر قەیرانی دیکە.

بەکارهێنانی روخسارە شاراوەکانی مەیلە هۆمۆسێکسوالییەکان ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕن لەدروستکردنی پەیوەندی هاوڕێیەتی بەشێوەیەکی دیارو ئاشکرا لەنێوان دووهاوبەشەکەداو ئەم مەیلانە لەرێی پشتبەستن بە هۆگربوونی خۆشەویستییی و سۆز، گوزارشتیان لێدەکرێت، چونکە مەیلی ئیرۆسییەت هێور دەبێتەوەو جۆرێك لەهاوڕێیەتی گەرموگوڕ لە نێوان دووهاوبەشەکەدا ڕوودەدات



.هەندێك لەهاوسەرەکان پەیوەندییەکانیان بە چالاکی هیترۆسێکسواڵ(توخم جیاوان) Heterosexuels –ی ئاشکرا دەستپێدەکەن، بەڵام ووردە ووردە مەیلە ئیرۆسییەکان بەرامبەر هاوبەشەکەی دی هێور دەبێتەوە. بەتێپەڕبوونی کات بە نزیکی پەیوەندی نێوانیان بەدەر دەبێت لەهەموو مەیلێکی ئیرۆسی و لەنێوان دوو هاوبەشەکەدا پەیوەندییەکی نیمچە خوشك و برایانە فۆرمەڵە دەبێت، لەچوارچێوەی ئەم پەیوەندییەدا خستنەوەبەرفرمانی سۆزداری بەرامبەر هاوبەشەکەی دی بەسروشتی دەمێنێتەوەو، جۆرێك لەهاوچەشنیکردنی ئاڵوگۆڕکراو وردە وردە بەرەو لەیەکچوون و هاوتابوونیان دەبات. تێبینی دەکەین لەم چوارچێوەیەدا پەنگخواردنی یان پچڕانی مەیلی ئیرۆسی Erotique بەرامبەر هاوبەشەکەی دی نابێت بەو شێوەیە لێکبدرێتەوە کە جۆرێکە لەلاوازی یان پیربوون، چونکە لێکۆڵینەوە سێکسوالییە هاوچەرخەکان سەلماندویانە ئەو کەسانە پارێزگاری لەتوانای سێکسوالی بێشوماری خۆیان دەکەن، تەنانەت لەدوای چوون بەتەمەنیشدا.

لەلایەکی دیکەوە دەرکەوتووە لەدوای مردنی یەکێك لەو دووهاوبەشە، چالاکی سێکسوالی بۆ هاوبەشە زیندووەکە دەگەڕێتەوە، لەهەندێك لەحاڵەتەکاندا زنجیرە کردارێکی ئاشکرا هەیە پشتدەبەستێت بە نواندنی یان لێکچواندنی هاوبەشەکە لەگەڵ وێنەی یەکێك لە باوان. ئەم نواندنە بۆ رابوونی "پەیوەندی ئۆدیبی" بەتاڵنەکراوە یان شیکارنەکراوە mal liquide دەگەڕێتەوە کە لەوانەیە ببێتە هۆی هێدی هێدی سەرهەڵدانی هەست و سۆزو

خۆشەویستیی، گواستنەوەی وێنەی ئۆدیبی باوان بۆ هاوبەش دەبێتە هۆی دروستبوونی پەیوەندییەکی نیمچە خوشك و برایانە لەنێوان دووهاوبەشەکەدا (ژن و پیاو).

ئەم شێوازە نادروستە لەپەیوەندی لەوانەیە بۆ ماوەیەکی دورو درێژ بەردەوام بێت بەو مەرجەی هیچ کام لەو دوو هاوبەشە ڕووبەڕووی مەیلە هیترۆسێکسواڵ– دژە توخمی Heterosexuels یان هۆمۆسێکسوالییەکان Homosexuels بەرامبەر کەسێکی دیکە لەدەرەوەی چوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتیی نەبێتەوە.

F.L ژنێك بوو ناچاربوو پەنا بۆچارەسەرکردن بەرێت، لەدوای ئەوەی بەهۆی شکستهێنانی لەژیانی هاوسەرێتیی و پیشەییدا ڕووبەڕووی نۆرەیەکی خەمۆکی توند بۆوە.

قۆناغی منداڵی بە ناخۆشیی و بێبەشبوونی سۆزدارییەوە بەسەربرد بوو بەتایبەتی لەدوای مردنی دایکی لەکاتی جەنگداو بێبەشبوونی لەسۆزی دایکایەتی و ئەمەش وایلێکردبوو بەشوێن ئەلتەرناتیڤی ئەم بێبەشبوونەدا بگەڕێت لەلای هەندێك لەو ژنانەی چاودێرییان دەکرد، لەقۆناغی هەرزەکاریدا هۆگری یەکێك لەو ژنانە بوو هەستی بە مەیلێکی توند دەکرد بەرامبەری، لەگەڵ کوڕێکی گەنجی قۆزدا هاوسەرێتی کرد بۆئەوەی لەم حەزە بە کەفوکوڵە ڕزگاری ببێت، ئەم کوڕە هەرچەندە کەسێکی کامڵ نەبوو، بەڵام هاوسەرێتی لەگەڵدا کرد، چونکە بووبووە هۆی هەژاندنی ئارەزووە هیترۆسێکسواڵەکانی.

ئەو هاوسەرێتییە ئەوەندە درێژەی نەکێشا، چونکە ژنەکە واتە F.L بەردەوام بوو لەسەر بەستنی پەیوەندی هاوڕێیەتی لەگەڵ



ژنانداو هێدی هێدی مەیلی بەرامبەر یەکێك لەهاوڕێ کچەکانی زیادیکرد، تا بەتەواوەتی لەهاوسەرەکەی جیابووە وە، بەڵام لەدوای ماوەیەك لەکامڵبوون و گەورەبوونی پێویست، بڕیاریدا خەریکی خوێندنەکەی بێت لەدوای ئەوەی لەم سەرکێشییانە بێزاربوو. دوای ماوەیەك هاوسەری دووەمی ناسی، کە لەئاستێکی ڕۆشنبیری بەرزدابوو، پیشەیەکی ڕێزداری هەبوو وێڕای ئەوەی لەچینێکی کۆمەڵایەتی ڕێزداریش بوو. F.L لای ئەم کوڕە گەنجە، جۆرێك لەمێیەتیی سروشتی خۆی بەدیکرد.

ئەم پیاوە ڕابووردووی ژنەکەی دەزانی و لەمەیلە هۆمۆسێکسوالییەکانی تێدەگەیشت و هیچ کاریگەریش نەبوو پێی، دەیتوانی بەئاسانی هاوچەشنی (تەماهی) لەگەڵدا بکات و وەڵامدانەوەی بۆ کەموکورتی سۆزی دایکایەتی کە ژنەکەی بەدەستییەوە دەیناڵاند، هەبێت، جۆرێك لەچاودێری و سۆزو خۆشەویستیی بەرامبەر دەنواند. هاوسەرەکەی نازی خۆیشیی و ژنەکەشی دەکێشا و ئەمەش ژنەکەی ڕازیدەکردو یارمەتیدەدا هاوچەشنی لەگەڵدا بکات.

F.L لەلایەن خۆیەوە لەگەڵ ژمارەیەك لە ژنانی شووکردوو تەڵاقدراو بەردەوام بوو لەسەر بەستنی هاوڕێیەتی، ئەم هاوڕێیەتییانە زۆرجار هاوسەرەکەشی بەشداری تێدا دەکردو نەدەگەیشتە سنووری پەیوەندییە سێکسوالییەکان.

F.L دوای ماوەیەك توانی وردە وردە دەستبەرداری سەرکێشییە هۆمۆسێکسواڵ(هاوتوخم)ەکانی ببێت و بەکاوەخۆ لەهاوڕێ کچەکانی جیابۆوە. ئەم پەرەسەندنەی بوو بەهۆی قەرەبووکردنەوەی

کەموکورتی سۆزی دایکایەتیی و گەشەسەندنی مەیلە هێترۆسێکسواڵەکانی.

گرێی خەسان، هەریەك لەدڵەڕاوکێ و ئارەزووی دەستکەوتنی "چووك"ی لادروستکرد. ئەمەش بووە هۆی هەژاندنی هەستی رقلێبوونەوە لەنێرینەو پاڵی پێوەنا پەرە بە توانای سەرنجراکێشانی خۆی بدات بۆئەوەی دەستبگرێت بەسەر ئەوانەی هەڵگری چووکن تا لەناو خودی خۆیدا پێکەوەنوسانیان لەگەڵدا بکات، لەگەڵ توانای سەرنجراکێشان و پێکەوەنووسانیدا، بەڵام نەیتوانی روخسارەکانی ئیرەیی و غیرەی بشارێتەوە بەتایبەتی لەو قۆناغەدا کە هاوسەرەکەی خەریکبوو بایەخی بە ژنێکی جوان دەدا، ئەم هەوڵیدەدا سەرنجی رابکێشێت، بەڵام شکستیهێنا. ژنەکە تا قۆناغێکی پێشکەوتووی شیکاری دەروونی لەسەر ئەم حاڵەتە مایەوە، وردە وردە دەستیکرد بە پشتبەستن بە خۆی و توانی لەکەسانی دیکە سەربەخۆ بێت و هەوڵنەدات سەرنجیان رابکێشێت، لەدوای ئەم پەرەسەندنە کە بەسەر F.L دا هات، هاوسەرەکەی تووشی پشێوی بوو، چونکە نەیتوانی لەگەڵ پەرەسەندنی ژنەکەیی و سەربەخۆبوونی ئەم (واتە پیاوەکە) خۆی بگونجێنێت.



## بەشی هەشتەم

# دابەشکردنی رۆڵەکان لەنێوان ئەندامانی خێزاندا

### جومگاندنی نەستی نێوان ئەندامانی خێزان:

لەچوارچێوەی ئەو زنجیرە کردارانەی کە پەیوەندییە خێزانییەکان کۆنترۆڵ دەکەن، کردارێکی گرنگ هەیە کە پەیوەستە بە جومگاندنی نەستیی نێوان تاکەکانەوە ئەویش ئەم کردارەیە: هەر هەڵوێستێکی سەرکوتکراو، تابۆ یان تەنانەت سایکۆسسی لەلایەن یەکێك لەتاکەکانەوە، لەبەرامبەردا لەلایەن تاکێکی دیکەی خێزانەوە بەشێوەیەکی عەفەوی هەڵوێستێکی گەڕاوەیی regressif، دەنوێنرێت. تێبینییە کلینکییەکان تایبەت بە خێزان جەخت لەوە دەکەنەوە ئەو فرمانانەی وەڵامدانەوەیان بۆ پێکهاتە سایکۆلۆژییە ناوەکییەکان "من و منی باڵاو ئەو" دەبێت، بەلای ئەو کەسانەوە وەك هاندەرێکی ناوەکیی نامێننەوە، بەڵکو بڵاودەبنەوەو لەنێوان تاکەکانی خێزانێکدا بەپێی هەندێك رێسا دابەشدەبن.

ئەم دیاردەیە بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا" لەچوارچێوەی پەیوەندییەکی دوالیزمیدا دەردەکەوێت، چونکە تێبینی جۆرێك لەدەستتێکەڵاوکردنی نەستی collusion in consciente هەیەو

لەبناغەی ڕێککەوتنی سایکۆلۆژی نێوان دووهاوبەشەکەدا دروستدەبێت" [1]، ئەگەر یەکێك لەدوو هاوبەشەکە هەڵوێستێکی گەڕاوەیی وەرگرت ئەوا ئەوی دیکەیان هەڵوێستێکی بەرگریکارانەو کاملأنە دەگرێتەبەر، ئەم هەڵوێستەی دواییان دەشێت وەلأمدانەوەیەکی ڕاستەوخۆ بێت بۆ دابینکردنی ئارەزووەکانی هاوبەشی یەکەم یان هەڵوێستەکە ئارەزووەکانی هاوبەشی یەکەم سەرکوت‌و تابۆ بکات. ئەگەر یەکێك لەدوو هاوبەشەکە ڕوخسارێکی نیرۆتیکی nevrotique (خەمۆکی یان ڕوخسارێکی دی) خستەڕوو ئەوا هاوبەشەکەی دی کاردەکات بۆ چەپاندنی ئەو ڕوخسارە لەناو خودی خۆیداو بە ڕوخساری کەسێکی بەهێزو پاڵپشتیکاری هاوبەشەکەی، خۆی دەردەخات.

## چەمکی ڕۆڵ‌و ناوەڕۆك‌و کاریگەرییەکانی:

دابەشکردنی ڕۆڵەکان بە ڕەگەزێکی سەرەکی دادەنرێت لەفرمانەکانی گروپداو دیاریکردنێکی ڕێکخراو خۆی دەسەپێنێت، لەبەرئەوەی بە شێوەیەکی زیندەگی پەیوەستە بە مێژووی تاکەوە، چونکە دووبارەبوونەوەی ئەو ڕۆڵە دەنوێنێت کە تاك لەچوارچێوەی خێزانە سەرەکییەکەیداو بەتایبەتی لەگەڵ دایك‌و باوك‌و خوشك‌و براکانیدا، وەریدەگرێت: X ڕۆڵێکی دیاریکراوی هەڵبژاردووە، لەگەڵ Y دا شێوازی هەمان پەیوەندی دووبارەدەکاتەوە کە پێشتر لەگەڵ یەکێك لەئەندامانی خێزانەکەیدا هەیبووە) بێگومان ئەو ڕۆڵەی پێشتر لەچوارچێوەی خێزانەکەیداو بەتایبەتی لەگەڵ یەکێك لە



باوانیدا، وەریگرتووە. دووبارەبوونەوەی ڕۆڵە دیاریکراوەکان پاڵمان پێوەدەنێت بۆ ئەو دەرئەنجامەی بڵێین سنورەکانی نەستی پەیوەست بە گۆڕانی پەرەسەندنە سۆزدارییەکان لەهەستی تاك‌و ئامادەبوونیاندا دەمێننەوە، بۆ وەرگرتنی ئەو ڕۆڵەی لەدوایدا وەریدەگرن.

– ڕیچەر Richter [2] پێناسەیەکی سنورداری بۆ ڕۆڵی تاك لەڕووی سایکۆلۆژی کۆمەڵایەتییەوە پێشکەش کردووە، دەڵێت: "ڕۆڵ کۆی کۆمەڵە ئاوێتەیەکە، بە شێوەیەکی هەستیی یان نەستیی دوو هاوبەش لەیەکتری چاوەڕێیدەکەن". لەم نێوکۆیەدا ڕیچەر Richter ئاماژەیداوە بە فرمانی بەرگریکارانەی تاك‌و ڕازیبوونی تاك بەرامبەر تایبەتمەندێتی ئەو ڕۆڵەی کە دەینوێنێت.

زۆرجار تاك بۆ ڕزگاربوون لەکرژبوونە سایکۆلۆژییە ناوەکییەکانی خۆی پسپۆرێتی لەڕۆڵێکی دیاریکراوو ڕازیبوون پێی بەکاردەهێنێت: تاك لەجیاتی ئەوەی خۆی ڕووبەڕووی ملململانێ ناوەکییەکانی خۆی بێتەوە، هەوڵدەدات بۆ گواستنەوەیان‌و دەیخاتە ناو کەسانی دییەوەو دەیانخنێتە introduire ئەو پەیوەندییەوە کە لەگەڵ تاکی بەرامبەردا هەیەتی. ئەم شێوە ڕێکخستنە لەسەر خێزانیش جێبەجێدەبێت، چونکە هەر تاکێك هەوڵدەدات ڕوخسارە ئارەزوونەکراوەکان لەناوەوەی خۆیدا ڕەتبکاتەوەو بیخاتە ناو ئەو پەیوەندییەوە کە لەگەڵ تاکی بەرامبەردا هەیەتی. لێرەدا شێوەیەك لەشێوەکانی بەرگریکردن هەیە کە کەسی بەرامبەر وەك بابەتێکی ئەلتەرناتیڤ بەکاردەهێنرێت هەروەك بڵێی درێژبوونەوەی نارسیزمی خود، خۆیەتی.

لەم مانایەوە لەوە تێدەگەین، وەرگرتنی رۆڵ و رازیبوون پێی لای تاك ئەو میكانیزمە بەرگرییە سایكۆلۆژییە كۆمەڵایەتییە دروستدەكات كە هاوتایە لەگەڵ میكانیزمە بەرگرییە سایكۆلۆژییە ناوەكییە intrapsychiques باوەكان لە (چەپاندن و گەڕانەوەو كودەتا بۆ دژو رەتكردنەوەو ئەوانی دی).

بەمشێوەیە پشتیوانیكردنی رۆڵەكان لەچوارچێوەی خێزاندا میكانیزمێكی بەرگریكردنی تاكانەییەو لەهەمانكاتدا فرمانێكی رێكخراوەو لەچوارچێوەی خێزاندا دەبێتە پاڵپشت بۆ شێوازی ژیان.

## دابەشكردنی رۆڵەكان و سودەكانی پەیدادەبن لێی:

ستێرلینStierlin و ریچەرRichter و ویلی Willi [3] لەوانەبوون كە زۆر بایەخیان بە مەسەلەی دابەشكردنی رۆڵەكان داوە لەچوارچێوەی خێزاندا، هەروەها فرۆید لەزۆربەی ئەو دەقانەدا كە چارەسەری ژیانی خۆشەویستیی تێداكردووە ئاماژەی بەم مەسەلەیە داوەو گرنگی زیاتری بە بایەخی پەیوەندی نێوان تاك و بابەتەكانی داوە:" ئێمە لەتاكی بەرامبەرماندا ئەو شتانەمان خۆشدەوێت كە لەخودی خۆماندا خۆشماندەوێت " یان بە مانایەكی دی، تاك نمونەی باڵای خۆی خۆشدەوێت كە لەبابەتی خۆشەویستییەكەیدا دایناوە.

ئەم روانگە فرۆیدییە كە لەمرۆدا بۆتە بابەتێكی باوو زانراو لەبەرامبەردا زۆر بەكەمی نەبێت ئەو سودانەی ئاشكرانەكردووە كە بابەتی خۆشەویستیی دەیچنێتەوە لەكاتێكدا ئەو بابەتە بۆتە خودی



تاك. چونكە تاك و بابەتی خۆشەویستی دەشێت سوودی ئاڵوگۆڕكراو لەكرداری دابەشكردنی رۆڵەكاندا بچننەوەو ئەم سودانەش دەشێت هەستی یان نەستی، نیورۆسسی یان نانیورۆسسی، بن .

ئەوەی زیاتر لەپرۆسەی دابەشكردنی رۆڵەكاندا تێبینی دەكرێت بەیەكەوەنووسانی كردارە تاكییەكان و پەیوەستبوونی روخسارەكانی منداڵی هەر تاكێكە: A بەهۆی مەیلە تاكییە خودییەكانی و گۆڕانەكانی پەرەسەندنی سۆزدارییەوە بۆتە بابەتی ئارەزووكردن لای B كەبە دەست كێشبەندییەكی هاوتاوە دەناڵێنێت و ئامادەیە بۆ وەلامدانەوە بە شێوازێكی تایبەتی. لەنێوان A و B– دا دابەشكردنی رۆڵە دیاریكراوەكان رێكدەخرێت. دەتوانین بڵێین، ئەگەر بەوردی تێبینی بكەین، A هانی B–ی داوە بۆ بینینی رۆڵێكی دیاریكراو یان بە پێچەوانەوە ، ئەم كارە وا پێویستدەكات هەردووكیان سووربوون و دەستپێشخەرییان هەبێت: چونكە روخسارەكان زیاتر نەستین، لەبەرئەوە لە نێوان دوو تاكەكەدا زۆر ئاڵۆزو ئاڵوگۆڕكراون.

لەواقیعدا ئامادەبوونی A و لەبەرامبەر ئەو پەیام و گوزارشتە هەستیی و نەستییانەدا كە دەریاندەبڕێت B بە ژمارەیەكی دیاریكراو لەجوڵەو وشەو هەڵوێست، وەڵامدەداتەوە كە پشتیوانی لەپەیامەكانی A دەكەن، بەمشێوەیە دابەشكردنی رۆڵەكان لەنێوان یەكتریدا تا ئاستێك بە ئارامی دەمێنێتەوە.

ئەو سوودانەی كە دوو هاوبەشەكە لەدابەشكردنی رۆڵەكان دەستییان دەكەوێت روون و ئاشكرا دەبن یان بەشێوەیەكی نەستی دەبێت، وەك ئەو سوودە گەڕانەوەییانەی regressif ئامانجی چێژوەرگرتنە یان بە ئامانجی خۆپاراستن رێكدەخرێن.لەهەموو

حاڵەتەکاندا گەڕان بەدوای سوودە داپۆشراو یان شارراوەکاندا، ئامانجی سەرەکی پرۆسەی ڕۆڵبینین دەنوێنێت:

NP قۆناغی منداڵی تارادەیەك بە ئاسانی بەسەر برد، بەڵام بەدەست جۆرێك لەهەستکردن بە گوناه، دەینالاند کە پەیوەست بوو بە بارودۆخی سەرەتای پەروەردەکردنییەوە، هەرچەندە بوونی ئەو هەستەی لای خۆی ڕەتدەکردەوە، بەڵام هەمیشە "هەستکردن بە گوناه"ی لەناخدا بوو. سەرەتای سەرکێشییە سۆزدارییەکانی لەگەڵ ئەو هاوڕێیانەدا بوو کە بەدەست گیروگرفتی خۆیانەوە دەیاننالاند، NP خۆی تەرخاندەکرد بۆ یارمەتیدانیان، لەنێو ئەو هاوڕێیانەدا کچێکی تیابوو ماددە بێهۆشکەرەکانی وەردەگرت و زۆر پێوەی ئالودەبوو، زۆریش یارمەتیدا، بەڵام لەدواییدا دەستبەرداری بوو، چونکە هەستیکرد لەڕووی سایکۆلۆژییەوە کەسێکی هاوسەنگ نییە. ئەم ڕووداوە زۆر کاریکردە سەر دەروونیی و بڕیاریدا ڕێگەو شێوازی مامەڵەکردنی خۆی بگۆڕێت و چیدی ئەو کەسانەی هەڵنەدەبژارد کە ڕووبەڕووی گیروگرفت بونەتەوەو خۆیشی بۆ خزمەتکردنیان تەرخاننەدەکرد، بەڵام ئەم شێوازە نوێیە لە مامەڵەکردندا بەرەو ژمارەیەك ئەزمونی شکستهاتووی برد، تا کچێکی دۆزییەوە کە ئێستا هاوسەرییەتی، ئەم کچە زۆر دڵسۆز بوو، حەزیشی لەم کردبوو، مەیل و ئارەزووە قوڵەکانی ئەمی دەدۆزییەوەو بەو ڕێکخستنە بەرگرییانە ئاشنا بوو کە NP بەکاریدەهێنا تا لەگەڵ واقیعدا خۆی بگونجێنێت.

لەدوای ساڵێك لە پەیوەندی نێوانیان، ڕووداوێکی ئۆتۆمبێل ڕوویدا کە NP خۆی لێیدەخوڕی وهەرچەندە ژنەکەی بە سەختی



بریندار نەبوو، هەروەها لەڕووی یاسایشەوە هیچ هەڵەیەکی نەکردبوو، بەڵام شعوری "هەستکردن بە گوناه"ی پێشووی لا بوژاندەوە کە لەناخیدا شاراوەو داپۆشراو بوو. NP لەسەرەتادا چارەسەرکردنی ڕەتکردەوە، بەڵام ژنەکە لەدوای ئەوەی خاڵی لاوازیی پیاوەکەی ئاشکراکرد توانی بە هاوکاری شیکارکارەکە یارمەتی هاوسەرەکەی بدات بۆ ڕزگاربوون لەو هەستکردن بە گوناهەی هەمیشە بە شاراوەیی لەدڵیدا بوو، بەڵام ڕەتیدەکردەوە.

- لەچوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتیدا جۆرێکی دیکە لەپرۆسەی دابەشکردنی ڕۆڵەکان هەیە، یەکێك لەدووهاوبەشەکە لەپێناوی هاوبەشەکەی دیدا بێ بەرامبەر قوربانی بە خۆیدەدات، دەکرێت تێبینی ئەمە بکەین لەوبارەدا کە یەکێك لەدوو هاوبەشەکە ڕۆڵی منداڵێکی بەناز یان ناز پێدراو دەخاتە پاڵ هاوبەشەکەیی و خۆیشی پارێزگاری لێدەکات و بایەخی پێدەدات بێئەوەی لەبەرامبەردا هیچی دەستبکەوێت "من هۆگری بووم، هەمووشتێکم لەپێناویدا کردووە، هەموو شتێکم پێبەخشیوە کە ویستوویەتی".

ریچەر Richter [٤] ئاماژەیداوە بە ڕۆڵی ئەلتەرناتیڤی ئەو هاوبەشە، کاتێك A ڕۆڵی هاوبەشەکەی پێشووی دەخاتەپاڵ(B) یان هەندێجار ڕۆڵی یەکێك لەباوان دەخاتەپاڵی (ئەو ڕۆڵە ئایدیالیزەکراو بێت یان بەشێوەیەکی دووفاقی خرابێتە بەرفرمان) بۆ نمونە دەوترێت: "تۆ وەك باوکم باشی" .. ئەم شێوازە لەپەیوەندیو دابەشکردنی ڕۆڵەکان لەلایەن دوو هاوبەشەکەوە بە پارێزگاریکراوی دەمێنێتەوە تاکو کامڵبوونی یەکێکیان دەبێتە هۆی گۆڕینی.

هەروەها لەم نێوکۆیەدا لەچوارچێوەی خێزاندا شێوەیەکی دیکە

لەدابەشکردنی رۆڵەکان تێبینی دەکرێت، هەموو ئەندامانی خێزان رۆڵێکی دیاریکراو دەخەنەپاڵ یەکێکیان: ئەم خستنەپاڵە لەهەندێك حاڵەتدا پشتدەبەستێت بە کەسایەتییەکی خێزانی پێشوو یان دەگەڕێتەوە بۆ هاوچەشنیکردنێکی identification میتۆلۆژی خێزانەکە لەگەڵ کەسایەتییەکی تا رادەیەك خەیاڵی. ئەم هاوچەشنیکردنە لەوانەیە دەرئەنجامی پۆزەتیڤانە بەدەستەوە بدات کە یارمەتیدەرە لەدابینکردنی تێربوونی نارسیزمی ئەو کەسەی کە رۆڵەکەی خراوەتەپاڵ، لەوانەشە دەرئەنجامی نێگەتیڤ بە دەستەوەبدات ئەگەر ئەم رۆڵەی دەخرێتە پاڵی بووە هۆی رقلێبوونەوەو داگیرکردنی بەهای خودیی یان بووە هۆی ناچارکردنی تا قورسایی و بەرپرسیارێتییەکی وا لەئەستۆبگرێت کە لەگەڵ ئارەزووە تایبەتییەکانی خۆیدا نەگونجێت، (لەخێزانەکەماندا یەکێکمان لەبابەتی ماتماتیکیدا زۆر باشە: پێویستە خوێندن لەم پسپۆڕییەدا تەواوبکات) ئەمە بە چاوپۆشین لەمەیل و ئارەزووەکانی خۆی. لێرەدا ئەم خستنەپاڵە هاوبەشە زیاتر پشت بە چەمکی پەیام mission و میتۆلۆژیی خێزانی دەبەستێت هەروەك چۆن پشت بەو خستنەپاڵە projection هاوبەشە دەبەستێت کە رێکخستنی خێزان دروستدەکات و پشتیوانی لێدەکات. کاتێك رۆڵێکی دیاریکراو دەخرێتەپاڵ ئەندامێکی خێزان ئەوا زۆرجار دەرئەنجامی پاسۆلۆژی لەسەر ئەو کەسە بەجێدێڵێت.

– شێوازێکی دیکە لە پەیوەندیدا هەیە کە پەیوەستە بەرووبەرووبوونەوەی ئەو هەستانە یان ئەو میکانیزمە نەستییانەی کە هەستکردن بە گوناه دەوروژێنن: کاتێك S دەروخێت و گوزارشت



لەهەستکردن بە گوناه دەکات، هاوبەشەکەی P ئەم هەستانەی لەلا هێور دەکاتەوە، بێئەوەی ئەوە ئاشکرابکات کە خۆی هیچ رۆڵێکی هەبووبێت لەوروژاندنیدا، لەمبارەدا، تێبینی دەکەین S هەست بە حەوانەوە دەکات، چونکە کەسێك هەیە کە یارمەتی بدات. P یش هەست بە بەهای خودێتی خۆی دەکات، چونکە توانای خۆشەویستیی و یارمەتی هەیە.

– زۆرجار P هەوڵدەدات قەناعەت بە S بکات کە هۆکاری شکستهێنان و هەستکردنی بە گوناه دەگەڕێتەوە بۆ کەسێکی دیکە: ئەو کەسە دەشێت دوژمن یان کێبڕکێکار یان بەرێوبەرەکەی بێت لەکارەکەی یان دەشێت بەهۆی فاکتەری بۆماوە یان خواردنەوەی کهولەوە بێت .

بەمشێوەیە Pو S خستنەپاڵەکانیان یەکدەگرێت کە خۆیان هۆکاری هەستکردن بە گوناه و شکستی دەخەنەپاڵ کەسێکی دیکە کە ئەو کەسە دەشێت واقعیی بێت (واتە بەراستی هەبێت) یان گریمانەیی یان رەمزی بێت. ئەمەش کاریگەریی پۆزەتیڤی بۆ سەر پەیوەندی نێوانیان دەبێت و کۆیان دەکاتەوە و توانایان بۆ رووبەرووبوونەوە بەهێز دەکات.

– لەهەندێك حاڵەتی دیکەدا، P بەرگەی هەستکردن بە گوناه لای S ناگرێت، چونکە ئەم هەستانە لەوانەیە دڵەڕاوکێ و ئەو کێشبەندییە هاوبەشەی بەشێوەیەکی نەستی کۆی کردوونەتەوە، ببوژێنێتەوە. لەم حاڵەتەدا P هاوبەشەکەی خۆی، واتە S رەتدەکاتەوە و لۆمەی دەکات بەهۆی گوزارشتکردنییەوە لەم هەستانەی و کاردەکات بۆ بەهێزکردنی خەمۆکی لەلای. رۆڵبینینی هەریەکەیان بەوشێوەیە

دەشێت بە جێگیری بمێنێتەوە، واتە S هەر بە نەخۆشیو P–یش هەوڵی چارەسەرکردنی نەداتو لەوانەیە قەناعەتی پێبکات کە چارەسەرکردن سودی نییە، چونکە چارەسەرکردنی Sو چاکبوونەوەی لەوانەیە ئەم ڕێکخستنە (واتە ڕێکخستنی پەیوەندیی نێوانیان ) بەرەو مەترسی بەرێت.

هەر لەچوارچێوەی خێزاندا شێوازێکی دیکە لەپەیوەندیدا هەیە کە پشتەبەستێت بەوەی رۆڵی منی نێگەتیڤ Moi negatif دەخاتەپاڵ تاکی بەرامبەر: A "بەشێوەیەکی نەستی" لایەنێکی نێگەتیڤ لە ناو خودی خۆیدا رەتدەکاتەوە لەجیاتی ئەوەی بەشوێن ئایدیالیزەکراوی منی خۆی Ideal de Moi لەهاوبەشە خۆشەویستەکەیدا B بگەڕێت (کە ئەمە ئەستەمە چونکە لەلایەنە نێگەتیڤەکەی خۆی رزگاری ناکات) بەڵکو بە پێچەوانەوە "بەشێوەیەکی نەستی" دەگەڕێت بەشوێن روخسارێکی نێگەتیڤ لە B دا، تا ئەو لایەنە ناچیزەی ناخی خۆی بخاتە پاڵی. A بە تایبەتی کەموورتییەکانی B یان منی نێگەتیڤی خۆی Moi negatif بۆ ئەم کردارە هەڵدەبژێرێت.

بەمشێوەیە B بەرگەی ئەو لایەنە خراپەی A دەگرێت یان بەهۆی بەرگەگرتنو بەرجەستەکردنی ئەو روخسارە نێگەتیڤەی A خۆی دەبێتە کەسێکی ناچیز (واتە A رقی لێی دەبێت). B روخساری نێگەتیڤی A دەخاتەروو بە شێوەیەکی دیار ئاشکرای دەکات بەمشێوەیە لەم حاڵەتەدا A دەتوانێت ئەو روخسارە لەناو ناخی خۆیدا فەرامۆش بکات یان رەتبکاتەوە، هەروەها بێئەوەی خۆی هەستی پێبکات لەدژی هەر باشبوونێك لە B–دا دەوەستێت، چونکە



ئەو باشبوونەی B لەوانەیە ببێتە هۆی لەقاندنی هاوسەنگییە ناوەکییەکەیی ئەو– A.

لەسەر بناغەی ئەم دابەشبوونە دوو بۆچوون هەیە:

١– رۆڵی قوربانی bouc emissaire :B لەرێگەی پاڵپێوەنانو هاندانی A– یەوە بەرگەی روخسارە نێگەتیڤەکان دەگرێت بە تایبەتی روخسارە غەریزەییە مەترسیدارەکان، بەمشێوەیە ئاماژە بە B دەدرێت کە ناتوانێت جڵەوی غەریزەکانی یان پاڵنەرەکانی بگرێت (هەرجۆرە غەریزەو پاڵنەری شەڕانگێزی یان سێکسوالی یان ناکۆمەڵایەتیی یان پاسۆلۆژیی یان لادانێك بن).

A لەوە دڵنیا دەبێت کە ئەم ملکەچی ئەو غەریزەو پاڵنەرە شازانە نابێت کە لەناو خۆیایەتیو بەمەش هەست بە دڵنەوایی دەکاتو هەستدەکات ئەو لەهاوبەشەکەی باشترە.

A هەندێجار دەتوانێت هەندێك لەپاڵنەری سادیزمی یان (خۆماتدان) بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ تێربکات، ئەم تێرکردنەی پاساوی هەیە، چونکە ئامانجی بێزارکردنی Bو سزادانییەتی. هەروەها A دەتوانێت تێربوونی غەریزی فەنتازی بەدیبهێنێت، چونکە دەتوانێت بە شێوەیەکی نەستی لەگەڵ B هاوچەشنی بکات لەو کاتەدا کە B روخسارە نێگەتیڤەکان دەنوێنێت."A بەوپەڕی خۆشحاڵییەوەو بێ هیچ خۆپارێزییەك لەکاتی چارەسەرکردندا باسی وردەکاری هەموو ئەو کارە بێزراوانە دەکات کە B ئەنجامیان دەدات".

لەهەندێك حاڵەتی دیکەدا، A کەسێکی خەمۆکەو بۆ رەخنەگرتن لەخۆییو سزادانی خۆی ئامادەیە. لەکاتی کرداری دابەشکردنی

رۆڵەکاندا، دەتوانێت ئەم مەیلانە بگۆڕێت و بیخاتەپاڵ B. بەمشێوەیە دەتوانیت بەهۆی هەڵبژاردنیB وەك کەسێکی لاوازو گوناهکار واخۆی ببینێت کەئەو باشترەو ئاقڵترەو زیاتر درك بە شتەکان دەکات و سروشتییە، هەروەها چەندە B لەرەفتارە هەڵەکانیدا بەردەوام بێت ئەو (واتەA) خۆی لە هەستکردن بە خەمۆکی و سزادانی خۆی بەدوور دەگرێت. ئەم رەفتارە هەندێجار لەوانەیە لەلایەن A یەوە بەشێوەیەکی شارەوە هانبدرێت.

٢- رۆڵی بەشە لاوازەکە: لەمبارەدا B روخسارە لاوازەکانی A بەرجەستە دەکات یان هاندەدرێت بۆ بەرجەستەکردنی روخسارە لاوازەکانی A. A جەخت لەخودی خۆی دەکاتەوە، چونکە خۆی بە بەهێزتر لە B دەبینێت. A دەتوانێت سودی نارسیزمی گرنگ لەم پەیوەندیی خۆشەویستییەیدا بە دەست بهێنێت، هەروەها دەتوانێت بەهۆی کرداری هاوچەشنیکردن لەگەڵ هاوبەشەکەیدا، بەشێوەیەکی فەنتازی بەشداری روخسارە لاوازو کەموکورتییەکانی B بکات و دەشتوانێت ئەم روخسارانە لەناخیدا بەندبکات و دانی پیادانەنێت یان رەتیبکاتەوە، چونکە B درێژبونەوەیەکی نارسیزمی ئەو دەنوێنێت، گوزارشتیی لێدەکات و دەیخاتەروو.

هەندێك تێبینی سەبارەت بە دابەشکردنی رۆڵەکان:

أ- دابەشکردنی رۆڵەکان پشت بە ئامادەباشییە تاکێتییەکان دەبەستێت کە پەیوەستن بە گۆڕانەکانی گەشەی سۆزدارییەوە لەماوەی قۆناغەکانی منداڵیدا، هەروەها تاك ناتوانێت هەموو رۆڵەکان ببینێت.

ب- وا پێویست دەکات هەموو ئەندامانی خێزان بەشداریبکەن و



ئەم بەشداربوونەش لەبارێکی گۆڕاودا دەبێت و یان روخسارە پاڵنەرییەکان Pulsionnels یان روخسارە بەرگرییەکانی Defensifs دژ بە پاڵنەرو دژ بە لیبیدۆ لەخۆیدەگرێت.

ج- ناتوانرێت ئەم دابەشکردنە بە پاسۆلۆژی Pathologique دابنرێت، چونکە لەسەرجەم پەیوەندییە خێزانییەکاندا تێبینی دەکەین و لەسەر ئاستی جیاوازیش: هەروەها دەشێت لەزۆر حاڵەتدا پەرەبسێنێت یان پێچەوانە ببێتەوە.

- ئەم دابەشکردنە دەبێتە حاڵەتێکی پاسۆلۆژی لەمبارانەی خوارەوەدا:

أ- ئەگەر چڕو، دوبارە بۆوەو،بەهێز بوو.

ب- ئەگەر چەقبەستوو، جێگیر بوو، پێچەوانە نەبۆوە یان ئاڵوگۆڕ نەکرا.

ج- ئەگەر کاریگەری پاسۆلۆژی هەبوو، بەڵام نەبووە هۆی تێرکردنی نارسیزمی.

- ئەم دابەشکردنەی رۆڵەکان، سودی نەستی بۆ تاکە جیاوازەکانی خێزان بەدەستدەهێنێت، هەروەها لەوانەیە سودی هەبێت لەحاڵەتەکانی نیورۆسسی خێزانیدا. لەم نێوکۆیەدا ریچەر Richter[°] دووجۆر نیورۆسسی خێزانی جیاکردۆتەوە، نیورۆسسی خێزانی بۆ نیشانەکان nevroses familiales de symptomes لەگەڵ نیورۆسسی خێزانی بۆ مۆرك یان خەسڵەت nevroses familiales de caracteres کە پشت بە رێکخستنی هاوبەشی بەرگریکردن لەنێوان تاکەکاندا دەبەستێت کە تارادەیەك لەگەڵ یەکتریدا هاوپەیمانیان بەستووە.

لەنیورۆسسی خێزانی بۆ نیشانەکاندا، ئەو کەسەی وەك نەخۆش ئامارژەی پێدراوە یان وەك کەسێك کە کەموکورتییەکی هەیە، ڕێگە دەدات بە هەموو ئەندامانی دیکەی خێزان لەوە دڵنیابن کە ئەوان ئەم نیشانانەیان هەڵنەگرتووە، هەر شتێك نێگەتیڤە دەخرێتەپاڵ تەنیا کەسێكو ئەو کەسە دەبێتە نیشانە یان نیشانەی symptome لۆکەلی خێزانەکە دەنوێنێت. ئەوکەسەی کە دیاریکراوە بۆ ئەمە یاخود وەك نەخۆش ئامارژەی بۆکراوە دەبێتە کەسی خواستراو لەچوارچێوەی خێزانەکەدا. لەم جۆرە خێزانانەدا دوورکەرتبوون یان دابەشبوونێك (clivage) ڕوودەدات لەنێوان ئەو تاکە کەمئەندامە کە کەموکورتی هەیە یان ئەوەی نیشانەی خێزانەکەی هەڵگرتووە لەگەڵ ئەندامەکانی دیکەی خێزانەکە کە لەو کەموکورتیو نەخۆشییە پارێزراونو بە کەسانی دروستو سروشتی دادەنرێن.

ئەم دابەشبوونە لەوانەیە زیادبکاتو ببێتە هۆی ڕەتکردنەوەی تاکە کەمئەندامەکە (نەخۆشەکە) و هەندێجار دەرکردنیشی. بەڵام بە شێوەیەکی گشتیی خێزان تا ئەو ئاستە ناڕوات کە ئەو کەسە نەخۆشە دەربکات، چونکە بەمە ئەو سوودانەی لەدەستدەدات کە لەوانەیە بەهۆی ئەم دیاریکردنەوە واتە بەهۆی ئەو ڕۆڵەوە کە خستویەتییە پاڵ ئەو ئەندامەیەوە، دەستییکەون.

لەنیورۆسسی خێزانیدا "بۆ مۆرك" پێچەوانەکەی ڕوودەدات، تێبینی دەکرێت هاوکارییەکی بەهێز لەنێوان تاکەکاندا ڕوودەداتو بەمە کۆمەڵەیەك لەتاکی ئایدیۆلۆژیی یان میتۆلۆژیی هاوبەش پێکدێنن کە گیروگرفتە ناوەکییەکانی هەر تاکێك لەم کۆمەڵەیەدا بایەخی پێدەدرێتو دەخرێتەوە بەرفرمان، بەمشێوەیە بەرامبەر هەر ئاگادارکردنەوەیەکی پاسۆلۆژی یەکێك لەو تاکانە، ئەندامەکانی



دیکەی خێزانەکە بەرگرییە هاوبەشەکانییان بەهێزدەکەنو لەگەڵ ئەو تاکەدا کە هەڵگری نیشانەکانە هاوچەشنی identifent دەکەنو ئەو تاکە دەبێتە ناوەندی بایەخپێدانی هەموان. خستنەپاڵە projections هاوبەشەکان (خراپ یان مەترسیدار) بەرەو دەرەوەی چوارچێوەی خێزانەکە جەمسەر دەگرنو ئەویش بە ڕێگەیەکی مەجازییو ئەفسانەییو هەندێجاریش بەشێوەی سایکۆسسی (سایکۆسسی بەکۆمەڵ delire collectif)، ئەمەش وادەکات، پێکهاتەی خێزانەکە پارێزراو بێتو بە باشیو دروستی بمێنێتەوە.

## دابەشکردنی ڕۆڵەکان لەحاڵەتە پاسۆلۆژییەکاندا:

ئەو پەیوەندییانەی کە کەسانی خەمۆك دەگرنەخۆ (زیاتر شڵەژاون) زۆرکات ڕێکخستنێکی تایبەتیان هەیە، چونکە ئەم جۆرە کەسانە، پەیوەندی خێزانی وەك هۆکارێك بۆ بەرهەڵستی کردنی پاڵنەرەکانی مردن، بەکاردەهێنن. ئەو هەڵوێستە خەمۆکییەی یەکێك لەو دووهاوبەشە دەیگرێتەبەر (هەستکردن بە گوناهو دابەزینی بەهای خودێتییو ئازاری دەروونییو ڕەشبینیو گومانکردنی خودو ...هتد)، لەوانەیە بەهۆی هاوبەشەکەی بەرامبەرەوە ئەم هەستانە بژێنەوە هەروەك بانگەوازێك بۆ پاراستنو جەختلێکردنەوەی بەهێزتر سەبارەت بە بەهای خود. کەواتە ئەم هاوبەشە خۆی دەبینێتەوە دڵنیایە لەخودی خۆی بەو سیفەتەی پارێزەری ئەو هاوبەشە خەمۆکەیەتییو بەمەش بەهای خودی لەڕێگەی ئەو پشتیوانییەوە زیاتردەبێت کە هاوبەشەکەی پێشکەشی دەکات. دابەشکردنی ئەم ڕۆڵانە بە شێوەیەکی هاوتایی Symetreque ڕێکدەخرێن.

**دەشێت لەمبارەدا چەندەها ئەگەر روویدەن:**

١- دەشێت هاوبەشی دووەم، لەسەر هەڵوێستی پارێزگاریکردنی خۆیو پشتیوانیکردن بمێنێتەوە کە بەشێوەیەکی نەستی بەکاریدەهێنێت بۆ جەختکردن لەدەسەڵاتی خۆیو دیاریکردنی شێوازی پەیوەندییەکە. هاوبەشی یەکەم لەباری خەمۆکیدا دەمێنێتەوە کە بەهۆی ئەم بارەی ئەمەوە هاوبەشی دووەم لەبارێکی سروشتیدا دەمێنێتەوە. ئەم ئەگەرە ئۆبێندۆف oberndorf جەختی لێکردووەو دەڵێت (ئەو هاوبەشەی لەچوارچێوەی پەیوەندیدا یان خێزاندا دۆخێکی نیورۆسسی دروستدەکات زۆرجار وا دەناسرێت کە سروشتییەو بڕواش بەخۆی دەکات کە وایە).لەم بارەدا وادەردەکەوێت یەکێك لەو دووهاوبەشە ئەو دڵەڕاوکێیەی خۆی دەشارێتەوە لەسەر حیسابی هاوبەشەکەی دی کە ئەو دڵەڕاوکێو خەمۆکییەی دەردەخاتو بەمە رێگە بە هاوبەشەکەی دەدات بە سروشتی دەربکەوێت.[٦]

٢- لەئەگەری دووەمدا لەقاندنو جووڵەیەك لەدۆخە سەرەکییەکاندا روودەدات، دووەمیان دەبێتە کەسێکی خەمۆك لەکاتێکدا کە ئەوەی دی (کە پێشتر خەمۆك بوو) دەگەڕێتەوە باری سروشتیو متمانەی بە خۆی دەگەڕێتەوە.

ژمارەیەك فاکتەری زۆرهەن کە رۆڵیان هەیە لەوروژاندنی کرداری لەقاندنو جووڵە یان نۆبەکاری لەدۆخەکاندا:

أ- لەوانەیە روداوێکی دەرەکی کاربکاتە سەر ئەو هاوبەشەی بە سروشتی دادەنرێتو ببێتە هۆی دابەزینی بەهای خود. لەسەر ئەم



بناغەیە، هاوبەشی نەخۆش، خەمۆکیی بەریدەداتو هەوڵ بۆ دڵنەواییکردنی هاوبەشەکەیيو یارمەتیدانی دەدات، ئەمەش پاڵپێوەدەنێت لە رووی نارسیزمییەوە رۆڵی پارێزەرو هەڵسەنگێنەری خۆی ببینێت.

ب- هەندێجار چارەسەرکردنی هاوبەشی خەمۆك، دەبێتە هۆی بێبەشکردنی هاوبەشی سروشتیی لەئەنجامدانی ئەو رۆڵەی بەتوندی لەرووی نارسیزمەوە بەکارهێنراوەتەوە.

ج- جوڵەی هاوچەشنیکردنی identification چڕ، پاڵ بە هاوبەشە سروشتییەکەوە دەنێت خەمۆکی هاوبەشەکەی بگرێتە ئەستۆو بەمشێوەیە بەدەست خەمۆکیی ئەوەوە دەناڵێنێت، بەمەش هاوبەشە خەمۆکە نەخۆشەکەیان، ئەوەی کە پێشتر نەخۆش بوو پشتیوانی لێدەکاتو دەیپارێزێت .

ئەم شێوازە لەدابەشکردنی رۆڵەکان لەو پەیوەندیانەشدا تێبینی دەکرێت کە لەنێوان کەسە سایکۆسییو خەمۆکییەکاندا هەیە: بۆنمونە ئەو هاوبەشەی تووشی پارانۆیا بووە خۆی بەسروشتی دادەنێتو بایەخ بە هاوبەشە خەمۆکەکەی دەدات، لەکاتێکدا ئەو هاوبەشە خەمۆکە لەسەر باری خۆی دەمێنێتەوەو خۆی تۆمەتبار دەکات.

لەمبارەدا ئەو دووهاوبەشە بەشێوەیەك هەڵسوکەوت دەکەن(هەروەك بڵێی لەسەر ئەوە رێککەوتوون یەکێکیان بەرگەی ئەو گوناهە بگرێت کە شایستەیەتییو، هاوبەشەکەی دی خۆی بێبەری دەکات لەم گوناهە)[٧]. ئەو هاوبەشە سایکۆسسیەش هەمیشە کاردەکات بۆ چارەسەرنەکردنی ئەو هاوبەشە خەمۆکەو پاساویشی بۆ ئەمە ئەوەیە کە چارەسەری سایکۆلۆژی بێسوودە، چونکە بەپێی

رای ئەو پەیوەندی نێوانیان لەناودەبات: ئەو هاوبەشە لەچارەسەرکردنی ئەو هاوبەشە خەمۆکە سڵدەکاتەوە، چونکە چارەسەرکردن وادەکات مەسەلەی پەیوەندی نێوانیان بکەوێتە بەر باس و لێدوان و ئەویش ئەمە رەتدەکاتەوە، چونکە دەیەوێت خۆی بەتەنیا یاساکان دیاریبکات و ئەو هاوبەشە خەمۆکە هەمیشە لەژێر چاودێریی و راوێژی ئەمدابێت و وایلێبکات هەست بە گوناه بکات.

– لەچوارچێوەی پەیوەندیدا شێوازێکی دیکە لەدابەشکردنی پەیوەندی هەیە، دوایین شێوازە، کە تێیدا رۆڵەکان تەواوکەری یەکترین و هاوتاش نین. هەروەها زۆرجار ئەم شێوازە لەو حاڵەتانەشدا تێبینی دەکرێت کە دوو هاوبەشەکە رۆڵە دژ بەیەکەکان لەنێوان خۆیاندا دابەشدەکەن، واتە ئەو رۆڵە دژبەیەکانەی تایبەتن بە کێشبەندییەکی هاوبەش لە شێوازی (پێش کۆمی یان پێش جێنیتالی) pregenital لەکاتێکدا پاڵنەرە ئەندەکییەکان pulsions partielles لای دوو هاوبەشەکە تەواوکەری یەکترن: تەوەری مازۆشی لای یەکێکیان وەڵامدانەوەی بۆ تەوەری سادیزم لای ئەوی دیکەیان دەبێت، تەوەری خۆرووتکردنەوە Exhibitionniste لای یەکێکیان وەڵامدانەوەی دەبێت بۆ تەوەری خۆماتدان Voyeuriste لای ئەوی دیکەیان. ئەم شێوازە لەپەیوەندی بەشێوەیەک دەمێنێتەوە کە بەپێی مرونەتی تاکەکان و پێکهاتەی پەیوەندییەکە قابیلی پێچەوانەبوونەوەیە.

دەتوانرێت بوترێت دەستتێکەڵاوکردنی دووهاوبەشەکە رێگە دەدات بە گوزارشتکردنی مەیل و ئارەزووە (پێش جێنیتالییەکان) لای هەریەکە لەدوو هاوبەشەکەو بەخشینی رەهەندێکی ئیرۆسی بەو مەیلانە، هەروەها دەشێت ئەو مەیلانە لەچوارچێوەی ئەو



پەیوەندییەداو لەلایەن ئەو دووهاوبەشەوە پراکتیزە بکرێت و بژێنرێنەوەو ناتوانرێت ئەم مەیلانە وەك نەخۆشی یان بە نەخۆشی Pathologique پۆلێنبکرێن.

لەچوارچێوەی شێوازی ئەم پەیوەندییانەدا دیاریکردنێکی دیکەو باو تێبینی دەکرێت کە پەیوەستە بە توانای پێچەوانەکردنەوەی رۆڵەکانەوە: بۆ نموونە روخساری مەیلە سادیزمییەکان هەمیشە لەلایەن یەك هاوبەشەوە گوزارشتی لێناکرێت. نۆبەکارییەك لەبینینی رۆڵەکاندا بەدیدێت بێئاگاداری دووهاوبەشەکەو بێئەوەی ئاگایان لەو کردارانە بێت کە دەبنە هۆی ئەم نۆبەکارییە. ئەم نۆبەکارییە لەوانەیە سیفەتێکی خولی هەبێت. بۆنموونە تێبینی دەکرێت، ئەو هاوبەشەی لەحاڵەتە ئاساییەکاندا مەیلەکانی چەپاندووە، لەژێر کاریگەری کهولدا کۆنترۆڵکردنی خۆی لەدەستدەدات بە توندی و رەقی سادیزمی خۆی بەرامبەر ئەو هاوبەشەی بەرامبەری، دەردەخات.

لەدوای مەستبوون هەست بە گوناه دەکات و بۆ پێچەوانەی ئەو حاڵەتە دەگۆڕێت کە لەسەرەوە باسمانکرد، هاوبەشەکەی دی سزای دەدات و کار بۆ بڵێسەسەندنی ئەم هەستکردن بە گوناهە دەکات، ملکەچی چاودێریی خۆی دەکات و بە توندی رسوای دەکات. ئەم چاودێریی و رسواییکردنە تا مەستبوونی داهاتوو یان جارێکی دیکە بەردەوام دەبێت.

ئەم مەیلانە بەشێوەیەکی دیار دەرناکەون، زۆرجار شاراوەن و تەنیا گوزارشتەکانیان دەردەکەون، هەروەها لەوانەیە دەوری بن و ناتوانرێت بە نەخۆشی دابنرێن.

## پەراوێزەکان :


1- WILLIJ., "La collusion narcissique", in Dialogue,1980, No.68,PP.40-54

2-ibid;PP 50-58.

3- WILLJ.,La relation de couple,tr,fr,Paris,Delachaux et Niestle,1982,P.161.

4-ibid .,PP75-83

5- ibid., PP.79-85

6- OBERNDORF C.P., "Folie a deux " ,in F-int .Psychoanal, 1934 , 15 ,PP.14-24.

7-LEMAIREJ- G.,Famille ,Amour ,Folie,Paris,Centurion, 1989, PP.87-90.




## بەشی نۆیەم

# هاوسەرێتی بەردەوام

### فرەیی تەکنیکەکانی پەیوەندیکردن (کۆمیونیکەیشن)

یەکێکە لەو رەگەزانەی یارمەتی ئاڵۆزکردنی پەیوەندی کردنی نێوان دوو هاوبەش دەدات، لەفرەیی تەکنیکەکانی پەیوەندیکردنەوە(کۆمیونیکەیشن) canaux de communications دێتو کە ئەو دوو هاوبەشە لەنێوان خۆیاندا بە کاریدەهێنن: بۆنمونە زمانی ژیانی سۆزداری بە نزیکترین زمان لەجەستەوە دادەنرێت ، کە رێگەیەکە بۆ پەیوەندیکردنی ئەنۆلۆژی (هاوتایی) Analogique و هیچ سینتاکسێکی زمانەوانی Syntaxe دیاریکراوی نییەو کۆمەڵێك مانا، لەخۆدەگرێت.

ئەم زمانە (واتە زمانی سۆزداری ) بە ئاڵۆزی لەهەموو بارودۆخەکاندا دەمێنێتەوەو وەرگێرانی ئەستەمە، لەبەرئەوە بێ یارمەتی زمانی زارەکی Verbal ئەستەمە توانای گوزارشت هەبێتو ئەمەی دواییان لەگەڵ عەیبەو کەموکورتییەکانیشیدا هەر بە باشترین زمان دەمێنێتەوە.

رەگەزە جەستەییەکان لەحاڵەتەکانی هەڵچوونیو سۆزداریدا هەژموونی خۆیان بەسەر گوزارشتە زارەکییەکاندا، دەکەن. ئەم

ھەژموونە تەنانەت لای کەسانی پێگەیشتوو کامڵیش بەدیدەکرێت لەحاڵەتی بەتاڵکردنەوەی ھەڵچوونی بەھێزدا: گەڕانەوە بۆ دواوە – بەرەو ڕێگە کۆنەکانی گوزارشتکردن– بەشێوەیەکی نەستی پێکھاتەکانی چالاکیی"سایکۆلۆژی سۆزداری"و منداڵی لەگەڵدا ھاوکات دەبێت. ئەوکەسەی لەڕێگەی جەستەییەوە گوزارشت لەھەڵچوونەکانی دەکات بێئاگایە لەم گوزارشتانە، چونکە نواندنی representationsئەم ھەڵچوونانە لای ئەو بەچەپێنراوی دەمێنێتەوە، بەمشێوەیە ئەو ھاوبەشەی دیکە یان کەسانی نزیك لێیەوە، دەشێت درك بەم گوزارشتانە بکەن کە ڕێکوپێکی ئەو تاکە یان ترسی یان ڕقی ئاشکرادەکاتو کەسەکە خۆی بێئاگایە لێیان، بەمشێوەیە لای ئەوانی دی ئەم دژبەیەکییە ئاشکراو ڕوون دەبێت، چونکە ئەو نواندنە جەستەییە mimique بەشێوەیەکی ئاشکرا گوزارشتی لە (کاریگەرییە ھەڵچوونی)ەیەکە کردووە کەتاك دانی پێدانانێت یان ڕەتیدەکاتەوە. تاك لەکاتی ھەڵچوونەکانیدا ئاگای لەجووڵەی نواندنە جەستەییەکانی نییەو لەوکاتەدا بەشێوەیەك وەك قۆناغی منداڵی کەلەخودو بوونی خۆی بێئاگابووە، گوزارشتیان لێدەکات.

فرەیی لەھۆیەکانی گوزارشتکردندا زۆرجار یارمەتیدەر دەبن لەئاڵۆزکردنی پەیوەندیکردنی نێوان دووھاوبەش. لەزۆرکاتدا تێبینی دەکەین، گوزارشتە جەستەییەکان (وەك جوڵەو نواندنی جەستەیی) لەگەڵ قسەکردنی زارەکیدا ھاوکاتن‌و جەختیان لێدەکەنەوە: بۆئەوەی ئەو ڕەخنە یان پەیامەی ئاڕاستەی ھاوبەشەکە دەکرێت کارابێت پێویستە لەگەڵ گوزارشتکردنێك لەشێوەی نواندنی جەستەیی یان



جوڵەییدا ھاوکات بێت .

بۆ نموونە ئەگەر یەکێك لەدوو ھاوبەشەکە ویستی سزای ھاوبەشەکەی بەرامبەری بدات یان داوای شتێکی لێبکات، لێی نزیکدەبێتەوە، بۆی پێدەکەنێت، نواندنێکی جەستەیی گونجاو دەنوێنێت کە لەھەموو پەرچەکردارێکی شەڕانگێزیانە بەدەرە، بەڵام کێشەکە لەم حاڵەتەدا لەوانەیە ئاڵۆزتر بێت بەتایبەتی ئەگەر یەکێك لەدوو ھاوبەشەکە لەو دیالۆگە لەگەڵ ھاوبەشەکەی توانی سەرکەوتن، بەدەستبێنێت. چونکە ھاوبەشە بەزیوەکە یان ئەو ھاوبەشەی قەناعەتی پێھێنراوە لەوانەیە بەجۆرێك لەو دۆخەدا بژی ھەروەك بڵێی لەو کرداری دانوساندنەدا شکستیھێناوە یان نارسیزمییەکەی بریندار بووە، ئەم ھاوبەشە لەئایندەدا بە ئاگاییەوە لەگەڵ ھاوبەشەکەی بەرامبەردا مامەڵەدەکاتو، ھەر دەستپێشخەرییەکی نەرمونیانیی و خۆشەویستیی لەلایەن ھاوبەشەکەیەوە ببینێت دەشێت وایلێکبداتەوە کە تەنیا فێڵێکە ئامانجی بەدیھێنان تێیدا، نیازێکی تایبەتییە. لەم نێوکۆیەدا تێبینی دەکەین، ھەر دەستپێشکەرییەکی نەرمونیانیی یان سۆزو ئەڤین لەوانەیە مەدلوولێکی پێچەوانە وەك ڕقوکینە لای ھاوبەشە شکستھاتووەکە، بگەیەنێت، وشەی"cheri" کە بۆ ئەم ئاڕاستەیە یان مانایە بەکاردەھێنرێتو ھەمیشە ھاوکاتە لەگەڵ نواندنی جەستەیی یان جوڵەییدا کە گوزارشت لەنەرمونیانی یان سۆزو ئەڤین دەکات، ئەم نواندنە جەستەییە لەوانەیە لەلایەن ھاوبەشە شکستھاتووەکەوە بە سڵەمینەوەو سەرسوڕمان، وەلابدرێتەوە. ئەم ھاوبەشە بۆی دەردەکەوێت لەرابوردوودا ملکەچی کردارێکی ھەڵخەڵەتاندن‌و

گاڵتەپێکردنێکی سۆزداری بۆتەوە. بەڵام لەمڕۆدا ئەوە ڕەتدەکاتەوە سازش لەسەر ئیرادەی بکاتو نایەوێت لەمەودوا هیچ کەسێك دەسەڵاتی بەسەردا بگرێت.

## کۆمیونیکەیشن لەنێوان ناوەڕۆكو پەیوەندیدا:

ناتوانین پەیوەندی لەگەڵ یەکدیدا نەکەین، چونکە (هیچ بارێکی پەیوەندینەکردن نییە، هەموو رەفتارێك مەدلولێکی پەیوەندیکردنی هەیە) [1] چالاکی یان خامۆشی، قسەکردن یان بێدەنگی هەریەکەیان مەدلولی پەیامیان message هەیە. ئەمجۆرە هەڵسوکەوتانە کاردەکەنە سەر کەسانی دیکەو لەبەرامبەردا ئەوان ناتوانن هیچ بکەن، هەر دەبێت وەڵامدانەوەیان هەبێت. پیاوێك لەقاوەخانەیەکی پڕ لەخەڵکدا دانیشتووە، ئەم تەنیا سەیری بەردەمی خۆی دەکاتو تەماشای کەس ناکات یان گەشتیارێك لەناو فرۆکەیەکدا لەشوێنی خۆی دانیشتووە، هەردووچاوی داخستووە، ئەو دوو پیاوە پەیامی تایبەتی بۆ ئەو کەسانەی چواردەوریان دەنێرن، ئەویش ئەوەیە: ئەمان نایانەوێت قسە لەگەڵ کەس بکەنو گوێ لەقسەی کەسیش بگرن، بەشێوەیەکی گشتیی ئەو خەڵکانەی لەچواردەوریانەوە نزیکن لەم پەیامە تێدەگەنو بە شێوەیەکی سروشتی وەڵامدانەوەیان بۆیان دەبێت، وەڵامدانەوەکەش واز لێهێنانیانە. ئەم هەڵسوکەوتانە بە ئاشکرایی گوزارشت لەئاڵوگۆڕکردنی پەیوەندیکردن دەکەن، بە هەمانشێوە ئەگەر ئەو پەیوەندیکردنە لەڕێگەی قسەکردنو لەچوارچێوەی دانیشتنێکی زیندوودا، بوایە.



- هەر فرمانێکی پەیوەندیکردن دوو روخسار لەخۆدەگرێت: هەندێك زانیاری راگەیەندراو دەگوازێتەوە کە ناوەڕۆکەکەی contenu پێکدێنێت، دووەمیشیان رێگەی پەیوەندیکرنەکەیە کە پەیوەندی پەیامنێر (ئەو کەسەی پەیامەکە دەنێرێت) لەگەڵ ئەو کەسەی پەیامەکەی پێدەگات دیاریدەکاتو پێی دەوترێت ئەودیو پەیوەندیکردن (مێتا کۆمیونیکەیشن–metacommunication)[2].

کاتێك دەوترێت "ئەمە فەرمانە" هەر بە رووکەشی تێدەگەین کە پەیامنێر دەیەوێت پەیوەندیی بەو کەسەوە کە پەیامەکەی بۆ دەنێرێت وەك پەیوەندییەکی هەژموونکردن پێناسە بکات.

هەندێجار هاوبەشەکان (ژنو پیاو) لەسەر ئاستی ناوەڕۆك کۆکن، بەڵام لەوانەیە لەسەر ئاستی رەهەندی پەیوەندی ناکۆك بنو پەیوەندی نێوانیشیان هەر بە ئارامی بمێنێتەوە تا ئەوکاتەی یان تاچەند ئەرکە دەرەکییەکان ئەم تەباییە لەسەر ئاستی ناوەڕۆك دەسەپێنن. بەڵام هەر کە بارودۆخەکە گۆڕدرا ئەو دوو هاوبەشە ناتوانن لەفەرامۆشکردنی ناکۆکییەکانی پەیوەندییەکەیان بەردەوام بن کە تائێستا بە شاراوەیی ماوەتەوە، لەم نێوکۆیەدا تێبینی دەکەین ئەو دوو هاوبەشە لەوکاتەدا کە ئەو داواکارییە دەرەکییانە تێدەپەڕێنن کە تائێستا وا پێویستیکردووە کۆششی هاوبەشی بۆبکەن، دوای تێپەراندنی ئەوانە بە تەواوەتی لەیەکتری جیادەبنەوە.

ئەم تێبینیانە لەسەر هاوپەیمانێتییە سیاسییو نێودەوڵەتی نێوان حزبەکان یان نێوان دەوڵەتانیشدا جێبەجێدەبێت کە پشتدەبەستن بە ئاراستەی ئایدیۆلۆژیی جیاواز هەروەك لە ساڵی ١٩٤٥ لەهاوپەیمانێتی نێوان وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو یەکێتی

سۆڤیەتی جاران لەپێش سەرکەوتنیان بەسەر ئەڵمانییەکاندا رویدا.
دواجار پێویستە لەم نێوکۆیەدا باسی (رۆڵی قوربانی) بکەین کە منداڵ دەیبینێت کە زۆرجار رۆڵێکی گرنگە لەهاوسەنگکردنی پەیوەندییە ناوخۆییەکانی نێوان ژن و پیاو: چونکە گیروگرفتەکانی منداڵ (شکستهێنانی لەخوێندندا، نیورۆسس یان سایکۆسس و لادانی هەرزەکاری). لەم حاڵەتانەدا زۆرجار دایك و باوك ناچاردەبن بەیەکەوە هەڵسوکەوت بکەن و توندوتۆڵییەکی تەواوی دەستکرد بە پەیوەنییەکەیان ببەخشن. تاقیکردنەوە کلینکییەکان سەلماندویانە لەو حاڵەتانەدا کە رەفتاری منداڵ بەرەو باشبوون دەچێت قەیران لەنێوان دایك و باوکیدا سەرهەڵدەداتەوە کە زۆرجار دەبێتە هۆی گەڕانەوەی منداڵ بۆ بینینی هەمان ئەرکی پێشووی.

پێشتر وتمان هەموو کارێکی پەیوەندیکردن دوو روخسار لەخۆدەگرێت ئەویش ناوەڕۆك و رێگەی پەیوەندیکردنەکەیە (کۆمیونیکەیشن) کە شێوازی پەیوەندی نێوان قسەکەران، دیاریدەکات، بوونی هەر رکابەرییەك یان دژ بەیەکییەك لەنێوان ناوەڕۆك و رێگەی پەیوەندیکردن لەرووی پراکتیکەوە دەبێتە هۆی ئەستەمی وەڵامدانەوە بەشێوەیەکی هارمۆنی لەلایەن گوێگر یان وەرگری قسەکانەوە. لەو نمونانەی زۆرکات لەنێوان هاوبەشەکاندا دەیبینین ئەمانەیە: "دەمەوێت بە شێوەیەکی عەفەوی خۆشی بوێم" یان "دەمەوێت سەربەخۆ بێت" یان "عەفەوی بە" ! .. ئەم گوزارشتانە هانی هاوبەشی بەرامبەر دەدات رەفتارێك بگرێتە خۆی کە بەسروشتی خۆیی ئەو رەفتارە ناگرێتەبەر، ئەمەی دواییان (واتە ئەم هاوبەشە) خۆی دەبینێتەوە لەهەڵوێستێکدا چەقی بەستووە کە



بەرگەی ناگرێت، چونکە وا پێویست دەکات کارێکی عەفەوی بکات، لەبەرئەوەی داوای لێکراوە ئەمەش نەك تەنیا لۆجیکێکی ساکارە، بەڵکو سروشتی پەیوەندیکردنی مرۆیش بە دوری دەگرێت. نمونەیەکی دیکە باسدەکەین ئەم دژبەیەکییەی نێوان هاوبەشەکان لەچوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتیدا رووندەکاتەوە: ژنێك هەمیشە گلەیی لەدەست لاوازی کەسێتی هاوسەرەکەیی و متمانەبەخۆ نەبوونی هاوسەرەکەی دەکرد. داواکارییەکەی بەمشێوەیە دادەڕشت: "دەمەوێت بەرامبەر بە من زیاتر هەژموونت هەبێت" . ئەم داواکارییە لەیەکەم ساتدا وادەردەکەوێت روون و ئاشکرا نییەو لێی تێناگەین، بەڵام لەواقیعدا ژن و پیاو یان ئەو دوو هاوبەشە دەخاتە هەڵوێستێکی ئەستەم و بەشێوەیەك تەنیا دوو چارەسەرییان لە بەردەمدا دەهێڵێتەوە کە بە هیچییان رازی نابن: ئەگەر پیاوەکە هەڵوێستی هەر بە نێگەتیڤی بمێنێتەوە، ژنەکە بێزار دەبێت، ئەگەر هەڵوێستێکی هەژموونداڕانەشی نواند ژنەکە هەر لەسەر هەڵوێستی خۆی دەمێنێتەوە، چونکە پیاوەکە ملکەچی داواکاریی ئەو بووە، لەجیاتی ئەوەی دژایەتی بکات و رای خۆی بەسەریدا بسەپێنێت. ژنەکە بە دڵنیایی خۆزگە بۆ گۆڕان لەهەڵوێستی هاوسەرەکەیدا دەخوازێت، بەڵام دەیەوێت بەشێوەیەکی عەفەوی بێت، واتە بەشێوەیەکی داواکراو نەبێت و ئەم داوا لەپیاوەکەی بکات.

واتزلویك Watzlawick[٣] لەچوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتیدا لێکۆڵینەوەی لەسەر زنجیرەیەك رێگەی پەیوەندیکردن ئەنجامداوەو ئاشکرایکردووە کە بوونی هەر دژبەیەکییەك لەنێوان ناوەڕۆکی پەیامەکەو رێگەی گەیاندنی لەوانەیە ببێتە هۆی

وەڵامدانەوەیەكی شكستهاتوو لەلایەن هاوبەشەكەی دیكەوە: چونكە لەوانەیە روخساری پەیامی ئەو پەیوەندیكردنە ئاڵۆز یان تێكەڵاو بێت، ئەمەش دەشێت ببێتە هۆی روودانی شڵەژان، بەمشێوەیە وەڵامدانەوە لەگەڵ ناوەرۆكدا دژ دەوەستێتەوە، بۆ نموونە، هەرزەكارێك گلەیی لەدایكی دەكات و پێی دەڵێت: "تۆ وەك منداڵ مامەڵەم لەگەڵدا دەكەیت"، دایكی وەڵامیدەداتەوە: "بەڵام تۆ منداڵی منی". ئەم وەڵامە كاریگەرییەكی شكستهاتوو لەسەر ئەو كوڕە هەرزەكارە بەجێدێڵێت، چونكە دەبێتە هۆی دروستكردنی شێواندنێك لای كوڕەكە.

زاڵبوون بەسەر ئەم كەموكورتییەداو سەرلەنوێ گەڕاندنەوەی ئەو دیالۆگە بە ڕێگەی راست و رەوان پێویستدەكات: یەكەمجار ئەو كوڕە بەشێوەیەكی كەم ئاڵۆزتر بە لێكدانەوەی ئەودیو پەیوەندیكردن "میتا كۆمیونیكەیشن– meta communicationne" ئاشنا ببێت، هەروەها پێویستە ئەوە بزانێت چۆن وشەی"منداڵ" بە مانای (كەسێكی ناكامڵ و پێنەگەیشتوو) بەكاردەهێنێت و لەبەرامبەردا ئەو دایكە پێویستە ئەوە بزانێت چۆن وشەی"منداڵ" بە مانای "كوڕ" بەكاردەهێنێت (واتە كە دەڵێت تۆ منداڵی منی مەبەستی لەوەیە كە بڵێت تۆ كوڕی منی).



## پەیوەندیكردنی دژبەیەكی: هەڵخەڵەتاندن و رقلێبوونەوەی دووفاقی:

بە پێشەنگی باتیسون ژمارەیەك توێژەر لەهەندێك حاڵەتی پەیوەندیكردنی نێوان ئەندامانی خێزانیان كۆڵییەوەو جۆرێك لەپەیوەنیكردنی دژبەیەكی (كۆمیونیكەیشنی پارادۆكسی ) Paradoxalیان ئاشكراكرد كە پشت بە (رقلێبوونەوەی دووفاقی) [٤] double–contrain لەمامەڵەكردن لەنێوان دوو كەسدا،دەبەستێت، چونكە ئەو منداڵەی پەیوەندییەكی خۆشەویستی بە باوكییەوە دەبەستێتەوە، دەكەوێتە بارێكی بێ متمانەییەوە كاتێك دژبەیەكییەك (پارادۆكسی) لەنێوان وتەكانی باوكی (یان دایكی)و رەفتاریان بەرامبەری بەدیدەكات، بەحوكمی پەیوەستبوونی خۆشەویستییەوە لەگەڵ ئەو باوانەدا (دایك یان باوكی) ئەو دژبەیەكییە قبوڵدەكات و لەپەیوەندییەكەدا پێی رازی دەبێت و هەوڵنادات پرسیاری دەربارە بكات یان ناڕەزایی دەربڕێت، چونكە دەترسێت لەلەدەستچوونی ئەم پەیوەندییەی لەگەڵ باوكیدا، ئەمەش لەناخیدا حاڵەتێكی هەمیشەیی لەشڵەژانی بۆ دروستدەكات و كاردەكاتە سەر گەشەی پەیوەندیكردنی سروشتی لەماڵ و لەناو كۆمەڵدا. ئەو كەسەی لەم جۆرە باكگراوندە دژبەیەكییەدا گەشەدەكات، سروشتییە بكەوێتە حاڵەتێكی سایكۆلۆژییەوە كە نەتوانێت وتەو كردار لەیەكتری جیابكاتەوە. تاك لەحاڵەتی ئەم بێ متمانەییەدا، ناتوانێت پەیوەندی جێگیرو هاوسەنگ لەگەڵ كەسانی دیكەدا ببەستێت، وێڕای

دروستبوونی دۆخێك لەگومانكردن بەرامبەر بە راستییەكانی دەوروپشتی.

جۆرێكی دیكە لەپەیوەندیكردن-كۆمیونیكەیشن communication هەیە پشت بە هەڵخەڵەتاندن‌و فێڵكردن لەگەڵ ئەویدیكەدا دەبەستێت، لەشێوەی ئەبستراكتدا ئەو هەڵخەڵەتاندنە، بەمشێوەیەیە: (ئەوەی دەیبینێت‌و بیری لێدەكەیتەوە دەیبیستیت یان هەستی پێدەكەیت هەڵەیە .. من پێت دەڵێم چی حەقیقەتەو پێویستە گویٚ لەچی بگریت‌و چی ببینیت‌و هەستی پێبكەیت). بێگومان ئەم جۆرە لەپەیوەندیكردن تەنیا كاریگەرییەكی سادەو ساكاری دەبێت لەسەر ئەو كەسانەی باوەڕییان بە دركپێكردنە تایبەتیەكانی خۆیان هەیە.

بەڵام دەبینین لەپەیوەندییە زیندووەكاندا (وەك پەیوەندی منداڵ بە باوانییەوە) یان لەهەڵوێستە ئەستەمەكاندا (وەك چەوساندنەوەی سیاسیی یان شتنی دەماخ) هەڵخەڵەتاندن یان فێڵكردن، تاك دەخاتە بارێكی شڵۆق یان لەقەلەقكەر، بەشێوەیەك ناتوانێت بەرگری لەخۆی بكات. لەواقیعدا ئەگەر لەبارێكدا بوو نەیتوانی ئەو هەڵخەڵەتاندنە داماڵێت یان بەهۆی ئەودیو پەیوەندیكردن"میتا كۆمینیكەیشن- metacommunicationnel"ـەوە ئەو فێڵە شیبكاتەوە ئەوا بەدیلی ئەو فێڵەیان داوە، بیٚ دەروازەیەك بۆ خۆڕزگاركردن دەمێنێتەوەو دەشێت ئەو هەڵخەڵەتاندنە درێژبێتەوەو گشت دركپێكردنەكانی بگرێتەوە.

لاین Laing [5] یەكەم كەس بوو چەمكی میتا كۆمینیكەیشنی هێنایە ناو سایكۆلۆژی نەخۆشییەوە، لەمبارەیەوە ئاماژەیداوە كە



(هەموو كەسێكی هەڵخەڵەتێنراو هەمیشە خۆی لەبارێكی شێواودا دەبینێتەوە) ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت كە هەست بەو بارە دەكات.

جاكسۆن Jackson [٦] لەلێكۆڵینەوەیەكدا بۆ شێوازی پەیوەندیكردن لەنێو ئەو خێزانانەدا كە كەسانی شیزۆفرینییان تێدایە، جۆرە پێكهاتەی پەیوەندیكردنێكی بەدیكرد كە لێكچووە لەگەڵ پێكهاتەی ئەو پەیوەندیكردنەی كە قسەمان لەسەركرد: كاتێك منداڵ درك بە تووڕەبوونی باوكی دەكات، ئەو باوكە تووڕەبوونەكەی رەتدەكاتەوە یان داننانێت بەم هەستەیداو زۆر لەكوڕەكەی دەكات كە ئەویش لای خۆیەوە حاشا لەو تووڕەبوونە بكات، منداڵ لەمبارەدا لەرووبەڕووبوونەوەی تەلەزگەیەكدا خۆیدەبینێتەوە یان سەلمێنراوێكی دوو دەمداو ناچارە یەكێك لەو دوو ئەلتەر ناتیڤە هەڵبژێرێت كە هیچ كامیان لەبەرژەوەندی ئەودا نین‌و واپێویست دەكات بەو راستییە ئاشنا بێت، ئایا بڕوا بە باوكی یان هەستە تایبەتیەكانی خۆی، بكات: ئەگەر بڕوا بە هەستەكانی خۆی بكات ئەوا پارێزگاری لەپەیوەندیكردنی متمانە پێكراوی لەگەڵ واقیعدا دەكات، بەڵام ئەگەر بڕوا بە باوكی بكات ئەوا بەردەوامبوونی پەیوەندی لەگەڵ باوكیدا زامندەكات، بەڵام لەمكاتەدا بەهۆی دركپێكردنی بۆ واقیع لەرێی راستی خۆی لادەدات.

دواجار دەتوانین بڵێین، پەیوەندیكردنی دژبەیەك یان كۆمۆمینیكەیشنی پارادۆكسی كاردەكات بۆ داماڵینی منداڵ لەتواناكانی، لێرەدا مەبەست لەداماڵین یان ئەبستراكتكردن ئەوەیە كە دژی هەر دركپێكردنێكی نارسیسزمییە لەچالاكی تایبەتی (من- moi) دا، بۆنمونە: منداڵێك لەقوتابخانە دێتەوە بە دایكی، دەڵێت:

"برسیمە" راستەوخۆ دایکی وەڵامیدەداتەوە "نەخێر، برسیت نییە".
لێرەدا زۆر بە باشی تێبینی دەکەین ئەو دایکە بە منداڵەکەی نەوت پێویستە ئێستا هیچ نەخوات یان کاتی نانخواردن نەهاتووە، بەڵکو بە پێچەوانەوە، دەستی لەئەزموونی تایبەتی منداڵەکە وەرداو ئەمەش کاریگەریی هەیە بۆ سەر داماڵینی منداڵەکە لەتواناکانی خۆی.

ئەم نمونەیە لەگەڵ نمونەیەکی دیکەدا کە د. ئەنزیوو D.Anzieu [٧] گێڕاویەتییەوە، هاوجێیە، کە باس لەمنداڵێکی بچوک دەکات، دایكو باوکی دەیخەنە ناو بانیۆیەك ئاوی گەرمەوە، کە منداڵەکە هاواری لێبەرزدەبێتەوەو هاوار دەکات ئاوەکە زۆر گەرمە، دایكو باوکی دڵنیای دەکەنەوە کە ئاوەکە زۆر باشەو ئەو گاڵتەدەکاتو یاریدەکات لەگەڵیاندا کە دەڵێت ئاوەکە گەرمە، منداڵەکە لێرەدا کەوتۆتە یان خراوەتە بەردەم دوو هەڵبژاردە، یان بڕوا بە هەستەکانی خۆی بکات یان بڕوا بە دایكو باوکی بکات. لێرەدا پێویستە لەسەری هەڵبژاردن لەنێوان بڕواکردن بە(من–moi)ی خۆی یان خۆشەویستیی بۆ بابەتەکەی (پەیوەندی لەگەڵ باوانیدا) بکات، منداڵەکە هەست بە پەرتبوونو دادڕان دەکات لەنێوان (من–moi) ی خۆیو بابەتەکەیدا (واتە خۆشەویستیو پەیوەندیکردنی لەگەڵ دایكوباوکیدا). ئەگەر ئەم شێوازە لەگەڵ منداڵدا دوبارەبۆوە ئەوا (من– son moi ) ـەکەی کە لەململانێیەکی هەمیشەییدا دەژی، ئەستەمە بتوانێت چارەسەری بکات یان ئەو ململانێیە شیبکاتەوە.



## شێوازەکانی پەیوەندیکردنو لەکار وەستانی جەختلێکردنەوە لەنارسیزم:

"شیکردنەوەی شێوازەکانی پەیوەندیکردن یان ئاڵوگۆڕکردن Transcations [٨] پشت دەبەستێت بە تێگەیشتن لەرەفتاری تاکەکانو چاودێریکردنیان لەچوارچێوەی پەیوەندی خێزانیدا، ئەم شیکردنەوەی ئاڵوگۆڕکردنەش ئەمانە لەخۆدەگرێت: شیکردنەوەی حاڵەتی من– moi (لە باوکدا – کەسی کامڵ – منداڵ) ئەمانە وەك پێکهاتەکانی کەسێتیی (واتە شیکردنەوەی پێکهاتەیی)، وەسفکردنی ئەم حاڵەتانە لەکاتێکی دیاریکراودا، واتە حاڵەتی (باوکێکی بەخێوکەر، منداڵێکی گونجاو، منداڵێکی سەرکێش)، شیکردنەوەی فرمانی، دواجاریش شیکردنەوەی پەیوەندییە ئاڵوگۆڕکراوەکان لەگەڵ چواردەوردا (واتە شیکردنەوەیەکی ئاڵوگۆڕکاری).

لەواقیعدا، شێوازی ئاڵوگۆڕکردن لەوانەیە ببێتە هۆی دروستبوونی رێککەوتنێکی راشکاوانە لە نێوان دوو هاوبەشەکەدا یان دەشێت ببێتە هۆی ناکۆکییو جەختلێنەکردنەوە لەنارسیزم. زۆربەی شیکارە خێزانییەکان تێبینی دووبارەبوونەوەی شێوازەکانی ئاڵووگۆڕکاری روخێنەرییان کردووە کە بەمشێوەیە روودەدات.

" لەرێگەی ئەم رەفتارەوە کە پێشکەشم کرد یان ئەم کارەی کە بە ئەنجام گەیاند، خۆمت پێشکەش دەکەم وەك ..... بە گشتییو بێئەوەی بە ئاشکرایی دەریبڕم، هەوڵدەدەم هانت بدەم ئەو وێنەی خۆمم بۆ پێچەوانە بکەیتەوە کە لەو باوەڕەدام جەختی لێدەکەیتەوە

بۆم، یان بەشێوەیەکی هەستی، من خۆم وەك باوکێك یان دایکێکی لە خۆبردوو یان سەرۆکێك یان قوربانییەك پیشان دەدەم، وەك منداڵ یان نەخۆش یان کەسێکی شکستو ئیفلیج، هەڵسوکەوت دەکەم، کە پێویستی بە پاراستنو چاودێریکردن هەبێت.

– لەبەرامبەر ئەو رەفتارەدا ئەوی دیکە یان کەسانێکی دیکە وەڵامدانەوەیان بەمشێوەیە دەبێت:

یان: من وات دەبینم کە خۆت دەردەخەیت: من دڵنیات دەکەم Jete confirme کە تۆ وایت.

یان: من هاوبەشی راکانت ناکەم، من بەشێوەیەکی جیاواز دەتبینم، جەخت لەو نمایشەت ناکەم کە خستتەڕوو سەبارەت بەخۆت، من بەشێوەیەکی شاراوە (ئەو رەفتارە رەتدەکەمەوە کە دەربارەی خۆت نواندت، من شتێکی دیکە دەبینم، سیفەتێك بۆ هەڵوێستێکی دیکە دەبینم یان لەوانەشە ئەم رەفتارە بەهۆی فاکتەرێکی دەرەکییەوە یان بەهۆی روخسارێکی دیکەی بارودۆخی خۆتەوە سەپێنرابێت)، "کەواتە من ئەو پێناسەیە رەتدەکەمەوە کە هەوڵدەدەیت دەربارەی خۆتو پەیوەندیت لەگەڵمدا پێم ببەخشێت".

– یان (لەوانەشە وەڵامدانەوەکە بەمشێوەیە بێت کە زۆر جیاوازە لەوانی دیکە ):

"من بەم هەڵوێستەم ئاماژە بەوە دەدەم کە خۆم ناڕەنجێنم تا ئەرکی وەڵامدانەوەت بکێشم، ئەوە رەتدەکەمەوە وەڵامت بدەمەوە، یان نامەوێت بکەومە ئەو داوە یان ئەو فێڵەوە کە من وایدادەنێم، هەوڵدەدەیت بمخەیتە ناوی، من رەفتارت بەو شێوەیە نابینم کە بانگەشەی بۆ دەکەیتو ئەوەش ناڵێم کە چۆنی دەبینم، چونکە من



بینینی ئەوە رەتدەکەمەوە ئەویش لەرێگەی ئاشکراکردنی هەڵوێستمەوە کە خۆم بۆ رەتکردنەوەی سەغڵەت ناکەم، تەنانەت ئەگەر ئەوەی بۆشم دەخەیتەڕوو بایەخێکی گەورەی هەبێت. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت تۆ بوونت نییە. من هیچ بایەخێك بە بوونی تۆ نادەمو ئەوەش کە بە شوێنیدا دەگەڕێی تا بۆ منی بەدیاربخەیت، بێسوودە. ئەگەر وەڵامدانەوەم هەبوو، تەنانەت ئەگەر بە ئاشکرا رەتکردنەوەشی بێت، چونکە ئەمە ئەوە دەگەیەنێت من بایەخێکت پێدەدەم کە تۆ شایستەی نیتو خاوەنی نیت".

ئەم ئینکارکردنە deni لەرێگەی کاریگەرییە روخێنەرەکانییەوە، ئامانجی داماڵینی بەرامبەرە لەهەموو تواناکانی، نەك هەر ئەمە، بەڵکو ئامانجی جەختلێکردنەوەیە لەو داماڵینە. لەواقیعدا ئەم داماڵینە تایبەتە بە بەشێك یان روخسارێك لەپەیوەندییەکە، هەروەها تایبەتە بە چالاکییەکی دیاریکراو و دیاریکردنی رۆڵی بەخشەر یان بارێکی تایبەتی، بۆ نمونە :

"دەتەوێت بۆم بسەلمێنیت کە لەمن باشتری، من نامەوێت لەم جۆرە لێدوانە تێوەگلێم، نامەوێت جەختت لێبکەمو ناشمەوێت رەتت بکەمەوە، چونکە ئەمە دەمخاتە ناو یارییەکەتەوەو ئەمەش جەختلێکردنەوەیە بۆ توانای تۆ کە لەمن باشتری لەم بوارەدا، یان لە خواستەکانتدا، بۆ راستکردنەوەی هەڵەکانی من، لەمن باشتری،...هتد".

نمونەیەکی دیکە: "دەتەوێت وادەربکەویت کە تۆ باشتری، ئەویش بەگەڕانت بە شوێن ئەوەی لەمساتەدا دەتەوێت بۆ منی دەربخەیت – نامەوێت بزانم ئایا تۆ لەهەندێك بواردا خاوەنی

توانستی لەمن باشتری لەهەندێك بواردا، بەڵام وا خۆم پیشاندەدەم كە گویێ بەوە نادەم كە دەیخەیتەڕوو". "من ئەوە ڕەتدەكەمەوە بێمە ناو ئەم كێبڕكێییەوە، ئەمەش بالآبوونی تێدایە بۆ من، تەنانەت ئەگەر تۆش لەسەر هەق بیت، چونكە ئەمە پەیوەندییەكەمان تێكدەدات"- "من هیچ شتێكی ئەوتۆ ناخەمەڕوو كە بەشێوەیەك بێت، ڕێگە لەبەدواچوونی هاندانی تۆ بگرێت"- "من فێڵە ئاراستەكراوەكانت بۆ تێوەگلانم لەگەڵ خۆتدا، ڕەتدەكەمەوە".

ئەم شێوازە لەئاڵوگۆڕكردن لەوانەیە كارنەكاتە سەر سروشتی پەیوەندی تا ئەوكاتەی یەكێك لەو دووكەسە لەتوانایەكی دیاریكراو یان كارامەیی هونەری دادەماڵێت بەشێوەیەك كارنەكاتە سەر بەهای خود لای تاكی بەرامبەر. بەڵام لەوانەیە ئەم شێوازە لەئاڵوگۆڕكردن ببێتە بارێكی پاسۆلۆژی ئەگەر بەهای خود یان هەستكردن بە كەمالو یەكێتی كەسێتیی تاكی بەرامبەر كەوتە بەر هەڕەشە، گەیشتن بەم دۆخە یان ئەمشێوەیە لەداماڵین (داماڵینی تاك لەتوانستەكانی) لەوانەیە ببێتە هۆی زامێكی نارسیزمی یان بە گوزارشتێكی دیكە ببێتە هۆی" لەكاروەستانی جەختلێكردنەوە لەنارسیزم discon firmation narcissique . ئەوەش دەزانین كە هەر پەیوەندییەكی دوالیزمی دروست نابێت تەنیا لەسەر تێركردنی مەیلو ئارەزووی تاكەكان نەبێت، لەبەرئەوە ئەو پەیوەندییە بەردەوام نابێت، تەنیا لەو حاڵەتەدا نەبێت كە یارمەتی جەختلێكردنەوە لەنارسیزمیConfirmation narcissique ئەندامەكانی دەكات.

جەختلێكردنەوە لەنارسیزمی ئاڵوگۆڕكراو، ئەو كردارە



سەرەكییەیە كە هەموو كێشكردنو مەیلەكان لەپەیوەندییە درێژخایەنەكاندا لەچواردەوری، كۆدەبنەوە. پشتبەستن بەمە یان لەسەر ئەم بناغەیە ئەو قەیرانانەی كە ئەو دووهاوبەشە لەماوەی ژیانی هاوسەرێتییاندا ڕووبەڕووی دەبنەوە كارناكاتە سەر جەختلێكردنەوە لەنارسیزمی ئاڵوگۆڕكراوی نێوانیانو ڕووبەڕووی مەترسی ناكاتەوە، لەبەرامبەردا ئەگەر ئەم جەختلێكردنەوەیە لەكار وەستا، ئەوا پێكهاتەی پەیوەندییەكە بەشێوەیەكی قوڵ دەكەوێتە باری شلۆق یان لەقەڵەقو وایلێدێت ئەو تێربوونانەی هەریەكە لەو دووهاوبەشە پێشكەشی هاوبەشەكەی دیكە دەكات بەشی پێویست ناكات بۆ بەردەوامبوونی پەیوەندییەكەو مانەوەی. لەم ڕوانگەیەوە شیكاركار (ئەوكەسەی چارەسەرە سایكۆلۆژییەكە لەگەڵ نەخۆشدا ئەنجامدەدات-وەرگێڕ) پێویستە شێوازی ئاڵوگۆڕكردن یان ئەو پەیوەندییە ئاشكرابكات كە بۆتەهۆی لەكار وەستانی جەختلێكردنەوە لەنارسیزمی ئاڵوگۆڕكراو لە نێوانیاندا.

لەهەندێك حاڵەتەكاندا، دووبارەبوونەوەی "وەستانی جەختلێكردنەوە لەنارسیزم" لای ئەو كەسەی كە بەشێوەیەكی زیندوو یان نادیار لەگەڵ كەسێكی دیكەدا پەیوەندی هەیە، دەبێتە هۆی ڕوودانی تێكچوونو زیانی گەورە لەكەسێتیدا، بەتایبەتی ئەگەر لەجۆری ئەو كەسانە بوو كەبەخێرایی تێكدەچنو لەڕووی سایكۆلۆژییەوە لاوازن یان پێكهاتەیەكی سایكۆسی psychotique یان سنووردariان limite هەیە.

بەپێی گوزارشتەكەی لاین Laing[٩] ئەم جۆرە كەسانە بەدەست نەبوونی دڵنیاییو هەندێك حاڵەتی دیكەوە دەناڵێنن، بۆنموونە: ئەو

مێردمنداڵانەی لەدوای ماندووبوونێکی زۆر توانیویانە بگەنە ئاشنابوون و کۆنترۆڵکردنی هەست و سۆزە تایبەتییەکانیان، هەروەها ئەو مێردمنداڵانەی بەهۆی لەدەستدانی پەیوەندیی ئاسودەو دڵنەوایيکەرەوە، دووچاری شۆکبوون. ئەم لەدەستچوونە وایلێکردوون بە شێوەیەکی بەتین پەیوەست و پاشکۆی ئەو پەیوەندییانە بن کە پێویستییان پێیەتی (وەک منداڵی ئەو ژن و پیاوانەی لەئاکامی تەڵاق جیادەبنەوە). ئەم جۆرە منداڵانە ئەگەری زیاتری تووشبوونیان بە نەخۆشییە سایکۆلۆژییەکان لەحاڵەتی نەمانی جەختلێکردنەوە لەنارسیزم-دا، لێدەکرێت، چونکە ناتوانن شێواوی و پشێوی ناو پەیوەندییەکە، ئاشکرابکەن یان جۆرێکی دیکە لەئەودیو پەیوەندیکردن "مێتاکۆمۆنیکەیشن- meta communication بسەپێنن.

## تێبینی سەبارەت بە وەستاندنی پەیوەندیکردن:

وەستاندنی یان پەککەوتنی پەیوەندیکردن لەنێوان دوو هاوبەشدا یان لەنێوان ئەندامانی خێزاندا زۆرجار نیازی بەرگریکردنی لەپشتەوەیە، کە ئامانجی پاراستنی تاکە. هەرچی فرۆفێڵ و رێگەکانی هەڵخەڵەتاندنە کە لەم بوارەدا بەکاردەهێنرێت زۆر ئاشکران و دەتوانرێت تێبینی بکرێت. وێڕای میکانیزمە باوە بەکارهێنراوەکان کە ئاسایی لەسەر ئاستی سایکۆلۆژیی ناوەکی intrapsychique بەکاردەهێنرێن: (وەک رەتکردنەوەو چەپاندن و بیرچوونەوەو پاساو هێنانەوەو هی دیکە) لەسەر ئاستی پەیوەندی



نێوان تاکەکان interindividulle، چەند میکانیزمێکی لێکچوو تێبینی دەکەین، وەک:

– شێواندن brouillage: واتە وابکرێت پەیوەندیکردن نادیارو نەزانراو بێت لەرێگەی زیادکردنی "ژاوەژاوێک" بە ناوی پەیوەندیکردنەکەوە، وەک کۆبونەوەی کۆمەڵێك دەستەواژەی پەرتبوو یان دابەشبوو هەروەك لەشێواندنی ئاسایی رادیۆدا روودەدات.

– گواستنەوە deplacement: واتە لەکارخستنی پەیام یان قسەی هەرەشە ئامێز، وایلێبکرێت ئەو قسانە بێسوود بێت ئەویش لەرێگەی خۆدەرخستن بەو شێوەیەی بەمانایەکی دیکە گوێی لەقسەکە بووە، یان خۆدەرخستن بەو شێوەیەی ئەو هیچ لەو ئاماژە قسەییانە تێناگات، ئەویش لەرێگەی پابەندبوونەوە بە ناوەرۆکێکی روون و ئاشکراو خاوەن بەها تا ئەو روخسارە هەرەشە ئامێزەی تایبەتە بە پەیوەندییەکە، فەرامۆش بکات. هەروەها گواستنەوەی پەیامەکە بەو شێوەیەی یان بە ئاماژەدان بەوەی کەسێکی دی لەرێگەی ئەم پەیامەوە هەرەشەی ئاراستە دەکرێت.

– پەکخستن Obstruction: ئەویش لەرێگەی جڵەوگرتنی قسەکردن و رێگەگرتن لەکەسانی دی بۆ بەکارهێنانی: پەکخستن بەشێوەیەکی کارامە تەنیا لەو رێگەیەوە نابێت کە بەزۆر رێگە لەوەڵامدانەوەی کەسانی دی بگیرێت، بەڵکو ئەم کارە بەشێوەیەکی شاراوە ئەنجامدەدرێت و بەمەش ئەو تاکە لەناڕەزایی و رەخنەی کەسانی دیکە دەربازی دەبێت.

– داماڵین لەتواناکان disqualification: ئەویش لەرێگای داماڵینی راستەوخۆ یان ناراستەوخۆی قسەکەر لەپەیامەکە

بەشێوەیەکی بریندارکەرانە: "تۆ لەهیچ تێناگەیت، تۆ هەرزەکارێکی بچوکیت، تۆ هیچ نیت تەنیا...."."

– خود داماڵین لەتوانا auto disqualification: بەشێوەیەکی ئاشکراو ئەندەکییە، زۆرجار بۆ خۆپاراستنەو ئامانجی ئەوەیە هێرشێکی ترسناك لەکاربخات:"من دەزانم کە زۆرکات هەڵە دەکەم، بەڵام ..."، ئەم خود داماڵینە زۆرجار بەپلەیەك کارامەو زیرەکانە دەبێت کە هانی قسەکەر یان ئەوکەسەی چاوەڕوانی قسەکردنی لێدەکرێت، دەدات بۆ قسەکردن ئەمە لەفیلمەکانی Colombo دا تێبینی دەکرێت کە بارێکی گێلی یان نزمی لەدیالۆگەکەدا وەردەگرێت.

– شـرۆڤەکردن dramatisation: واتـە رووداو یـان پەیوەندیکردنو دەرئەنجامەکانی والێبکرێت تراژیدیی بێت:

ئەم مانۆڕە جیاوازانە لەوانەیە ئامانجیان سنوردانان یان بەتاڵکردنەوەی کاریگەری یەکێك لەمانە بێت:

– پەیامە هەڕەشە لێکراوەکە.

– یان خاوەنی پەیام یان پاڵنەرەکانی، ئەویش لەرێگەی ئەم پەیامانەوە: (ئەو زۆر هیلاکە، روخاوە،....هتد).

– یان رێساکانی قسەکردنی واقیعیانە (لەزمانی تێناگەیت، قسەدەکاتو دەمی پڕە، نازانێت چۆن گفتوگۆکە بەڕێوەبەرێت).

ئەم مانۆڕانە پەیوەندی زۆریان بە توانای شیکردنەوەی پەیوەندییو گوزارشتکردنی قسەکردنەوە هەیە، دۆخی ئەو هاوبەشەی لەم بوارەدا کارامەیە لەکەسانی دیکە کەمتر هەڕەشەی لەسەردەبێت، هەروەها دەتوانێت لەدۆخێکی بەهێزدابێتو



ئاڵوگۆڕکردن یان ئەو پەیوەندیکردنانە بەرێوەبەرێت یان بوەستێنێت کە قەڵسو وەڕسی دەکەن. ئەو هاوبەشە کارامەیە دەتوانێت رێساو تابۆی وا بسەپێنێت کە ئاشکراکردنیان یان رووبەرووبوونەوەیان، ئەستەم بێت.

## چـوونەوەیەکی پەیوەنـدیکردن: کۆتـە فرمـانییو کۆمەڵایەتییو ئابوورییەکان:

لەبناغەی هەموو پەیوەندییەکی دووالیزمدا، پێشئەوەی ئەو پەیوەندییە وەك پێکهاتەیەکی رێکخراو بوونی، هەبێت، هەر تاکێك ئارەزوو دەکات بەرامبەرەکەی بهەژێنێت، هەروەها ئارەزووش دەکات ببێتە بابەتی خۆشەویستییو هەژاندنی بەرامبەرەکەی. ئەم ئارەزووانە رۆڵێکی گرنگ دەگێڕن لەئاڵوگۆڕکردنی مەیلو پەیوەندیکردن لەگەڵ یەکتریدا. پەیوەندیکردن لەسەرەتای پەیوەندیدا فراوانو بەهێزە، ئەویش لەبەرئەوە نییە کە ئەو پەیامانەی لەم ماوەیەدا دەردەچن راستگۆیانەترو بەئەمانەتترن لەگەڵ واقیعدا وەك لەو پەیامانەی لەدوایدا، دەردەچن، بەڵکو ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ئارەزووکردنی ئاشنابوون بەوی بەرامبەرو گەڕان بە شوێن ئەو زانیارییانەی لەوەوە دەردەچنو هەروەها دەگەڕێتەوە بۆ ئارەزووی گوزارشتکردن لای هەر یەکێکیان، کەلەسەرەتای پەیوەندیدا زۆر توندو بەهێزە. لەنێوان دوو هاوبەشدا یان ئەو کەسانەی لەئایندەدا دەبنە هاوبەشی یەکدی ئارەزوویەك هەیە بۆ بەیەکەوە بوونو ئارەزوودەکەن بەیەکەوە قسەبکەنو گفتوگۆ لەنێوان

یەکتریدا ئاڵوگۆڕبکەن.

کەواتە پەیوەندیکردن، لەماوەی یەکەمی ژیانی هاوسەرێتیدا بەرەو دەرکەوتن‌و قوڵبوونەوە دەڕوات لەکاتێکدا کە لەم ماوەیەدا پەیوەندیکردن بەشێوەیەکی ڕێژەیی ئاسانترەو چێژی زیاتر بە دوو هاوسەرەکە دەبەخشێت، بەهەرحاڵ هەر هاوبەشێك (هاوسەرێك) ئەوە دەزانێت لەماوەی مانگی هەنگوینیدا پەیوەندیکردن بە هەموو شێوە جیاوازەکانییەوە زۆر گرنگە، ڕوودات کە لەئاڵوگۆڕکردنی ئاشنابوون بەیەکتری زیاتر یارمەتیدەر دەبێت. کەواتە واپێویست دەکات دوو هاوبەشەکە (ژن‌و پیاو) لەم ماوەیەدا لەسەر پەیوەندیکردنی باش ڕابێن، ئەو کەسانەش کە سوود لەم ماوەیە بۆ دووهێندکردنی ئاشنابوونی ئاڵوگۆڕکراوییان لەگەڵ یەکتریدا، وەرناگرن، بەمە فرسەتێکی گرنگ لەیاری ئاڵوگۆڕکردنی پەیوەندییەکانیان لەدەستدەدەن، ئەمەش جەخت لەوە دەکات کە پێکهاتەی پەیوەندی هاوسەرێتی پشتدەبەستێت بە ماوەی مانگی هەنگوینی (سەرەتای پەیوەندی) چونکە لەم ماوەیەدا بەهۆی ئارەزووی زۆری هاوبەشەکان بۆ ئاڵوگۆڕکردنی پەیوەندیکردن‌و ئاشنابوون، پەیوەندیکردن ئاسان دەبێت.

کەواتە بۆچی پێدەچێت بزاوتی پەیوەندیکردن بوەستێت، لەکاتێکدا خۆشی بەخش‌و بەسوودە بۆ هاوسەرەکان‌و پەیوەندی نێوانیان دروستدەکات‌و دەیچەسپێنێت؟ لەکوێوە ئەوە ڕوودەدات؟ لەکاتێکی دیاریکراودا کە پەیوەندیکردن بەرەو ئەوە دەڕوات کە کارایی کەمتر ببێتەوە، بێئەوەی بەتەواوەتی ونببێت؟ هەروەها ڕێگرییەکان freins لەکوێوە دێن‌و لەبەردەم پەیوەندیکردندا



دەوەستن؟ بێگومان هەندێك لەهاوسەرەکان دەتوانن پەیوەندیکردنی نێوانیان باشترو قوڵتر بکەن، سەرلەنوێ هەموو ڕێگەیەکی نوێ بۆ داهێنانی پەیوەندیکردن بدۆزنەوە کە ئەمانە یارمەتییان دەدات بۆ ڕێکخستنی پەیوەندی ئاڵوگۆڕکراوی نێوانیان، بە پێچەوانەشەوە زۆرێك لەهاوسەرەکان لەقۆناغێکی زوودا، گرژبوون (چونەوەیەك) لەپەیوەندیکردنی نێوانیاندا ڕوودەدات، چونکە فۆرمەلەبوونی ئێمە Nous ی ڕاستەقینە، زۆر ئەستەمە. لەوەدەچێت تەنیا هاوسەرەکان تووشی یاسای گشتیی چوونەوەیەکی پەیوەندیکردنی ڕاستەقینە نەبن، چونکە لەناو کۆمەڵ‌و گروپە کۆمەڵایەتییەکانی دیکەشدا تێبینی دەکەین. بەتایبەتی ئەو گروپە بچووکانەی کە ئامانجیان تایبەتە بە ئامانجێکی دەرەکیی، نەك بە پەیوەندی ناوەوەی نێوان تاکەکان لەگەڵ یەکتریدا: لەمکاتەدا باش بەڕێوەچوونی گروپەکە چوونەوەیەکی بارگەی سۆزداری نێوان ئەندامەکان دەسەپێنێت، ئەویش لەبەر بەرژەوەندی پەیوەندیکردنێکی فرمانی زیاترو ئەقڵانی سادەکراو.

ژن وپیاو (هاوسەرەکان) لەبەرئەوەی ئەوانیش وەك گروپ و کۆمەڵەکانی دیکە چێژ لەئامانجی دەرەکی لەدەرەوەی خۆیان دەبینن، پێویستیان بەوەیە لەنێوانیاندا پەیامی سیفەت هەواڵی هەبێت‌و بەئاسانی بەڕێوەبچێت، بێئەوەی بە گواستنەوەی بەها سۆزدارییەکان ئاڵۆز ببێت. ژن‌و پیاو لەم ڕێسا گشتییە دەرناچن کە بارگە سۆزدارییەکانی پەیوەندیکردن سنوردار دەکات، هەرچەندە ئەم بارگە سۆزدارییانە بایەخی زۆریشیان هەیە لەبەدەستهێنانی کارایی باشتر لە پەیوەندییەکەیاندا.

ئەو ڕێگەرە ئۆرگانیانە چین لەبەردەم ئەم پەیوەندیکردنەدا؟ لەگۆشەنیگای ڕێکخستن و پەیوەندی دوالیزمیدا بەراوردکاری یان پێوانە، بەتایبەتی لەگەڵ ئەو گروپە پچوکانەدا کە سیفەتێکی فرمانییان هەیە لەوانەیە بۆ لێکۆڵینەوە زۆر بە سوودبن، لەم گروپانە:

– وەرشەکانی بەرهەمهێنان و گروپەکانی کار، تیمەکانی توێژینەوەو تیمە سەندیکاییەکان، شانەی حزبە سیاسیەکان ...هتد، ئەمانە پێویستە وادابمەزرێن تا ئەو کاریگەرییە ببەخشن کە لەپێناویدا دروستبوون و ببنە دامەزراوەی فرمانی. هەروەها فرمانە پراکتیکییە جیاوازەکان کە پێویستە هاوسەرەکان لەدەرەوەی خۆیان ئەنجامی بدەن، وەك ئەرکە پەروەردەیی و خۆراکیی و کۆمەڵایەتییەکان ...هتد، ئەم فرمانانە واپێویست دەکات پەیوەندییە ناوەکییەکان لەنزمترین ئاستی ئارامیدا بن و هەر هاوبەشێك زانیاری information زیاترو تائەوپەڕی توانا وردتری دەربارەی چالاکی بابەتییانەو ئامانجەکانی هاوبەشەکەی بەرامبەری، دەستبکەوێت.

بەمشێوەیە بۆئەوەی وزەی بەکارهاتوو بەشێوەیەکی هەمەکی لەجێبەجێکردنی فرمانی ئەندامەکان و نوێکردنەوەی پەیوەندییان، سەرقاڵ نەبێت (هەموو ئەو وزەیە سەرفنەبێت)، ئەوا هەندێك لەو ڕێسایانەی پەیوەندییان بە مەرجە مادديی و کۆمەڵایەتیی و کولتورییەکانەوە هەیە بەرەو ئەوە دەڕۆن خۆیان دابمەزرێنن، ئەو ڕێسایانەش وەك دابەشکردنی ئەرکەکان و زۆری دیکە. نابێت فرمانی بەرهەمهێنەرو ئابوورییانەی پەیوەندی هاوسەرێتی بە بەهانەی روانین لەتەنیا روانگەیەکی سایکۆلۆژییەوە فەرامۆشبکرێن یان لەبواری بینین و تەماشاکردن دوربخرێنەوە. بەمشێوەیە دەبینین



واپێویست دەکات لەپێناوی بەرهەمهێنانی باشدا بارگە سۆزدارییە ئاڵوگۆڕکراوەکانی نێوان دووهاوبەشەکە (ژن و پیاو) سنوردار بکرێن و بچنەوەیەك.

کەواتە دەتوانرێت بوترێت بەهۆی چوونەوەیەکی پەیوەندیکردن لەسەر ئاستی سۆزداری ئەو دووهاوبەشە دەتوانن لەسەر ئاستە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان ..هتد بەشێوەیەکی باشتر کاربکەن. بەڵام هەر کە ئەم ئەرکە کۆتایی هات – یان هەروەك پەندە چینیەکە دەڵێت (هەر کە ماڵ تەواو بوو)– پەیوەستی نێوان ژن و پیاو بەشێوەیەکی ریشەیی لاوازدەبێت، بێگومان هەندێکیان دەتوانن ئامانجی هاوبەشی نوێ بدۆزنەوەو سەرلەنوێ پێکهاتەی پەیوەندییەکانیان ڕێکبخەنەوە، لەکاتێکدا هاوبەشی دیکە یان ژن و پیاوی دیکە هەن ناتوانن ئەم تواناییانە ئاشکرابکەن و بێ دۆزینەوەی ئامانجێکی هاوبەش، دەمێننەوەو پەیوەندیکردنییان لەسەر ئاستی ژیانی سۆزداری بە سنورداری دەمێنێتەوە، ئەم مەرجانەش ڕێگە نادەن بە پەرەپێدانی مەیلی نوێ یان کێشکردنی ئیرۆسی پێویست. زۆر بەروونی نموونەی ئەم هاوسەرانە بایەخی پەیوەندیکردن لەسەر ئاستی ژیانی سۆزداریی و لایەنە خراپەکانی ئەم ئاڵوگۆڕکارییە ئاشکرادەکەن، کە لەوانەیە دینامییەتی پەیوەندیکردنەکەیان بە پێی کارایی پراکتیکی ئامانجەکانیان سنوردار ببێت.

## ڕێگرییەکانی دیکەو ئاڵۆزکردنی پەیوەندیکردن:

لەچوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتیدا ڕێگری دیکە لەبەردەم پەیوەندیکردندا هەیە، کە ئەستەمە بە تەواوەتی دیاریبکرێن، ئایا ڕێکخستنێکی سیستیماتیکی یان سروشتی تاکێتییان هەیە. زۆرکات گەڕان بەشوێن ئاسوودەییدا Securite یان ڕێگەیەك بۆ ژیانێکی هێمن و دوورکەوتنەوە لەناکۆکیی و گرژی، ئەو کەسانە بەرەو ئەوە دەبات بەشێوەیەکی ئیرادی ئاستی پەیوەندیکردنیان دیاریبکەن و تەنانەت بە لەبەرچاوگرتنی ئەو وەهمەش Illusion کە لەوانەیە لەهەڵوێستێکی لەمجۆرەدا دروست ببێت: لەوانەیە ئەو حەوانەوەی دوو هاوبەش لەچوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتیدا – (وەك پەیوەندییەکی پەنا بۆبراو)– بەدیدەکەن ئەگەر لەدەرەوەی هاوسەرێتیی نەیدۆزنەوە، ئەوا بۆ قەرەبووکردنەوەی پەنا بۆ چوونەوەیەکی پەیوەندیکردنە ناوەکییەکانیان دەبەن، ئەویش یان لەڕێگەی خستنەوەبەرفرمانی چالاکیە دەرەکییە هاوبەشەکانی نێوانیان یان لەیەکجیاکراوەکان واتە ئەو چالاکییانەی بە تەنیا ئەنجامی دەدەن، یان ڕەتکردنەوەی ئەوەی لەم هەڵوێستەوە پەیدا دەبێت.

– نابێت ئەو پەیوەستییە لەیاد بکەین کە لەنێوان پەیوەندیکردن و ڕاگەیاندندا information هەیە. ئەگەر لەسەرەتای پەیوەندی هاوسەرێتیدا دەوڵەمەندکردنی ڕاگەیاندن لای تەواوی هاوسەرەکان زۆر گرنگ بێت، ئەوا ڕاگەیاندنی ئاڵوگۆڕکراو لەنێوانیاندا بەرەو



وشکبوون و چوونەوەیەك دەچێت، بەو ڕێژەیەیی یەکێك لەدوو هاوبەشەکە نەتوانێت پەرە بە ڕاگەیاندنی نێوانیان بدات و پەیامی نوێ ئاڕاستەی هاوبەشەکەی بکات، ئەمەش بەشێوەیەکی تایبەتی ڕاستە، کاتێك لەلایەن ژیانی کۆمەڵایەتیی و دەرەکییەوە هەریەك لەپەیوەندیکردن و ڕاگەیاندن هاننەدرێن، لەوانەیە لەرابووردوودا ئەمە ڕاست بووبێت: دەتوانین ئەو ژیانە بێنینە پێش چاوی خۆمان، کە مرۆڤ پێش زیاتر لەچەند سەدەیەك، لەقوڵایی دۆڵێکدا ژیاوە، لەبەرئەوە پێویستیان بەوە نەبووە سەرلەنوێ ئەو پرسیارە دەربارەی پەیوەندییە ئاڵوگۆڕکراوەکانی نێوانیان بخەنەوەروو، ئەمە لەکاتێکدا ئەگەر واشمان دانا کە ئەم توانایەیان هەبووبێت، بەڵام بارودۆخی تەکنۆلۆژیی و کولتووری کە ئێستا تیایدا دەژین و بەتایبەتی هاتنە مەیدانی بەرفراوانی ڕاگەیاندن و ئەو هاندانەی لێوەی پەیدابووە – بەباشی یان بە خراپی– بەشێوەیەکی ڕیشەیی تا ئاستێك سەرلە نوێ پرسیارکردنی دەربارەی پەیوەندییە ئاڵوگۆڕکراوەکان، سەپاندووە. "ناتوانین پەیوەندی نەکەین"، بەڵام پەیوەندیکردن هەر ملکەچی ڕاگەیاندن و ئارەزووکردنی پەیوەندیکردن دەبێت.

– لەسەرەوە ئاماژەمان بەوەدا چۆن دوو هاوبەش ئاسودەیی ناوەوەیان، بەلاوە باشترە لەپەیوەندی نێوانیان، تەنانەت ئەگەر ئەو ئاسوودەییە پشتی بە "ڕێگەیەکی ژیان" بەستبێت، کە زیاتر پڕ لەناخۆشیی و گرژی بێت وەك لەروونکردنەوەی ئەو مەسەلانەی لەوانەیە ئەوان پێی قەڵس و وەڕس بن و ناچاریان بکات بەشوێن ڕێگەیەکی نوێ و ئەستەمدا بگەڕێن بۆ ژیانیان. گرتنەبەری ئەم ڕێگەیە لەژیاندا یان ئەم جۆرە ڕێوشوێنە لەژیاندا، گوزارشت

لەئاسوودەییەکی ساختە securite یان وەك دەڵێن سیاسەتی نەعامە(وشترمرخ)، دەکات. ئەم ڕێگەیە لەگەڵ لایەنە خراپو ناواقیعییەکەیدا، بەڵام لەچوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتیدا زۆر باوە. بەشێوەیەکی گشتیی پەیوەندیکردنیی سەرەکی لەلایەکەوە سیفەتی چێژبەخشینو ئیرۆسی هەیە، لەلایەکی دیکەشەوە لەگۆشەنیگای نارسیزمییەوە سیفەتی بە بەهاتری هەیە. لەماوەی یەکەمی پەیوەندیدا ڕاگەیاندن بە تەواوەتی ڕاست نییە، بەڵام بەو سیفەتەی چێژو بەها بەخشە بۆ هاوبەشەکان، بەشێوەیەکی پۆزەتیڤو حەماسی لەلایەن دووهاوبەشەکەوە بەرهەمدێتو دەخرێتەوە بەرفرمان.

هەر لەدوای پلەیەك لەئاڵۆزبوون ڕاگەیاندن لەپێشکەشکردنیدا ئەستەمتردەبێتو دەبێتە سەرچاوەیەك بۆ قەڵسیی و وەڕسبوون: چۆن دەتوانرێت پاساو بۆ ئەم کارە یان هەڵسوکەوتە بهێنرێتەوە بێ باسکردنی ڕوخسارێکی بڕواپێهێنەرو شاراوە لەپەیامێکی پێشووتردا؟

چۆن دەتوانرێت ڕوخسارێکی خودی بەشێوەیەکی عەفەوی ڕەتبکرێتەوە کە تا ئەوکاتە بەوپەڕی بەئاگاییەوە شاراوەتەوەو پارێزراوە؟ چۆن دەتوانرێت بەشێوەیەکی تایبەتی گۆڕانێك لەهەڵوێست یان پەخشی پەیامێکی باشتر لەلایەن بەرامبەرەکەمانەوە بەدەستبێنینن لەکاتێکدا ئەگەر ڕێگەی پێنەدەین یەکێك لەشێوەکانی ناڕازیبوون لای ئێمە ئاشکرابکات، واتە ڕێگەی پێبدەین ئەولایەنە ناڕازییە لەئێمەدا ئاشکرابکات کە ئەو قەڵسو وەڕس دەکاتو بەرەو گۆڕانی خود دەیبات، بەمشێوەیە پەیامە ئاڵوگۆڕکراوەکان لەوانەیە



هێندە چێژبەخشو گونجاو نەبن، نە بۆ یەکەمو نە بۆ دووەمیش (واتە دووهاوبەشەکە)، ترس لە "قەڵسیو وەڕسبوون" یش قەرەبووی دەستکەوتنی پاداشت دەکات.

دەرئەنجام لەرووی ژیانی سۆزدارییەوە، پەیوەندیکردن بەرەو چوونەوەیەك دەڕوات، بەمشێوەیە ئاستێك بۆ دەرکردنی پەیامی ڕەخنەگرانەی نوێ، دادەنرێتو پەیامنێر دەترسێت بە پەیامێکی زەمو ڕەخنە وەڵامبدرێتەوە، لەبەرئەوە ئەو کەسە بێدەنگبوون یان شێواوی پەیامە تایبەتییەکانی خۆی بەلاوە باشترە. ئەگەر پرسیارێکمان ئاڕاستەکرا چۆن دەتوانین بێدەنگ بین؟ وەڵامنەدانەوە واتە جەختکردن لەناوەڕۆکێك کە دەمانەوێت بیشارینەوە، هەرچی وەڵامدانەوەشە ئایا جەختکردنەوە نییە لێی؟ لەکاتێکدا وەڵامەکە تەنیا یەك وەڵامە، بۆیە وەڵامدانەیەکی شێواو دەبێت. بەمشێوەیە شێواوی لەپەیوەندیکردندا وەك چالاکییەکی گرنگ وایە لای زۆر لەهاوسەرەکان تەنانەت ئەگەر لەحاڵەتی بێئاگایی، لەنێوان خاوەن پەیوەندییەکانیشدا، ڕویدا یان بێئاگادارییان یان دوور لەنیاز یان ئیرادەی ڕاشکاوانەی خۆشیان، ڕوویدا. لەواقیعدا لێکۆڵینەوە لەم شێواندنە، قەڵسیی و وەڕسبوونیش لەوەڵامدانەوەدا دەخاتەروو، بەمانایەکی دیکەو دواجار قەڵسیی و وەڕسبوون لەپەیوەندییەکە دەگەیەنێتو بەشێوەیەکی بەرفراوانترو لەناوەڕۆکە هەڵنەسەنگێنراوو ڕوخێنەرەکانیدا بۆ ئەوو بۆ خود، "قەڵسیو وەڕسبوون" لەمانەوە لەگەڵ هاوبەشی بەرامبەردا، دەگەیەنێت. ئێمە ناتوانین ئەوە بزانین کە خۆمان پەیامەکان دەشێوێنین. دانپێدانەنان بەمەدا یان نەزانینی پابەندبوونێکی خۆنەویست altruisteو بەهەمان هێندیش

خۆپەرستانەیەو وەك یاسایەكی زۆرەملێ تا پلەیەكی دیاریكراو خۆیدەسەپێنێت.

بەمشێوەیە لەچوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتیدا دەردەكەوێت زوربەی هاوسەرەكان لەجیاتی روونكردنەوەی بریندارکەرو ئازاراوی كە ئەشكەنجەو هەندێك نسكۆ ئاشكرادەكەن، ئەوەیان پێ باشترە قەڵسیی و وەڕسبوونیان تا لێكدابڕان یان هەندێجار جیابوونەوەش فەرامۆشبكەن و بیشارنەوە، كە لای هەندێك لەهاوسەرەكان ئەم لێدابڕان یان جیابوونەوە بە كتوپڕی روودەدات، لەكاتێكدا بە رووكەش زۆر یەككگرتوو دەردەكەون.

## پەیوەندیكردن لەچوارچێوە ژیانی رۆژانەدا :

لەچوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتیدا شێوەی دیكە لەگوزارشتی رەمزی دیاریدەكرێت كە رۆڵی گرنگییان هەیە لەسەر ئاستی پەیوەندیكردنی نێوان دوو هاوبەشەكە (ژن و پیاو)، بۆنمونە ئامادەكردنی خواردن و قاوە دروستكردن، لەوانەیە وەك دەستپێشكەرییەكی باشی رێزدانان بۆ هاوبەشی بەرامبەرو جەختكردنەوە لەبەهای خودێتی ئەو، جێبەجێبكرێت. بەڵام دەشێت ئامادەكردنی خواردن یان قاوە، لەبەرئەوە ئەنجامبدرێن، كە ئەو هاوبەشە داوای لێكراوە نەك وەك رێزدانان لەو هاوبەشە، بەڵكو بەهۆی فشارخستنەسەر، ئەو كارەی بۆبكات. لەمحاڵەتەدا ئەنجامدانی ئەم ئەركە مەغزایەكی شەڕانگێزیی بێزار لەخۆدەگرێت و پەیوەندی نێوان دوو هاوبەشەكە لەپەیوەندی نێوان سەرگەورەو



كۆیلە دەچێت.

هەندێجار "ئامادەكردنی خواردن" بەڵگەیە بۆ شكستی ئەو هاوبەشەی خۆراكی بۆ ئامادەدەكرێت: لەمبارەدا خواردن ئامادەدەكرێت بۆ ئەو هاوبەشە، هەروەك چۆن بۆ منداڵێك ئامادەدەكرێت كە ناتوانێت خۆی خواردن دروستبكات. ئەگەر نموونەیەكی دیكە وەربگرین، بۆ نموونە تێبینی لێخوڕینی ئۆتۆمبێل بكەین، بابەتی یان هۆكاری ئاژاوەی دووبارە بووەی نێوان هاوبەشەكانە (ژن و پیاو).

مەسەلەی لێخوڕینی ئۆتۆمبێل دەشێت گوزارشت لەبەئاگایی و بێ متمانەیی بكات بە توانای هاوبەشەكەی دیكە. هەروەها لەوانەیە گوزارشت لەترس و لەدۆخێكی نێگەتیڤ لەئۆتۆمبێل لێخوڕیندا بكات و لەوانەشە هەولێك بێت بۆ گۆڕینی هاوبەشەكەی دی بۆ مرۆڤێكی شكست و لاوازو بەتایبەتیش (وەك زانراوە) ئەمڕۆ مۆڵەتی شۆفێری لەمانا سیمبولییەكەیدا وەك دروشمێك تەماشادەكرێت، مانای وایە خاوەنی مۆڵەت كەسێكی پێگەیشتوو كامڵە، ئەم دروشمە رێگە بە هاوبەشی ناكامڵ و پێنەگەیشتوو دەدات (كە زۆرجار ژنە) هەوڵبدات بۆ گەیشتن بەو زۆرینە سیمبولییە (واتە هەڵگرانی مۆڵەتی شۆفێری).

## هەڵوێستەكان وەك مەدلول و لێكدانەوە جیاوازەكانیان:

هەڵوێستە سەرنجڕاكێشەرەكان Seduction (كە دەچێتە چوارچێوەی رێكپۆشی جەستەیی و قژو جلوپۆشاك) رۆڵێكی گرنگ

لەچوارچێوەی پەیوەندیکردنی نێوان هاوبەشەکان، دەگێڕن: ئەو ژنەی جوانەو بەشێوەیەکی باش بایەخ بەڕێکپۆشی خۆی دەدات کاریگەرییەکی پۆزەتیڤ لەسەر هاوسەرەکەی جێدێڵێت. بەڵام ئەم ڕەفتارە لەوانەیە مۆرکێکی دووفاقی وەربگرێت، ئەگەر کاریگەری پۆزەتیڤی لەسەر کەسانی دیکەش جێهێشت.

لەم نێوکۆیەدا، ئەو ژنە جوانەی کە پراکتیزەی تەفرەدان دەکات، بەها دەبەخشێت بەو کەسە کە بەختی هەبووە لەدەستکەوتنی و ڕاکێشانی بەلای خۆیدا، بەڵام لەو حاڵەتەدا ئەم دەستکەوتن و ڕاکێشانە دەبێتە جێگەی پرسیار کە ئەم ژنە ڕۆڵی تەفرەدانی کەسانی دیکەو کێبڕکێکەران، دەبینێت: هەڵبژاردنێکی لەم جۆرە، یەکەم بەهایەکی نارسیزمی بە هاوسەرەکەی دەبەخشێت، بەمەش دەبێتە شایەتحاڵ لەسەر توانای تەفرەدان و پلەوپایەی پیاوەکەی، بەڵام ئەم پیاوە ئەگەر درکی بەوەکرد لەئێستادا هەڵوێستی سەربەستانەی ژنەکەی، وەك هەوڵێك بۆ تەفرەدانی کەسانی دیکە، بەکاردەهێنێت، ئەوا ئەم هەڵوێستە کاریگەرییەکی نێگەتیڤانە لەسەر هاوسەرەکەی بەجێدێڵێت، ئەویش بەهۆی ئەو ڕیسواییەوە کە ژنەکەی ئاڕاستەیکردووە لەبەرامبەر دوژمنە وادانراوەکانیدا (واتە خۆی بە دوژمنیان دادەنێت).

لەلایەکی دیکەوە، سەرکەوتنی پیاو لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە دەبێتە سەرچاوەی هاندان لای ژن، تا ئەوکاتەی هاوسەرەکەی پەیوەستە پێوەی. بەڵام ئەم سەرکەوتنە لەوانەیە ببێتە سەرچاوەیەك بۆ شکستی ژن ئەگەر درکی بەوەکرد پیاوەکەی ئەم سەرکەوتنە وەك هۆکارێك یان هەوڵێك بۆ تەفرەدانی ژنانی دی بەکاردەهێنێت.



## پەیوەندیکردنی زاوزێیی (جینیتالی):

پێویستە ئاگاداری ئەوە بین ئەو زمانەی کە دوو هاوبەش لەچوارچێوەی پەیوەندیکردنی زاوزێیی (جینیتالی) بەکاریدەهێنن، زۆرجار مۆرکی هاندان بۆ کاری سێکسوالی لەخۆدەگرێت، بەڵام لەوانەشە ببێتە هۆی پەرچەکردارێکی نێگەتیڤ کە زۆرجار پەردەپۆشکراون.

ئەو پەیامەی لەبارودۆخی گونجاودا هانی کاری سێکسوال دەدات ئارەزووی سێکسوال لای ئەو هاوبەشە بە ئاگا دێنێت کە بەشێوەیەکی هاوتا وەڵامدانەوەی دەبێت. زۆرجار ئەم کارە سەرەتاییە لەشێوەی نەخۆشییەکی بەدەر لەململانێ ڕێکدەخرێت، بەتایبەتی لەقۆناغە سەرەتاییەکاندا، چونکە ڕابوونی ئارەزوو لای هاوبەشی بەرامبەر خۆی لەخۆیدا چێژ بەخشەو بەهایەکی نارسیزمی بە تاك دەدات.

بەڵام لەوانەیە هاندان ببێتە هۆی دروستکردنی ئاڵۆزی، کە ئەمەش دەبێتە ڕێگر لەبەردەم ڕابوونی ئارەزووی سێکسوال لای هاوبەشەکەی دی، ئەم هاوبەشەی دی لەوانەیە وا هەستبکات ئەم هاندانە کە هاوبەشەکەی بەرامبەری پراکتیزەی دەکات وەك ئەوە وایە بەسەریدا سەپێنرابێت و ئامانجی داماڵینی بێت لەئارەزووە تایبەتییەکەی، هەروەها لەوانەیە بەشێوەیەك لەو دۆخەدا بژی هەروەك ئەوەی بوارێك بێت بۆ کێبڕکێ یان ململانێیەکی دەمامککراو لەنێوانیاندا، بەتایبەتی ئەگەر لەدۆخێکی وادا نەبوو تا بەشێوەیەکی

گونجاو یارمەتیدەر بێت لەوەڵامدانەوەی هاوبەشەکەی. لەمحاڵەتەدا لەوانەیە بەشێوەیەکی نێگەتیڤ بەرهەڵستی بکاتو ئەویش لەڕێگەی هەستنەکردن بە هیچ وەڵامدانەوەیەکی سێکسواڵی لەکاتی ئەنجامدانی کاری سێکسوالدا.

لەم چوارچێوەیەدا تێبینی دەکەین " نیشانە سێکسوالەکە" بەشێك لەپرۆسەی پەیوەندیکردنی نێوان هاوبەشەکان فۆرمەلەدەکاتو لەوانەیە لەسنووری پەیوەندییەکانی پلەو پایەی نێوانیاندا لێکبدرێتەوە: پرۆسەی هاندان دەشێت کاریگەری هەبێت بۆ سەر گۆڕینی جەوهەری تاكو هەستەکانی تا ئەو ڕۆژە دێتو ئەو دەسەڵاتە رەتدەکاتەوە کە هاوبەشەکەی لەسەری پراکتیزەی دەکاتو لەرێگەی چەپاندنی ئەو ئارەزووە سێکسوالییەوە بەرگری لەخۆی دەکات، بەمە هاوبەشەکەی لەوەڵامدانەوەی پێویست بێبەشدەکات.

ئەگەر مەسەلەی "پەككەوتنی سێکسوال" وەك نموونە وەربگرین، تێبینی دەکەین یەکێك لەدوو هاوبەشەکە پەنادەباتە بەر لەکارخستنی inhibition ی یەکلایەنە لەئەنجامدانی کردارەکە، بەمەش گوزارشت لەرێگەگرتنی تەواو بەرامبەر کاری سێکسوال دەکات: ئەم نیشانەیە لای ئەم هاوبەشە جۆرێك لەرێککردنەوەو چاکسازیی بەدیدەهێنێت لەنێوان نیازە ئاشکراکانیدا (گەڕان بەشوێن تێرکردنی خودو جەختکردنەوە لەپیاوەتیی) لەگەڵ نیازە شاراوەکانیدا (رەتکردنەوەی ملکەچبوون بۆ ئارەزووی ئەوی دیو رەتکردنەوەی دانپیادانان بە دەسەڵاتیو سزادانیداو ...هتد).



**پەراوێزەکان:**

1-WATZLAWICK P., Une logique de la communication,tr fr , paris , Seuil, 1972,P.46.

2-WATZLAWICK P.,Les cheveux du Baron de Munchhausen,tr fr , Paris , Seuil,1991,P.20.

3-WATZLAWICK P., Changements , Paradoxes et Psychotherapie , tr fr,Paris , Seuil , 1975.

4-WATZALAWICK P., Une logique de la communication , tr fr ,Paris , Seuil,P.46.

5-LAING R., Politique de la famile et autres essais,tr fr . paris , Stock , 1972.

6-JACKSON D., Etude de la famille , Paris , seuil.1981.

7-ANZIEU D., Le transfert Paradoxal, in Nov. Rev Psychanal,1975,NO,12,PP.49-72.

8-VANJ., Lanalyse transactionnelle, Toulouse , Ed.Privat , 1981.PP.37-52

9-ibid., PP.71-76.

## بەشی دەیەم

# فاکتەرە ئابوورییەکانو پەیوەندییەکانی پلەو پایە

### سامان لەچوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتیدا چی دەنوێنێت؟:

سامان لەکۆمەڵگەی ئێستادا توخمی سەرەکی دەسەلاتو پلەوپایە، دەنوێنێت، هێمایە بۆ تواناو تەنانەت بۆ بەهای خود هەروەها لەوانەیە هەندێجار هێزی فیزیکی زیرەکیی یان نەمریش بنوێنێت: سامان لەم رۆژگارەی ئێستادا بۆتە پێوەرێك بۆ پێودانگدانانو رێزگرتن (فلان کەس ئەوەندە دۆلار دەهێنێت) هەروەها سەرکەوتنی ماددی بۆتە سەلمێنراوێکی جەختلێکراو لەسەر بەهای خودێتی مرۆڤ، جۆرێك لەئایین دروستبووە کە پێیوایە سەرکەوتنی ماددی بەڵگەیە بۆ نیعمەتێکی خودایی. هەروەها سامان ئاڵوگۆڕکردن لەگەڵ دەرەوەدا دەنوێنێت، ئاستی کۆمەڵایەتیی و ئایندەی منداڵانو نەریتەکانی ژیان دیاریدەکات .. (تەنانەت سامان ئەم نەریتانەش دەخولقێنێت وەك: خەرجکردنی سامان بۆ مەبەستی تەنیا دەرکەوتن یان ناوو ناوبانگ "پاراستنی پلەو پایەیەکی دیاریکراو" یان زۆر بەسادەیی بۆ لاساییکردنەوەی دراوسێ



خەرجدەکرێت).

سامان لەچوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتیدا، توخمێکی سەرەکی پلەوپایە دەنوێنێت. ئەو زمانەیە کە بەهۆی دیالۆگی رۆژانەی ژیانی ماددییەوە گوزارشت لەخۆی دەکاتو لەگەڵ دیالۆگی سێکسوالو دیالۆگی زارەکیدا بونیادی پەیوەندی هاوسەرێتی، فۆرمەلەدەکەن.

هەرچی سەرچاوەی سامانیشە دەتوانرێت لەم مەسەلانەدا تێبینی بکرێت: ئەگەر سامان دەرئەنجامی کارو توانستی پیشەیی بێت ئەوا لای ئەو کەسەی ئەو سامانەی دەستدەکەوێت، مەدلولێکی هەڵسەنگاندنیی دەبێت، بەڵام دەشێت مەدلولێکی شکستهێنەریشیی هەبێت لای ئەو کەسەی خۆی لەبارودۆخێکدا دەبینێتەوە کە رێگەی پێنادات قازانج بکات یان دەستکەوتی هەبێت (تێبینی دەکەین لەم رۆژگارەدا بێ ئیشی ئەم فرسەتانەی زیادکردووە).

لەهەندێك خێزانە دەوڵەمەندەکاندا سامان بەکارکردنەوە پەیوەست نییە، تێبینی دەکرێت سامان لەم خێزانانەدا زیاتر بە سەرمایەوە پەیوەستە وەك لەپەیوەستبوونی بە دەستکەوتی تاکە کەسەوە، ئاژاوەوەو ناکۆکییەکان روودەدەن هەروەك بڵێی ناکۆکی نێوان خێزانە بنەڕەتییەکانی ئەو دوو هاوبەشەیە، زۆرجارناکۆکی روودەدات کاتێك یەکێك لەدوو هاوبەشەکە درك بەوە دەکات کە لەبەرخاتری سیفەتو خەسڵەتەکانی خۆی (جوانی، زیرەکی، تواناکان) هەڵنەبژێراوە، بەڵکو بەهۆی ئەو سامانەوە کە هەیەتی بۆ ئەو هاوسەرێتییە، هەڵبژێردراوە.

## پەیوەندی نێوان بابەتو سامان لەچوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتیدا:

لەچوارچـــێوەی پەیوەنـــدی هاوســـەرێتیدا، لێکۆڵینـــەوەی پەرەسەندنی پەیوەندی بابەتگەری نێوان (منداڵو دایک) یارمەتیدەر دەبێت لەتێگەیشتن لەگۆڕانەکانی ئەو پەیوەندییەی کە دووهاوبەش لەئاینـــدەدا لەگـــەڵ ســـاماندا دروســـتیدەکەن. پاشـــکۆیەتی dependence تەواوی منداڵ لەگەڵ دایکدا توانای خاوەنداریێتیی posseder یان بەرگەگرتنی لەدەستدان amanquer لەئایندەدا بە منداڵ، دەبەخشێت.

هەموو ئەزمونێکی تێربوون satisfaction لەقۆناغی زارەکیدا – oral هەستی چێژو حەوانەوە بە منداڵ دەبەخشێت، هەر ئەزمونێکی شکستیش frustration ئازارو قەڵسیو وەڕسی لا دروستدەکات. منداڵ لەم قۆناغەدا فێری ئەوە دەبێت، کە هەر شتێك هەستدەکات باشە، لەناو خود-دا پێکەوەنووسانی introjecte لەگەڵ بکاتو هەر شتێکیش کە هەست بکات خراپە، رەتیبکاتەوە.

کەواتە وادەردەکەوێت ئەم شێوازە لە فەنتازیای پێکەوەنوسان نموونەیـــەکی ســـەرەتایی کـــرداری هاوچەشـــنی خـــستنەپاڵە identification projectif کە منداڵ لەگەڵ بابەتی یەکەمیدا (دایک) دروستیدەکات، لێرەوە ئەزموونە سەرەتاییەکانی منداڵ کە لەگەڵ بابەتەکەیدا (دایک) ژیاوە، بایەخی خۆی هەیە لەبەهێزکردنی هەستکردن بە ئاسودەیی کاتێك ئەو منداڵە لەئایندەدا دەبێتە هاوسەر



هەروەها لەبەهێزکردنی ئەو متمانەیەیی بە هاوبەشی بەرامبەری دەبەخشێت.

توانای منداڵ، لەسەرەتادا بۆ خۆشویستنی ئەو بابەتە (دایك)، زیاتر لەسەر توانای بۆ خستنەوەبەرفرمانی investir ئەم بابەتە چڕدەبێتەوە وەك بابەتێکی تەواو (باش یان خراپ)، واتە بەو مانایەی بابەتێکی کەموکورتە objetde manqué یان بابەتێکە لەوانەیە لەدەستبچێت.

– تێپەڕاندنی قۆناغی زارەکی oral پەیوەستە بە چۆنێتی تێپەڕاندنی قۆناغی کۆمییەوە Anal، هەروەها پەرەسەندنی ژیانی دەروونی منداڵ شکستدەهێنێت ئەگەر تەنیا بە دۆگمایی fixee لەقۆناغی زارەکیدا مایەوە: منداڵ لەم جۆرە کێشبەندییەدا وەك بابەتێکی پێداویستیی objet de besoin لەناو بابەتەکەدا دەژی، واتە وەك ئامانجێك نەك وەك هۆیەك بۆ دەستکەوتنی چێژ.

منداڵ لەم شێوازی توانەوەیەدا fusionnel جۆرەها بەرگری بەکاردەهێنێت وەك ئەو بەرگرییانەی لەدۆخی شیزۆ- پارانۆیدی schizo-paranoide بەکاردەهێنرێن: بۆنموونە دووکەرتبوون یان دابەشبوون clivage پشتدەبەستێت بە دابەشکردنی بابەت (دایك) بۆ باشو خراپ، بەشە باشەکە لەناو خود- دا پێکەوەنووسانی بۆدەکرێت، لەکاتێکدا بەشە خراپەکە دەخرێتە پاڵ بابەت، لەم نێوکۆیەدا نابێت کردارەکانی دیکە فەرامۆش بکرێن، وەك ئیرەییو بەرچاوتەنگی Envie et Avidite کە میلانی کلاین M.Klein [1] باسی لێوەکردوونو منداڵ لە پەیوەندی لەگەڵ بابەتدا(دایکیدا) بەکاریاندەهێنێت ئەویش بەپێی فەنتازیای زارەکی لەچوارچێوەی

پەیوەندییەکان لەژیانی تاکدا.

لەم قۆناغەدا (مانگەکانی یەکەمی لەدایکبوون) منداڵ بە چێژی ئاڵوگۆڕکردن echange ئاشنا نییەو بابەتەکەش (دایك) لای ئەو بابەتێك نییە بۆ لەدەستدان، وەك ئەو بەشە وایە کە گشت (دایك ومنداڵ) تەواودەکات.

پەیوەندی منداڵ لەگەڵ بابەتەکەدا (دایك) پەیوەندییەکی هاوژیانییە symbiose، ئەگەر کەسێك دەستودڵی باش بوو ئەوا ئەمە بەهۆی لاوازی خود-ی ئەو کەسەوەیە، زیاتر لەوەی لەبەرئەوە بێت کە خۆی بۆ خزمەتکردنی کەسانی دیکە تەرخانکردووە، ئەو کەسە توانای خاوەنداریێتی نییە، چونکە بابەت و تاك (گشت)ێکی تێروتەواو دروستدەکەن لای و (بەخشین) یش لای ئەو بەرامبەر بە وەرگرتنە یان یەکسانە پێی، چونکە بەهاکان لەم جۆرە دۆخەدا، لەگەڵ یەکدا یەکسانن.

هەر جیابوونەوەیەکی واقعیی یان فەنتازی وەك دامالین arrachement و هەڕەشەی گەورە بۆ سەر کەمالی تاك و یەکێتییەکەی، هەستی پێدەکرێت و لەبەردەم ئەم هەڕەشەیەدا نەخۆشیی زارەکی(واتە ئەو کەسەی کە لەقۆناغی زارەکیدا چەقیوە) هەست بە دارمان دەکات و شکستدەهێنێت لەدارشتنەوەی هەر داواکارییەکی بۆپاراستنی خۆی، لەگلەیی و گازندەدا نقوم دەبێت بەشێوەیەك لەوەسفکردنیدا شکستدەهێنێت و چاوەڕێیی هەر کەسێکی دی دەکات لەجیاتی ئەو داواکانی دابڕێژێتەوە، ئەم نابەرپرسیاریێتییە لەوانەیە بۆ ئاستێکی بەرێت بەشێوەیەکی مشەخۆریی و بارگرانی بەسەر کەسێکی دیکەوە بژی کە لای ئەو



لەوێنەی دایکێکی خۆراك پێدەر دایە کە بەهیچ شێوەیەك وشکناکات.
ئەم کەسە نەخۆشانە (ئەوانەی لەقۆناغی زارەکیدا چەقیون) چاوەڕێی هەموو شتێك لەوی دیکە، دەکەن، هەروەك بڵێی ئەوە مافێکی هەمیشەیی و وەرگیراوە بۆیان، چونکە لای ئەوان خاوەنداریێتی بەشێوەیەکی کارا، وەرناگیرێت. ئەو کەسانە هیچ ریزێك بۆ خاوەنداریێتی دانانێن و هەست بە هیچ ئارەزوویەك بۆ خاوەنداریێتی ناکەن، شێوەیەکی دیکەی بەرگریکردن defensif لەم جۆرە کێشبەندییەدا لە داواکردنی زۆرو زۆر زۆر وتراوەدا خۆیدەنوێنێت. نەخۆشی زارەکی هەمیشە داوای زۆر دەکات، بەردەوام گلەیی و گازاندە لەوە دەکات کەسێکی خۆشەویست نییە یان خۆشیان ناوێت لە بەرامبەر هەر شکستییەکدا واهەستدەکات ئەمانە هێرشن بۆ سەری، لەبەرئەوە بە شێوەیەکی شەڕانگێزیی و لاوازیی وەڵامدانەوەی بۆیان، دەبێت.

کەسی زارەکی (واتە ئەو کەسەی لە قۆناغی زارەکیدا چەقیوە fixe) سامانی بەلاوە گرنگ نییە وەك بەهایەك بۆ ئاڵوگۆڕکردن Echange یان هەڵگرتن یان بەخشینیی ئەو سامانە بە مەبەستی تێرکردن لەکاتێکی دواتردا، "سامان بەلایەوە هیچ بەهایەکی ئیرۆسی نییە، لەبەرئەوە داماڵین و بردنی شتێکی شیاوە، نەك هەرئەوە، بەڵکو دەشێت لێیبسەندرێت یان بەشێوەیەکی سەرشێتانە خۆی سەرفیبکات، بەمشێوەیە کەسی بەرامبەر لەوانەیە ببێتە بابەتی روتکردنەوەو بردن، تەنانەت تا ئەو ئاستەی کەسی زارەکیی پارووی نان لە دەمی ببچرێت، بێئەوەی هەست بە هیچ گوناه یان پەشیمانییەك بکات.[٢]

کەسی زارەکی ئەستۆپاکی خۆی لەم زەوتکردنە، رادەگەیەنێت، بەو پێودانگەی ئەم بابەتە یان ئەوی بەرامبەر لە روانگەی ئەوەوە هیچ بوونێکی نییەو ئەو بە بابەتێك بۆ خۆشەویستی دانانێت‌و هەست بە هیچ ئازارێکیش ناکات لە داماڵینی لە هەر بەهایەکی خود. کەواتە ئەوی بەرامبەر وەك بابەتێك بۆ ئارەزوو دەمێنێتەوەو دەشێت پلەوپایەو کاریگەریی خۆی لەسەر پراکتیزە بکات، قۆرغ‌و ئارەزووی دەکات‌و لە ژێر رەحمەتی خۆیدا دەیهێڵێتەوە.

لەم شێوازە کارایەدا هەموو شێوەکانی زەوتکردن بەدیدەکەین کە بەشێوەیەك لە شێوەکان دەرکەوتووەو دەتوانرێت لەسەر ئاستی بەرچاوتەنگی avidite کە لەگەڵ پەیوەندی دوانی (منداڵ – دایك) دایە، زیاتر دیاریبکرێت وەك لەسەر ئاستی کێبڕکێی ئۆدیبی. خەسڵەتی نەخۆشییەکەش (مانەوە لە قۆناغی زارەکیدا) زیاتر رەوتێکی سایکۆسی Psychotique لەخۆدەگرێت وەك لەنیترۆتیکی Nevrotique.

پشتبەستن بە چەپاندن refoulement یارمەتی دیاریکردنی مەسەلەی پەیوەندی زارەکی (واتە ئەو کەسەی لەقۆناغی زارەکیدا ماوەتەوە) بە سامانەوە، دەدات. سامان بەلایەوە تەنیا شتێکە، واتە بەو مانایەی سامان زیاتر بەهایەك بۆ بەکارهێنان usage دەنوێنێت وەك لەبەهایەك بۆ ئاڵوگۆڕکردن Echange. سامان لێرەدا بەهایەکی رەمزی وەرناگرێت‌و ئەو فەنتازیانەش کە پەیوەستن پێوەی بە فەنتازیای پێکەوەلکان incorporation دەمێننەوە. کەواتە سامان بابەتێکە بۆ قۆرغکردن یان کارتێکردن بەهۆیەوە نەك بە ئامانجی دەوڵەمەندبوون یان بەرژەوەندییەکی تایبەتی، بەڵکو ئامانجی



بەتاڵکردنەوە Vider ی ئەوی بەرامبەرە کە وادادەنرێت خاوەنی هەموو شتێکە.

دەتوانین لەم قۆناغەدا پەیوەندی تاك بە بابەتەکانییەوە دیاریبکەین، وەك پەیوەندییەکی کارتێکەری کە هیچ بەهایەکی بۆ بابەتەکە (پەیوەندی لەگەڵ بەرامبەر) نەبێت ئەوەندە نەبێت کە دەکرێت بەکاربهێنرێت یان یاری پێبکرێت بێ رەچاوکردنی بوونی واقیعیی.(٣)

لێرەدا سامان پەیوەندییەکی رەچەڵەکی metonymique لەگەڵ بابەتەکەدا هەیە، واتە بەشێکە لە بابەت، کەواتە کارەکە پەیوەندی بە بەتاڵکردنەوەی بابەتەکەوە لەم بەشە هەیە کە پارێزگاری لێکردووە، لەوانەیە شیرپێدانی سروشتیی دایك، نمونەیەك بێت لەچوارچێوەی ئەو فەنتازییانەی کە دایك، دەنوێنن.

ئەم ئاماژەدانە یارمەتی شروڤەکردنی هۆکاری گواستنەوەی deplacement سامان لە لایەن یەکێك لەهاوبەشەکانەوە دەدات (لەکاتی ناکۆکی هاوسەرێتیدا روودەدات ژن‌و پیاو یەکێکیان پارە لەوی دیکە دەبڕێت یان دەیبات)، لەکاتێکدا ئەو هاوبەشەی سامانەکەی لێدەبڕدرێت وەك کەسێکی ئومێدبڕاو یان لە واقیعدا وەك کەسێکی خراپی لێدێت. لەو بەرگریکردنانەی کە دەچنە چوارچێوەی فەنتازیا زارەکییەکانەوە، بەکارهێنانی سامانە بەرامبەر بەو شیرە یان خۆراکە کە بابەت (پەیوەندی بە کەسی بەرامبەر) لەکەسی زارەکیی قەدەغەی دەکات. لەبەر ئەوە وا پێویستدەکات ئەمەی دواییان (کەسە زارەکییەکە) بەرامبەرەکەی یان ئەویدی لە سامان دابماڵێت، بەڵکو بیدزێت تاکو زامنی مانەوەی خۆی بکات. لێرەوە لەو توندوتیژییە

دەگەین کە باڵ بەسەر کەسی زارەکیدا دەکێشێت، لەداواکارییە دراوییەکانیدا، کە دەکرێت وەك گوزارشتێك لەترسی رووبەڕووبوونەوە لەترسی مردن، درکی پێبکرێت (لێرەدا مردن مەبەست لەمردنی دەروونییە نەك مردنی فیزیکی).

کاتێك قۆناغی زارەکی تێدەپەڕێنرێت هێشتا خەسڵەتی خەیاڵی تێیدا دەمێنێتەوە کە وادەکات تاك داهێنەر بێت، تەنانەت وەبەرهێنەرێکی چاونەترس بێت. بۆئەوەی تاك لەم کارەشدا سەربکەوێت پێویستە لەسەری شێوەی دیکە لەو رێکخستنانە ببڕێت کە دەبێتە هۆی گۆڕینی پەیوەندی ئەو تاکە بە بابەتەکانییەوە (منداڵ بە دایکەوە)، ئەویش لەپێناو ئامانجی ئاڵوگۆرکردنی باشتر، کە لەوانەیە لەچوارچێوەی قۆرغکردنی بابەتەکان رزگاری بکات کە لەقۆناغی زارەکیدا بەسەریدا زاڵبوون.

تاك لەرێگەی فەنتازیای کۆمییەوە Anal لەبارودۆخێکی نێگەتیڤەوە بۆ بارودۆخێکی پۆزەتیڤی کارا دەڕوات، هێزی جوڵێنەری خۆویست دەست بە دەرکەوتن دەکات وەك فێربوونی رۆیشتن و کۆنترۆڵکردنی گوشەرە ماسولکەکان sphincters کە وادەکات پەیوەندی تاك بە بابەتەکانییەوە مۆرکێکی ئیرۆسی وەردەگرن.

بابەتی پاشەڕۆ excrementiel لەم قۆناغەدا (واتە قۆناغی کۆمی Anal ) ئەوەندە پارێزگاری لەمۆرکی نارسیزمی دەکات کە ئەو بابەتی پاشەڕۆیە چەندە لەفەنتازیادا بۆ جەستەی تاك (منداڵ) دەگەڕێتەوە، هەروەها پاشەڕۆ مۆرکێکی بابەتگەرییانە وەردەگرێت لەئەگەری جیابوونەوەی پچڕپچڕی لەجەستە واتە لە گشت.



(ئەم بابەتە پچڕپچڕە detachable وەك بابەتی دیاری object cadeau پێشکەشی دایك دەکرێت یان وەك بابەتی خستنەپاڵ projectable object کە ئامانج داڕمانییەتی، بەکاردەهێنرێت، ئەویش بەپێی ئەزموونی ژیان Vecu یان سروشتی پەیوەندی لەگەڵ ئەو دایکەدا) [٤]

بابەت لەقۆناغی پەرەسەندنی لیبیدیدا بە دووفاقی Ambivalence وێنادەکرێت، بەڵام پێچەوانەی دووفاقی قۆناغی زارەکی، لەبەرئەوەی منی باڵا sur–moi لەم کاتەدا دروستبووە، بۆیە ئەم دووفاقییەی کە پەیوەستە بە قۆناغی کۆمییەوە، بە هەستکردن بە گوناه وێنادەکرێت.

ئەگەر فەنتازیای کۆمی (واتا ئەو کەسەی فەنتازی کۆمی هەیە) وەك فەنتازیای زارەکی (واتا ئەو کەسەی فەنتازیایی زارەکی هەیە) وابێت و ئامانجی گێڕانەوەی یەکێتی نارسیزمیی و سەربەخۆیی بێت، ئەوا فانتازیایی کۆمی هۆکاری دیکە بۆ بەدیهێنانی ئەم یەکێتیی و سەربەخۆییە بەکاردەهێنێت. لەواقیعدا تاکی کۆمی (واتە ئەو کەسەی لەقۆناغی کۆمی گەشەکردنی لیبیدا ماوەتەوە) دەگاتە دۆخی جەختلێکردنەوە لەخودی خۆی وەك گشت untout، ئەویش لەبەرهەڵستیکردنیدا بۆ بابەتەکە نەك لەتێروتەواوبوونی نارسیزمیدا.

لەچوارچێوەی کێشبەندی کۆمیدا، دۆخی سادیزم هەژموونی هەیە: لێرەدا ئەویدیکە وەك رێگر یان بەربەستێك لەبەردەم بەدیهێنانی ئارەزووەکانیدا دەژی، بەربەستێك پێویستە کۆنترۆڵ و ملکەچبکرێت، شەڕانگێزیش بزوێنەری ئەم کۆنترۆڵکردنەیە. قۆناغی پەرەسەندنی لیبیدۆ بەوە پێناسەدەکرێت کە کۆئەندامی ماسولکە

وەك شەڕانگێزی بەكاردێت بۆ بەتاڵكردنەوە sedecharger، لەهەمانكاتدا بۆئەوەی مۆركێكی ئیرۆسی ببەخشێتو پەیوەندیش لەگەڵ بابەتەكە (پەیوەندی منداڵ بە پاشەڕۆوە) بە پەیوەندی سەر گەورەو كۆیلە وێنابكرێت. ئەم پەیوەندییە مۆركێكی بەرگریكاری دەبێت بەو هێندەی كە گوزارشت لەململانێیەك دەكات دژی پاشكۆبوونی زارەكی oral dependence كە منداڵ نەیتوانیوە بەسەریدا زاڵبێت یان لێی تێپەڕبێت.

هەر جێگیربوون یان چەقینێك fixation لەم قۆناغە یان شێوازە لەرێكخستن، تاك ناچاری پەیوەندییەك دەكات كە بەهۆی پەیوەستی هێزەوە هەژموون دەكرێت تا دڵەڕاوكێ بەسەریدا زاڵ نەبێت. دەتوانین بڵێین ئەو هەژموونەی ئەم شێوازە لەپەیوەندی لەگەڵ بابەتدا پێ جیادەكرێتەوە ئەفزەلیەتی باشتر دەبەخشێت بۆ خستنەوەبەرفرمانی پەیوەندییەكی كارا، كە تاك وەك بەندێك دەبەستێت بە بابەتەكەوە زیاتر لەوەی وەك بابەتێك پێوەی پابەند بێت. پێویستە مەسەلەكان ئاسانتر بكەین: بابەت لێرەدا پاشەڕۆ (پیسایی) Merde دەگەیەنێت. تاك بە بەرهەڵستیكردن یان وەستان بەرامبەر ئەم بابەتە (پیسایی) جەخت لەخۆیدەكاتەوە، ئەمە قۆناغی (نەخێر– non) یان ڕەتكردنەوەیە، كە كاراترین شێوەكانی گوزارشتكردن، ئارەزووی پیسایی و دارمانی بابەتەكەیە. چونكە (من– moi) لەرێگەی دانپێدانان بەو بابەتەدا (ئارەزووی پیسایكردن) دەبێتە (نا من non-moi)و جەخت لەخود دەكات.

ئارەزووی خاوەندارێتی پێش كرداری پێكەوەنووسانی ئەویدیكە دەكەوێتو جۆرێك لەدورەپەرێزی لەناو پەیوەندییەكەدا



دروستدەكات، بەمەش ڕێگە بە شێبوونەوەی ئاڵوگۆڕكردنی echange دەدات، تەنانەت ئەگەر ئەم ئاڵوگۆڕكردنە بە پەیوەندی (هەژموونكار– هەژمونلێكراو)یش وێناكرابوو.

ئەگەر تاك توانی ئەم قۆناغە (قۆناغی كۆمی) ببڕێت، ئەوا لەدوای ئەوە متمانەی دەستدەكەوێت لەگەڵ توانای زاڵبوون بەسەر غەریزەدا Le palsionnel و ڕێزگرتن لەبابەتەكە وەك مرۆڤێك كە كیانی خۆی هەیەو هەروەها لابردنی ئەو بەربەستانەی كە دێنە ڕێگەی بێ هیچ دڵەڕاوكێیەك. بەڵام ئەگەر بە چەسپاوی fixe لەسەر ئەم شێوازە مایەوە، ئەوا كە گەورەو كامڵ دەبێت خەسڵەتی وای لەسەر دەردەكەوێت كە مۆركی كۆمییان هەیە، تاك لەمبارەدا: یان مانایەك بۆ واقیعو توانای ئەبستراكتكردن بەدەستدەهێنێت كە ڕێگەی پێدەدەن بۆ بەهێزكردنی خۆی لەواقیعدا، یان مەیلێكی بەهێزی بۆ خاوەندارێتی Possessivite لادروستدەبێت. دەبینین فرمانی خاوەندارێتی posseder لەبنەڕەتدا مۆركێكی كۆمی هەیە بۆ ئارەزووی خاوەندارێتیكردن:ئەم فرمانە لەلاتینییەوە هاتووە posseder sasseoir dessus ماناكەشی واتە (دانیشتن لەسەر).

بابەت (پاشەڕۆ) لەپەیوەندی كۆمیدا بەشێوەی پیسایی fecal بێزراو یان هەژموونلێكراو دەبێت، ئەویش ئامانجی خاوەندارێتییە، یان وەك كۆیلە وایە idolatre وەك ئەو زانا كیمیاییەی كە پیسایی بۆ ئاڵتوون دەگۆڕێت، بەڵام پەیوەندییەكە (پەیوەندی منداڵ بە پاشەڕۆ) هەر بە دووفاقی وێنادەبێتو ئەوەی بە دەستێك دەبەخشرێت بە دەستەكەی دیكە وەردەگیرێتەوە، چونكە پەیوەستبوون بە سامانەوە وێنە یان كاردانەوەی پەیوەستبوونە بە

بابەتەوە (تاك بەوی بەرامبەرەوە)، بە مانای مانۆی manicheen [*] واتە پەیوەستی هێزو ململانێ: لەلایەکەوە لاوازەکانو لەلایەکی دیکەوە بەهێزەکان هەن، بەهێزەکان لاوازەکان قۆرغدەکەن: ئەو کەسەی خاوەندارە وەك کەسێکی باش هەڵدەسەنگێنرێت، وا گونجاوتریشە مرۆڤ هەمیشە خاوەندارێتی بکات تەنانەت ئەگەر لەسەر حیسابی زیان پێگەیاندنی ئەوەی بەرامبەریشی بێت، چونکە خاوەندارێتیکردن واتە بوون.

هەر جیابوونەوە یان ناکۆکی یان نوشستییەك لەناو چوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتییدا، بەکارهێنانی جۆرەها بەرگری defenses بەسەر تاکدا، دەسەپێنێت، کە بەپێی بونیادی ئەو کەسە لەوانەیە بیگەڕێنێتەوە بۆ ئەو چەسپاندنانەی fixation کە بەشێوەیەکی باش لێیان تێنەپەڕیوە. (بوژاندنەوەی فەنتازی کۆمی تاك ناچار دەکات شێوازی گەڕانەوە regressives، پەیڕەو بکاتو لەم روانگەیەوە لەوانەیە سامان وەك بابەتێکی ئەلتەرناتیڤ، بەکاربێنێت. بەمشێوەیە تاك پەنا دەبات بۆ پراکتیزەکردنی دەسەڵات بەسەریدا) [٥].

سەرلەنوێ هەژمونکردنەوەی سامان لای یەکێك لەهاوبەشەکان لەوانەیە هەندێجار لەلایەن هاوبەشەکەی دیکەوە دەست بڵاوییەکی سەخییانەی بەدوادا بێت، چونکە بە شێوەیەکی کتوپڕ هەڕەشەی کراوەتەسەر.

نەبونی متمانە بەرامبەر هاوبەشەکەی دیو چۆنێتی بەکارهێنانی سامان لەچوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتیدا بۆ چەسپاندن یان مانەوە لەقۆناغی کۆمیدا، دەگەڕێتەوە. چونکە نەخۆشی کۆمی (ئەوەی لەقۆناغی کۆمیدا ماوەتەوە) لەو بڕوایەدایە هەموو خەڵك



چاویان لەسامانەکەیەتیی و داوای لێدەکەن هەروەك چۆن لەقۆناغی منداڵیدا دایکی چاوی لەپیساییەکەی selles بوو. لەبەرئەم هۆکارە سامانەکەی دەشارێتەوەو لەبەرچاوی خەڵك نایهێڵێتو بە نهێنی کۆیدەکاتەوە. بەشێوەیەکی خۆپەرستانە هەڵسوکەوت دەکات هەموو شتێك بۆخۆی هەڵدەگرێت، لەبەرئەوە تەنیا لەحاڵەتێکدا ئاڵوگۆڕکردن دەکات کە لەبەرژەوەندی خۆیدا بێت، ئەو خۆی رێکخەرەو تا ئاستی رەزیلی پارە کۆدەکاتەوە، هەروەها کەسێکی کەللەڕەقەو بە نهێنی پارە کۆدەکاتەوە تا ئارەزووی کەسانی دیکە نەوروژێنێت کە لەروانگەی ئەوەوە بەردەوام شکانەوەی وێنەی دایکینو لەوانەیە هەڵبکوتنە سەری.

بەدوای ئەم قۆناغە (کە پشت بە ئابوریو خاوەندارێتی دەبەستێت) لەپەرەسەندنی لیبیدیدا، منداڵ وایلێدێت دەتوانێت بەرگەی لەدەستدانی پیساییەکەییو دوایش بابەتەکانی، بگرێت، بێئەوەی هەست بکات مەترسیی لەسەرە. لەم قۆناغەدا رازیبوون بە لەدەستدان یان خەسارەت laparte بەشێوەیەکی کاوەخۆ لەگەڵ فڕێدانی پیسایی هاوجێدەبێت، کە منداڵ وەك چالاکییەکی ئەفرێنەر تێیدا دەژی ئەمەش لەو چوارچێوەیەی کە میلانی کلاین M.Klein [٦] بە دۆخی خەمۆکی depressive Position ناوینــاوە. بەشێوەیەکی کاوەخۆیانە بابەتەکە وەردەگرێت، لەم حاڵەتەدا کە بابەتەکە ناتەواوە objet de manqué رێگە بە ئەگەری دروستبوونی پەیوەندییەکی بابەتگەرییانە دەداتو بابەتەکە تێروتەواو دەبێت. تێپەڕین لەم قۆناغە لەسەر بناغەی ئاڵوگۆڕکردنێکی دروست، دەروازە لەبەردەم دروستبوونی پەیوەندی

لەگــەڵ بابەتەکــە والادەکــات، پەیوەندییــەك کــە بەخــشین بەســەر خاوەنداریێتیدا زاڵدەبێت، بەڵام چەسپاندن یان مانەوە لەم قۆناغەدا بە شــێوەیەکی ئاشــکرا کێــشبەندی یــان نەخۆشــییەك لەشــێوەی دەستبلاوی لەخەرجکردندا prodigalite دەخاتــەڕوو کــە زۆرکــات وەك شــێوازێك لــە دەســتدرێژیکردن بــۆ ســەر ئــەوی بەرامبــەرو بریندارکردنی نارسیزمییەکی دەردەکەوێت، ئـەویش لـە رێگـەی بـە فیڕۆدانی سامان و سەرفکردنی.

لەمحاڵەتەدا دەتوانین پێکهاتەیەکی بەرگریکارانە formation defensive بۆ بەرهەڵستیکردنی ئارەزووی پاشکۆیەتی بەرامبەر ئەوی دیکە، ببینین یان بەدیبکەین.

کەواتە سامان لەچوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتییدا فرمانێکی نموونەیی لەنێوان هاوبەشەکاندا دەگرێتە ئەستۆ.چونکە وەرگرتن و بەخشین تەوەری پەیوەندییەکەن لەگەڵ بابەتەکەداو هەر دورکەوتنەوە یان لێکترازانێکیش لەئەنجامدانی ئاڵوگۆڕکاری سۆزداریدا رووبدات دەشێت لەسنوری ساماندا دانوسانی (گفتوگۆی) لەسەر بکرێت. کەواتە دەشێت سامان ببێتە بابەتی نیشانەیی symptomatique، وەك هەر نیشانەیەکی دی ببێتە چارەسەرێك بۆ رێککردنەوەی پێویستییەکانی ئابوری دوو هاوبەشەکە.

هەندێجار لەوانەیە سامان وەك بابەتێکی ناوەند لە نێوان (من و نامن– moi and non moi) دا بەکاربهێنرێت، کە بەکارهێنانی دەچێتە جێگەی پەیوەندی بە بابەتەوە (خاوەندارێتی) لە ئابوری دوو هاوبەشەکەدا. چونکە ئەو سامانەی دەبێتە ئەلتەرناتیڤی بابەتی ئەندەکی partiel (دەستدرێژی بۆ سەر ئەوی بەرامبەر) لەگەڵ ئەو هەموو پێداویستیانەدا دەگونجێنێت کە داواکراوە نارسیزمییەکان



دەیسەپێنن، بەدەرچوون لەم سیفەتە واتە بەکارهێنانی سامان وەك بابەتێك بۆ پراکتیزەکردنی ئەو بەرگریانە کە تاك لەماوەی پەرەسەندنی لیبیدیدا پەنایان بۆ دەبات و ئەوەش لەوانەیە بە ئامانجی دوورخستنەوەی بابەتی خۆشەویستی بێت لەدەستدرێژیی و تەقینەوەی رقوکینەدا.

لەچوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتیدا، بێ باسکردنی بیرۆکەکانی فرۆید ناتوانین قسە لەسەر پەیوەندی سروشتیی سامان بکەین، ئەوەی زانراوە حاڵەتی دروست بێ دەستنیشانکردنی حاڵەتی نەخۆشیی دیاریناکرێت کە زۆرکات دەرناکەوێت، تەنیا لەشێوەی ئازاردا نەبێت souffrance.

هەرجارێك یەکێك لەودوو هاوبەشە (ژن و پیاو) خۆی لەمەترسییەکی نارسیزمیدا دەبێنێتەوە، ناچارە پەنا بباتە بەر گەڕانەوە regresser بۆ ئەو رێکخستنە بەرگرییانەی لەگەڵ چەسپاندنەکاندا fixations هاوجێ دەبن. (مەبەست لەمانەوەیە لەهەندێك لەقۆناغەکانی پەرەسەندنی لبیدی)، چونکە حاڵەتی نەخۆشی کە پەیوەندی بە سامانەوە هەیە هەمیشە رەنگدانەوەی حاڵەتی نەخۆشییە کە پەیوەندی بە نارسیزمەوە هەیە، (چونکە نارسیزم خۆشەویسترین سامانە کە ئێمە خاوەنین، تاك هەر کە رووبەڕووی مەترسی بۆوە پەنا بۆ ئەو بەرگرییانە دەبات کە دەکەونە ژێر دەسەلاتییەوەو لەچوارچێوەی رێکخستنە دوابەدواییەکانی کە ئێستا بە رێکخستنی (زارەکیی و کۆمیی و چوکیی) ناودەبرێن، رێگەی جوڵەو کارکردنی پێدەدەن، ئەمانە وێڕای ئەو زامە نارسیزمییانەی هاوبەشەکەی دی کە واچاوەڕواندەکات خۆشی بوێت، بەسەریدا دەیسەپێنێت) [٧]

## رۆڵی سامان لەچوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتیدا:

سامان کاردەکاتە سەر هەموو بوارەکانی ژیان و لەچوارچێوەی ژیانی هاوسەرێتیدا رۆڵی خۆی دەبینێت، چونکە کاریگەری فاکتەرە سایکۆلۆژییەکان دیاریدەکات، هەروەها لەوانەیە پەیوەندی ئاڵۆز لە نێوان دوو هاوبەشەکەدا (ژن و پیاو) دروستبکات.

پیاو بەپێی بۆچوونە کلاسیکییەکان ئەو ژێنەرەیە کە رەفاهییەتی خێزانەکەی دابیندەکات. لێرەوە سامان پێداویستییەکی یان دەرئەنجامێکی سروشتی هێزی پیاوەتی دەنوێنێت، "هێمای چووکییە Phallique کە یەکسانە بە توانای سێکسوال" [٨]

ژن بە پاشکۆبوونی بۆ پیاو، خۆی دەگونجێنێت، هەندێجار دەڕواتە ناو جۆرە نارسیزمییەکەوە کە هیچ بەهایەکی نییە تەنیا بۆ هاوسەرەکەی نەبێت، دەتوانێت بەهۆی ئەم شێوازەی ژیانییەوە کاربکاتە سەر ژیانی ئەوەی بەرامبەرو فشار بخاتەسەری. (ئەمە کەللەڕەقی هەندێك لەو ژنانە شرۆڤە دەکات کە لەپیاوەکانیان جیابوونەتەوەو داوای نەفەقەیان لێدەکەن، هەرچەندە پێویستیشیان پێی نییە: ئەمە هۆیەکە بۆ سەپاندنی بوونییان لای ئەو کەسەی دەستبەردارییان بووە). ئەو ژنانەی بەهۆی سامانەوە سەرشۆڕکراون یان چەوسێنراونەتەوە، بە مەبەست دەیانەوێت لەبەهای سامان کەمبکەنەوە ئەویش لەرێگەی سەرفکردنی سامان بەشێوەیەکی دەستبلاو یان پەرتکردنی، بەم کارەیان دەیانەوێت سوکایەتیکردنی خۆیان بەرامبەر ئەو بەڵگەنامانە یان ئەو کۆتە بسەلمێنن کە پیاوان



لەو باوەڕەدان بە هۆیەوە دەیانبەستنەوە.

کاتێك ژنان هەستدەکەن بوونەتە ماددەیەك بۆ خۆبادان پێیانەوە (لەخۆبایی بوونی پیاو) وەك ئۆتۆمبێل یان تابلۆی زەیتی، هەستدەکەن بوون بە شت (واتە گۆڕاون بۆ شت) Chosifier بەمەش بەهاو ناسنامەی خودێتیان لە دەستدەدەن.

P.N لەرووی ماددییەوە، ژیانێکی باش دەژیا، بەڵام لەدوای ماوەیەك لەتووشبوون بە خەمۆکییەکی دژوارو ناخۆش، خۆی کوشت. دراوسێکان سەریان لەوە سوڕما کە رویدا، ئەوان دەیانووت "خاوەنی هەموو شتێکە، زێڕو مرواری و فەرۆ". بەڵام لەواقیعدا P.N خاوەنی هیچ نەبوو، لەخۆشەویستیی و سۆز، بێبەش بوو واتە لەنێو ئەو سەروەت و سامانە بێشومارەیدا بە دەست بێبەشبوونی سۆزدارییەوە، دەیناڵاند. هاوسەرەکەی لەو باوەڕەدابوو دەتوانێت بە پارە هەموو شتێك بکڕێت، تەنانەت خۆشەویستیش، لەرووی سۆزدارییەوە، ئەمە بووە هۆی فەرامۆشکردنی ژنەکەی.

– بەشێوەیەکی تایبەتی بەندی نێوان نیازو ئامانج و خەرجکردنی سامان ئاڵۆزە، کاتێك مەسەلەکە پەیوەندی بە پێشکەشکردنی دیارییەکەوە هەیە بۆ کەسێك، چونکە دیاری لەچوارچێوەی پەیوەندی خۆشەویستیدا رۆڵێکی ناوازە دەبینێت، لەوانەیە ئەفسونێك دروستبکات و پەیوەندیی توندوتۆڵبکات و بەهایەکیش بە هەردوو هاوبەشەکە، ببەخشێت، لەوانەشە بریندارکەر بێت، کاتێك پێشکەشکردنی ئەو دیارییە قەرەبوویەك دەنوێنێت، چونکە پێشکەشکردنی دیاری دەبێتە هۆی بەخشینی ئەو هاوبەشە لەئەرکی بایەخدان یان گرنگیدان بە هاوبەشەکەی بەرامبەری.

## چۆن سامان لەنێوان ژن و پیاودا ئاڵوگۆڕدەکرێت؟:

دەگمەنە ژن بە تەنیا بارقورسیی دارایی خێزانەکەی بگرێتە ئەستۆ. بەڵام بێکاری یان نەبوونی کارێك بۆ پیاو لەوانەیە ئەمە بسەپێنێت، زۆربەی پیاوان هەستدەکەن کارکردنی ژن بەهای خودێتی ئەمان کەمدەکاتەوە.

ژن کاردەکات، چونکە کرێی ئەو ئیشکردنەکە زۆر یارمەتی سوککردنی بارقورسایی خێزانەکەی دەدات. بەڵام ئەم پابەندبوونە زۆرجار پیاوان، بە ئازارو خەفەتەوە، پێی رازی دەبن. هەندێك لەپیاوان هەستدەکەن کارکردنی هاوسەرەکانییان ئازادی هەڵسوکەوت و بڕیاریان، پێدەبەخشێت، ئەم ئازادییەش لەهەندێك مەترسی چاوەڕوانکراو بەدەر نییە (لێکۆڵینەوەکان جەخت لەوە دەکەنەوە، زۆربەی زۆری حاڵەتەکانی تەڵاق لەم سەردەمەدا لەلایەن ژنانی ئیشکەر یان فەرمانبەرەوە داوادەکرێت، چونکە خاوەنی سەربەخۆیی ماددی خۆیان و ئەمەش وادەکات پشت بە هاوسەر یان خێزانەکانییان نەبەستن) [٩]. قبوڵکردنی پیاو یان رەزامەندی پیاو بەرامبەر کارکردنی ژن بەشێوەیەکی ئاشکرا بەرهەڵستی ناکرێت، بەڵام لەوانەیە کاردانەوەی دیاریکراو لەسەر هەندێك مەسەلەی ماڵ وخێزان، هەبێت، هەر لەفەرامۆشکردنی پێوەکردنەوەی قۆپچەی کراس و ئامادەکردنی خۆراکەوە تا دەگاتە لەبیرچوونەوەو دواکەوتن لەکاتی سەردان و گەشتەکاندا: ئەو پیاوەی بە کارکردنی ژنەکەی رازی دەبێت تا ئاستێك لەئارلکوین Arlequin دەچێت کە تەپڵێکی



بە منداڵە بچکۆلەکەی بەخشیی و پێی وت "بە باشی یاری پێبکە، بەڵام هیچ دەنگە دەنگ نەکەیت".

هاوکاریکردنی ژن و پیاو لەهەڵگرتنی یان لەئەستۆگرتنی بارقورسیی دارایی خێزاندا، بە دەگمەن نەبێت، نەخشە بۆ داڕێژراو نییە، زۆرکات بەشێوەیەکی شاراوە دەبێت، بە تێپەڕبوونی رۆژگار ئەو هاوکارییە رێکدەخرێت.

بەڵام ئەگەر ئەم مەسەلەیە بە رەزامەندی چارەسەر نەبوو، ئەوا دەشێت ببرێتە لای قەزا یان دادگا. بەڵام پەنابردن بۆ قەزا هیچ کاتێك ئەو گیروگرفتانە چارەسەرناکات، کە دابەشکردنێکی دژبەیەك لەخۆیدەگرێت.

- بەو بەهانەیەی پیاو، پێویستە ژنەکەی بژێنێت. L.N - ی فەرمانبەر کە خاوەنی بودجەیەکی بەرز بوو، ئەوەی رەتکردەوە هاوکاری نەفەقەکردنی ماڵ و خێزانەکەی بکات، دوای ئەوەی هەستیکرد کە هاوسەرەکەی، قۆرغی دەکات... ناکۆکییەکی شاراوە و گیروگرفتی زۆر لەنێوانیاندا دەستیپێکرد. پیاوەکە هەوڵیدەدا بودجەی ژنەکەی بۆ پارەی ئەو ئەپارتمانە تەرخانبکات کە کڕیبوویی و بڕە پارەیەکی زۆریشی لەبانك قەرز کردبوو، L.N هەستیدەکرد مێردەکەی هۆکارێکی گونجاوی بەکاردەهێنا بۆ داماڵینی موچەکەی بە مۆڵی و نەیدەتوانی بۆ حیسابی تایبەتی خۆی هیچ پارەییەك پاشەکەوت بکات.

زۆرجار تێبینی دەکرێت کارکردنی ژن یان هاوبەشیکردنی دارایی ژن ئەو کاریگەرییەی لەسەر هەندێك لەپەیوەندییە تەقلیدییەکان نابێت. هەر هاوبەشێك (ژن و پیاو) بە بەشێك لەپارەکەیان هاوکاری

یەکتردەکەن، لەبەرامبەردا هەر یەکەیان پارێزگاری لەمافی تایبەتی خۆیان دەکەن. پیاو ناتوانێت بەرگەی ئەوە بگرێت کە لەوێنە تەقلیدییەکەی دابماڵرێت، بەڵام ژن هەست بە گوناه دەکات، لەو حاڵەتەدا ئەگەر هەستیکرد هاوسەرەکەی دابڕیوە یان جێگەی ئەوی گرتۆتەوە.

بودجەی ژن بەدەگمەن نەبێت لەبودجەی پیاو زیاتر نییەو ئەگەر ئەمە رویدا نابێتە هۆی هیچ گیروگرفتێکی دیاریکراو ئەگەر دوو هاوبەشەکە بڕوایان بەو پێوانە یان پێودانگانە بۆ بەهاکان هەبوو کە بە تەواوەتی جیاواز بوو لەپێودانگەکانی سامان‌و ماددە.

## کێ بڕیار لەسەر خەرجکردنی پارە دەدات؟:

بەشێوەیەکی گشتیی ژن بڕیار لەسەر خەرجکردنی پارە دەدات بە تایبەتی کاتێك بابەتەکە پەیوەندی بە خەرجکردنی ئاساییەوە هەیەو لەگەڵ رۆڵیدا وەك بەخێوکەر دەگونجێت. پیاو بەلایەوە باشترە ئەو خەرجکردنانەی کە پەیوەندییان بە کاروباری بەرفراوانترەوە هەیە وەك کڕینی خانوو یان ئۆتۆمبیل، خۆی ئەفزەڵیەتی لەم جۆرە بڕیارانەدا هەبێت: پیاو هەندێجار لەو باوەڕەدایە ژنەکەی بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە رازییە بەرامبەر بڕیارەکانی، بەڵام تووشی شۆك‌و سەرسوڕمان دەبێت کاتێك ئەوەی بۆئاشکرا دەبێت کە ژنەکەی نارازییە: وەك ئەو هاوبەشەی لەدوای ماوەیەکی دوورودرێژ لەبێبەشبوون‌و هەژاری بەهۆی ئەو قەرزانەوە کە بۆ کڕینی خانوو کەوتبووە سەرشانی خۆی بەتەنیا بینییەوە کاتێك هاوسەرەکەی ئەوەی رەتکردەوە بە بەشێك لەموچەکەی هاوکاری لەگەڵدا بکات،



چونکە پێی وابوو ئەو پرۆژەیە پەیوەندی بەوەوە نییەو زۆر ئازاری چەشتووەو بەشی خۆی بەرگەی ئەو نەهامەتییانەی، گرتووە.

- هەندێك لەپیاوان بۆ بەهانە هێنانەوەی لەبێبەشکردنی هاوسەرەکانییان لەهەندێك کەمالیات کە ژیانی هاوچەرخدا واپێویست دەکات مرۆڤ ئەو کەمالیاتانەی، هەبێت، پەنا بۆ هۆکاری گرانی دەبەن‌و هۆکاری گرانی دەکەنە بەهانە، هەروەها ژیانی دەستگرتنەوە (رەزیلی) بەسەر ژنەکانیاندا دەسەپێنن، ئەمیش لەپێناوی بەدیهێنانی ئامانجی باشتر، بەڵام لەوکاتەدا گیروگرفتەکان دەردەکەون کە ژنان بۆیان ئاشکرادەبێت کە ئەو پاساوانەی هاوسەرەکانییان بۆیان هێناونەتەوە لەبەردەم دابینکردنی پێداویستییە کەمالیاتەکانیاندا، نیازی باشیان لەخۆنەگرتووە: "بەو بەهانەیەی نرخی تەلەفیزیۆن بەرزەو لەئێستادا ناتوانن بیکڕن، ژنەکەی ناچاردەکرد رۆژانە لەگەڵیدا بڕوات بۆ ماڵی باوکی بۆ سەیرکردنی تەلەفیزیۆن، بەڵام لەدوای ماوەیەك ژنەکە هەستی بە بێزاربوون کرد لەو هاتوچۆیەو بڕیاریدا تەلەفیزیۆن بکڕێت تا بەهێمنی لەماڵەکەی خۆیدا تەماشای بکات، ژنەکە کاریکردو بڕێك پارەی لەماڵی باوکی قەرز کرد تا توانی پارەی پێویست بۆ کڕینی تەلەفیزیۆن کۆبکاتەوە. ئەم کارە پیاوەکەی زۆر تووڕەکرد، ژنەکەش لەدواییدا زانی کە مەسەلەی پێداگرتن لەسەر بەرزی نرخی تەلەفیزیۆن لەلایەن پیاوەکەوە، تەنیا هۆکارێك بوو بۆ بەهانەهێنانەوەی لەنەکڕینی تەلەفیزیۆنەکە".

ئەم مەسەلەیە بەسەر کاتەکانی پشووشدا جێبەجێدەبێت، کە پیاو حەزدەکات لەگەڵ ماڵی باوکیدا پشوو بەسەر بەرێت‌و هۆیە

ئابورییەكان دەكاتە بەهانەو بیانوو، لەواقیعدا پیاو بەم هەڵسوكەوتەی هەندێك مەسەلەی دیكە دەشارێتەوە، وەك: بەردەوامی دەسەڵاتی ماڵی باوكیی بەسەریدا، هۆگربوونی قۆناغی منداڵیی و ترسان لەتوڕەبوونی ماڵی باوكی .. ئەم هەڵسوكەوتە هاوبەشەكەی بەرامبەری (هاوسەرەكەی) بە ئاسانی دركی پێدەكاتو دەرینابڕێت، ئەمەش لەوانەیە ببێتە هۆی كەڵەكەبوونی رقوكینەو ناكۆكی شاراوە و پەردەپۆشكراو.

- خەرجكردن یان مەسرەفكردن la depense مانای جیاواز، لەخۆدەگرێت: قەرەبووی كەموكورتییەك دەكاتەوەو پاساو بۆ شتێك دەهێنێتەوەو هەڵیدەسەنگێنێت، هەروەها دەشێت پەرچەكردار یان وەڵامدانەوەیەكی شەڕانگێزییانە بێت بەرامبەر بە هەژموونێك:

B.N دیلی بودجەیەكی بەرتەسك و سنوردار بوو، لەبەرئەوە بەشارەزایی زۆرو دەستكەوتەكانییەوە بەرگری لەخۆیدەكرد، كە وای لەهاوسەرەكەی (پیاوەكە) كردبوو ببێتە دیلی دڵەڕاوكێیەكی هەمیشەیی، چونكە بارودۆخی رەسمی پیاوەكە رێگەی پێنەدەدا دەستبەرداری بەڵێن و رێكەوتنەكانی خۆی ببێت، هەرچەندە پیاوەكە سووربوو لەسەرئەوەی ئەمانە جێبەجێبكات لەشەڕانگێزییەكی دیكەدا ژنەكە پارەی قژبڕین و درووومان و پزیشكی ددانیشی بۆ خۆی نەدەهێشتەوە.

ئەم میكانیزمە كەمتر ئاشكرادەبێت یان دەردەكەوێت كاتێك نەخۆشی جەستەیی دەبێتە پەناگەی (ژنەكە یان پیاوەكە)، چونكە ئەو رقەی لەئەنجامی رێوشوێنە ئابورییە بێپلانەكان یان چۆنێتییەكانەوە دروستدەبێت، لەوانەیە ببێتە هۆی پشێوی



فسیۆلۆژی جەستەیی بێئەوەی هیچ هۆكارێكی ئەندامی بۆ رووداني هەبێت.

هەروەها خەرجكردنی سامان یان سەرفكردنی رۆڵی لەمەسەلەی هەڵبژاردندا هەیەو لەوانەیە ململانێ لەنێوان ئارەزووەكانو هەڵبژاردندا لەسەرەتای پەیوەندیدا یان دوای ماوەیەكی دیاریكراو، دەربكەوێت: (هەر هاوبەشێك لەرێگەی هەڵبژاردنەوە ئارەزووەكانی بۆ چێژوەرگرتن یان هەژمونكردن ئاشكرا دەبێت، زۆرجار دژبەیەكی ئەم ئارەزووانە ململانێ دروستدەكات. ئەم ململانێیە كتوپڕ روودەدات كاتێك ئارەزووەكان لەگەڵ رێكەوتنێكی پێشینەیی نێوان دوو هاوبەشەكەدا لەسەر هەندێك لەمیكانیزمەكان دژ دەوەستێتەوە) [١٠].

L.P ژنێك بوو لەگەڵ هاوسەرەكەیدا، سەبارەت بەو پڕۆژانەی دەیانویست لەكاتی پشووی هاویندا جێبەجێبكەن، رێكەوتنی تەواویان هەبوو، بۆ ئەمەش بڕیاریاندا بڕێك پارە لەبودجەی مانگانەی خۆیان كۆبكەنەوە، بەڵام L.P دوچاری سەرسامی بوو كاتێك هاوسەرەكەی پێی راگەیاند ئامێرێكی مۆزیكی گرانبەهای، كڕیوە.

ئەم هەڵسوكەوتەی هاوسەرەكەی رقی هەڵساندو توڕەی كرد، چونكە دركی بەوەكرد ئەم ئامێرە هیچ سودێكی پێنابەخشێت، بەڵكو لەزۆر هەڵبژاردنی دیكەی بێبەشیكردووە كە دەیویست بۆخۆی بەدیبهێنێت.

دواجار ماوەتەوە بڵێین سامان ئەگەرچی هۆیەكە بۆ ئاڵوگۆڕكردن یان پلەوپایە، بەڵام هەر لەكرۆكی پەیوەندی هاوسەرێتیدا دەمێنێتەوە، هەروەها دەشێت بناغەیەك بۆ ئاژاوەو ناكۆكی قوڵ

لەنێوان هاوبەشەکانیشدا، دروستبکات، یاخود ببێتە نیشانەیەك بۆ ئاشکراکردنی زۆر گیروگرفتی دیکە.

## پەیوەندی سامان بە بەهای خودێتیی و ئینتمای کۆمەڵایەتییەوە:

مەسەلەی بەکارهێنانی سامان ناتوانرێت لەمەسەلەی ئینتمای کۆمەڵایەتیی هاوبەشەکان (ژن و پیاو)، جیابکرێتەوە. سامان بە روخسارە هێما و نەستییە (قوڵ یان دیارە) جیاوازەکانییەوە، بەپێی ئینتمای کۆمەڵایەتییان ئاماژەی دیاریکراو لای هەریەك لەو دوو هاوبەشە، دەنوێنێت. بەپێی ئەم درکپێکردنە لەوانەیە رێگەی خەرجکردنی پارە بناغەیەك بۆ ناکۆکییەکانی نێوان دوو هاوبەشەکە دروستبکات: بۆنمونە بابەتی کڕینی ئۆتۆمبێلێك، لەوانەیە ببێتە بابەتێکی دژبەیەك لەنێوان دوو روانگەی جیاواز. روانگەی یەکەم بەستراوە بەو حەوانەوەو خۆشییەی کە بەکارهێنانی ئۆتۆمبێل، دابینیدەکات، لەلایەکی دیکەشەوە روانگەی دووەم، بەستراوە بە بایەخی ئەو کارتێکردنە گریمانەییەی لەسەر کەسانی دیکە بەهۆی کڕینی ئەم ئۆتۆمبێلەوە، دروستدەبێت.

کڕینی ئۆتۆمبێلێکی خێراو ماکینەبەهێزو سەرنجڕاکێشەر بۆ پیاوێك کە بڕوای بە پیاوەتیی خۆی و بەهای مرۆڤایەتی و پێگەی کۆمەڵایەتیی خۆی، نەبێت ئەوا دەشێت کڕینی ئەو ئۆتۆمبێلە (ئاماژەدەرێکی مۆرك چووکی Phallique ببەخشێت لای ئەو پیاوە کە ئامانجی جۆرێکە لەجەختلێکردنەوە لەخۆی کە پشتدەبەستێت بە



کەسانی دی یان ئەم جەختکردنەوەیە ناکرێت بەدیبێت تەنیا بەهۆی یان بە کەسانی دیکەوە، نەبێت) [(١١)]. لەوانەیە خاوەندارێتیکردنی ئەم جۆرە ئۆتۆمبێلە (کە زۆر بە دەگمەن بەکاریدەهێنێت) لای ئەو پیاوە رێگەیەکی وەهمی کارا بێت بۆ جەختکردنەوە لە خۆی، لای هاوڕێ و دراوسێکانی. چونکە هەڵبژاردنی ئەو جۆرە ئۆتۆمبێلە بۆ سوودوەرگرتن یان خۆشیی و حەوانەوە نییە بۆ ژیانی خۆی، بەڵکو بەهۆی ئەنگێزەیەکی لادەرانەوەیە بۆ جەختکردنەوە لەخودی خۆی یان قەرەبووکردنەوەی ئەو هەست بەسەرشۆڕییکردنەی تێیدا ژیاوە، یان بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەو هەستی شەڕانگێزیی، یان بەزەوتکردن و رەهنکردنەی کە لەخودیایەتیی و درکی پێناکات.

کڕینی ئەم ئۆتۆمبێلە دەبێتە سەرچاوەی ناکۆکی لەنێوان دوو هاوبەشەکە، بەو هێندەی، چەندە ئەم ئۆتۆمبێلە ئەرکی جیاواز لەفرمانی ئاسایی خۆی دەبینێت، وێڕای ئەوەی بڕی پارەی زۆر بۆ کڕینی خەرجکراوە کە دەکرا بە شێوەیەکی دیکە بەکاربهاتایە کە بارودۆخی ژیانی ژنەکەو سەرجەم ئەندامانی خێزانەکەی ئاسانتر بکردایە. بەمشێوەیەو بەتایبەتی لەڕێگەی ئەم گیروگرفتەوە ئەو گیروگرفتانە وێنادەبن کە مەسەلەی ئینتیما بۆ چینە جیاوازەکان، دروستیدەکەن: (پیاو لەمجۆرە حاڵەتانەدا هەمیشە ئامانجی ئەوەیە بە روخساری کەسێك دەرکەوێت و وانیشانبدات کە سەربە چین و توێژێکی کۆمەڵایەتی جیاوازە لەچین وتوێژی بنەڕەتی خۆی. پیاو لەڕێگەی ئەم کردارەوە هەوڵدەدات واخۆی پیشانبدات کە زیاتر لەژنەکەی بەو ئایدیۆلۆژییە هەژمونکراوە کاریگەرە کە دەستکەوت و سامان و ئینتیما بۆ چینە کۆمەڵایەتییە دەوڵەمەندەکان،

هەڵدەسەنگێنێت).[١٢] لەوانەیە ئەم کارە بەرەو قەرزێکی گەورەشی بەرێت تا لای هاوڕێو دراوسێکانی سود لەم ئینتمایە وەربگرێت. لەم نێوکۆیەدا تێبینی ئەوە دەکرێت مەسەلەی ئینتمای چینایەتی یان هۆشیاریی چینایەتی لای ژن، ملکەچی ئەو ئەگەرو مەترسییانە، نابێتەوە کە پیاو ملکەچیان دەبێت.

لەم چوارچێوەشدا مەسەلەی دیکە هەن کە لەوانەیە ببنە هۆی ڕوودانی گرژییەکی توند لەنێوان دوو هاوبەشەکەدا، چونکە کارکردنی بەردەوامو ئامادەنەبوون لەماڵەوە لەپێناوی دەستکەوتنی سامان یان دەستکەوتی ماددیدا، لەوانەیە لای یەکێك لەو دوو هاوبەشە بەشێوەی جیاواز شرۆڤەی، بۆبکرێت: کارکردن لای یەکێکیان لەوانەیە فرسەتێك بێت بۆ چاککردنی باری ئابوریی هەموو ئەندامانی خێزانەکە لەبەرئەوە کۆشش دەکاتو زۆربەی کاتەکەی لەکارکردندا بەسەردەبات، تا دەگاتە مەبەستی خۆی. ئەم کارە یان هەوڵو کۆششە لەوانەیە لای ژن جۆرێك لەفەرامۆشکردن یان بایەخپێنەدان لەلایەن هاوسەرەکەیەوە بگەیەنێت، چونکە ئەو بەهانەو پاساوانەی کە پیاو لەرێگەی کارکردنی جدییەوە بۆ ژنییان دەهێنێتەوە، لای ژن ئاماژەیەك نین بۆ بەهایەکی پیشەیی یان مرۆیی. بەڵکو بە پێچەوانەوە لەوانەیە وەك ئاماژەیەك بۆ پاشکۆبوونێکی سەرشۆڕی بەرامبەر سەرۆك کار، شرۆڤە بکرێن یان وەك بەڵگەیەك بۆ بێ توانایی پیاو لەبەختیارکردنی هاوسەرەکەی لێکبدرێنەوە. ئەم جۆرە ناکۆکییە رۆژانە دووچاری هاوبەشەکان، دەبن، بە تایبەتی لای ئەو کەسانەی کە نەیانتوانیوە بەو رەگەزە شاراوە یان پەنهانیانە ئاشنابن کە پێودانگەکانی بەها لەلایان، دیاریدەکات.



دواجار دەتوانرێت بوترێت مەسەلەی ئینتیمای کۆمەڵایەتیی و دیاریکردنی بەها تایبەتیەکان بەندن بە بەڵگەیەکی نەستی گرنگو دیاریکراو کە پشت بە کێشبەندی کۆمیی، چوکیی یان زارەکی، دەبەستن.

M.R لەچوارچێوەی خێزانێکدا بەوپەڕی رەفاهیەت دەژیا کە پارێزگاری لەدابونەریتو بەنەمری هێشتنەوەی تیرەو بنەچەیانی دەکرد. باوکی ئەو کچە-M.R، لەپلەوپایەی کۆمەڵایەتیی و سیاسیدا خێزانێکی خانەدانو ناسراوبوو، بەڵام ئەو وەك باووباپیرانی بەهرەمەند نەبوو هیچ کاریگەرییەك یان پلەوپایەیەکی کۆمەڵایەتیی، نەبوو. هەمیشە شانازی بە ئینتیمایەوە بۆ ئەو بنەچەیەی خۆی دەکرد، ئەمەش ناچاری کردبوو پارێزگاری لەو بەهاو پێودانگانە، بکات کە پێشتر لەخێزانەکەیدا، باوبوون: رقی لەخوێندنو کرانەوەی ژن بوو، ئەمە پاڵی پێوەنابوو کچەکانی لەتەواوکردنی خوێندن بێبەش بکات، لەبەرئەوەی کە میراتێکی زۆریشی بۆ مابۆوە، بایەخی بە سەروەتو کۆکردنەوەی سامان، دەدا.

خاتوو M.R هەمیشە رەخنەی لەو دابونەریتو چەمکانە دەگرت کە باوکی لەسەریان دەرۆیشت، بەڵام بەناچاری هەر پشتیشی پێدەبەستن، بۆیە خەونی بەوەوە دەبینی، هاوسەرێتی لەگەڵ پیاوێکی بەهێزو خاوەن پلەوپایەدا، بکات.

ئەو پیاوەی هاوسەرێتی لەگەڵدا کرد سەر بە خێزانێکی جووتیارو هەژار بوو، باوکی ئەو کوڕە خۆزگەی نەمریو پلەوپایەی کۆمەڵایەتی بەرزی بۆ کوڕەکەی دەخواست، چونکە خۆی نەیتوانی بوو ئەو خەونەی بەدیبێنێت، لەبەرئەوە پێشنیازی ئەوەی بۆکرد پسپۆڕێتیی

لەبوارێکی زانستدا، بەدەستبێنێت کە یارمەتی بدات بۆ خێرا سەرکەوتن لەژیاندا (واتە لقی بازرگانی هەڵبژارد).

کوڕەکەی دوای تەواوکردنی خوێندن لەبواری بازرگانیدا پۆستێکی گرنگی، وەرگرت، بەلأم بە پێی وتەکانی M.R– ی خێزانی هەر بەدەست نیگەرانی ناخییەوە، دەینالأند.

ژنەکەی دەیوت: "لەمن زیاتر بە دەست گیروگرفتەوە دەنالێنێتو ناتوانێت وەك پێویست بژی، بە ئومێدم یارمەتی بدەم تا بەشێوەیەکی باشتر بژی، واتە بەو شێوەیەی کەمن ژیاوم، بەلأم ئەو لای خۆیەوە یارمەتی منی نەدەدا".

شیکارەکان ئاشکرایدەکەن ئەو سەرکەوتنەی پیاوەکە بەدەستیهێنابوو، لەرووی کۆمەلأیەتییەوە یارمەتی دەدا بۆ "جەختلێکردنەوە لەخۆی"و ئەوەش لەسەر حیسابی بەختەوەری خێزانەکەی بوو. پیاوەکە پێی وابوو ئەوسوددە ماددییانەی کە پێشکەشی خێزانەکەی دەکات، بەسە بۆ تێرکردنی ئارەزووەکانیان، زوربەی کاتەکانی لەسەر کارکردن بەسەردەبردو لەدانیشتنی شەوانەو کات بەسەربردنو رابواردنو دوور دەکەوتەوە، بەو هیوایەی بالأبوونی کۆمەلأیەتی زیاتر، بەدەست بهێنێت.

ئەم کۆششە بەردەوامەی وایلێکردبوو ژنەکەیی و منداڵەکانی فەرامۆش بکات. M.R هەمیشە بەرامبەر ئەم هەڵسوکەوتەی لۆمەی دەکردو هەندێجاریش پیاوەکە یارمەتیدەدا بۆ راستکردنەوەی ئەو هەلأنەی کە دەیکردو رێگەی بۆ خۆشکرد بڕواتە ناو ئەو ناوەندە کۆمەلأیەتییانەوە کە حەزیدەکرد هاتوچۆیان بکات. بەلأم گیروگرفت لەوەدابووئەو پیاوە لەوە دەترسا کە لەوپەیوەندییە کۆمەلأیەتییانەدا،



ژنەکەی پێرابکێشێت، بۆیە وردەوردە جۆرێك لەئیرەیی بەرامبەر بە پەیوەندییەکانی ژنەکەی، پێوە دیار بوو، دەیویست ملکەچی بکاتو تەنیا بە ڕۆڵی خۆیەوە پابەندی بکات، لەهەمانکاتیشدا لەڕووی کۆمەلأیەتییەوە، هیوای ئەوەی دەخواست درەوشاوەو دیاربێت. ئەم دژبەیەکییەی لەپیاوەکەدا دەرکەوت، بووە هۆی دەرکەوتنی کاریگەری لەسەر ژنەکەو دەستیکرد بە گلەییو ناڕەزایی بەرامبەر هەڵسوکەوتەکانیو ژنەکە ئەوەی رەتکردەوە تەنیا ژنێکی پارێزگاریلێکراوبێت لەناو ماڵداو هیچ رایەکی، نەبێت. وردەوردە ژنەکە ئازایەتی خۆی ونکردو هەستی بە نائومێدی دەکردو بەهای خودێتی خۆی لەدەستدا. هەرچی پیاوەکە بوو لای خۆیەوە لەو بێزارییەی ژنەکەی تێنەدەگەیشت کە هەستی پێدەکرد، لەبەرئەوە هیوابڕاوی کردو نەیدەزانی چۆن دڵی رازیبکات.

لەسەرەتای پەیوەندییەکەدا پیاوەکە هەستیدەکرد کە کەسێکی خۆشەویستەو حیسابی بۆدەکرێت، لەدوایدا لەو باوەڕەدابوو، کە لەتوانایدایە گیروگرفتەکانی خۆییو ناڕازیبوون لەژنەکەی بخاتەڕوو، بەلأم ئەم هەڵوێستەی پیاوەکە کاریگەرییەکی خراپی لەسەر دەروونی ژنەکە بەجێهێشت، چونکە پیاوەکە وایدادەنا کە بەرپرسە لەناڕازیبوونی هاوسەرەکەی. پیاوەکە جۆرێك بێزاری لەکارەکەییو لەسەر ئاستی ژیانی کۆمەلأیەتی پێوە دیاربوو هەمیشە بەشوێن سەرکەوتنی پیشەییو ماددیدا وێڵبوو، چونکە لەروانگەی ئەوەوە سەرکەوتن لەکارەکەیدا تاکە سەلمێنراوە بۆ جەختکردن لەخۆشەویستیی خۆی بەرامبەر بە ژنەکەی.

لەدوای ماوەیەك لەپەیوەندییەکەو بەتایبەتی لەدوای ئەوەی

پیاوەکە بۆ ماوەی شەش مانگ بەهۆی ئیفلاسبوونی ئەو کۆمپانیایەی کە کاری تێدا دەکرد، لەکارکردن وەستا، گیروگرفت لەنێوان دوو هاوبەشەکەدا زیادبوو، وازهێنانی پیاوەکە لەکارکردن بەلای پیاوەکەوە، کۆتایی سەرکەوتن بوو، وایدادەنا سەرەتای نەهامەتیی و نوشوستییە، هەمیشە بە ژنەکەی دەوت: "دەزانم وەك جاران خۆشت ناویم، چونکە لەکارەکەمدا سەرنەکەوتم". ژنەکەش ئەم لێدوانەی پیاوەکەی، وەك سوکایەتییەك دادەنا و لێکیدەدایەوە، بۆیە دەستیکرد بە گەڕان بە شوێن کارێکدا بۆی تا خۆشەویستیی و بایەخپێدانی خۆی بۆ بسەلمێنێت.

لەدوای ماوەیەك پیاوەکە توانی کارەکەی پێشووی بەدەست بێنێتەوە، بەڵام ئەو کێشبەندییەی کە بە دەستییەوە دەینالاند هەروەك خۆی مایەوەو بەمشێوەیە گوزارشتی لێدەکرد: "ئەگەر سەرکەوتنم بەدەستهێنا هیچ کاتێك ئەوەم بۆ ئاشکرا نابێت خۆمت خۆشدەوێت یان تۆ بە شوێن سەرکەوتن لەکارەکەمدا، دەگەڕێی".

ئەو کێشبەندییەی لێرەدا تێبینی دەکەین لەکاریگەری فشارە کۆمەڵایەتیی و کولتورییەکانی ئەو ناوەندەدا کۆبۆتەوە کە دوو هاوسەرەکە تیایدا، ژیاون و هەروەها لەپابەندبوونیان بەو بەهاو پێودانگانەی کە لەو ناوەندەدا باو بووە، پیاوەکە لای خۆیەوە کوڕی جوتیارێکی هەژار بووەو هەر لەمنداڵییەوە ئەو هەستەی هەبووە کە ئەرکی سەرکەوتنی کۆمەڵایەتیی و تۆڵەکردنەوەی ئەو سەرشۆڕییەی لەئەستۆیە کە باوکی بەدەستییەوە ناڵاندووییەتی.

هۆگربوونی بەهێز بە خوێندنەکەیەوە وایلێکردبوو نەزانێت چۆن لەگەڵ خەڵکدا مامەڵە دەکات و تەنانەت چۆن گوزارشت



لەئارەزووەکانی بکات. بە تایبەتی ئەوەی کە فێری بوو بوو رکابەرێتیی و کێبڕکێ بوو. ئەو "ئۆتۆمبێلە مارسیدسە" کە باوکی خەونی پێوە دەبینی و بەشێوەیەکی تایبەتیش سامان لای ئەو پیاوە بووبووە ئەو تاکە شتەی کە دەتوانێت دەروونی هێوربکاتەوەو بەهۆیەوە جەخت لەبەهای خودێتی خۆی، بکات.

ئەم ژن و پیاوە هەڵبژاردنیان بۆ یەکتری "بێ ئاگاداری خۆیان" ئامانجی بەردەوامی پێدان و تەواوکردنی ئەو گۆشەنیگا نهێنییەی خێزانەکانیان بوو کە لێوەی هاتبوون. پیاوەکە لای خۆیەوە درکی بەوەدەکرد ژنەکەی سەر بە خێزانێکی دەوڵەمەندو پارەدارە، لەبەرئەوەی پێشتر ژنەکەی بەدەست مامەڵەی باوکییەوە زۆری چێشتبوو، پیاوەکە هەوڵیدەدا بۆ سەرکەوتنی کۆمەڵایەتی خۆی، تا جەخت لە خۆی بکات و متمانەش بۆ ژنەکەی بگەڕێنێتەوەو جەخت لەئینتیمابوونی خۆشەویستیی بۆ چینێکی کۆمەڵایەتیی پارەدارو دەوڵەمەند، بکاتەوە.

ژنەکە لای خۆیەوە (بێ ئاگاداری خۆی) خەونی بە بەهێزکردنی ئینتیما بۆ خێزانەکەیەوە دەبینی و ئەویش لەڕێگەی هاوسەرێتیکردن لەگەڵ پیاوێکی بە توانادا کە بەهۆی سەرکەوتنیەوە بتوانێت ئەو سووکایەتییە بسڕێتەوە کە باوکی بوو بووە هۆی دروستکردنی یان روودانی.

لێرەدا تێبینی دەکەین چۆن (ئایدیۆلۆژی هاوبەشی ئەم دوو خێزانە ملکەچی لۆژیکێکی هەژموونی چینایەتی بوون، بەرەو هەڵسەنگاندنی ململانێ و جەختلێکردنەوەی لەخود و کێبڕکێ و سەرکەوتنی ماددی و دەسەلات بەسەر کەسانی دیکەو

فەرامۆشکردنی بەها مرۆیی و سۆزدارییەکانی، بردن)[١٣]. لەبەر ئەم هۆیە تێبینی دەکەین هەر قەیرانێکی ئابووری یان دارایی سەرپێیی و تێپەڕبوو، بەشی ئەوەدەکات خەونەکان تێکبشکێنێت و جەختلێکردنەوەی ئاڵوگۆڕکراو بلەقێنێت.

لەشیکارکردنی ئەمبارەدا نابێت تەنیا پشت بە روخساری کۆمەڵایەتیی– کولتوری ببەسترێت، چونکە لایەنی سایکۆلۆژی هەیە کە مۆرکێکی تاکانەو ریکخراوەیی هەیەو پەیوەندی بە سروشتی پەیوەندییە دوالییزمییەکانەوە هەیە، ئەو پیاوە لەرووی گۆشەنیگای شیکارییەوە "هەر لەمنداڵییەوە" ئەو دژ بەیەکییە ویژدانییەی بەرامبەر باوکیی و دایکی هەیبووە، هەر پاراستوویەتی، هاوچەشنیکردن لەگەڵ باوکیدا ئەستەم بوو، بۆیە لەرێگەی رۆڵە هەژێنراوەکانی باوکییەوە هاوچەشنی لەگەڵ دایکیدا کرد، بەڵام بەشێوەیەك لەئاڵۆزیی و هەستکردن بەگوناه، بەدەر نەبوو. بۆ جەختکردنەوە لەخۆی رێگەیەکی بەدینەدەکرد، تەنیا لەرێگەی شێوازی شەڕانگێزییەوە، نەبێت، ئەویش بە ژێرپێنان و سەرشۆڕکردنی کەسانی دیکە، ئەمەش هەستکردن بە گوناهی لادروستدەکردو بەرەو دەستبەرداربوون لەم جەختلێکردنەوەیە دەیبرد. دژی رەفتاری دایکی دەوەستا، چونکە سوکایەتیکردنی باوکی بێ هیچ بەرپەرچدانەوەیەك قبوڵدەکرد، ئەمەش لەرێگەی رەفتاری رەتکراوە بۆ هاوچەشنیکردن لەگەڵ وێنەی دایکیدا، گوزارشتی لێدەکرد، زیاتر لەجارێك پەیمانی لەگەڵ خۆی دەبەست بۆ دروستکردنی پەیوەندی سادیزم لەگەڵ کەسانی دیکە، بە پشت بەستنێکی ئاشکرا بە پەیوەندی باوکی بە دایکییەوە. ئەمەش ئاشکرا



لەپەیوەندی لەگەڵ ژنەکەیدا دەردەکەوت کە هەمیشە هەوڵیدەدا دەسەڵاتی بەسەردا هەبێت و رێگە لەکرانەوەی بگرێت لەگەڵ کەسانی دیکەدا. بە پەرۆشبوون و سەرکەوتنی سەرسام بوو، لەگەڵ ئەوەدا غیرەی لێدەکرد، چونکە پەیوەندی تایبەتی خۆی هەبوو، سەرکەوتنی باشی بەدەستهێنابوو، پیاوەکە ئارەزووی دەکرد خۆی ئەو سەرکەوتنانە بەدیبهێنێت.

کێشبەندی خەسان castration لای ئەم پیاوە تەواو ئاشکرابوو، لەجەختلێکردنەوەی خۆی و وروژاندنی غیرەی کەسانی دیکەدا، خۆی دەبینییەوە، لێرەشەوە ترسان لەهەڕەشەکردنی خەسان لەوەی کە پشتی بە وێنەی سەرەکی باوك بەستووە، دەرکەوت.

بەڵام گیروگرفتەکە لە کێشبەندی خەسان تێپەڕی، چونکە بەهای خودێتیی و نارسیزمیی (خۆشەویستی بۆ خۆی) شوێنی پرسیاربوون، ئەو پیاوە بەدەست هەستکردن بە نائاسوودەیی دەیناڵاندو لەگەڵ ئەو سەرکەوتنەشدا کە بەدیهێنابوو لەخۆی رازی نەبوو. دڵەڕاوکێی خەسان کێشبەندی پێش جێنیتاڵی pregenitale لا ژیاندەوە، کە پەیوەست بوو بە مانەوە کۆمییە fixations anales جوڵاوەکانەوە. ئەم چەسپاندنە یان مانەوە لە رێگەی ئەو خستنەوەبەرفرمانە لیبیدییە چڕەوە کە بە سامانی دەبەخشی ئاشکرا دیار بوو، یان "سامان وەك دیاری". ئەم سامانەی (کە دەیبەخشی یان پێوەی پابەند بوو) وەك هۆکارێك بۆ کۆنترۆڵکردنی بابەتەکانی، بە تایبەتی ژنەکەی، بەکاریدەهێنا. ژنەکە بەتایبەتی ئەم روخسارەی رەتکردەوە نەك لەبەرئەوەی (بایەخ بە سامان) نادات، بەڵکو لەبەرئەوە بوو ئەوەی رەتکردەوە کە پەیوەندی نێوانیان لەسەر ئەم ئاستە

دیاریبکرێت و بەمەش ئەوەی رەتدەکردەوە کە ژنێکی پارێزگاریلێکراوو بیٚ راو بۆچوون بێت. کێشبەندی کۆمی لای ژنەکە بەشێوەیەکی جیاواز بوو لەوەی هاوسەرەکەیی و چەند پیاوەکە دۆخێکی گەڕاندنەوە یان گەڕاوە regressif ی لەسەر ئەم ئاستە وەردەگرت، ئەوەندە ژنەکە ئازاد دەبوو، هەروەها کرداری "فۆرمەلەبوونی پێچەوانەیی "reactionnelle formation رێکدەخست و بە شێوەیەکی شاراوە لەسەر ئەم ئاستە هەڵوێستێکی پێشکەوتووی، بەدەستدەهێنا.

هەروەها لەسەر ئاستی پەیوەندی دوالیزمیش بەوپەڕی بایەخەوە تێبینی کردارەکانی خستنەپالٚ– پرۆجێکشن projection، دەکەین، بۆنموونە کێشبەندییەکی دژبەیەك لای پیاوەکە مایەوە: دەیویست ببێتە خاوەنی ژنێك کە لەلایەن کەسانی دیکەوە بە باش دانرابێت (یان بە باشی تەماشا کرابێت)و بابەتێك کە لای کەسانی دی بەهای هەبێت و لەهەمانکاتیشدا دەیویست ژنەکەی بەشێوەیەکی هەمەکی ببێتە پاڵپشتی ژنەکەی (واتە پیاوەکە دەیویست بەتەواوەتی پاڵپشتی ژنەکەی بێت). بەڵام ئەگەر ژنەکە بەمشێوەیە چاودێریکراوبێت ئەوا پیاوەکە بەسەریدا زاڵدەبێت، هەروەها دەستپێشخەرییەکانی لەخۆشەویستییدا چ بەهایەکیان دەبێت ئەگەر بەمشێوەیە بەسەریداسەپێنراو بن و عەفەوی نەبن؟ بەمشێوەیە پیاوەکە نەیدەزانی "بابەتی خۆشەویستی" یە لای ژنەکەی یان ژنەکەی بەتایبەتی بەشوێن سەرکەوتنەکانیدا وێڵە. هەستیدەکرد کەسێکی بێزراوەو توانای رازیکردنی ژنەکەی نییەو هەر بە شێواوی مایەوە، ئەو دڵەڕاوکێیەیی لەشێوازی پارانۆیدی



paranoide یدا هەستی پێدەکرد، بە سەریدا زاڵبوو، ئایا بەهای خودێتی هەیە؟ (مەبەستی لەژنەکەی بوو) ئایا دەتوانێت جگە لەخۆی هیچی دیکەی خۆش بوێت یان تەنیا ئەو پارەیەی خۆشدەوێت کە ئەم پێشکەشی دەکات؟ ئەم خستنەپاڵە projection رزگاری دەکرد لەو گومانەی بەرامبەر بەهای خودێتی خۆی و توانای بۆ خۆشەویستی هەیبوو.

پیاوەکە هەمیشە وێنە بێزراوەکەی ناو خودی خۆی دەخستەپالٚ projecte ژنەکەی (یان لەژنەکەیدا بەتاڵی دەکردەوە) و ژنەکەش بەرامبەر ئەم خستنەپاڵەی پیاوەکە بە توندوتیژی وەڵامیدەدایەوەو وای لەپیاوەکە دەکرد هەست بە گوناه، بکات.

دەتوانرێت لێرەدا لەرێگەی شێواندنی کێشبەندییە سایکۆلۆژییە ئاڵوگۆڕکراوەکانەوە درك بە رەهەندی کۆمەڵایەتی– کولتوری بکرێت. بۆنموونە ژنەکە وێنەی ژنێکی پارێزگاریلێکراوی رەتدەکردەوە کە رێز لەسەرکەوتنی پیاوەکەی بگرێت یان ئەو حەوانەوە مادییەی کە هاوسەرەکەی پێشکەشی دەکرد بە هەند وەربگرێت. ئەوژنە سەرلەنویٚ داوای ئاشکراکردنی هەستە سۆزدارییەکانی لێدەکرد. ئەو هەستانەی کە لەسەرەتای پەیوەندییدا ژنەکە بەهەند وەریدەگرتن، بەشێوەیەکی هەمەکی تێکشکێنران ئەویش بەهۆی ئاشکراکردنی نیازەکانی و ئەو وێنە بێزراوە کە دەربارەی هاوسەرەکەی (پیاوەکەی) دروستبوون. ئەو هەڵوێستانەی پیاوەکە پێوەی پابەند بوو رێگربوون لەبەردەم جەختلێکردنەوەی ئاڵوگۆڕکراودا، چونکە لای پیاو گوزارشتکردن لەهەستە سۆزدارییەکان، "لاوازی" دەگەیاندو پێی وابوو "باشێتی" دەرئەنجامی لەدەستدانی ئازایەتییە، لەکاتێکدا

سەرکەوتنی کۆمەڵایەتی بە پێچەوانەوە گوزارشت لەپلەوپایە دەکاتو بەهای خودێتی، بەهێزدەکات. پیاوەکە هەستە تایبەتییەکانی خۆیو تەنانەت ئەو بیرۆکەیەی کەسێکی سۆزدار یان باش بێت، قبوڵنەدەکرد، لەبەرئەوە نەیدەتوانی ئەو جەختلێکردنەوە یان متمانەیە بە ژنەکەی ببەخشێت کە هەمیشە بەدوایدا، وێڵبوو: ژنەکە بڕوای تەواوی بەوە بوو کە ژنێکە شایستەی ئەوەیە بە هەستە سۆزدارییەکان لەلایەن پیاوێکی باشو بە بەهاو دەوڵەمەندەوە، خۆش بویسترێت.

بەتایبەتی لەم هەڵوێستەدا تێبینی رۆڵی فاکتەرە کۆمەڵایەتییەکان دەکەین کە پەیوەستە بە گروپێکی دیاریکراوەوە کە پێودانگەکانی پشت بە کێبڕکێی توندڕەوانە دەبەستێت، بەوپێیە شەرەفو رێزلێنان بۆ ئەو کەسە دەگەڕێتەوە کە بەسەر کێبڕکێکەرەکەیدا زاڵدەبێت.

## سامانو پلەو پایە لەچوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتیدا:

هەر لەسەرەتاوە کۆمیسیۆنکردنی دەسەڵات لەناو چوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتیدا رێکدەخرێت، پەیوەندییەکانی پلەوپایە لەنێوان دووهاوبەشەکەدا بەچەند فاکتەرێکەوە پەیوەستە وەك: فاکتەرەکانی ئابووریی و سۆزداریی و کولتووری: (لەچوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتیدا ململانێیەکی بەردەوام لەپێناوی پلەوپایەو دەسەڵاتدا هەیە، زۆرجار کێبڕکێکردن لەسەر دەستکەوتی مادییەو بەپێی ئەم پێودانگە هەر هاوبەشێك دەستکەوتی زیاتر بەدەست



بێنێت وا پێویستدەکات ئەو هەژمونی هەبێت) .[١٤]

لەبارودۆخی ئابووری ئێستادا زۆرکات پیاو لەم ململانێیەدا براوەیەو ئارەزوو دەکات پاڵپشتی ئەم جۆرە پێودانگە بکات، (بەڵام هەندێجار روودەدات "کە ئێستا بۆتەهۆی گرژییەکی زۆر" بێکاری ببێتەهۆی گۆڕینی پەیوەستنامەی پلەوپایە لەنێوان هاوبەشەکاندا، هەروەها لەوانەیە ببێتەهۆی هەستکردن بە دابەزینی بەهای خود لای ئەو پیاوەی بەر لەماوەی بێکاری هاوسەنگی خودێتی بەو مەرجە دەسەلماند خۆی هەژمونکار بێت، ئەمەش لەوانەیە لای ئەوپیاوە ببێتە هۆی دەرکەوتنی پەرچەکردارێکی خەمۆکی ئاشکرا یان دیار) .[١٥]

وێڕای ئەم گیروگرفتانە، گیروگرفتێکی دیکە هەیە بەهۆی بەراوردکردنی بەهای خودێتی تاك بە بڕی سامانەوە، روودەدات (بەراوردکردنی دەستکەوتەکان لەنێوان ژنو پیاودا). لەگەڵ ئەوەشدا بەگشتیی داهاتی ژن لەداهاتی پیاو کەمترە، بەڵام لەوانەیە (هەندێجار) رێژەکان پێچەوانە ببنەوە. لەهەندێك حاڵەتدا تێبینی دەرکەوتنی گیروگرفت لەنێوان هاوبەشەکاندا دەکەین، چونکە هەندێك لەپیاوان واهەستدەکەن بەرزی داهاتی ژن لەداهاتی ئەمان مەترسییەك بۆ سەر پلەوپایەو پیاوەتییان دروستدەکات. ئەم مەسەلەیە بەرەو بابەتێکی دیکەمان دەبات ئەویش رووبەرووبوونەوەی گیروگرفتە تەرحکراوەکانە لەچوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتیدا، بەتایبەتی ئەوانەی پەیوەندییان بە مەسەلەی پلەوپایەو بڕیاردانەوە هەیە: بۆ نموونە، کێ بڕیار دەدات؟ چۆن بڕیارەکان دەدرێن؟ تێبینی دەکەین کاتێك رای ژنو پیاو

دژبەیەك دەوەستن ئەو هاوبەشەی بە تەنیا سامان پەیدادەكات یان بە دەستی دەهێنێت ئەو هەژمونكارە. بەڵام ئەگەر ژنەكە خۆی بە تەنیا پارەی پەیدا كرد-كە ئەمە دەگمەنە- رەچاوی ئەوە دەكات لەم حاڵەتەدا هاوسەرەكەی (پیاوەكەی) برینـدار نەكات و پلەوپایەو هەژمونی خۆی دەشارێتەوە.

لەو حاڵەتانەدا كە ژن و پیاو پێكەوە كاردەكەن، تێبینی دەكەین مەرج نییە بڕیاردان لەلایەن ئەو هاوبەشەوە بێت كە دەستكەوتی زیاتر پەیدا دەكات. چونكە مەسەلەی كاركردنی ژن یان یارمەتیدانی ماددی پیاو لەلایەن ژنەوە لەوانەیە ڕێژەی پلەوپایە لەنێوانیاندا هاوسەنگ بكات، چونكە بێ ئەو (واتە ژنەكە) نابێت بڕیارەكان بدرێن و دەشتوانێت ناڕەزایی بەرامبەر هەر بڕیارێك هەبێت كە لەگەڵیدا ناگونجێت، لەبەرئەوە زۆرجار پێشنیازەكانی بڕواپێهێن و كارپێكراو دەبن.

لەبەرامبەردا سەبارەت بەمەسەلەی كاری ژن ناكۆكی هەیە، چونكە هەندێك لەهاوسەرەكان لێخۆشبوونیان بەرامبەر كاری ژنەكانیان نییە، هەست بە سووكایەتی دەكەن، هەروەك بڵێی كاری ژنەكانیان گوزارشت لەلاوازی كەسێتیی ئەوان دەكات. هەندێكی دیكە لەپیاوان هەوڵدەدەن دڵنەوایی خۆیان بەوە بدەنەوە كە كاری ژنەكانیان تەنیا یارییەكە یان جۆرێكە لەكات بەسەربردن.

خاتوو M.A و هاوسەرەكەی لەدوای كەڵەكەبوونی كۆمەڵێكی زۆر لەو گیروگرفتانەی كە پەیوەندییان بە كاركردن و پەروەردەكردنی منداڵەوە هەیە، ناچاربوون پەنا بۆ چارەسەركردن بەرن. ژیانیان لەسەرەتادا گونجاوو رێك بوو، كاتێك لە فێرگەی ئەندازیاری



یەكتریانناسی لە راو بۆچوونە سیاسیی و فەلسەفییەكاندا هاوبەشبوون.

خاتوو M.A بۆ ماوەیەكی كاتی بەهۆی سەرقاڵی پەروەردەكردنی پێنج منداڵەكەیەوە، ناچار بوو واز لەكاركردن بێنێت، پاشان گەڕایەوە بۆ كاركردن و كارەكەی لەبواری ئەندازیارییەوە بۆ خوێندن و فێركردن، گواستەوە:

لەم ماوەیەدا توانی بەشێوەیەكی پێویست لەو مەسەلانە وردبێتەوە كە پەیوەندییان بە هاوسەرێتیی و پەروەردەكردنی منداڵەوە هەیە، سەبارەت بە ژیانی كۆمەڵایەتیش كرانەوەی زۆری پێوە دیاربوو. پیاوەكە لای خۆیەوە لەبواری پیشەی ئەندازیاریدا لەكاركردن بەردەوام بوو، پۆستەكەی بەرز بووەو موچەكەی دووئەوەندەی مووچەی ژنەكەی لێهات. هەرچەندە لەرووی بیروباوەڕەوە هەریەكەیان دەربارەی كاری ئەوی دیكەیان كۆك و تەبابوون، بەڵام ململانێی نێوانیان بە بەهێزی مایەوەو سەبارەت بە مەسەلە ماددییەكانیش شێوەی ناكۆكیی وەرگرت، لەدوای ئەوەی ناڕەزایی زۆری پیاوەكە بەرامبەر بە ژنەكە كەڵەكە بوو هەوڵیدا وا لەژنەكە بكات هەست بە گوناه بكات و بەرپرسیارێتی منداڵە گەورەكانی خستەئەستۆ (لەدوای ئەوەی پیاوەكە كارتێكردنی خۆی لەسەر منداڵەكانی لەدەستدابوو).

پیاوەكە لەبەرئەوەی غیرەی لەژنەكەی دەكرد، هەوڵیدەدا سروشتی كاری ژنەكەی بێزراو بكات، ئەم دەستەواژانەی ئاراستە دەكرد: (كارەكەی تۆ بیدعەیەكی مرۆڤایەتییەو تەنیا پاساوێكەو هیچی دیكە نییە ... تۆ تەنیا یەك لەسەر سێی داهاتی منت دەست دەكەوێت ...)

ئەم قسانە بەتەواوەتی لەگەڵ ئەو پرەنسیپانەدا دژ دەوەستان کە هەردووکیان بڕوایان پێی هەبوو، لەبەرئەوە ژنەکە دەیتوانی قسەکانی بەئاسانی لەدژی پێچەوانە بکاتەوە، چونکە لاوازیی و شێواوییەکەی بۆ ئاشکرا دەکردو وایلێدەکرد هەست بە لەدەستدانی بەهای خودێتی خۆی بکات. ئەم نارەزاییانەی ژنەکە رووبەرووی دەکردەوە بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ بوونی هەبوو، بەڵام تا ئەوکاتە بەشێوەیەکی ئاشکرا گوزارشتی لێنەکردبوون.

ئەم حاڵەتە رووخسارە تایبەتییەکانی کەسێکی رەسیو دەخاتەروو کە بەهای خودێتی خۆی لەدوای تێپەڕبوونی ماوەیەك بەسەر سەرکەوتنێکی گەورەی کۆمەڵایەتی، لەدەستداوە: (دڵەڕاوکێی خەسان) لای پیاوەکە تائێستا شینەبۆتەوە mal liquide لەسەر ئاستی رێکخستن، جۆرێك لە کودەتاو لەقین لەبەرژەوەندی ژنەکە، روویداوە: لەقۆناغەکانی پێشوودا پیاوەکە کامڵ و پێگەیشتوو دەردەکەوت و بڕوای بەخۆی هەبوو، چونکە درکی بەوەدەکرد بارودۆخی ژنەکە خراپە و لەخوار ئەمەوەیە، بەڵام ئەمڕۆ بارودۆخەکە هەڵگەڕاوەتەوە، چونکە ژنەکە توانیویەتی لەسەر ئاستی ژیانی کۆمەڵایەتی بکرێتەوەو کار بکاتە سەر منداڵەکانیی و پەیوەندی لەگەڵ هاوسەرەکەیدا. چەندە کەسێتی ژنەکە گەشەی دەکردو دەکرایەوە، هێندە پیاوەکە هەستی بەلاوازیی و روخان دەکرد. بۆئەوەی ئەو لاوازییەی خۆی رەتبکاتەوە، ماوە ماوە جیاوازی لەنێوان داهاتە بەدەستهاتووەکانی نێوانیانی دەهێنایەوە یادی ژنەکە: پیاوەکە سامانی وەك پێودانگێکی کوانتەمی (بڕی) بۆ دیاریکردنی بەهای خودێتی بەکاردەهێنا. ژنەکە لای خۆیەوە



بەئاسانی درکی بەم دژ بەیەکییە ئاشکرایە کرد، سوودی لەکەوتنی مەعنەوی هاوسەرەکەی وەرگرت تا دەسەڵات و پلەوپایە لەبەرژەوەندی خۆی بگەڕێنێتەوە.

لەم نێوکۆیەدا تێبینی دەکەین هەمیشە پەیوەندی پلەوپایە لەنێوان هاوبەشەکاندا کاریگەر نابێت بەو هاوبەشەی کە داهاتی زیاتر بەدەستدەهێنێت. ئەم پەیوەندییە بەو چینە کۆمەڵایەتییەشەوە پەیوەستە کە دوو هاوبەشەکەی لێوە هاتوون: بۆنمونە لەچینە نەدارەکاندا، تێبینی دەکەین، ژن و پیاو بە پێی دابونەریتی ئەو چینە ئیشکەرە هەڵسوکەوت دەکەن: پیاو موچەکەی بەتەواوەتی دەخاتە دەستی ژنەکەیەوە، ئەمە لەو کاتانەدا کە ژنەکە بڕیاردەدات چی پێویستە بۆ کڕین، تەنیا بڕێکی ئەو پارەیە دەداتە دەست پیاوەکەی هەڵسوکەوتی پێوە بکات. هەڵسوکەوتی پیاو لەم حاڵەتەدا ملکەچی مەرجی پەروەردەیی دیاریکراوە، ئەوەی بۆ ئاشکرادەکەن رۆڵی سەرەکی ئەو پەیداکردنی پارەو خۆراکە بۆ خێزانەکەیی و بەپێی ئەو پێودانگە واپێویستدەکات خۆی بەتەنیا سەرچاوە ئابورییەکان بۆ خێزانەکەی دابینبکات، ئەمەش بەهایەکی خودی پێدەبەخشێت. بە رێگەیەك هەڵسوکەوت دەکات کە نایەڵێت ژنەکەی لەدەرەوەی ماڵەوە، کاربکات.

لەم نێوکۆیەدا چەندەها پاساو دەهێنێتەوە تا جەخت لە لایەنە خراپەکانی کارکردنی ژن لەدەرەوەی ماڵ بکاتەوە، بەمشێوەیە لەبەرئەوەی ئەو پەیوەندییەی ژنەکەی بە پیاوەکەوە بەستۆتەوە، پەیوەندییەکی پاشکۆیەتییە، ئەوا ژنەکە لەرێگەی کارکردنەوە دەستبەرداری هەڵسەنگاندنی خۆی، دەبێت، واتە هەڵسەنگاندن

بەهۆی پیشەوە کە پیاو بە هۆیەوە خۆی پێهەڵدەسەنگێنێت.

– لەلایەکی دیکەوە لەم بوارەدا، روخساریکی دیکەی ئەو گیروگرفتانە، دەردەکەوێت کە پەیوەندییان بە "هۆشیاری چینایەتییەوە" هەیە: لەهەندێك حاڵەتدا لەوانەیە سامان یارمەتی گۆڕینی ئینتیما بۆ چینێکی کۆمەڵایەتی دیاریکراو بداتو لەمیشەوە ناکۆکی لەنێوان هاوبەشەکاندا، دەردەکەوێت: یەکێك لەو دوو هاوبەشە دەیەوێت بە چینە کۆمەڵایەتییە بنەڕەتیەکەوە پەیوەست بێت، لەکاتێکدا ئەوەی دیکەیان، هەوڵدەدات خۆی لێ دەربازبکات. لەمحاڵەتەدا سەبارەت بەو هاوبەشەی کە ئارەزووی گۆڕینی چینی بنەڕەتیی خۆی دەکات، دەستکەوتی ماددی هۆی سەرەکییە کە یارمەتی ئەو هاوبەشە دەدات بۆ خۆدەربازکردن لەچینە بنەڕەتییە کۆمەڵایەتییەکەی، لەبەرامبەردا لەوانەیە دەستکەوتی ماددی بەرز جۆرێك لەهەستکردن بە گوناه لای ئەو تاکە دروستبکات کە لەچینێکی کۆمەڵایەتی خاکیدا لەدایکبووەو هەر پارێزگاری لەهەستی ئینتمابوونی بۆ ئەو چینە کردووە، چونکە درکی بەوەکردووە کە داهاتی بەرز لەوانەیە لەچینی بنەڕەتیی کۆمەڵایەتی خۆی، دووریبخاتەوە.

## پاڵپشتەکانی دیکە بۆ پەیوەندییەکانی پلەو پایە:

پێویستە ئاگاداری ئەوە بین کە سامان تاکە هۆکار نییە بۆ جەختکردنەوە لەدەسەڵاتو پلەو پایە لەنێوان هاوبەشەکاندا: بەڵکو لەناو چوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتییدا مەعریفەو سەرکەوتنی پیشەیی و زانستیی پەیوەندی بەهێزییان بە پراکتیزەکردنی



دەسەڵاتەوە، هەیە: لەم نێوکۆیەدا تێبینی ئەوەدەکەین کە توانستی زانستی یارمەتی پاڵپشتیکردنی پەیوەستی نێوان دوو هاوبەش دەدات، تەنانەت ئەگەر ئەم توانستە یارمەتی باشکردنی بارودۆخی ماددیشی نەدا. چونکە ئەو پێودانگەی هەڵگری مەعریفەی پێ جیادەکرێتەوە وادەکات بەسەر کێبرکێکارەکەیدا سەرکەوتن بەدەستبهێنێت. لەمبارەدا هاوسەرێتیی لەگەڵ پیاوێکی بڕواپێکراوی خاوەن توانستدا یارمەتیدەر دەبێت لەزیادکردنی بەهای خودێتی هاوبەشەکەی بەرامبەرو، ئەو سوودەش کە لەم بوارەدا بەدەستدەهێنرێت بەندە بەخاوەنداریێتی تەواوی ئەو هاوبەشەوە. بەڵام ئەم شێوازە لەپەیوەستی لەوانەیە کاریگەری ئەو هاوبەشەی کە خاوەنداری دەکرێت کەمبکاتەوەو وایلێبکات ببێتە پاشکۆی ئەو هاوبەشە باوەڕپێکراوە کە خاوەن خاوەن توانستە. چونکە ئەو پێودانگەی ئەم هاوبەشەی لەدەرەوە (لەسەر ئاستی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان) پێدەناسرێت لەوانەیە لەناوەوە (لەچوارچێوەی پەیوەندی دووانی نێوان خۆیاندا) ببێتە پاڵپشتی ئەوپلەوپایە "گریمانەیی" دیەی ئەو هاوبەشە لەناو خێزانەکەی خۆیدا هەیەتیو هەروەها لەوانەیە مەترسییەکیش بۆ سەر هاوبەشەکەی دی، بنوێنێت.

هەروەها لەناو چوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتیدا ئاشنابوون بە زانست تەنیا هۆکار نییە بۆ کارتێکردن، چونکە هەندێك جۆری کارامەیی وەك (هونەری چێشتلێنان، فرە پیشەیی، پەرستیاری، درومان) دەشێت ئەمانە سەرچاوەیەك نەبن بۆ دانانی پێودانگ، بەڵام لەوانەیە رۆڵی گرنگ لەپەیوەندییەکانی پلەوپایە لەنێوان

هاوبەشەکاندا، ببینین.

شێوەیەکی دیکە لەشێوەکانی مەعریفە هەیەو خۆی لە (توانای گوزارشتی قسەکردن Elaboration verbale) دا دەبینێتەوە، چونکە ئەو هاوبەشەی لەسەر ئاستی زمانی زانستی یان جێبەجێکردنی پیشەییدا بە توانایە، مەرج نییە لەپەیوەندییەکانی پلەوپایە لەناو چوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتیدا باشترین هاوبەش بێت. لەبەرامبەردا ئەو هاوبەشەی لەتوانایدایە لەکاریگەرە هەڵچوونییەکان تێبگات و درکیان پێبکات و لەشیکردنەوەی کردارەکاندا لەچوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتیدا دەستی بالای هەبێت، ئەم هاوبەشە لەتوانایدایە هاوبەشەکەی دی ملکەچ پێبکات و بڕوا بە راو پاساوەکانی ئەو بهێنێت.

خاتووA.Bو هاوسەرەکەی، بەهۆی قەیرانێکەوە کە لەم دواییەدا روویدا، ناچاربوون پەنا بۆ چارەسەرکردن بەرن و بووە هۆی ئاڵوگۆڕکردنی پەیوەندییەکانی پلەوپایە لەنێوانیاندا، پیاوەکە لەلایەن خۆیەوە بەهۆی مەعریفە زانستییە زۆرەکانییەوە خاوەنی پێودانگێکی گەورەبوو، ئەوخۆی بڕیاری دەداو یاسا و پێوەرەکانی لەناو چوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتیدا دیاریدەکرد. هەرچی ژنەکە بوو، هەمیشە پیاوەکەی دەکردە پاڵپشتی خۆی (واتە پیاوەکەی پشتیوانی هەمیشەیی ئەو بوو)، لەهەموو کاروبارێکدا راوێژی پێدەکردو کاروباری خۆی دەخستە بەردەستی، بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ لەسەر ئەم بارە مایەوە، بێئەوەی هیچ گلەییەك بکات یان ناڕەزاییەك، دەربڕێت.

ئەو ژنە کە بەگەنجی شوویکردبوو، لەژێر رکێفی خێزانەکەیدا



لەتەواوکردنی خوێندن بێبەشیان کردبوو. کاتێك گەنجێکی رۆشنبیرو بڕواپێکراوی ناسیی و رێزدانانی بۆگەڕایەوە، بۆی دەرکەوت خۆشیدەوێت و دەیەوێت هاوسەریی لەگەڵدا بکات، هەمیشە ئەو ژنە ئارەزووی ئەوەی دەکرد بگاتە کۆمەڵگەیەکی رۆشنبیرو پێشکەوتوو، لەبەرئەوە بەرامبەر هیچ بڕیارێکی هاوسەرەکەی ناڕەزایی دەرنەدەبڕی.

پیاوەکەش واتە هاوسەری ژنەکە لەخێزانێکی هاوشێوەوە هاتبوو، بەلام جیاوازی نێوان خێزانی ئەوو خێزانی ژنەکەی ئەوە بوو، ئەم هەمیشە دایك و باوکی بۆ تەواوکردنی خوێندن هانیاندەداو بەهۆی کۆششی تایبەتی خۆشییەوە توانی سەرکەوتن بەدەستبێنێت و پۆستێکی کۆمەلایەتی رێزدار، وەربگرێت، ئەو پیاوە هەر بەزوویی ژنی هێنا لەکاتێکدا هێشتا بەشێوەیەکی باش شوێن پێی خۆی لەچوارچێوەی پێگەی کۆمەلایەتییدا نەچەسپاندبوو، لەبەرئەوە تێربوونی تەواوی لای ژنەکەی دۆزییەوە، چونکە بووبووە مایەی سەرسامی ژنەکەیی و بڕیارەکانی بڕواپێکراوو جێبەجێکراو بوون.

کاتێکی ئەوەندە زۆر بەسەر ئەم هاوسەرێتییەدا تێپەڕی نەکرد، لەرووی رۆشنبیرییەوە ژنەکە بەدەست باری پلەنزمی خۆیەوە دەینالاند: درکی بەوەکرد کە بڕیارەکانی هیچ بەهایەکیان نییە، چونکە ناتوانێت بڕوا بەهاوسەرەکەی بهێنێت، لەبەرئەوە بڕیاریدا خوێندنی بالا تەواوبکات، سەرەتا پیاوەکە لەلایەن خۆیەوە، هیچ ناڕەزاییەکی دەرنەبڕی، چونکە پێی وابوو ئەم خوێندنە بێسوودەو هیچ کارناکاتە سەر بارودۆخی ئەو.

لەدوای ماوەیەك ژنەكە توانی زانیاری گرنگی دەستبكەوێت و هەروەها خوێندنەكە وایلێكرد "توانای گوزارشتكردنی قسەكردن Elaboration verbale" ی دەستبكەوێت. ئەم توانایە لەناو چوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتییاندا، بوو بەهۆی ئاڵوگۆڕی خێرا لەپەیوەندییەكانی پلەوپایە. خاتوو B.A چیدی بەئاسانی بڕوای پێنەدەهێنرا، لەچوارچێوەی مەرجی توندوتۆڵدا دەستی بەتەرحكردنی بەهانە تایبەتییەكانی كردو لەهەموو حاڵەتەكاندا بەهانەكانی ئەو زیاتر لەگەڵ ئەقڵیەتی هاوسەرەكەیدا هاوجێدەبوون. لەگەڵ تێپەڕبوونی كات لێدوانەكانیان توندوتیژتر دەبوو، پەیوەندییەكانی پلەوپایە لەبەرژەوەندی ژنەكە، بەردەوامبوو. پیاوەكە چیدی نەیدەزانی چۆن بەرگری لەبەهانە تایبەییەكانی خۆی بكات و وردەوردە جڵەوی شتەكانی لەدەستدەچوو. سەرەتا بەشێوەیەكی شەڕانگێزانە وەڵامدانەوەی هەبوو، ئەمەش زیاتر پشتیوانی لەورەی ژنەكەی، دەكرد، دواتر بە ڕێگەیەكی خەمۆكییانە، ئەمەش وای لەژنەكە كرد مافی چاودێریكردن و دڵنەواییكردنەوەی هاوسەرەكەی، بەخۆی ببەخشێت ، پیاوەكە بەوە دڵخۆشی خۆی دەدایەوە كە بەهۆی ئەوەوە ژنەكەی توانیویەتی ئەم پێشكەوتنە بەدەستبهێنێت، بەڵام ئەم بڕوایە بەشی ئەوەی نەدەكرد ئەو بەختەوەرییە بنەڕەتییەی بۆ بگەڕێنێتەوە كە لەسەرەتای پەیوەندی هاوسەرێتییاندا هەستی پێدەكرد. وەڵامدانەوە خەمۆكییەكانی پیاوەكە، پەیوەندییەكی ئاشكرایان هەبوو بە تێكچوونی پەیوەندییەكانی پلەوپایە لەناو چواچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتیدا، لەنێوان شێوازەكانی "گوزارشتی قسەكردن"دا كە هەریەكەیان



بەكاریاندەهێنا، جیاوازیی روون و ئاشكرا بەدیدەكرا. پیاوەكە بە ڕێگەیەكی بابەتیی و لۆژیكییانە مەسەلەكانی دەخستەڕوو، پشتی بەو راستیانە دەبەست كە دەرئەنجامی ئاشكراو سادەی لێهەڵدەهێنجاندن.

بەڵام لەرووبەرووبوونەوەی ئەم "ئەقڵە وەرزشییەدا" ژنەكە بە ئەقڵییەتێكی ئاشكراو ورد ناڕەزایی دەردەبڕی ئەویش لەڕێگەی ئاشكراكردنی كەموكورتی و نەبوونی بەڵگەی پێویست بۆ سەلماندنەكانی (واتە سەلماندنەكانی پیاوەكە)یان لەڕێگەی تەرحكردنی ئەو پرەنسیپانەی لەدەرئەنجامی لێدوانی پیاوەكە هەڵیدەهێنجاندن. ئەم شێوازە لەسەلماندن پیاوەكەی بێدەنگكردو وایلێكرد دووچاری سەرسورمان بێت، چونكە نەیدەزانی چۆن بەرگری لەخۆی بكات و وەڵامبداتەوە. هەروەها هەمیشە شۆڕشی توڕەبوون وایلێكردبوو پێگەی خۆی لەبەردەم ئەو ژنە هێمنەدا لەدەستبدات، ژنەكە هەستی بە گەشەكردن و پەرەسەندنی كەسێتیی خۆی دەكرد.

پیاوەكە هەوڵیدەدا لەم كەشە هەڵبێت، چونكە بەرگەی سەركەوتنی ژنەكەی نەدەگرت، بەڵام لەگەڵ ئەم بارەشدا هەر بە هۆگری ژنەكەیەوە مایەوە و نەیدەتوانی رووبەڕووی راكردن و جیابوونەوە ببێتەوە، تەنیا لەڕێگەی فەنتازیاوە نەبێت. هەرچی ژنەكەشە، ئەویش هەر هۆگری بوو، بەڵام لەكاتی گفتوگۆدا دركی بەو روخسارە روخێنەرو بێزراوەی هەڵوێستی پیاوەكە نەدەكرد، ئەوەی كە بەلایەوە گرنگ بوو، تەنیا پشتیوانی لێكردنی بەهانە تایبەتییەكانی خۆی بوو.

پەیوەندییەکانی پلەوپایە لەنێوانیاندا لەسەر رێسای سڕینەوەو وێرانکردنی بەهانەو سەلمێنراوەکانی ئەوی بەرامبەر بوو، تا بە تێپەڕبوونی کات توانییان ئەو کارتێکەرە هەڵچوونییە نەستییانە دیاریبکەن کە پەیوەستبوون بە هەڵوێستو گفتوگۆکانییانەوە، هەروەها بەند بوو بە وروژاندنی گفتوگۆی نێوانیان بە رێگەیەکی دروستو بیناکەرانە.

– لێرەدا ئاشکرایە، ئەو هاوبەشەی دەتوانێت درك بە کارتێکەرە هەڵچوونییەکان بکاتو لێیان تێبگاتو پەیوەندییە ئاڵوگۆڕکراوەکان دیاریبکات، دەتوانێت جڵەوی کاروبارەکان لەچوارچێوەی پەیوەندییەکەدا بگرێتەدەست.

– بایەخی ئەم جیاکاریە یارمەتی تێگەیشتنی ئەو کاریگەرە سەرسوڕهێنەرە دەدات کە ژنێك لەسەر هاوسەرەکەی هەیەتیو خۆی خاوەنی رۆشنبیرییەکی سنوردارە، لەکاتێکدا هاوسەرەکەی رۆشنبیرییەکی بەرفراوانی هەیە، ئەم کاریگەرییە هەندێجار لەرووخسارە راستەوخۆ و پەروەردەییەکان تێپەڕ دەبێت، تائەوەی هەموو بوونییان بەتەواوەتی دەگرێتەوە. بەمشێوەیە لەهەندێك ژینگەدا، بارودۆخە سیاسییو کۆمەڵایەتییەکان کە پاڵ بە منداڵانی کوڕەوە دەنێت بۆ تەواوکردنی خوێندن، لەوانەیە لەچوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتیدا، بەشێوەیەکی دژبەیەك ببێتە هۆی دروستکردنی کاریگەرییەکی پێچەوانە لەپەیوەندییەکانی پلەوپایەدا. لەواقیعدا ئەم بارودۆخانە پاڵ بە کوڕانەوە دەنێن بۆ خوێندنی فراوانو درێژخایەنو کارکردنی بەردەوام هەر لەکاتێکی زووی تەمەنییانەوە، ئەویش لەپێناوی دەستکەوتنی داهاتێکی بە



بڕەووزۆردا، لەوانەیە ئەم کارکردنە بەردەوامە لەکاتەکانی دەستبەتاڵی دووریان بخاتەوە، ئەمەش وابکات لەئاڵوگۆڕکردنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییو سۆزدارییەکانو لەو چاوپێکەوتنو تێکەڵاوبوونانە بێبەش بن کە بۆ ئالوودەبوونو گونجاندن، یارمەتییان دەدات.

بەمشێوەیە لەوانەیە هەمان ئەو بارودۆخە (بەشێوەیەکی ئەندەکی) کچ لەم ئەرکانە، ئازادبکاتو کاتی پێویستیی بۆئاشنابوونی تەواو لەگەڵ پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە ئاڵوگۆڕکراوەکانو ئالودەبوونیان پێببەخشێت، دەتوانرێت بوترێت، کچ خاوەنی شارەزاییو توانستیی زیاترە لەبواری (زانستی پەیوەندییە مرۆڤایەتییەکاندا).

لەلایەکی دیکەوە ئینتمای ژن بۆ کۆمەڵەکانی ژنانو کۆمەڵە رۆشنبیرییەکان، وادەکات پاڵپشتی دەسەڵاتی ژن لەناوچوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتیدا زیادبکات: چونکە ئەو ژنەی بەهۆی ئاگاداربوونو گوێگرتن لە هۆیەکانی راگەیاندنەوە، ئاگاداری گۆڕانکارییە رۆشنبیرییو کۆمەڵایەتییەکانە، دەتوانێت بەشێوەیەکی باشتر لەپیاوەکەی، لەداواکارییە هەنوکەییەکانی منداڵەکانی تێبگات. پیاو بە دۆگمایی لەو پرەنسیپو پراکتیزانەدا دەمێنێتەوە کە لەماوەی هەرزەکاری خۆیدا بڕواپێکراوبوون، درك بەو گۆڕانە ناکات کە بەسەر منداڵەکانییدا هاتووە، بۆیە هەر زوو لەبەردەمیاندا واخۆیدەبینێتەوە کە لەهەموو تواناکانی داماڵراوە، لەروانگەی ئەم منداڵانەوە باوکیان هەموو دەسەڵاتێکی مەعنەوی لەدەستداوە، چونکە پرەنسیپە دێرینەکانی لەگەڵ پرەنسیپە هەنوکەییەکانی ئەماندا، ناگونجێت.

تەنیا ژنەکە توانای پەیوەندیکردنی لەگەڵ منداڵەکاندا دەبێت، هەرچی پیاوەکەشە پشت بە یارمەتی ژنەکە دەبەستێت، تا پارێزگاری لەنزمترین ئاستی پەیوەستبوون لەگەڵ منداڵەکانیدا بکات کە خۆشیدەوێن، هەرچەندە لێشیان تێناگات.

## فاکتەرە سۆزدارییو پەیوەستییەکانی پلەوپایە:

هەندێك لەپەیوەندییەکانی هاوسەرێتیی بە جۆرێك لە "پاشکۆبوونی ئاڵوگۆڕکراو Codependence" جیادەکرێنەوە. ئەم پاشکۆبوونە لەوانەیە سروشتێکی هاوتای لای هەردوو هاوبەشەکە هەبێت، چونکە هەندێجار تێبینی دەکەین ئەو کەسە لاوازانەی بە شوێن "جەختلێکردنەوە لەنارسیزم"دا دەگەڕێن، ئارەزووی ئەوە دەکەن هاوبەشێکیان دەستبکەوێت کە حاڵەتەکەی بە تەواوی لەگەڵ خۆیاندا هاوجێ بێت، بەمە جۆرێك لەدەستتێکەڵاوکردنی Collusion راستەقینە دەربارەی ئەم کێشبەندییە هاوبەشە بەدیدەهێنن.

لەسەر ئاستی زارەکی Oral شێوازی دیکەی دەستتێکەڵاوکردن هەیە کە پەیوەندییەکان تێیدا هاوتانینو یەکێك لەدوو هاوبەشەکە هەڵوێستێکی باوکانە لەخۆدەگرێت، لەکاتێکدا ئەویدیکە شێوازێکی گەڕاندنەوەیی یان گەڕاوەیی regressif وەردەگرێت. لەم دابەشکردنە (ناهاوتایەدا) تێبینی دەکەین هاوبەشی گەڕاوە (واتە ئەو هاوبەشەی بۆ قۆناغێکی زووی تەمەن دەگەڕێتەوە – وەرگێڕ) ئارەزووی ئەوەدەکات هەموو دەسەڵاتەکانی بداتە هاوبەشەکەی دی،



چەندە دەگەڕێتەوە (واتە چەند بۆ قۆناغێکی زووی تەمەنی دەگەڕێتەوە) ئەوەندە هاوبەشەکەی بەرامبەری لەم دەسەڵاتانەدا دەکاتە کۆمسیۆنی خۆیو لەهەمانکاتدا جەخت لەپاشکۆبوونی زیاتری خۆی هاوبەشەکەی، دەکات.

ئەم کۆمسیۆنکردنە (ناهاوتایە) ی دەسەڵاتەکان لەوانەیە لەناو پەیوەندی هاوسەرێتیدا تێربوونێکی ئاڵوگۆڕکراوو رێکخستنێکی جێگیری لەپەیوەندی دوالیزمی نێوانیاندا لێوە پەیدا ببێت. بەڵام لەو حاڵەتەدا ئەگەر رووداوێك سەریهەڵدا کە یەکێك لەدوو هاوبەشەکە بێبەش بکات لەپشتبەستن بەویدیکە، ئەوا ئەم جێگیربوونە لەوانەیە رووبەڕووی نوشستی ببێتەوە.

لەململانێی توندا، تێبینی ئەوە دەکەین کە ئەو هاوبەشەی دەستپێشخەرییەکی هێمایی ئەنجامدەدات تا ئاستی دابڕان توانای خۆی دەردەبڕێت. ئەم هاوبەشە توانای خۆی بۆ سەربەخۆبوونو پاشکۆنەبوونی ئەوی بەرامبەر ئاشکرادەکات، بەمەش هاوبەشەکەی دی دەخاتە دۆخێکی ئەستەمو وایلێدەکات زیاتر پاشکۆی بێت، هەروەك بڵێی کەوتبێتە ژێر بەزەیی ئەوەوە. بەتایبەتی لەم دۆخەدا ئەو هاوبەشە دەسەڵاتی راستەقینەی خۆی بەسەر هاوبەشەکەی بەرامبەریدا پراکتیزەدەکاتو بەمەش دەتوانێت ناڕەزاییەکانی دەربڕێت، هەروەها ئەم هاوبەشە لەدیاریکردنی ئەو مەرجانەدا توندوتۆڵ دەبێت کە لەپێناو بەردەوامبوونی ژیانێکی هاوبەشدا دایدەنێت. بێ گەیشتن بەم ئاستەو لەوحاڵەتەدا کە هیچ کام لەهاوبەشەکان بەشێوەیەکی راستەوخۆ ئەگەری توانینی جیابوونەوە باسناکەن، ئەوا هەر هەڵوێستێك کە لەسەربەخۆبوونێکی دیاریکراو

یان توانای بەسەربردنی ژیان بەتەنیا، سەرهەڵبدات، لەتوانایدایە هەندێك پلەوپایە بەو هاوبەشە ببەخشێت.

هەندێك لەهاوسەرەكان هەمیشە بەشێوەیەك هەڵسوكەوت دەكەن، هەروەك بڵێی لەپێناوی دەسەڵاتدا بەردەوام لەم ململانێیەدا دەژین: ئەو هاوسەرانەی رووبەرووی "هەستی ئاڵوگۆڕكراو" دەبنەوە، هەر هاوبەشێكیان هەوڵدەدات بوارێكی فراوان لەسەربەخۆبوون بخاتەڕوو، لەبەرئەوە سوورە لەسەرئەوەی ملكەچی كەس نەبێت و تەسلیمی هەڵخەڵەتاندنی سۆزداریی نەبێت.

K.M و ژنەكەی لەدوای زنجیرەیەك لەگیروگرفت كە شێوەیەكی دراماتیكیان وەرگرتبوو، ناچاربوون پەنا بۆ چارەسەركردن بەرن. لەسەرەتادا ژنەكە داوای راوێژی كرد، هەرچی K.M ـی هاوسەری بوو بەهەندێك لەخۆباییبوونەوە لەگەڵیدا دەهات، لەسەر كورسییەكە دادەنیشت، دوای پشوویەك بەچاوێكی لووتبەرزانەوە دەیڕوانییە دەوروپشتی خۆی و بەسەرلەقاندنێكەوە ئاماژەی بە ژنەكەی دەدا، دەست بەقسەكردن بكات. ژنەكە ملكەچی دەبوو، دەستی بە راڤەكردنی بارودۆخەكە دەكرد، هەرچی پیاوەكەیە قسەكانی ژنەكەی بەهەندێك دەستكارییەوە راستەدەكردەوەو دایدەڕشتنەوە، پاشان بەدوایدا هۆكاری بنەڕەتی گیروگرفتەكەی بە ئارەزووی خۆی راڤەدەكرد. بەپێی رای ئەو، بەشێوەیەكی سەرەكی هەڵەكە لەژنەكەیدا بوو، چونكە بەپێی رای پیاوەكە هیچ كات ژنەكە ملكەچی داواكاریی ژیانێكی هاوبەش و دركپێكردنی دروستی نەبووەو هیچ خۆشەویستییەكی دەرنەبڕیوە، ژنەكەش لەلایەن خۆیەوە هەوڵیدەدا بەرگری لەخۆی بكات، پاساوی بۆ هەموو هەڵسوكەوتێكی



دەهێنایەوە كە هاوسەرەكەی ناڕەزایی بەرامبەری دەردەبڕی. لەهەموو پاساوەكانیدا پشتیدەبەست بەو پرەنسیپانەی هاوسەرەكەی كە لەچوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتیدا دیاریكردنی یاسای لەئەستۆ گرتبوو: ئەو پیاوە بەپشتبەستن بە پێودانگە تایبەتییەكانی خۆی پاساوی بۆ هەڵسوكەوتەكانی دەهێنایەوە، لەكۆتاییدا ئەوەی ئاشكراكرد كە پێویستە ئەو (واتە ژنەكەی) هەڵسوكەوتەكانی، بگۆڕێت، چونكە ئەو پرەنسیپانەی كە دەریاندەبڕێت جەختلێكراون و قابیلی لێدوان نین. لەكۆتایی دانیشتنەكەدا هەرچەندە ژنەكە زۆر هەوڵیدا كە كاتی چاوپێكەوتنێكی دیكەیان، دەستبكەوێت (واتە دیاریبكرێت)، پیاوەكە ئەوەی ئاشكراكرد كە ئەو دانیشتنە كلینكییانە بەلای ئەوەوە هیچ سوودێكیان نییەو پێویستە كۆتاییان پێبێت.

دوای تێپەربوونی ماوەیەك، پیاوەكە پەیوەندیكرد (واتە پەیوەندی بە كلینكەكەوە كرد – وەرگێڕ) و راستەوخۆ ئاشكرایكرد كە پێویستی بە دانیشتنێكی دیكە هەیە، هەر لەهەمان ئەو رۆژەدا كە هاتن، دەركەوت بەتایبەتی پەیوەستییەكانی پلەوپایە لەنێوانیاندا پێچەوانە بۆتەوە: ژنەكە بەهێمنی هاتە ژوورەوە، بەڵام پیاوەكە شڵەژاو شێواو بوو. دەستی بەقسەكردن كردو باسی ئەوەی كرد كە ژنەكەی هەڵەیەكی زۆر گەورەی كردووە كاتێك بڕیاری جیابوونەوەی داوە. ژنەكە لای خۆیەوە قسەكانی ئەوی راستكردەوەو دەیوت تائێستا هیچ دەستپێشخەرییەكی واقیعی لەو چەشنەی نەكردووە، بەڵام ئامادەیە بۆ جێبەجێكردنی بڕیارەكانی لەوبارەدا ئەگەر هاوسەرەكەی لەسەر ئەو عینادیی و كەللەرەقییە، بەردەوام بێت.

لەمکاتەدا ژنەکە بەشێوەیەکی تەواو دەستی بە داوای گۆڕینی مەرجەکانی ژیانیان کرد، وێڕای ئەوەی چیدی ملکەچی بەهانەی پیاوەکەی نەدەبوو کە وەك هۆیەك بۆ هێنانەوەی پاساو هەڵسوکەوتەکانی بەکاریدەهێنا. بەمشێوەیە لەمەودوا بێدەنگ نابێت و بەوە رازی نابێت پیاوەکە بە ئارەزووی خۆی پەیوەندییەکە بەڕێوەبەرێت. هاوسەرەکەی لەلایەن خۆیەوە هەوڵیدەدا لەبایەخی ئەو ناڕەزاییانە کەمبکاتەوە کە ژنەکە دەیخستنەڕوو، بەڵام هەمیشە پشتی بە قسەکانی ئەو دەبەست. ژنەکە دەیوت پێویستە بەشێوەیەکی ریشەیی بگۆڕێت، چونکە چیدی بەرگەی تووڕەبوون و وەڕسییەکانی ناگرێت، داوای دەکرد لەناو چوارچێوەی پەیوەندییەکەدا ئاگای لەڕێڕۆیشتنی کاروبارەکان بێت، بەتایبەتی ئەوانەی پەیوەندییان بە سەرچاوە ماددییەکانی ماڵەکەوە هەیە کە پێشتر پیاوەکە خۆی بەڕێوەی دەبردن. لەمکاتەدا ئەو ژنە کاتێکی بۆخۆیی تەرخانکرد، بۆ گەڕان بەشوێن کارێکدا تا یارمەتیدەر بێت بۆ هەندێك لەسەربەخۆیی ماددی.

بەتایبەتی ئەم هەڵوێستەی ژنەکە، پیاوەکەی خستە دۆخێکی شەرمندەو دەترسا ئەم هەڵوێستە نوێیەی ژنەکە ببێتە هۆی جیابوونەوە لێی ئەگەر تێربوونی وەهمی لای کەسانی دیکە دەستکەوت، پیاوەکە دەیوت: "توانای زۆری هەیە، گەنج و جوان و زیرەکە، توانایەکی بێشوماری بۆ تەفرەدان و کێشکردنی ئارەزووی خەڵك هەیە، بەڵام هەڵەیەکی گەورە دەکات، ئەگەر ئەم توانایەی لەبەردەم کەسانی دیکە بەکارهێنا، ئەو کەسانەی کە ناتوانن ئەو تێربوونانەی پێببەخشن کە من پێم بەخشیوە".



لەکۆتایی دانیشتنەکەدا پیاوەکە داوای نوێکردنەوەی چاوپێکەوتنەکانی کرد، بەڵام ژنەکە رەتیکردەوەو وتی: "ئەوە منم نیم کە پێویستە بگۆڕێم، بەڵکو بەتایبەتی تۆ، پێویستە پەند لەم چاوپێکەوتنە وەربگریت و هەڵوێستەکانت بگۆڕیت".

لەدوای شەش مانگ لەم چاوپێکەوتنە پیاوەکە پەیوەندیکردەوەو داوای یارمەتیکرد، چونکە ژنەکە لەدەرەوەی هاوسەرێتییەکەیان، پەیوەندییەکی دیکەی بەستووە، ئەمە کاریگەرییەکی زۆرخراپی کردبووە سەر دەروونیی و بەخەمۆکی لەسەری شکابۆوە. هەرچەندە پیاوەکە لێی دەپاڕایەوە، ژنەکە بەمە ئەوەندەی دیکە جەختی لە خۆی دەکردەوەو لەخۆبایی دەبوو، متمانەی بەخۆی زیاتر دەبوو تا وایلێهات بەشێوەیەکی بەردەوام رقی لەپیاوەکەی دەبۆوە.

## دەسەڵاتی دەمامکراو:

بەهێزترین جۆرەکانی دەسەڵات لەچوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتیدا، ئەو دەسەڵاتەیە کە بەشێوەیەکی دەمامکراوو پەردەپۆشکراو پراکتیزە دەکرێت. چونکە ئەو هاوبەشەی هەژموونکارە "یان خاوەن هەژموونە" ئەو بەشێوەیەکی گشتیی یاساکان و دەسەڵات دیاری و پراکتیزەدەکات و بڕیارەکان دەردەکات، بەڵام هەمیشە بەئاگایە لەپەردەپۆشکردن و شاردنەوەی دەسەڵاتیدا، هەروەها دەسەڵاتی خۆی ناخاتە روو، رەچاوی هەستیاری هاوبەشەکەی دەکات، بەمەش پارێزگاری لەپلەوپایەی راستەقینەی خۆی دەکات،چونکە ئەگەر هاوبەشەکەی درك بەو دەسەڵاتە بکات کە

بەسەریدا پراکتیزەدەکرێت لەوانەیە "پەرچەکرداری" ی تایبەتی هەبێت و ئەو دەسەڵاتە لەهاوبەشەکەی دابماڵێت.

بەمشێوەیە لەچوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتیدا، پەیامە دەسەڵات ئامێزەکان سیخناخ دەبن لە دژبەیەکی "رقلێبوونەوەی دووانی" doudles contraintes و تەنیا پشت بە ئەقڵانیەت نابەستن، بەڵکو پشت بە فاکتەرە سۆزدارییەکانیش دەبەستن، بۆ نمونە دەستەواژەکانی وەك "خۆشحاڵ دەبم ئەگەر" یان "خۆشحاڵم دەکەیت ئەگەر" جێگەی دەستەواژەکانی "تکایە ئەوە بکە" یان "ئەو کارەم بۆبکە"، دەگرنەوە.

وێڕای ئەمانە، دەبینین بزوتنەوە هاوچەرخەکانی ژنان و زیاتر لەمان هەڵوێستی هەستداری زۆرێك لە کچە گەنجەکان گوزارشت لەرەتکردنەوەی دەسەڵاتی پیاوان دەکەن، کاتێك دەیانەوێت لەرێگەی دەربڕینی سەرسامییەوە بەرامبەریان و ئەو توانای فریودانەی دەیخەنە پاڵیان دەسەڵات بەسەریاندا بگرن. دەیبینین ئەو ژنانە لە پیاهەڵدان و شێوەکانی ئەڤینداری پیاوان سڵدەکەنەوە، لەکاتێکدا ئەگەر پیاوان بشیانخەنە ریزەکانی پێشەوە ئەوا لەبەئاگایی و بەرگریکردن لەخۆیان دایاندەماڵن، ئەویش بەتایبەتی لەرێگەی لێدان لە ژێی خۆشەویستیی (واتە کاردەکەنە سەر بواری خۆشەویستییان).

بەمشێوەیە ئەو ژنانە بەئاگان بەرامبەر قسەکردنی کلاسیکیی و ئەو هەڵوێستانەی بەتایبەتی لەدەسەڵاتی راستەقینە دایاندەماڵن، ئەویش لەرێگەی پەخشینی دەسەڵاتی زۆر پێیان. راستە ئێستا ئەو وتانەی وەك "من خزمەتکاری تۆم خانمەکەم" یان "من کۆیلەی



جوانییەکەتم" یان "من ملکەچی بڕیاری تۆم" بەدەگمەن بەکاردێن، چونکە ئێستا ئەو فرتوفێڵەی کەلەپشتی ئەم قسانەوەیە، بەسەر کەسدا تێناپەڕێت، بەڵام ئەمە رێگە لەوە ناگرێت کە بەپێی پێویست هەڵوێستی بڕواپێکراوی دیکە وەك ئەلتەرناتیڤ بەکاربهێنرێن، کە ئاشکراکردنییان ئەستەمە.

گۆڕانکارییە ئایدیۆلۆژییەکان وادەردەکەون هەروەك بڵێی راستەوخۆ بۆشێوازی دەستخستنەسەر دەسەڵات دەگۆڕدرێن، ئەمەش بەرەو شێوازێکی ئاڵۆزی گفتوگۆکردن و میکانیزمێك دەڕوات کەبە "رقلێبوونەوەی دووانی" وەسفدەکرێت، لەم چوارچێوەیەدا جۆرێك لە دژبەیەکی تێبینی دەکرێت لە نێوان "پرەنسیپ" کە مەبەستمان لێی ئازادییە و لەگەڵ "پراکتیزەکردن" کە مەبەستمان لێی رقلێبوونەوەیە.

ئەم واقیعە لەرێگەی هەندێك دەستەواژەوە ئاشکراو رون دەبێت وەك: "تۆ ئازادی، بەڵام" .... ماناکەی ئەوەیە "تۆ ناچاری ئەوە بکەیت کە من پێت دەڵێم و ئەگەر واتنەکرد ئەوە دەگەیەنێت کەتۆ منت خۆشناوێت" یان "تۆ دڵسۆزی خۆت نیت" یان "ئەگەر ئەوە نەکەیت کەمن پێت دەڵێم ئەوامانای وایە تۆ گێلیت".

مانا شاراوەکە، بەم ئاشکرایی و روونییە نییە، بەڵام قسەکە ئەگەری ئەم لێکدانەوەیە لەخۆدەگرێت، هەرچەندە دەستەواژەکە تەنیا وتوویەتی: "تۆ ئازادی".

ئەم رقلێبوونەوە پەردەپۆشکراوە دووفاقییە رێگە بە دەمامککردنی دەسەڵاتی ئەو لایەنە دەدات کەبەسەر ئەوی دیکەدا دەسەڵاتی هەیە، لەکاتێکدا دانپێدانان بەم دەسەڵاتە لەوانەیە

دەسەڵات لەدەستی ئەو لایەنە (یان ئەو هاوبەشە) دابماڵێت.

ئەم فرتوفێڵانە هیچ بەرهەمێك (سودێك) ناچننەوە تەنیا لەوکاتەدا نەبێت ئەگەر لەلایەن دوو تیمەکەوە (دووهاوبەشەکەوە) کە بەراستگۆیی و نیازپاکییەوە هەڵسوکەوت دەکەن، نکوڵی لەدەسەڵاتییان بکەن. خۆی لەخۆیدا، ئەم روخسارانە بەهیچ سیفەتێکی نەخۆشی جیاناکرێنەوە، بەومانایەی ئەگەری نەخۆشییەکی کۆمەڵایەتییان لێبکرێت، ئەمانە واتەواتێکن بە پلەیەك لەپلەکان لای هەموو هاوسەرەکان هەن، بەوانەشەوە کە بانگەشەی بەختەوەری دەکەن و رووبەڕووی شۆك نابنەوە.

لەمحاڵەتانەدا دەسەڵات دابەشدەبێت (بەتایبەتی دیاریکردنی پێوانەکانی هەڵسوکەوتکردن و پێودانگە کۆمەڵایەتییەکان) لە نێوان دوو تیمداو هەریەك لەو دووتیمە پارێزگاری لە مەیدانێکی تایبەت بە خۆی دەکات، لەگەڵ توانینی ئەگەری پەرەسەندنیدا. بۆ زانیاری ئەو هاوسەرانەی کە بەدەست بوونی تێکچوونێکەوە لە نێوکۆی هەڵسوکەوتێکدا دەناڵێنن یان ئەوانەی لەبارێکی هەمیشەیی بەیەکداکێشاندا، دەژین، هەمان شێواز بەکاردەهێنن، بەڵام بە رێگەیەکی دۆگماو شەڕانگێزییانە، یان بەلایەنی کەمەوە کەمتر دەبێتە مایەیی شەرمەندەیی بۆ یەکێکیان، بەڵام لەهەموو حاڵەتەکاندا دەبینین هاوسەنگبوونی هێزەکان زۆربەیان پشتدەبەستن بە ئەنجامدانی یاری فاکتەرە سۆزدارییەکان کە بەکاردەهێنرێن یان یارمەتیدەردەبن لەدەمامککردنی پەیوەندییەکانی دەسەڵاتدا.



**پەراوێزی وەرگێڕ:**

(*) مانۆی- Manichean or Manicheen: بیروباوەڕێکە بانگەشەی بڕواهێنان دەکات بە ململانێی نێوان روناکیی و تاریکی.

**پەراوێزەکان :**


1- KLEIN M., Envie et gratitudes et autres essais, Paris, gallimard, 1968, PP.120-136.

2- ABRAHAM K., Oeuvres completes, Paris, payot, 1922, p.225.

3- DOREY R., "La relation demprise ", in Nourelle e revue de psychanalyse", no.24,Paris.gallimard,1981

4- FREUD S., "Caractere et erotisme anal " , in Nevose , Psychose et Perversion , Paris P,U,F, 1979.

5- FERENCZI S., Oeuvres completes, psychanalyse II, tr fr, Paris, payot, 1970,pp,142-149.

6- KLEIN M., "Le deuil et ses rapports avec les etats maniaco – depressifs ", in essais de psychanalyse, Paris, Payot, 1969.

7- GRUNBERGER B., "Le narcissisme ", in Essais de psychanalyse,
Paris, Payot, 1975, pp. 50-65.

8- MILIRY N., "Iargent et les conflits conjugaux", in Dialogue, 1977, no. 58,p. 5.9-
MICHEL A., Statut professionnel de la femme et structure de couple , Paris , C.O.R.D.E.S, 1972, VI,

P. 175.
10-MILLERY N., "Largent et les conflits conjugaux", in Dialogue, 1977, No. 58, p. 5.
11- GIBEAULT A., "La Symbolique de Largent " in " 1' agent dans la cure ", No.
12, Les chahiers du centre de psychanalyse et de psychotherapie, printemps, 1986.
12- MICHEL A., "Ideologies, groupes de pression et politique en France, in "Perspectives psychiatr ", 1976, I, No. 55, pp. 6-12.
13- BOONS M.C., "La lutte des classes dans le champ psyhanalytique", in" Psychanayse et politique, Paris, Seuil, 1974, pp. 129-139.
14- LEMAIRE J-G., " Largent et le pouvoir dans le couple", in Dialogue, 1977, No. 58, pp. 26-31.
15- SINGLY F., " La lutte conjugale pour le pouvoir domestique", in Rev. Franc Social, 1974, XVII. PP. 84-100.



## بەشی یانزەهەم

# ژیانی سێکسوال
# گیروگرفتەکانیو ڕێگەکانی چارەسەرکردنی

### ئامادەکاری بۆ کاری سێکسوال:

هەریەکە لەژنو پیاو بەرێگەی جیاواز لەئامادەکاری preludes سێکسوالیدا دەژین. هەریەکەیان سیستمێکی تایبەتیو رێگەیەکی دیاریکراوی بۆ وەڵامدانەوەی هەژێنەرە دەرەکییەکان، هەیە. پێکەوەنووسان یان یەکگرتنی دوو جەستە کارێکی هەروا سادە نییەو ئەوەندەش بەس نییە تەنیا ئارەزووی جووتبوون بکەین، تا بتوانین ئارەزووەکانی خۆمانو کەسانی دی تێربکەین.

پێویستە لەجووتبووندا coit پەلەنەکرێت، چونکە پێویستە پیاو بایەخێکی زیاتر بە ئامادەکارییە سێکسوالییەکان بدات وەك لەخودی جووتبوونەکە، لێرەوە دەبێت بەر لەدەستپێکردن بە کاری جووتبوون لەدەرکەوتنی ئارەزووەکانی هاوبەشەکەی بەرامبەر دڵنیا بێتو فەرامۆشی نەکات، پیاوی کارامە ئەو پیاوەیە هیچ هۆیەك پشتگوێنەخات بۆ چێژوەرگرتن لەپێناوی گەیشتن بە ترۆپکی چێژ(ئۆرگازم).

زۆرکات پیاوان لەکاری سێکسوالدا پەلە دەکەن، چونکە کێرڤی

هەژان لای پیاو جیاوازە وەك لەكێرڤی هەژان لای ژن. هەر كە پیاو كاری تێكراو هەژانو رەپبوونی چووك روویدا، كۆئەندامی نێرینەیی بە تەواوەتی بایەخدەدات بە هێوركردنەوەی ئەو شڵەژانەی كە بەرگەگرتنی ئەستەمە. لەبەرئەوەی میكانیزمی سایكۆلۆژیی جیاواز كۆنترۆڵی ئارەزوو، دەكات، بۆیە ئارەزووی پیاو بەشێوەیەكی خێراتر لەئارەزووی ژن پەرەدەستێنێت. هەستكردنیی سێكسوال لای ژن بەشێوەیەكی هێواش گەشەدەكات (پەرەدەستێنێت)، لەبەرامبەردا كاتێكی دورودرێژی پێویستە بۆ خامۆشبوونەوە. ژن بە پێچەوانەی پیاوەوەیە، چونكە پیاو هەستكردنیی سێكسوالی بە خێرایی دەكەوێتە باری ئامادەكارییەوە.

زۆركات گەیشتن بە ئۆرگازم Orgasme لای ژن ئەستەمەو پێویستی بە كاتێكی دورودرێژتر لەپیاو، هەیە، لەبەرئەوە هەمیشە ژن لەوبارەدا كە ماوەی جووتبوون كورتە یان هاوبەشەكەی ناتوانێت درێژە بە كاری سێكسوال بدات لەوە دەترسێت لەرووی سێكسوالەوە تێرنەبێت: پیاوی باش ئەو پیاوەیە لەرێگەی ئامادەكاری باشەوە ژنەكەی سازبكاتو لەپێش جووتبووونداو بەرەو پلەیەكی بەرز لەوروژاندنی سێكسوالی بەرێت، كاتێك جووتبوونیش دەستپێدەكات بتوانێت پێشئەوەی خۆی بە ئۆرگازم بگات چەند جارێك ژنەكەی بە حاڵەتی ئۆرگازم بگەیەنێت، لەمحاڵەتەدا دوو هاوبەشەكە ئەگەر خۆیان ئارەزووی ئەوەیانكرد دەتوانن بەشێوەیەكی هاوكات بە ئۆرگازم بگەن.

پێویستە لەسەر هەموو پیاوێك لەرۆڵو بەرپرسیارێتی سەركەوتنی كرداری سێكسوالییو بە دواهاتنی هۆشیارو بەئاگا



بێت، هەروەها پێویستە لەسەر پیاو توانای كارتێكردنی بۆسەر خودی خۆی هەبێت تا چاوەڕێی ژنەكەی بكات كە ئاماژە بە ئارەزووی رەتكردنی penetration چووك بۆ ناو زێ، بدات: ئەو ژنەی كە دەتوانێت بگاتە ئەم ئاستە لەوروژانو كارتێكردنی سێكسی، ئەوا هەست بە ئارەزوویییەكی بەهێز دەكات بۆ نزیكبوونەوەو جووتبوون، ئەویش لەبەرئەوەی هەموو جەستەی ئاماژەی پێدەدەن.

گەمەبازی وا لەجەستەی ژن دەكات قابیلی وروژاندنو كارتێكردن بێتو بەو جووتبوونە رازی بێت كە بەخێرایی بەرەو ئۆرگازمی دەبات: گەمەبازییەكانی پیاو كە بەدەستەكانی لەسەر جەستەی ژن دەیانكات، دەرچەی زێ vulve بۆ چوونە ناوەوەی چووك penis ئامادەدەكاتو دەردراوەكانی كە رژێنی بارتۆلین bartholin لەناو زێدا vagin دەریدەن، چوونە ناوەوەی چووك ئاساندەكەن، هەروەها میتكەو مەمكەكان رەپدەبنو ئامادەدەبن بۆ پێشوازیكردنی ئەو هەستانەی بەدوای كرداری ئامادەكارییەكەدا دێن.

ئەو پیاوەی بێ ئامادەكردنی ژنەكەی بە پلەیەكی دیاریكراو لەوروژاندن لەگەڵیدا جووتدەبێت، تەنانەت ئەگەر لەچێژوەرگرتنیشدا لەگەڵیدا هاوبەشیی بكات ئەوا هەر دەبێتە هۆی دروستكردنی هەستێكی ناچیز لەكاتی جووتبوونەكەو سێكس ساردی fridigite لای ژنەكە دروستدەكات. چونكە ئەو رەتكردنەی بەناو زێیەكی وشكدا تێدەپەڕێت لەوانەیە كاربكاتە سەر لینجی زێی هەستیار، هەروەها لەبەرئەوەی نەگەیشتۆتە دۆخی وروژاندنی پێویست لەچەكانی زێ ئازارییان پێدەگاتو میتكە clitoris پاندەبێتەوە،

لەمبارەدا وێڕای ئەمانە، لەوانەیە ژن تووشی وازهێنانو دورکەوتنەوە لەسێکس ببێتو لەکاتی جووتبووندا هەست بە گاڵتەجاڕی بکات، بەمەش جووتبوون وەك کرداری ئیغتسابی لێدێت.

پیاو دەتوانێت لەرێگەی گەمەبازی پێشوەخت بەجەستەی ژنەکەیی و ناوچە هەستیارەکان ئاشنابێت، بەمەش لەچێژوەرگرتندا لەگەڵ شێوازی تایبەتی ژنەکەدا بگونجێتو یارمەتیشی بدات بۆ ئاشکراکردنو دۆزینەوەی هەستکردنە تایبەتییەکانی خۆی. لێرەدا، بەهۆی قسەکردنەوە پێویستە لەسەر هەردوو هاوبەشەکە، گوزارشت لەهەستەکانیان بکەن بێ هیچ خۆپارێزییەك تا بتوانن یەکەیەکی سەرکەوتوو لەخۆشەویستیی و نزیکبوونەوە بخولقێننو پاشان دەست بە دیالۆگی جەستەیی بکەن.

ئەو پیاوەی لەکاری سێکسوالیدا پەلەدەکات، بەدەست بێ توانایی لەتوانا تایبەتییەکانی خۆیەوە دەناڵێنێت، هەروەها دەشێت گوزارشت لەئارەزوویيەکی نەستی بۆ بێبەشکردنی ژنەکەی لەچێژوەرگرتن بکات. جووتبوون لەم حاڵەتەدا رێگەیەکی ئۆتۆماتیکییە بۆ دوورکەوتنەوە لەتێوەگلان لەهەموو شتێك، ئامادەکاری سێکسوال بەشێوەیەکی تەواو حەقیقەتی کەسێتی ئاشکرادەکات، لەبەر ئەم هۆیە هەندێك لەپیاوان سڵ لەم ئامادەکارییە دەکەنەوە، چونکە لایەنی شاراوەی کەسێتیان ئاشکرادەکات. دەتوانین لەکاتی جووتبووندا وا هەستبکەین تەنیاین، بەڵام ئەستەمە لەکاتی ئامادەکاری بۆ کرداری سێکسوالدا تەنیاییمان دەمامکپۆش بکەینو ئەویدی فەرامۆش بکەین، (ئەم واقیعە لەگەڵ کاری لەشفرۆشیدا prostitution دا هاوجێدەبێت، کە کەسی لەشفرۆش



تەنیا کرداری جووتبوونەکە دەکاتو بەشێوەیەکی گشتیی هەر ئامادەکارییەك بۆ کاری سێکسوال رەتدەکاتەوە تەنیا لەوکاتەدا نەبێت ئەگەر پارەی زیاتری پێبدرێت)[١].

حەقیقەتی رەفتارەکانمان لەسێکسدا دەرناکەوێت تەنیا لەرێگەی پەیوەندییە سێکسوالییەکانەوە نەبێت. ئەم رەفتارەش تەنیا دەرئەنجامی ئامادەکردنی دوورودرێژی قۆناغی بەرایی منداڵیمانە: لەقۆناغی منداڵیدا، ئەزموونە سێکسوالییەکان بە کەسێتی منداڵیمانەوە دەنوسێتو رێگە بۆ ئامادەکردنی سێکسوالی جیاکراوەمان لەگەورەییدا خۆشدەکات: بۆنموونە ژنی مازۆشیی لەرووی سێکسوالەوە ناکرێتەوە یاخود خۆی نادا بەدەستەوە، تەنیا لەگەڵ هاوبەشێکی هەژمونکارو خراپدا نەبێت، ئەو ژنەش کە پاڵنەرەکانی دایکایەتیی تێنەپەڕاندووە زیاتر چێژ لەبەخشین وەردەگرێت وەك لەوەرگرتن، ئەو پیاوەش کە مەیلی خۆماتدان voyeuriste ی هەیە ناتوانێت لەژوورێکی داخراودا کرداری سێکس بکات، بۆیە پێی خۆشە ژنەکەی زیاتر بە رووتی ببینێت لەوکاتەدا کە گەمەبازییە تایبەتییەکانی خۆی دەکات. ناکرێت ئەم هەڵسوکەوتانە بەلادان دابنرێن مادام نەگەیشتۆتە ئاستێکی تایبەتیو ئەنجامدانی پەیوەندییە سێکسوالە سروشتییەکانیش رەتناکەنەوە.

لەکاتی کرداری سێکسوالدا، هەندێك جوڵەو بارودۆخ زیاتر لەبارەکانی دیکە کارمان تێدەکات، مەیلە نەستییەکان لەناخماندا دەبزوێنێت، وەك، مەیلە هۆمۆسێکسوالییە Homosexualite شاراوەکان یا ئارەزوویيەکی پەنهان بۆ خۆروتکردنەوە Exhibition

یان مەیلی سادی یان مەیلی خۆماتدان. لەکاتی کرداری سێکسوالدا خۆمان بۆ هاوبەشەکەمان ئاشکرادەکەین کە لەواقیعدا چۆنین، سێکس حەقیقەتی خودمان ئاشکرادەکات، ئەو کەسەی سڵدەکاتەوە لەم حەقیقەتە، هەمیشە هەوڵدەدات لەئامادەکاری سێکسوال رابکات تا لەمەترسییە نەستییەکانی دوربکەوێتەوەو تواناکانی نەخاتە بەردەم شوێنگەی پرسیار.



# وەڵامدانەوەی سێکسوال لای ژن

## ١- گۆشەنیگای ژن بەرامبەر بە سێکس:

لەگەڵ گۆڕانی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و بایەخدانی راگەیاندنەکانیش بەچێژی سێکسوال، ژن هەر هۆگری بۆ خۆشەویستیی و سۆز ماوەتەوە کە رێگەی بۆ خۆشدەکەن بەوپەڕی ئاسودەیی و متمانەوە لەئامێزی خۆشەویستەکەیدا تەسلیم ببێت Abandon، ئەگەر هەڵبژاردنی (خۆشەویستی بێ ئۆرگازم و ئۆرگازم بێ خۆشەویستی) خرایە بەردەمی ژنان، ئەوا زۆربەیان خۆشەویستیان بێ ئۆرگازم لاپەسەندترە.

ف. دۆڵتۆ F.Dolto [٢] لەمبارەیەوە جەختی لەوەکردۆتەوە: (ژنان لەپیاو لێبوردەترن بەرامبەر نوشوستی یان بێبەشبوون لەئۆرگازم، بەڵام هەرگیز بەرامبەر بێبەشبوون لەخۆشەویستی لێبوردنییان نییە). ژن بە پێچەوانەی پیاوەوە، هەست بە پێویستی سەرکەوتنی پەیوەندیی سێکسوالی ناکات تا جەخت لەنارسیزمیی بکات، ژن لەجووتبووندا ساتەکانی ئەڤینداریی و لەئامێزگرتنی بەلاوە پەسەندترە کە جەستەی لەگەڵ جەستەی هاوبەشەکەیدا یەك جەستەی تەواوکەری یەکتر پێکبێنن، کە بەردەوام خۆشەویستیی و ئارەزووەکانی شەپۆل دەدەن.

ژن تەنیا لەوکاتەدا هەست بەلاوازی دەکات کە ئارەزووی نامێنێت بەرامبەر ئەو کەسەی خۆشی دەوێت و ئارەزووی دەکات، یان ئەو

دەستبەرداری دەبێت.

– کەواتە سیفەتەکانی هاوبەش (پیاو)-ی نموونەیی کامانەن کە چێژ بە ژنەکەی ببەخشێت و بیگەیەنێتە ئۆرگازم؟ زۆربەی پسپۆڕەکان لەبواری چارەسەری سێکسوالدا لەسەرئەوە کۆکن کە تەکنیك و ئارامیی و ئەزموون لەپیاودا، ژن ناگەیەننە ئۆرگازم، چونکە پیاوی باش ئەو پیاوەیە پاڵپشتێکی باش بۆ بۆچوون و ئەڤین و فەنتازیا ئیرۆسییەکانی ژنەکەی، بنوێنێت، پیاوی باش ئەو پیاوەیە وا لەژنەکەی بکات متمانەی بەهەستە جەستەییەکانی ژنەکەی هەبێت و بۆ جەختلێکردنەوە لەمێیینەتیی خۆی یارمەتییدات و ڕێگەی نەدات گومانی لەجەستەی یان لەهزرەکانی یان لەشێوەیەك لەشێوەکانی ڕەفتاری یان ڕێگەی ژیانی هەبێت، ئەو بایەخدان و مجامەلەیەی کە پیاو بۆ ژنەکەی دەیکات کەشێك لەئاسودەیی و حەوانەوە دەخوڵقێنێت، لەم نێوکۆیەدا، ژنێك لەدەفتەری بیرەوەرییەکانیدا نوسیبووی: (ئەوانە وردەکاری بچوکن لەلایەن هاوبەشەکەمەوە ڕۆژانە پێشکەشم دەکات و بەهەند وەریاندەگرم، کاتێك زەردەخەنەم بۆ دەکات، بەدەستەکانی گەمەبازیم لەگەڵدا دەکات، لەساتی چاوەڕواننەکراودا دەستەواژەی(خۆشم دەوێیت)م پێدەڵێت.. لەوکاتەدا پێویستم بەوەیە گوێم لێی بێت یان لانی کەم چاوەڕێی دەکەم گوێم لێی بێت.... ئەمە ڕێگەیەکی خۆش و شیرینە بۆ دەستکردن بەکاری ڕۆژانە، ئەو پیاوێکی خۆشەویست و ئێسك سوکە، هەروەها لەناو جێگەشدا خۆشەویست و ئێسك سوکە، من ئێستاکە هەست بە ئۆرگازم دەکەم).



## ٢– ڕۆڵی فەنتازیا لەوروژاندنی ئارەزووەکانی ژن:

کەشی ئاسودەیی و خۆشەویستیی یارمەتی بزواندنی فەنتازیای ئیرۆسی fantasme erotiique لای ژن دەدەن (فەنتازیای ئیرۆسی)یش لەجێی خۆیەوە ئارەزووەکانی ژن دەبزوێنێت، لەوانەیە لەم بوارەدا خەیاڵ ڕۆڵێکی باشتر لەڕۆڵی دەست یان لێو یان ئەندامی زاوزێ، ببینێت، شکستهێنانی خەیاڵی ئەفرێنەر لەکاتی کرداری سێکسوالدا، لەوانەیە بە نێگەتیڤی کاربکاتە سەر کردارەکە زیاتر لەکاریگەری ئەو تەکنیکەی کە دوو هاوبەشەکە پەیڕەویدەکەن. لەم نێوکۆیەدا تێبینی ئەوە دەکرێت کە دەستتێکەڵاوکردنی ئاڵوگۆڕکراو لەنێوان دوو هاوبەشەکەدا یارمەتیدەرە بۆ دەربڕینی ئازادو پێداویستییە فیزیکیی و فەنتازییەکانیش ئاشکرادەکات و ئەویش بە ئامانجی تێرکردنیان بەشێوەیەکی گونجاوتر لەچوارچێوەی دیالۆگێکی ئاشکراو ڕاشکاوانەدا.

(ناکرێت ئارەزوو دروستببێت ئەگەر فەنتازیا کارنەکات، چونکە لەوانەیە خەیاڵی ئیرۆسی ئەڵقەیەکی گەیاندن لەنێوان خۆشەویستیی ڕۆحیی و خۆشەویستیی جەستەییدا دروستبکات، هەروەها دەشێت نەك تەنیا مانا بە گەمەبازییە سێکسوالییەکان، بدات، بەڵکو لەوانەیە مانا بەو نیشانانەش بدات کە دەبنە هۆی وەستاندنی inhibent کردارە سێکسوالییەکە)[٣].

– کەواتە ڕۆڵی فەنتازیا چییە؟

١– هێزی چێژی سێکسوالیی، بەهێز دەکات، ئارەزووە نەستییەکانمان دابیندەکات، گشت پاڵنەرە ئەندەکییەکانمان pulsions partielles لەپاڵنەری خۆماتدان و خۆڕوتکردنەوەو فیتشیزمیی fetichisme و سادیی و مازۆشیی و هۆمۆسێکسوالی، تێردەکات، کە ئەمانە ناکرێت لەواقیعدا بەدیبێن.

٢– جێگەی واقیع دەگرێتەوەو ڕۆڵێکی قەرەبوویی compensation دەنوێنێت، چونکە یارمەتی تێرکردنی ئەو ئارەزووانە دەدات کە ناکرێت دانیان پێدابنرێن، یان لەواقیعدا بەدیبهێنرێن.

٣– پێداویستیمان بۆ ئەفراندن تێردەکات و یارمەتی کۆنترۆڵکردنی دڵەڕاوکێ و قەرەبووی ئەو کەموکورتی و شکستییەمان دەکات کە لەچوارچێوەی ژیانی واقیعیماندا ڕووبەڕووی دەبینەوە.

– جۆرەکانی ئەو فەنتازیایانە کامانەن کە زۆرکات ژن پەنایان بۆ دەبات؟

زۆرکات ژن پەنا بۆ ئەم فەنتازیایانە دەبات: خەیاڵ لەپیاوێک دەکاتەوە گەمەبازی لەگەڵ دەکات یان بەسۆزەوە گەمەبازی لەگەڵ پیاوێکدا، دەکات. بەپەرۆشییەوە پیاوێک لەئامێزیدەگرێت و دیمەنێکی ڕۆمانسی دەخاتە خەیاڵییەوە: ئەم ناوەڕۆکە ڕۆمانسییە لەکەشێکی ئاسودەیی و چێژ بەخشدا یارمەتی ژن دەدات بۆ تەسلیمبوون بە هاوبەشەکەی.



هەرچی فەنتازیاکانی دیکەشن دەکرێت بۆ ئاوێتەی نارسیزمیی و خۆماتدان یان خۆڕوتکردنەوە بگەڕێنرێنەوەو ئاماژە بە هەندێکیان دەدەین، وەك: هەوڵدان بۆتەفرەدان و کێشکردنی ئارەزووی پیاو یان بەشێوەیەکی کاوەخۆییانە خۆڕوتکردنەوە لەبەردەمیدا، یان ببێتە بابەتی ئارەزووی کۆمەڵێکی زۆر لەپیاوان. پیاوێك لەئامێزبگرێت کە بەپەرۆشییەوە بیوروژێنێت. ژنێکی خراپ یان لەشفرۆش بێت. خۆی وادەردەخات هاوبەشەکەی ڕەتدەکاتەوەو بەرهەڵستی دەکات پێشئەوەی تەسلیمی ئارەزووەکەی ببێت. پیاوێك ئیغتسابی بکات، هاوبەشی لەکردارێکی سێکسوالی بەکۆمەڵدا بکات، لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لەپیاوان لەیەککاتدا سێکس بکات. چووکێکی گەورە بیبڕێت (ڕەت بێت بە ناویدا)، گەمەبازی لەگەڵ ژنێکدا بگۆڕێتەوە (پێکەوە گەمەبازی بکەن). هەندێك لەژنان هەوڵدەدەن ئەم فەنتازیایانە بچەپێنن، یان سانسۆڕی بکەن لەکاتی کرداری سێکسوالکردن لەگەڵ هاوسەرەکانیاندا، چونکە وایدادەنێن ئەمانە فەنتازیای لادەرن و لەدڵسۆزییانەوە بەرامبەر هاوسەرەکانیان نەهاتووە یان ئەمانە ڕێگەدەگرن لەتوانەوە لەگەڵ هاوسەرەکانیاندا. بەڵام درك بەوەناکەن ئەم فەنتازیایانە زۆر یارمەتی بزواندن و بوژاندنەوەی چێژی سێکسوالی لەلایان دەدات.

لێرەدا پێویستە لەوە بەئاگابین کە خۆشەویستی و ڕێزگرتنی زیاد لەپێویستی ژن بەرامبەر هاوسەرەکەی لەوانەیە ببنە بەربەستێك لەبەرامبەر بەکارهێنانی شەڕانگێزی پێویست بەرامبەری، هەروەها لەوانەیە ببنە ڕێگر لەبەردەم بەکارهێنانی ئاوێتەلادەر perversـەکانی دەچنە ڕیزی فەنتازیا ئیرۆسییەکانەوە، چەپاندنی ئەم

فەنتازیایانە لەکاتی کرداری سێکسوالییدا ژیانی سێکسوالی دوو هاوبەشەکە لاوازدەکەن و لەچوارچێوەی رۆتینی خۆشەویستیی و ڕێزی ئالۆگۆڕکراودا خامۆشدەبێت (دەکوژێتەوە).

## ئۆرگازم لەژندا:

دەتوانرێت ئۆرگازم لەژندا (بەپێی دانپیادانانی هەندێك لەژن) بە هەستکردن بەگێژبوون و تەسلیمبوون و لەدەستدانی خود، دیاریبکرێت.

ژن لەکاتی ئۆرگازمدا هەست بەشلەژان و گەرماییەك دەکات کە هەموو جەستەی دەگرێتەوە لەگەڵ ئارەزووکردنی زیاتری بەتاڵکردنەوەی هێمنانە. ئۆرگازم وەك پریشکی ئاگرێك وایە پێش بڵێسەدانی هەموو جەستە دەکەوێت و لەساتێکی تایبەتدا دەگاتە ترۆپك و کتوپڕ بەدوایدا هەستکردن بەخاوبوونەوەو بەتاڵبوونەوە، دێت. زۆرکات ئەم هەستکردنە هاوکاتە لەگەڵ چێژو هەستکردن بە تێربوون و کەمال.

ئۆرگازمی سێکسوالی لەژندا وەك بەتاڵکردنەوەی دووالیزمی وایە لەسەر هەردوو ئاستی سایکۆلۆژیی و جەستەیی کە لەئەنجامی هەڵچوونێکی ئێرۆسی توندەوە ڕوودەدات.

ئۆرگازمی سێکسوالی یارمەتی خۆبەتاڵکردنەوەی ئەندەکیی و شیبوونەوەی ئەو دڵەڕاوکێیە دەدات کە پەیوەستە بە هەڵوێستە پاسۆلۆژییەکانەوە: زۆربەی ژنان دانبەوەدا دەنێن کە لەکاتی ئۆرگازمدا مەترسییەکانیان بەتاڵکردۆتەوە.



ئەم سەلماندنانە ف.گرۆیر F. gruyer جەختیلێکردونەتەوە، کاتێك دەڵێت: (تەنیا لەچوارچێوەی گۆڕانێکی خۆشەویستیدا نەبێت ئەم جوڵەیە لەتەسلیمبوون و توانەوە ڕوونادات، کە ڕێگە بۆ ژن خۆشدەکات ناسنامەی خۆی لەدەستبدات و لەویدیکەدا ونببێت. ئەم هەستە بە لەدەستچوونی کۆتایی و وروژاندنی ئێرۆسی لەچوارچێوەی حاڵەتێك لەگەڕانەوە regressif ڕوودەدات کە یارمەتی دووبارەبوونەوەو ژیاندنەوەی شۆکە سۆزداریی و منداڵییەکان دەدەن، پاشان بزواندن و دواتریش شیبوونەوەیان)[٤].

لەم نێوکۆیەدا دانیشتنە کلینکییەکان جەخت لەوە دەکەنەوە، زۆربەی ژنان، ئەوانەی نەگەیشتوونەتە ئۆرگازم، تێبینی دەکرێن بەخێرایی تووڕەدەبن و لەڕووی هەڵچوونییەوە نائارامن و لەناوچەی حەوزیاندا هەست بە ناڕەحەتی دەکەن.

– ئەو تاقیکردنەوانەی کینسی Kinsey [٥] لەسەر ژمارەیەك لەژنان ئەنجامیداون جەخت لەوە دەکەنەوە کە ژن دەتوانێت بگاتە چەند ئۆرگازمێك بە پێچەوانەی پیاوەوە کە لەماوەیەکی زەمەنی کورتدا ناتوانێت بەیەك ئۆرگازم زیاتر بگات.

ژن دەتوانێت لەرێگەی ئەنجامدانی ماستەربەیشن– Masturbation [٦] (دەستلێدان لەئەندامی زاوزێ) وە لەماوەی چەند دەقیقەیەك کەمتر بە شەش ئۆرگازمی تەواوبگات. هەرچەندە ئەم ئۆرگازمانە بەهێزبن، ژن ئەوەندە زیاتر دەتوانێت بە ئۆرگازمی زیاتربگات. بە گریمانەیی، دەتوانرێت ژن لەسەر ئاستی سێکسوالی بە چاوبرسی یان بەرچاوتەنگ دابنرێن، هەرچەندە ئاستی ئەو ئۆرگازمە سێکسوالییەی کە پێیدەگەن بەرزیش بێت، هەر تێرنابن.

شێرفی Sherfey [٦] پستبەستن بە تاقیکردنەوەکانی ماستەرس masters وجۆنسن jonhson لەمبوارەدا جەخت لەوەدەکات، ژن دەتوانێت بە بیست ئۆرگازم زیاتر بگات لەکاتی بەکارهێنانی مەساجی کارەباییدا vibromasseur و لەو گەیشتن بەو ئۆرگازمانەش ناوەستێت تەنیا لەوکاتەدا نەبێت کە هەموو جەستەی شەکەت دەبێت، ژن دەتوانێت هەفتەی دووجار ئەم جۆرە کردارانە ئەنجام بدات.

لەم تاقیکردنەوانەوە ئەوە هەڵدەهێنجرێت کە زۆربەی ژنان لەرێگەی ئەنجامدانی کاری سێکسوال لەگەڵ هاوسەرەکانیاندا ناتوانن بە تەواوەتی تێربن، بەڵام ژن بە پێچەوانەی پیاوەوە، پەنا بۆ سێکس نابات تەنیا بۆ بەتاڵکردنەوەی گرژبوونێکی بایۆلۆژی ، بەڵکو هەوڵدەدات لەرێگەی سێکسەوە گوزارشت لەهەموو مێیەتیی خۆی بکات، ئامانجی سێکس لای ژن تێرکردنی فرمانێکی ئیرۆسی نییە، بەڵکو هەوڵدەدات لەسەر هەموو ئاستەکان پەیوەندی بکات، لەرێگەی سێکسەوە بە شوێن فرمانە نائیرۆسییەکاندا دەگەڕێت تا جەخت لەخودو هێزی خۆی بکات.

## ٤- چێژی میتکەو چێژی زێ:

" ئایا زانینی چێژی سێکسوالیی لای ژن لەسەر ئاستی میتکە clitoris یان لەسەر ئاستی زێ vagin دیاریدەکرێت؟" ئەمە ئەو پرسیارەیە کە هەمیشە دەکرێت.

دوو چەمکی دژ بەیەك هەیە بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە: چەمکی



فرویدی بایەخی زیاتر دەدات بەوەی کە چالاکی ئیرۆسی کچی بچکۆلەو هەرزەکار پشت بە میتکە دەبەستێت و دواتر لەگەڵ نەرزەبووندا بەرەو ناوزێ دەگۆڕێت. لێرەوە هەر پشت بەستنێك یان بایەخدانێك بە چێژی میتکەیی لەکچی نەرزەبوودا ئاماژە بە چەسپاندنی نیورۆسسی (دەماری) nerrotique دەدات، لەسەر قۆناغی منداڵی.

چەمکی دووەم دژی ئەم رایە دەوەستێتەوە: کینسی Kinsey وایداناوە تەنیا ئۆرگازمی میتکەیی هەیەو بوونی ئۆرگازمی زێی هیچ بناغەیەکی نییە، پاشان کارەکانی جۆنسن jonhson و ماستەرس masters بەدوایدا هاتن و جەختیان لەم رایە کردو وایاندانا کە وروژێنەرەکانی میتکە بناغەی گەیشتنن بە ئۆرگازم لەژنداو زێ تەنیا لەسەر ئاستی سێ بەشی یەکەمی دەروازەی زێ دەوروژێت. لەکۆتاییدا فیشەر Fischer [٧] لەرێگەی ئەو چاوپێکەوتنانەوە کە لەگەڵ ٣٠٠ ژندا ئەنجامیدا لە ٦٥٪یان وروژاندنی میتکەیان بەلاوە پەسەندتر بوو.

– هەندێك لەزانایان هەوڵیانداوە رووخسارە سایکۆلۆژییەکانی ژن دیاریبکەن کە لەکاتی ئۆرگازمی میتکەیی و لەکاتی ئۆرگازمی زێیدا هەستی پێدەکات. گەیشتنە ئەو دەرئەنجامەی ئەو ژنەی زیاتر چێژ لەوروژاندنە میتکەییەکان وەردەگرێت نارسیزمیترو زیاتر شەڕانگێزییەو حەزی لەچێژ بینینی خۆییە: لەقۆناغی منداڵیدا ئارەزوویەکی بەهێز بۆ دەستکەوتنی چووك لای ئەم ژنە گەشەیکردووەو هەوڵدەدات بە هەڵوێستێکی فریودەرو هەژمونکەر ئەم ئارەزووەی بشارێتەوە. هاوبەشەکەی بێبەشدەکات

لەدەستکەوتنی چێژی خۆی‌و بە ئەستەمیش تەسلیمی گەمەبازییەکانی دەبێت، بەئاگایی خۆی لەدەستنادات تەنیا لەو کاتەدا نەبێت کە خۆی بە تەنیا دەبێت، شێوازەکانی وروژاندنی ئیرۆسی لای ئەم ژنە دەکەونە دەرەوەی زێ، واتە لەسەر ئاستی میتکەو مەمك‌و قاچەکانی دەبێت.

لەبەرامبەردا ئەو ژنەی هەست بەچێژی زێ دەکات دەتوانێت بە ئامادەبوونی ئەویدی تەسلیم ببێت، زیاتر منداڵانەیەو هۆگری پیاوەو بە دەگمەن نەبێت پەنا ناباتە بەر ماستەربەیشن– Masturbation، هەروەها درك بەوەدەکات کە چێژی سێکسوالی بەدینایەت، تەنیا لەسەر ئاستی پەیوەندییە کەسێتییەکان نەبێت.

بەشێوەیەکی گشتی ئەوەی تێبینی دەکرێت، ژن وێڕای ئەوەی هەندێك وروژاندنی تایبەتی لەهەندێکی دیکە بەلاوە پەسەندترە، بەڵام هەست بە ئارەزوویەکی بەهێزدەکات بۆ رەتبوونی penetration چوك بەناو زێدا، چونکە رەتبوون پێویستی بۆ خۆشەویستی لای تێردەکات‌و بۆشایی فوتێکراوی زێ لەکاتی وروژاندنی سێکسوالیدا پڕدەکاتەوە. ئەو ژنانەی بەهەڵە وادەزانن ناتوانن بگەنە ترۆپکی چێژوەرگرتن، هەست بە چێژێکی بێشومار دەکەن بەرامبەر هەر رەتبوونێك کە بۆ پڕکردنەوەی زێ پێویستییانە، هەروەها هەست بە گرژبوونێکی ناوەکی چێژبەخش، دەکەن.

– ژن هەست بە ئۆرگازمێکی بەهێزدەکات ئەگەر وروژێنەری ئیرۆسی لەچەند ناوچەیەکی جەستەییەوە وەرگرت، ژن دەتوانێت چێژ لەوروژاندنی ناوچەیەکی تایبەت لەجەستەی، وەرگرێت، بەڵام ماوەو توندیی‌و جۆری ئۆرگازمەکەی سنووردارەدەبن‌و دەترسێت



ئازارێکی لەو ناوچە تایبەتییەدا بۆ دروستبکات: بۆنموونە وروژاندنی میتکە بەدەگمەن نەبێت، ناتوانێت جگە لەهەندێك هەستکردنی ئیرۆسی، هەستی دیکە بەدیبێنێت کە ژن ئەو هەستکردنە ئیرۆسییە لەگەڵ ئۆرگازمی راستەقینەدا تێکەڵدەکات، ئەم ئۆرگازمە میتکەییە ناتوانێت ببێتە هۆی خاوبوونەوەو خامۆشبوون لای ژن، بەڵکو بەپێچەوانەوە، لەوانەیە ئارەزوویەکی بەهێزی بۆ دروستبکات بۆ تێرکردنی هەستکردنە سێکسوالییەکانی دیکەو لەگەڵ ئەوەشدا لەرووی سێکسوال‌و سایکۆلۆژییەوە پێداویستییەکانی پڕ نەکرابنەوە.

لەکاتێکیشدا ژنان درك بەوەدەکەن کە میتکە ئەو پریشکە ئاگرە پەسەندکراوەیە پێش رەتبوونی چوك بۆناو زێ شەهوەتی سێکسوالییان دەوروژێنێت، بەڵام زێ لای زۆربەیان بە ناوەندی هەستکردنی ئیرۆسی پەسەندکراو دەمێنێتەوە.

## پشێوییە سێکسوالییەکان لای ژن:

بەشێوەیەکی گشتی ژن رووبەڕووی پێنج پشێوی سێکسوالی دەبێتەوە:

١–سێکس ساردی Frigidite
٢–کەمبوونەوەی تەڕی زێ Absence de lubrification
٣–نەگەیشتن بە ئۆرگازم Anorgasmie
٤–کرژبوونی زێ Vaginisme
٥–ئازاری جووتبوون Dyspareunie .

**١- سێکس ساردی:** ژنی سێکس سارد frigide هەست بە هیچ ئارەزووییەکی سێکسوالی ناکاتو بە گەمەبازییەکان لەسەر ئاستی میتکە یان مەمکەکان یان زێ کاریگەر نابێت، لەسەر ئاستی سایکۆلۆژیش سێکس ساردی بە ئامادەنەبوونی بیرۆکەو فەنتازیا ئیرۆسییەکان خۆیدەنوێنێتو بەشێوەیەکی گشتیی ئەم جۆرە ژنانە لەکاتی کرداری سێکسوالدا، نێگەتیڤن.

**٢-کەمبوونەوەی تەڕی زێ:** نەبوونی وروژاندن لای ژن دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی تەڕایی زێ absence de lubrification هەروەها تێبینی سوورنەبوونەوەو پڕنەبوونی خوێن لەئەندامە دەرەکییەکانی زاوزێدا دەکرێن. لەکارکەوتنی ئەم قۆناغە لەژندا روودانی دەگمەنەو تەنیا لەو بارانەدا تێبینی دەکرێت کە ئیسترۆجین کەمە وەك ژنانی بەتەمەن.

**٣-نەگەیشتن بە ئۆرگازم:** لەحاڵەتی پشێوی لەئۆرگازمدا واتە نەگەیشتن بە ئۆرگازم Anorgasmie لەوەڵامدانەوەی سێکسوالیدا قۆناغی ئۆرگازم دەوەستێت inhibition، ئەو ژنانەی بەدەست ئەم حاڵەتەوە دەناڵێنن، لەوانەیە بەشێوەیەکی سروشتی بوروژێنرێنو بگەنە ئاستێکی بەرز لەوروژاندنی سێکسوالی ویڕای مانەوەی ئارەزوو سێکسوالییەکانیان بە بەهێزی.

دەتوانرێت بە دووجۆر لەم پشێوییە، جیابکرێتەوە:

ا- نەگەیشتن بە ئۆرگازمی سەرەتایی Anorgasmie primaire کە ژن ناتوانێت بەهیچ کام لەجۆرەکانی ئۆرگازم بگات.

ب- نەگەیشتن بە ئۆرگازمی دووەمیی Anorgasmie secondaire لانی کەم ژن یەکجار بە ئۆرگازم دەگات، ئەویش بەپێی



ئەو نموونانەی لەوروژاندنی سێکسوالیدا پەیڕەوی دەکات.

هەروەها دەکرێت پۆلێنی ئەم پشێوییانە بەمشێوەیە بکرێت:

-نەگەیشتن بە ئۆرگازمی تەواو(لەسەر ئاستی میتکە یان مەمکەکان یان زێ)

-گەیشتن بە ئۆرگازم تەنیا لەرێگەی بەکارهێنانی مەساجی کارەبایی Vibromasseur ییەوە.

-گەیشتن بە ئۆرگازم تەنیا لەرێگەی ئەنجامدانی ماستەربەیشن- Masturbation.

**٤-کرژبوونی زێ** Vaginisme: ئەو حاڵەتەیە، چووك بەناو زێدا بە ئەستەمی رەتدەبێت یان چووك لەکاتی هەوڵدانیدا بۆ رەتبوون بەهۆی کرژبوونی ماسولکە خۆنەویستەکانی دەوروپشتی سێگۆشەی دەرەوەی زێ-وە،زۆر بە ئەستەم رەتدەبێت، کرژبوونی زێ ئاوێتەی کردارێکی سایکۆلۆژی- فسیۆلۆژییە (واتە هەردوو هۆکاری سایکۆلۆژیی و فسیۆلۆژی بەشدارن لەرودانیدا-وەرگێڕ).

**٥-ئازاری جووتبوون:** ئەو ژنەی بە دەست ئازاری جووتبوونەوە dyspareunie دەناڵێنێت، لەکاتی جووتبووندا هەست بە ئازارێك لەناو زێدا دەکات. لای ژن پەیوەندییەك لەنێوان ئازاری جووتبوونو نەخۆشییە ئۆرگانییەکاندا هەیە، بۆنموونە: هەوکردنی زێو هەوکردنی حەوزو هەوکردنی ملی منداڵدان، ویڕای بوونی برینداریی و گمۆڵ (وەرەم) لەناو زێدا، هەروەها پەیوەندییەك لەنێوان ئازاری جووتبوونو گیروگرفتە سایکۆلۆژییەکاندا، هەیە. ئەو ژنەی تووشی ئازاری جووتبوون دەبێت ناتوانێت شوێنی ئازارەکە دیاریبکات، چونکە ئازارەکە بڵاودەبێتەوەو ئاڵۆزە.

# وەڵامدانەوەی سێکسوال لای پیاو

وەڵامدانەوەی سێکسوال لەپیاودا لەدوو قۆناغی جیا پێکدێت. قۆناغی یەکەم سووربوونەوەیەکی لوولەیی لەچووکدا روودەدات (واتە چوونی خوێن بۆ چووک) کە دەبێتەهۆی رەپبوون Erection، هەرچی قۆناغی دووەمیشە بریتییە لەئۆرگازم‌و زنجیرەیەك لەگرژبوونی ئۆرگازمی ماسولکە خۆنەویستەکانی ئەندامی زاوزێ لەخۆدەگرێت.

**١-رەپبوونی چووك لەپیاودا:**

بە چوونی خوێن بۆ ناو لوولە خوێنییەکانی چووك penis رەپبوون Erection ی چووك لەپیاودا روودەدات، لوولەکانی خوێن فراوان دەبن‌و دەکشێن‌و پاشان خوێنهێنەرەکان دادەخرێن‌و خوێن لەژوورە تایبەتەکانی چووکدا پەنگدەخواتەوەو بەوە رەپدەبێت، بەڵام لەدوای گەیشتن بە ئۆرگازم‌و فڕێدانی ejaculation تۆو، خوێنبەرو خوێنهێنەرەکان کارەکانیان پێچەوانە دەکەنەوەو ئەمەش دەبێتە هۆی رۆیشتنی خوێن بۆ دەرەوەی چووك‌و بەمە قەبارەکەی لەدوای تەواوبوونی کاری سێکسوال، بۆ قەبارەی سروشتی خۆی دەگەڕێتەوە(واتە نەرم دەبێتەوە).

رەپبوون بە وروژاندنی ناوەندی رەپبوون دەستپێدەکات کە دەکەوێتە بەشی خوارەوەی دڕکەمۆخ، ئەم وروژاندنە لەدەماخ‌و



چووکەوە دەگەنە ئەم ناوەندە: ئەگەر پیاو خەیاڵی لەسێکس یان دیمەنێکی وروژێنەر کردەوە ئەم دیمەنانە لەدەماخەوە دەگوێزرێنەوە بۆ ناوەندی رەپبوون لەدڕکە مۆخدا، ئاماژەیەك بۆ چووك دەنێرن‌و رەپبوون دەستپێدەکات. لەبەرامبەردا ئەگەر پیاو دەستی بۆ چووکی برد یان بەدەستی یاری پێکرد، ئەم هەستانە بۆ ناوەندی رەپبوون دەگوێزرێنەوەو لەدوای وەڵامدانەوە، فرمان بە چووك دەدات‌و رەپبوون روودەدات.

ئەگەر چووك رەپنەبوو بێت ناتوانێت بە ناو زێدا رەتببێت، لەکاتی روونەدانی رەپبووندا جووتبوون ئەستەمە، ئەو فاکتەرانەش زۆرن کە کاردەکەنە سەر رەپبوون، وەك تەندروستی گشتیی‌و بەپێتی هۆرمۆنەکانی نێرینە لەخوێنداو تەمەن‌و پلەی وروژاندن‌و باری سایکۆلۆژیی پیاو.

هەندێك بیرۆکەو خەیاڵی ئیرۆسیش لای پیاو دەبنە هۆی رەپبوون، هەروەها بینینی کچێکی نیمچە رووت یان ماچکردنی کچێکی دیاریکراو یان دەستلێدانی، دەبێتە هۆی رەپبوون، هەروەها دەشێت رەپبوون لەکاتی تاقیکردنەوەکاندا یان خوێندنەوە یان ئەنجامدانی وەرزشێکی تایبەتدا یان هەڵمژینی عەترێکی دیاریکراو رووبدات.

لای زۆربەی پیاوان رەپبوونی بەیانیان روودەدات، لەوانەشە هۆکارەکەی پڕبوونی میزەڵدان بێت بەمیز یان لێخشاندنی چووك بێت لەجلوبەرگ یان نوێن‌و پێخەف یان دەشێت بەهۆی بینینی هەندێك خەونی سێکسیی‌و وروژێنەرەوە بێت.

**٢–ئۆرگازم لەپیاودا:**

ئۆرگازم لەپیاودا دوو قۆناغ لەخۆدەگرێت: قۆناغی یەکەم Emission بریتییە لەدرککردن بە ڕژاندنی تۆو (هاویشتنی تۆو)، بە دواییدا قۆناغی دووەم دێت کە بریتییە لەهاویشتن بۆ دەرەوە ejaculation، ئەم قۆناغە ٨٪ی چرکەیەك دەخایەنێت و گرژبوونی هێڵدارە ماسولکەکان لەبنکی چووکدا لە خۆدەگرێت.

## پشێوییە سێکسوالییەکان لەپیاودا:

لەپیاودا سێ پشێوی سێکسوالی هەیە: ١– پەککەوتنی سێکسوال impuissance ٢– خێرا ڕژاندن ejaculation premature ٣– دواکەوتنی ڕژاندن(هاویشتن) ejaculation retardee.

**١–پەککەوتنی سێکسوال:** دەتوانرێت وەسفی پەککەوتنی سێکسوال impuissance بە نەبوونی بەردەوامی لەرەپبوونی چووك، وەسفبکرێت یان نەبوونی بەردەوامی ئەم ڕەپبوونە بەشێوەیەکی پێویست بۆ ئەنجامدانی جووتبوون تا گەیشتن بە ئۆرگازم.

لەوانەیە پەککەوتنی سێکسوال(سێکسی) بەهۆی هەندێك نەخۆشی ئەندامییەوە لەپیاودا رووبدات وەك: تووشبوونی ژێرلانکەرژێن یا ژێرمێشکەرژێن، گونەکان بە نەخۆشی، نەخۆشی شەکرە، کەمی دەردانی تستوسترون، هەروەها لەوانەیە بەهۆی



هەندێك نەخۆشی سایکۆلۆژیی بە تایبەتی خەمۆکی–یەوە، رووبدات.

هەرچی جۆرەکانی پەککەوتنی سێکسواله ئەمانەن:

ا. لەدەستدانی یان ئامادەنەبوونی ئارەزووی سێکسوالی و لەمیشەوە لەدەستدانی رەپبوون.

ب. لەگەڵ ئەوەشدا کە ئارەزووی سێکس هەیە یان هەندێجار ڕژاندن(هاویشتن)یش ڕوودەدات، بەلام شکستهێنان لەرەپبووندا ڕوودەدات.

ج. رەپبوونی لاواز، کە پێش رەتبوونی چووك بۆ ناو زێ خامۆشدەبێتەوە.

د. رەپبوون و رەتبونی سروشتی بە دواییدا شکستهاتن لەڕژاندندا (هاویشتندا)، هەروەها شکستهاتن لەگەیشتن یان بەدیهێنانی ئۆرگازم.

–ماستەرس Masters و جۆنسن Jonhson [8] پەککەوتنی سێکسوالییان کردووە بە دوو جۆرەوە:

ا. پەککەوتنی سێکسوالیی یەکەمی ilmpuissance primairi ئەو پیاوەی شکستدەهێنێت لەرەپبوونی چووکی لەهەموو هەوڵێکیدا بۆ جووتبوون، وادادەنرێت کە تووشی پەککەوتنی سێکسوالیی یەکەمی بووە.

ب. پەککەوتنی سێکسوالیی دووەمی impuissance secondaire ئەو پیاوەی لەهەوڵدانیدا بۆ جووتبوونێکی سێکسی یان زیاتر سەرکەوتن بەدەستدەهێنێت، وادادەنرێت تووشی پەککەوتنی سێکسوالیی دووەمی(لاوەکی) بووە. ماستەرس Masters وایداناوە ئەو پیاوەی تووشی پەککەوتنی سێکسوالیی

دووەمی (لاوەکی) بووە لە ٢٠٪ی هەوڵدانەکانی بۆ سەرکەوتن لەجووتبووندا، شکستدەهێنێت.

**٢- خێرا رژاندن(هاویشتن):**

تووشبوونی خێرارژاندن peremeturee ejaculation لەکۆنترۆڵکردنی خۆویستانەی ئۆرگازمدا شکستدەهێنێت، لەئەنجامی ئەمەشدا رژاندن بەخێرایی روودەدات، رەپبوون لەمبارەدا بەهێز یان لاواز دەبێت، بەڵام لەپێش رەتبوونی چووك بەناو زێدا، یان راستەوخۆ لەدوای ئەوە خاودەبێتەوە، لەئەنجامی ئەمەشدا هاوسەرەکەی لەگەیشتن بە ئۆرگازم، شکستدەهێنێت.

ماستەرس Mastersو جۆنسن Jonhson ئەم حاڵەتەیان بەمشێوەیە دیاریکردووە: (ئەو کەسەی تووشی خێرا رژاندن بووە، لە ٥٪ی حاڵەتەکاندا پێش ژنەکەی دەگاتە ئۆرگازم). هەروەها ج. ئەبراهام G.Abraham، پیاوی تووشبووی لەحاڵەتی خێرا رژاندندا بەوە پێناسەکردووە کە ئەو کەسەیە لە دە جوڵە کەمتری چووك لەناو زێدا دەگاتە حاڵەتی ئۆرگازم. دواجار دەتوانرێت بوترێت کەسی تووشبوو بە خێرا رژاندن یان هاویشتنی خێرا ئەو کەسەیە ماوەی کەمتر لە ٣٠ چرکە لەرەتبوونی چووك بەناو زێدا دەگاتە حاڵەتی ئۆرگازم.

**٣-دواکەوتنی رژاندن:**

دواکەوتنی رژاندن (هاویشتن) retar dee ejaculation، ئەو کەسەی توشی درەنگ رژاندن (هاویشتن) یان شکستهاتن لەرژاندندا



بوو ئەوا بەدەست کۆنترۆڵی خۆویستانەی زیاد لەپێویستەوە، دەناڵێت. توشبوو لەوەلامدانەوەی خۆنەویستانەی رژاندا دووچاری ئەستەمی دەبێت، هەرچەندە پێویستییە وروژێنەرە سێکسوالییەکانیشی وەرگرتبێت (واتە کاری تێکردبێت) تووشبوو هەر هەست بە درەنگ رژاندنو چێژو وروژاندنی سێکسوالی دەکات، هەروەها چەند جارێك رەتبوون روودەدات، بەلام لەوەلامدانەوەی خۆنەویستانەی کرداری رژاندا دووچاری ئەستەمی دەبێت.

ئەو پیاوانەی بەدەست دواکەوتنی رژاندنەوە دەناڵێنن، هەرچەندە بە ئامادەبوونی هاوسەرەکانیان دەگەنە حاڵەتی ئۆرگازم، بەلام تەنیا لەوکاتانەدا کە لەدەرەوەی زێ سێکس دەکەن ئەم حالەتە روودەداتو ناتوانن لەناو زێدا کرداری رژاندنی تۆو(تۆو رشتن) بکەن.

ئەو پیاوەی تووشی دواکەوتنی رژاندن بووە، دەتوانێت لەکاتی جووتبووندا بۆماوەی سەعاتێك چووکی لەباری رەپیدا بهێڵێتەوە، بەلام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا زۆربەی ژنان گلەیی و گازندە لەدەست جووتبوونی دورودرێژ دەکەن، ئەو جووتبوونەیان بەلاوە پەسەندترە کە بە رژاندن کۆتایی دێت، وەك لەو جوتبوونە درێژخایەنانەی لەگەڵ پیاوێکی تووشبوو بە دواکەوتنی رژاندنداو چەند جارێك ئۆرگازمی دووبارە بووەیان بۆ دێنێتەدی، زیاتر ئەو جووتبوونەیان بەلاوە پەسەندە کە بە رژاندن کۆتایی دێت وەك لەو جووتبوونەی بێ هیچ هەڵدانێك (رشتنی تۆو) تەواودەبێت.

# هۆکارە سایکۆلۆژییەکانی پشێویی سێکسوال

## ١- روانگەی شیکاری سایکۆلۆژی:

زۆربەی لێکۆڵینەوەکانی شیکاری سایکۆلۆژی جەخت لەوە دەکەنەوە بەربەستە سێکسوالییە هەنووکەییەکان تەنیا گوزارشتێکی هێمایین بۆ گیروگرفتە ترۆماتیزم[ب]-ییەکانی منداڵی، ئەگەر ویستمان چارەسەری ئەو نیشانانە بکەین کە لەئێستادا لەسەر نەخۆش دەردەکەون، ئەوا دەبێت چارەسەری ئەو هۆکارە شاراوانە بکەین لەمنداڵیدا، هەروەها ئەو ترس و هەڕەشانەی منداڵ لەئەنجامی پراکتیزەکردنی هەندێك کرداری سێکسوالی شاز لەماوەی منداڵیدا رووبەڕوویان دەبێتەوە، کاتێك دەبێتە کەسێکی نەرزەبوو سەرلەنوێ ئەو ترس و هەڕەشانە لەرێگەی رووخسارەکانی ژیانی سێکسوالییەوە، دەبوژێنەوە.

ئەم ترسانە بەو ئاقارەدا دەڕۆن کە بەروونی لەچەند نەخۆشییەکی تایبەتدا دەربکەونەوە، ئەویش لەرێگەی هەندێك کاری رێککردن و چاکسازیی نەستییەوە کەتاك خۆی درکییان پێناکات: ئەو ژنەی تووشی گرژبوونی زێ بووە خەیاڵدەکاتەوە لەپێکەوەنووسانی چووك و تێکشکانی چووك، هەروەها خەیاڵ لەپەیوەندی سێکسوالی دەکاتەوە هەروەك بڵێی کردارێکی شکان یان تێپەڕینێکی خوێناوییەو هەست بە دڵەڕاوکێیەکی هەمیشەیی دەکات. ئەم ژنە لەرێگەی تەسککردنەوەی ماسولکەکانی زێ- وە کرداری رێککردن و چاکسازیی نەستی، ئەنجامدەدات کە وادەکات جووتبوون ئەستەم



بێت. بەپێی چەمکی شیکاریی سایکۆلۆژیی دواکەوتنی رژاندن (هاویشتنی تۆو) گوزارشت لەمەترسییەك دەکات کە بەندە بەکرداری رژاندن و رەتبوونی چووك بۆناو زێ کە ئەویش (ترسان لەخەسان)ـە. ئەو پیاوەی تووشی زووڕژاندن بووە لەوکاتەدا کە دەیەوێت ژنەکەی پیس بکات و لەگەیشتن بە ئۆرگازم بێبەشی بکات، هەست بە سادیزم دەکات بەرامبەر ژنەکەی. (لەم جۆرە پیاوانەدا تێبینی فەنتازییاکانی لەکار وەستان inhibition دەکرێت کە فەنتازیاکانی زێی داندار Vagin dente یان زێی هەڵلۆشەر Vampire لەخۆدەگرێت، کە پیاو هەستدەکات ئەو جۆرە زێیانە ماددەکەی ناو چووکی بە تاڵدەکەنەوە-واتە ئەو پیاوانە واهەست دەکەن زێی ژنەکانیان داندارە یان چووکیان هەڵدەلووشێت بۆیە ناتوانن کرداری رژاندن بەسەرکەوتوویی ئەنجامبدەن-وەرگێڕ)، ئەو پیاوەی تووشی پەککەوتنی سێکسوال دەبێت، بەدەست دڵەڕاوکێی خەسان Castrationوە دەناڵێنێت، کە لەئەنجامی ئارەزووی تابۆ بەرامبەر بە دایکی و ترس لەتۆڵەی باوکی دروستبووە.

درك بەوە دەکەین کە پەیوەستبوونی هەستە نێگەتیڤەکان بە ئارەزووە سێکسوالەکانەوە لەوانەیە لەماوەی قۆناغی منداڵیدا دەربکەون و سەرلەنوێ ببنە هۆی روودانی گیروگرفتی سێکسوالی لەکاتی نەرزەبووندا: لەمحاڵەتەدا نیشانەی پشێوی سێکسوال وەك دەرئەنجامێکی فسیۆلۆژی بۆ دڵەڕاوکێ دەردەکەوێت، نەك وەك هۆکارێك بۆ خۆپاراستن لێی. لەوانەیە ئەم دڵەڕاوکێیە لەچەند هۆکارێکەوە سەرهەڵبدات، وەك: ئەو پاڵنەرە تابۆیانەی لەکاتی منداڵیدا هەن، هەستکردن بە گوناه یان شەرم بەهۆی پەروەردەیەکی کۆنەوە، یان بەهۆی دەمارگیری ئاینییەوە.

## ٢- روانگەی دینامییەتی پەیوەندیی:

بایەخدەران بە دینامییەتی پەیوەندی هاوسەرێتی، جەخت لەوەدەکەنەوە نیشانەی پشێوی سێکسوال تەنیا دەرئەنجامی ناکۆکیو خراپ تێگەیشتنیی نێوان هاوبەشەکانە. هەرچی ئەو هۆکارانەشن کە دەبنە هۆی روودانی خراپ تێگەیشتن ئەمانەن: رقوکینەو شەڕانگێزی بەرامبەر هاوبەشی ژیان، ترس لەبەجێهێشتن و ململانێ لەپێناوی دەسەڵات لەچوارچێوەی پەیوەندی دوالیزمیدا. هەر هاوبەشێك هەوڵدەدات دەسەڵات بەسەر هاوبەشەکەی دیکەدا، بگرێت، (نیشانەی پشێوی سێکسوال) لەنێوانیاندا لەسنووری پەیوەندییەکانی پلەوپایەدا شرۆڤە دەکرێت، ئەگەر یەکێك لەو دوو هاوبەشە، هەستیکرد هاوبەشەکەی دی بەسەریدا پراکتیزەی دەسەڵات دەکات، ئەوا کار بۆ چەپاندنی ئارەزووەکانی دەکات، بەمشێوەیە بەرگری لەخۆیکردووەو هاوبەشەکەشی لەوەڵامدانەوەی پێویست بێبەشکردووە: بۆنموونە ئەگەر مەسەلەی پەککەوتنی سێکسوالی impuissance مان لای یەکێك لەو دوو هاوبەشە وەرگرت، تێبینی دەکەین ئەم هاوبەشە پەنای بردۆتەبەر لەکاروەستانی سێکسوالی inhibition sexuelle بەمە ناڕازیبوونی تەواوی لەکاری سێکسوال لەئەنجامدانی کرداری سێکسیدا دەردەبڕێت (یان گوزارشت لەناڕازیبوونی تەواو دەردەبڕێت بەرامبەر ئەنجامدانی کاری سێکسی لەرێگەی پەککەوتنی سێکسوالەوە): (لەلایەکەوە، ئەم نیشانەیە جۆرێك رێککردن وچاکسازی لەنێوان نیازە



روون و ئاشکراکاندا "وەك گەڕان بەشوێن تێربوونێکی دیاریکراودا، رەتکردنەوەی ملکەچبوون بۆ ئارەزووی ئەویدیکە، رەتکردنەوی داننان بە دەسەڵاتەکەیدا، سزادانی و ...هتد"، لەلایەکی دیکەوە نیازە نەستییەکان "وەك دورکەوتنەوە لەدڵەڕاوکێی خەسان، دورکەوتنەوە لەهێزو زەبری بەرامبەرەکەی یان بەرگەگرتنی گرێی شەڕانگێزی، یان سادی بەرامبەر بە توانای سێکسوالی" بەدیدەهێنێت)[١٢].

هەروەها تێبینی دەکرێت کە نەگەیشتن بە ئۆرگازم anorgasmie لەوانەیە سەبارەت بە ژن رێگە چارەیەك بێت ئەگەر ئۆرگازم وادانرا کە ملکەچبوونە بۆ پیاو (واتە ژنەکە وا لەئۆرگازمدا ژیا کە ملکەچبوون بگەیەنێت بۆ پیاو).

لەوانەیە ئەم نیشانانە گوزارشت بن لەنەبوونی متمانە بەرامبەر هەڵسوکەوتەکانی هاوبەشەکە، بەرامبەر دوو روویی و فێڵەکانی، یان لەوانەیە دەرئەنجامی گۆڕانی هەستەکانی باوکایەتیی بن بۆ ئەو هاوبەشە (واتە هەستی باوکایەتیی گوازراوەتەوە بۆ ئەو هاوبەشە) ئەمەش دەبێتە هۆی دروستبوونی پەیوەندییەکی زیاد لەپێویستی پاشکۆیەتی یان ترسی زیاد لەپێویست لەبەجێهێشتنی ئەو هاوبەشە (واتە ئەو کەسە دەترسێت هاوبەشەکەی بەجێیبهێڵێت).

دواجار لەهەندێك حاڵەتدا دەشێت خراپ تێگەیشتن یان کەموکورتی یان بەهەڵە تێگەیشتن لەهاوبەشی بەرامبەر، دەرئەنجامی رەتکردنەوەی ئاشکرای ئەو هاوبەشە بن: (ئەم رەتکردنەوە نەستییەی هاوبەشی بەرامبەر لەسەر شەڕانگێزیو رقوکینە یان دوورکەوتنەوەی سێکسوال دەژی "واتە رەتکردنەوەی نەستیی بەندە

بە بوونی ئەوانەوە"، هەروەها فرسەت بەرووداني زنجیرەیەك هەڵسوکەوتی هاوسەرێتیی، دەدات، کە دەچنە چوارچێوەی تێکدانو ڕێگریکردن لەبەردەم گونجاندنی سێکسوالی لەنێوان دوو هاوبەشەکەدا: چونکە کەشی گرژی ئامێزو نوشوستی بەردەوام لەسەر ئاستی پەیوەندی سێکسوالی تەنیا چەند رووخسارێکن بۆ ئامادەنەبوونی پەیوەستی سۆزداری لەنێوان دوو هاوبەشەکەدا)[١٣]، وێڕای ئەم فاکتەرانە، فاکتەری دەوروبەرو ناوەندی پیشەیی و کۆمەڵایەتیی هەن کە بەشێوەیەك لەشێوەکان کاردەکەنە سەر ئاستی ئەنجامدانی کرداری سێکسوال.

–هەندێجار نیشانەی پشێوی سێکسوال ئارەزوویەکی ئۆدیبی چەپێنراوو شیکارنەبوو Mal liquide ئاشکرادەکات: ئەگەر هەڵبژاردنی تاك بەشێوەیەکی گەورە پشتی بە وێنەی باوك بەستبوو بۆ هاوبەشەکەی، ئەوا لەمکاتەدا نیشانەی پشێوی سێکسوالی روودەداتو دەبێتە هۆی رووداني سێکس ساردی یان پەککەوتنی سێکسوال (پەککەوتنی سێکسی)، ئەم نیشانەیە تەنیا بەرامبەر هەندێك کەسی تایبەتی دەبێت (وەك هاوبەش) جگە لەو هاوبەشە تایبەتییە ئەوکەسە لەپەیوەندی سێکسوالیی لەگەڵ کەسانی دیکەدا، سروشتیی دەبێت.

– لەهەندێك بارودۆخدا، هاوبەشەکان لەپەیوەندی هاوسەرێتییدا دەژین وەك هەڕەشەیەك بۆ سەر ناسنامەی هەریەکەیان، بەتایبەتی ئەگەرئەو حاڵەتە پەیوەندی بەو کەسانەوە هەبوو کە لەرووی سایکۆلۆژییەوە لاوازن: لەمبارەدا نیشانەی پشێوی سێکسوال لای ئەو هاوبەشە وەك هەوڵدانێك دەردەکەوێت بۆ پاراستنی ناسنامەی



خۆی لەرووبەڕووبوونەوەی ئەوەی هەستی پێدەکات کە هاوبەشەکەی بەرامبەری باڵی بەسەردا کێشاوە یان داگیریکردووە. مەسەلەکە لێرەدا پەیوەندی بەرێکخستنی تایبەتی پەیوەندییەکەوە هەیە، چونکە توندی پەیوەستنامەو بەهێزی پەیوەندیی کە ئەودوو هاوبەشە هەستی پێدەکەن دەبنە هۆی دیاریکردنی پەیوەندییەکە لەسەر ئەو ئاستە (واتە لەسەر ئاستی دەرکەوتنی ئەو نیشانانە (symptoms.

ئەو سەرکێشییە سێکسوالانەی هەندێك کەس لەدەرەوەی پەیوەندی هاوسەرێتی پەنای بۆ دەبەن نابێت بەو شێوەیە شروڤەبکرێن کە هاوبەشە بنەڕەتییەکە لاواز بووە یان بایەخی لەدەستداوە، بەڵکو ئامانجی ئەو پەیوەندییانە راکردنە لە داگیرکردن لەلایەن هاوبەشی بەرامبەرەوە. دەتوانین ئەم دیاردەیە رونبکەینەوە لە روانگەی شیکارییەوە، ئەویش (پشتبەستن بە پەیوەندی نێوان "دایك–کوڕیە" کوڕیەی شیرەخۆرە ناتوانێت رووبەڕووی رەفتاری مشەخۆریانەو دەستتێوەردانی دایکی لە کاروبارەکانیدا ببێتەوە، لەبەرئەوە بەچەندەها رێگە وەڵامدانەوەی بۆدەبێت وەك لەدەستدانی ئارەزووی خواردن یان رەتکردنەوەی خواردن)[١٤]. هەروەها تێبینی ئەم دیاردەیە لەچوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتیشدا، دەکرێت: کاتێك یەکێك لەو دوو هاوبەشە هەستدەکات هاوبەشەکەی دی بۆتە مشەخۆر لەسەری و دەستدەخاتە کاروبارەکانییەوە، بەشێوەیەکی نەستیی لەرێگەی راکردن لێی یان وەستانی مەیلی ئیرۆسی بەرامبەری وەڵامدانەوەی دەبێت بۆی، ئەم میکانیزمە mecanisme کە دورکەوتنەوەی هەڵواردەیی سێکسوال لەخۆیدەگرێت "واتە تەنیا

هاوبەشەکەی خۆی دەگرێتەوە"و، لەدەرەوەی چوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتیی بە سروشتی دەمێنێتەوە. دورکەوتنەوەی سێکسوال لەوانەیە شێوەی سێکس ساردی لای ژن یان پەککەوتنی سێکسوال لای پیاو، وەربگرێت، کەواتە ئەم دوورکەوتنەوەیە لەوانەیە بۆ سروشتی ئەو پەیوەندییە دوالیزمییە بگەڕێتەوە، بە تایبەتی ئەگەر یەکێك لەو دوو هاوبەشە هەستیکرد هاوبەشەکەی بەرامبەری هەڵیدەلوشێت‌و لەچوارچێوەی کردارێکی هاوچەشنی خستنەپاڵی ئاڵوگۆڕکراودا، داگیریدەکات. لێرەدا دەرکەوتنی نیشانەی پشێوی سێکسوال گوزارشت لەبوونی قەیرانێك لەپەیوەندیداو هەوڵدانێکی نێگەتیڤ‌و سەرنەکەوتووانە بۆ دوورکەوتنەوەی پێویست دەکات، ئەویش لەپێناوی پاراستنی خود لەپەیوەندییەکی خۆشەویستی خنکێنەردا.

- دڵەڕاوکێ بەرامبەر پەیوەندییەکی بەهێزی خۆشەویستی، لەوانەیە لەسەر ئاستی ڕێکخستنی پەیوەندی سێکسوالی لەنێوان دوو هاوبەشەکەدا دەربکەوێت، لەمبارەدا تێبینی دەکەین، یەکێك لەو دوو هاوبەشە بەدەست هیچ نیشانەیەکی پشێوی سێکسوالەوە نانالێنێت‌و لەمبارەدا کاتێك هاوبەشەکەی دی چارەسەردەکرێت، ئەو (واتە هاوبەشی یەکەم) بۆ دواوە دەگەڕێتەوەو شکستدێنێت بەشێوەیەك پەیوەندی نێوانیان ئەستەم دەبێت، زۆربەی ئەوانەی بەدەست ئەم دیاردەیەوە دەناڵێنن (ئەو نیشانانەی هەیانە سروشتێکی هاوشێوەیان هەیە کە دەکرێت لەرێگەی ترسان لە "تەسلیمبوونی هەمەکی بۆ ئەویدی Abandon" لەکاتی پەیوەندی هاوسەرێتیدا گوزارشتیان لێبکرێت)[١٥].



ئەزموونی هاوژیانی symbiotique یان توانەوە fusionnel بایەخی ئیرۆسی گەورەی هەیە، تەنیا لەو سنوورەدا کە تاکەکان دەتوانن بەرگەی بگرن، بەتایبەتی لەسەرەتای پەیوەندی هاوسەرێتیدا، (بەڵام زۆر کەس هەن کە بونیادی سایکۆلۆژییان لاوازەو ناتوانن بۆ عەدەم‌و ونبوون لەویدیدا بگەڕێنەوە، بە تایبەتی لەکاتی ئۆرگازمدا، چونکە ئەم بارە پێویستی بە وەڵامدانەوە بۆ بەرامبەرو دەستبەرداربوون لەخود، هەیە)[١٦]. لەسەرەتای پەیوەندیدا گەڕاندنەوە یان گەڕانەوە regression دەشێت‌و ئاسانیشە، بەڵام پەرەسەندنی ژیانی هاوسەرێتیی‌و گیروگرفتەکانی لەوانەیە کاربکەنە سەر پاڵپشتیکردنی کەشی ئارام‌و توانەوەش لەگەڵ ئەویدیدا ببێتە مایەی دڵەڕاوکێ.

دواجار دەشێت لەهەندێك حاڵەتدا وێنەی هاوبەش ببێتە پاڵپشتی خستنەپاڵە شەڕانگێزییەکانی پەیوەندیدار بەبابەتە سەرەتاییەکانی تاك (واتە باوان)، کە ئەو شەڕانگێزییە بۆ هەمان هاوبەش دەگوازێتەوە یان دەیخاتەپاڵی (واتە ئەو بابەتانەی پەیوەندییان بە دایك‌و باوکەوە هەیە، ئەو کەسە بۆ هاوبەشەکەی دەگوێزێتەوەو لەودا بەتاڵیدەکاتەوە- وەرگێڕ).

## تیۆرەکانی فێربوون:

بەپێی ئەم تیۆرانە پشێوی سێکسوال لەئەنجامی وەستانی کاری سێکسوالی inhibition sexuelle وەرگیراو بەهۆی مەرجدارێتییەوە conditionnement ڕوودەدات. ئەم مەرجدارێتییە

لەپەیوەندی نێوان دۆخێکی ناجیزو هەڵهاتوو لەگەڵ وەڵامدانەوەیەکی سێکسوالی دیاریکراو، پێکدێت (واتە دۆخێکی ناخۆش بە سێکسوالی تایبەتی وەڵامدەدرێتەوە-وەرگێڕ)،: ئەگەر هەستکردنی سێکسواڵ بووە هۆی دڵەڕاوکێی، ئەوا لەداهاتوودا ئەو تاکە بە دورکەوتنەوە وەڵامدەداتەوە، لەم کاتەدا (واتە ئەگەر ئەو هەستکردنە سێکسوالییە بووە مایەی دڵەڕاوکێ بۆ تاك، ئەوا لەئایندەدا وەڵامدانەوەی ئەو تاکە لەکاتی روودانی ئەم کردارەدا، دوورکەوتنەوە دەبێت لەو هەستکردنە سێکسوالییە)، بەمشێوەیە دەبینین بنچینەی زوو هاویشتن یان خێرا رژاندن لەپیاودا هەمیشە بۆ ئەزموونی سێکسوالی لەبارودۆخی ترۆماتیزمیدا دەگەڕێتەوە، کە هانی زووهاویشتن دەدات. هەروەها تێبینی دەکرێت ئەو ژنەی ناگاتە ئۆرگازم لەوانەیە فێری بەندکردن یان چەپاندنی هەستە سێکسوالەکان بووبێت کە دەبنە مایەی دڵەڕاوکێ، ئەمەش دەبێتە هۆی وەستانی کاری سێکسوالی ئەو ژنەو لەم حاڵەتەشدا نەگەیشتن بە ئۆرگازم دڵەڕاوکێ دروستناکات، لەدواییدا ئەم مەرجدارێتییە لەسەر ئەمشێوەیە بەهێزدەبێت: بۆئەوەی لەدڵەڕاوکێ دووربکەوێتەوە پێویستە خۆی بەدوور بگرێت لەو ئۆرگازمەی کە دەیوروژێنێت.

بەپێی ئەم تیۆرە، چارەسەری سێکسوال پشت بەڕاهێنانە ئیرۆسییەکان دەبەستێت، کە ئامانجی لەکاروەستانی نیشانەی پشێوییە سێکسوالەکانە، ئەویش لەڕێگەی کاوەخۆ رووبەڕووبوونەوەی ئەو دۆخە ترسناکە.



## هۆکارە سایکۆلۆژییەکانی پشێوی سێکسوال لەژندا:

تابۆ کۆمەڵایەتیی و کولتورییەکان ژن لەسێکسدا بە رۆڵی نێگەتیڤ و پاشکۆبوونەوە پابەنددەکات، ئەم رۆڵە رێگە لەژن دەگرێت گوزارشت لەئارەزووە فسیۆلۆژییەکانی، بکات.

بەهۆی ژینگەو پەروەردەی ئاینییەوە، ماستەربەیشن- Masturbation-ی کچان لەقۆناغی هەرزەکارییدا قەدەغەن. (لەمبارەیەوە ئامارە نوێیەکان کە لەسەر(٢٠٤) ژن ئەنجامدراون، کە لەقۆناغی هەرزەکارییدا ماستەربەیشنیان نەکردوە، ئاماژە بەوە دەدەن لەرووی سێکسوالەوە ٩٥٪یان لەسەرەتای ساڵانی یەکەمی هاوسەرێتیدا ساردبوون. لەبەرامبەردا ئامارێکی هاوشێوە ئەنجامدرا سەبارەت بە ژمارەیەك لەژنان کە لەماوەی قۆناغی هەرزەکارییدا هەندێك گەمەبازی ئیرۆسی-خودییان کردوە، تەنیا ١٣٪یان ئەوەیان ئاشکراکرد لەرووی سێکسوالەوە لەسەرەتای ساڵانی یەکەمی هاوسەرێتیاندا، ساردبوون)[١٧].

ململانێی ئەو ژنانەی لەرووی سێکسوالەوە لەکار وەستاون (یان تووشی پەککەوتن بوون) لەهەستکردن بە گوناهدا، دەسوڕێتەوە. هەروەك بڵێی ئەم ململانێیە لەلایەن دادوەرێکەوە یان سانسۆرێکی ناوەکییەوە دەردەچێت، کە تابۆ کۆمەڵایەتیی و خێزانییەکان دەنوێنێت کەبە درێژایی ماوەی منداڵیی و هەرزەکاری کەڵەکەبوون، کاری ئەم دادوەرە یان "منی باڵا- sur moi" یە پشکنینی هەر رەفتار یان ئارەزوویەکە لە تاکەوە دەردەچێت.

هەرجارێك لای ئەو ژنەی كە لەرووی سێكسوالەوە لەكاركەوتووە، ئارەزوویییەك سەرهەڵبدات ، ئەوا ئەم دادوەرە ناوەكییە دەستێوەردانی خۆی دەكات و بە گوێیدا دەچرپێنێت:(نابێت وەك لەشفرۆش هەڵسوكەوت بكەیت) ...(پێویستە تەسلیمی غەریزە ئاژەڵییەكانت نەبیت).

-(گرژبوونی زێ vaginisme)و(ئازاری جووتبوون dyspareunie) كە ژن بەدەستییانەوە، دەناڵێنێت تەنیا نیشانە symptome یەكی هێمایین لەسەر ئاستی فیزیایی، بۆ گیروگرفتە سایكۆلۆژییەكان كە زۆرجار بەشێوەی نەستین).[18] لەهۆكارەكانی ئەم پشێوییانە تێبینی چوار هەستی نێگەتیڤ دەكەین، كە ئەمانە: هەستكردن بە گوناه، دوركەوتنەوە لەسێكس و شەڕانگێزیی و ترس.

**١- هەستكردن بەگوناه:**

هۆیەكانی هەستكردن بە گوناه لای ژن بۆ گیروگرفتی منداڵی لەقۆناغی ئۆدیبیدا، دەگەڕێتەوە.

-خاتووF.A پێنج ساڵە هاوسەرێتی لەگەڵ ئەندازیارێكی گەنجدا كردووە، بەڵام نەیتوانیوە كاری سێكسوالیی لەگەڵدا تەواوبكات..
F.Aهاوچەشنیی لەگەڵ هاوسەرەكەی دەكات وەك ئەلتەرناتیڤێك بۆ باوكی كە زۆری خۆشویستووەو لەبەرخاتری دۆستەكەی ماڵەكەی جێهێشتووە (واتە باوكی ماڵەكەی جێهێشتووە).

زۆرجار ئەم هەڵچوونانە كە بۆ هەردوو قۆناغی منداڵیی و هەرزەكاریی دەگەڕێنەوە، لەبیركراون، بەڵام زایەڵەی سایكۆلۆژییان هەر دەمێنێتەوە، لەوانەیە ئەم هەڵچونانە ببنە هۆی دەركەوتنی



دەرئەنجامێكی نێگەتیڤ لەسەر هەردوو ئاستی سایكۆلۆژیی و سێكسوالیی، تەنانەت لەدوای ماوەیەكی دوورودرێژ لەتێپەڕبوونی كات بەسەریاندا.

L.P- كچێك بوو لەخێزانێكی محافیزكارو كۆنەخواز ، لەو باوەڕەدا بوو كە كارێكی ئابڕوبەرانەی كردووەو لێخۆشبوونی نییە، كاتێك لەرێگەی ماستەربەیشن- Masturbation ەوە هەستی بە چێژی میتكە كرد. ئەم كچە لەو وروژاندنە ئیرۆسییە سەریسوڕما، هیچ كاتێك پەروەردەو رێنماییەكانی پیاوانی ئایینی لەبیرنەدەچۆوە كە هەموو بانگەشەیەكییان بۆچێژی سێكسوالی قەدەغەكردبوو.

N.K- كچێك بوو هەمیشە وەك بوونەوەرێكی ناسێكسوال asexue پەروەردە دەكرا، باوكی لەو باوەڕەدا بوو پێویستناكات هیچ ئارەزوو یان چێژێكی سێكسوال تاقیبكاتەوە، لەهەموو زانیارییەكی تایبەت بە سێكسوال و ژیانی سێكسوالی كەمبوو، نەیدەزانی یان ئەو رەوتەی فەرامۆشكردبوو كە ژوانێك بۆ ماچێك و لەماچێكەوە بۆ گەمەبازیی و لەگەمەبازییەوە بۆ جووتبوون، دەڕوات، بەمشێوەیە خۆی بەدووگیانیی بینییەوە، بێئەوەی بزانێت چۆن و بۆچی؟.

M.A- كاتێك ساڵانی یەكەمی منداڵی دەكەوتەوە یادی لەشەرما سوور دەبۆوەو هەستی بە هەڵچوونێكی زۆر دەكرد، كە لەهەمان ئەو ژوورەدا دەخەوت، كە دایكی و باوكی تێیدا دەخەوتن، سی ساڵ بەسەر ئەوەدا تێپەڕی بوو هێشتاM.A بە شێوەیەكی ورد ئەو ئاه وئۆف و هەناسە بڕكێیانەی لەیاد بوو كە لەكاتی شەودا لەژوورەكەدا، گوێی لێیان دەبوو.

–زۆربەی جار هەستکردن بە گوناه، دەبێتە هۆی دروستبوونی هەستکردن بەحەیاو شورەییەکی زۆر: پێنج ساڵ بەسەر هاوسەرێتیاندا تێپەڕی بوو،N.M نەیدەتوانی لەبەردەم هاوسەرەکەیدا خۆی رووتبکاتەوە.

**٢– دوورکەوتنەوە(سڵەمینەوە) لەسێکسوال:**

ئەم سڵەمینەوەیە لەرووداوی شاز یان وروژێنەرەوە بەرهەمدێت: بینینی پیاوێك بە رووتی، هەوڵدان بۆ دەستدرێژیکردن و ئیغتساب، دەستدرێژی یان گەمەبازی لەلایەن (باپیر یان مام یان دراوسێ و هەندێجار باوکیش).

ئەم رووداوانە لەقوڵایی یادەوەریدا، لە شێوەی (زامی سوتێنەر یان گرێی بەسویدا) هەڵدەگیرێن و دەپارێزرێن. ئەم گرێیانە لەوانەیە یارمەتیدەربن بۆ دەرکەوتنی نیشانەی سایکۆلۆژیی یان فیزیکیی(وەك گرژبوونی زێ، ئازاری جووتبوون).

لەلایەکی دیکەوە، سڵەمینەوەی سێکسوالی، لەوانەیە دەرئەنجامی روداوی نوێ بن، چونکە لەشەوی یەکەمی بوکێنیدا زۆرێك لەژنان لەلایەن هاوسەرەکانیانەوە دووچاری نوشوستی و نائومێدییەکی چاوەڕواننەکراو دەبن، بۆ نموونە پیاوی گێل و نەزان کە دڵەڕاوکێی هەیەو شارەزایی لەگەڵ ژناندا کەمە، لەوانەیە کەشێك لەنەبوونی ئاسودەیی لای ژنەکەی دروستبکات، زۆرێك لەژنانیش داخی ئەوە هەڵدەکێشن کە هاوسەرەکانیان لەپێش هاوسەرگیریداو لەپێش ئەواندا هیچ ژنێکیان نەناسیوە، وێڕای کۆمەڵێك فاکتەری دیکە کە لەشەوی بوکێنیدا روودەدەن، وەك هیلاکی و هەڵچوون و کرژی



دەماری کە لەوانەیە لەگەڵ ئەم نوشستیانەدا هاوکات بن، لەبەرئەوە هەندێك لەئایینەکان وەك(Kama Sutra) لەوڵاتی چین ئامۆژگاری هاوسەرەکان، دەکەن بە دواخستنی کاری سێکسوال بۆ ماوەی دوو هەفتە یان زیاتر لەدوای هاوسەرێتی.

**٣– شەڕانگێزی بەرامبەر هاوبەش:**

زۆرجار ئەم شەڕانگێزییە دەرئەنجامی رووداوی قۆناغی منداڵی یان قۆناغی هەرزەکارین.

–V.R بە جوانییەکی ئەفسوناوی ناسرابوو، بەڵام بەرامبەر بە کوڕان زۆر هەستیار بوو. هاوسەرێتی لەگەڵ کوڕێکی گەنجدا، کرد کە بەدەست (زوو هاویشتن) ەوە Ejaculation premature دەیناڵاند، لەدوای زنجیرەیەك لەنوشوستی رقی لەهاوسەرەکەی دەبۆوە، هەستی بەبێزران بەرامبەری، دەکردو پاشان گرژبوونێکی توند لەزێیدا دەرکەوت.

–P.N ماوە ماوە بەدەست (گرژبوونی زێ) وە دەیناڵاند، واتە هەر پێنج مانگ جارێك ئەم نیشانەیە دەردەکەوت و دوایی نەدەما. شیکارکردن ئاشکرایکرد ئەم نیشانەیە پەیوەستە بەو گیروگرفتانەوە کە لەنێوانیاندا واتە لەگەڵ هاوسەرەکەیدا رویاندەدا. بەپێی روانگەی شیکارکاری ئەم شەڕانگێزییە بەرامبەر هاوبەشی ژیان لەوانەیە لای ژن گوزارشت بێت لەئارەزوویەکی نەستی و ئەویش بە ئامانجی بێبەشکردنی پیاو لەچێژو سەرشۆڕکردنی تا تۆڵە لەخەسانی خۆیی castration بکاتەوە، لای ئەم جۆرە ژنانە سڵەمینەوەو دوورکەوتنەوەیەکی گشتیی بەرامبەر بە پیاوان تەشەنەدەکات، (ژنێك

پیاو بە دوژمنی خۆی دابنێت چۆن لەئامێزیدا چێژ وەردەگرێت)[19].

٤-ترس:

ترس لە (ڕەتبوون- defloration) تەوەرەیەکی سەرەکییە کە ژمارەیەکی زۆر لەترسەکانی دیکە لەلای ژنانی تووشبوو بە گرژبوونی زێ‌و ئازاری جووتبوون لەدەوری خۆی کۆدەکاتەوە.

N.D- کچێکی زۆرهەستیارو بە ئاگایە، حەز لەدڵداریی‌و گەمەبازی هێواش‌و سووک دەکات، بەڵام پەیوەندی سێکسوالیی ڕەتدەکاتەوە، چونکە دەترسێت لەچێژێکی تێرو تەواودا نوقم ببێت. بەشێوەیەکی هەمیشەیی پێشبینییەکی باوکی لەگوێیدا دەزرنگایەوە: (وەك دایكت دەبیت بە لەشفرۆش)

D.K- دەربارەی درینی پەردەی کچێنی defloration فەنتازیای تۆقێنەری هەبوو: لێشاوێك خوێن، برینی پیس بوو، کاری دڕندانەو ئیغتساب، خۆی پێش ئازار دەکەوت‌و بەتەواوەتی نەیشدەزانی هۆکاری ترسەکانی چین. (ئەندامی زاوزێی) لەهەموو خەیاڵ‌و بیرکردنەوەیەکی جەستەیی بەدوردەگرت‌و هیچ کاتێك بۆ تەنیا جارێکیش هەوڵینەدابوو ئەو ئەندامەی ئاشکرابکات یان دەستی لێبدات.

هەروەها هەندێك ترسی دیکەش هەن لای ئەو ژنانەی تووشی گرژبوونی زێ بوون، وەك: ترس لەدووگیانی، ترس لەمنداڵبوون، ترس لەمنداڵی ناسروشتی.



## هۆکارە سایکۆلۆژییەکانی پشێوی سێکسوال لەپیاودا:

ئەو پیاوەی تووشی پەککەوتنی سێکسوال بووە لەپێش یان لەکاتی هەوڵدانیدا بۆ جووتبوونە سەرەتاییەکانی، یان لەقۆناغی هەرزەکاریدا، بەدەست دڵەڕاوکێیەکی توندەوە ناڵاندوویەتی. هەروەها دەمارگیری ئایینی‌و پەیوەندییە سێکسوالییە شازەکان یان شارەزایی پێشینە لەگەڵ ژنانی لەشفرۆشدا، بەشێوەیەك لەشێوەکان کاردەکەنە سەر ئەنجامدانی کرداری سێکسوال لای پیاو. ماستەرس Masters و جۆنسن jonhson [20] دەگێڕنەوە، هەندێك لەو نەخۆشانەی چارەسەرییان کردوون، بەشێوەیەکی هەمیشەیی لەپێش‌و دوای تەمەنی نەرزەبوون لەژووری دایکییان نوستوون. یەکێك لەو پیاوە نەخۆشانە، وتوییەتی دایکی بەڕووتی لەهەمان ئەو ژوورەدا دەخەوت کە ئەم تێیدا دەخەوت‌و لە هەندێك حاڵەتیشدا مکوڕی دەکرد (سووربوو) لەسەر شتنی ئەندامی زاوزێی ئەو پیاوە(واتە کوڕەکەی )کاتێك لەتەمەنی پانزە ساڵیدا بووە.

هەندێك لەپیاوان بێ هیچ شارەزاییەکی سێکسوالی لەپێشینە، دەگەنە ڕۆژی هاوسەرێتیکردن، ئەو پیاوانە زۆرکات لەئەنجامی پەروەردەیەکی کۆنەخوازەوە، بەکۆمەڵێك زانیاری هەڵە دەربارەی سێکس مێشکیان سیخناخ کراوە، سێکس بەلایانەوە تاوان‌و هەڵەو شتێکی ترسێنەرو شەرمەو کەسێتی تێکدەشکێنێت‌و کارێکی ناڕەوشتییە...هتد، ئەم جۆرە پیاوانە لەگەڵ هاوتاکانیان واتە لەگەڵ ئەو ژنانەدا هاوسەرێتیی دەکەن کە هیچ زانیارییەکیان نییە یان

تووشی هەندێك پشێوی سێكسوالی بوون، بەمەش لەكاتی هەوڵدان بۆ سەرەتای جووتبوون بارگرانییەكی نوێ دەكەوێتە ئەستۆی پیاوان، لەمكاتەدا حاڵەتەكە بەرەو خراپتر دەڕوات و یەكەم هەوڵدان بۆ جووتبوون شكستدەهێنێت و لەوانەیە ببێتە هۆی شكستهێنانی هەوڵەكانی داهاتووش و بە تێپەڕبوونی كات پەككەوتنی سێكسوال لای پیاو بەهێزدەكەن.

– تێوەگلان لەپەیوەندی سێسوالی شاز بۆنموونە وەك نێربازی pederasie دەبێتە هۆی دەركەوتنی نیشانەی گرنگی پشێوی سێكسوال لای پیاو.

دواجار هەندێك ئەزموونی سێكسوالی شكستهاتوو لەماوەی قۆناغی هەرزەكاریدا لەگەڵ ژنانی لەشفرۆشدا دەبنە هۆی پاڵپشتكردنی نیشانەی پشێوییە سێكسوالەكان لای پیاو و لەوانەیە تا دوای هاوسەرێتیش بەردەوام بن.

## زانیارییە سێكسوالە هەڵەكان:

لەوانەیە كەموكوڕتی لەوەرگرتنی زانیاری سێكسوالدا، ببێتە هۆی دروستكردنی رێگرییەكی سەرەكی لەبەردەم چالاكیی سروشتیدا، لەم نێوكۆیەدا تێبینی ئەوە دەكەین زۆربەی پیاوان بە قۆناغەكانی (وەڵامدانەوەی سێكسوالی) ژنەكانیان ئاشنانین، هەروەها هەندێكیشیان تەنانەت لەبوونی ئەو قۆناغە بێئاگان. كۆمەڵێكی فراوانیش لەژنان هەن فسیۆلۆژی وەڵامدانەوەی سێكسوالی خۆیان نازانن (یان نامۆن پێی) كە بەرەو تێربوونی سێكسوالیان دەبات.



هەروەها ئەم ژنانە ناگەنە ئۆرگازم و بەمەش داوای گەمەبازی پێویست لەلایەن پیاوەوە ناكەن بۆ وروژاندنیان.

– زانیارییە سێكسوالە هەڵەكان دەبێتە هۆی روودانی نوشوستی سایكۆلۆژیی و پشێوی لەسەر ئاستی پەیوەندی هاوسەرێتی.

یەكێك لەم زانیاریانە پێیوایە (پێوەری دروست) بۆ وەڵامدانەوەی سێكسوال لەكاتی جووتبووندا پشت بە گەیشتن بە ئۆرگازم دەبەستێت، هەروەها هەندێك لەژنان لەو باوەڕەدان كە سروشتی نین، چونكە بەهۆی وروژاندنە ناوەكییەكانی (زێ)وە ناگەنە ئۆرگازم. ئەم بیركردنەوە پوچ و زانیارییە هەڵانە لەوانەیە ببنە هۆی دروستكردنی زۆر گرێ و شڵەژان، بەتایبەتی لای ئەو ژنانەی وەڵامدانەوەی سێكسوالیان هێواش یان لاوازەو بەمشێوەیە رێگەدەگرن لەتەسلیمبوون بە هاوبەشەكانیان و لەوانەیە بەشێوەیەكی تەواو ببنە ژنانی سێكس سارد(واتە تووشی سێكس ساردی ببن).

زانیاری دیكە هەیە لەسەر سێكسوال، دەڵێت(پێوەری دروست) یان سروشتی بۆ پەیوەندی سێكسوال بەشێوەیەكی هاوكات پشت بەگەیشتن بە ئۆرگازم، دەبەستێت (واتە ژن و پیاوەكە لەیەككاتدا بگەنە ئۆرگازم). لەوبارەدا كە ژن و پیاو لەهەمانكاتدا پێكەوە ناگەنە ئۆرگازم وایدادەنێن لەڕووی سێكسوالەوە گونجاونین لەگەڵ یەكتردا.

پێویستە لێرەوە جەخت لەوەبكرێت، هاوكاتی لەئۆرگازمدا (واتە ژن و پیاو پێكەوە) رودانی دەگمەنەو تەنیا لەوبارەدا دێتەدی ئەگەر ژن بتوانێت بە ئاسانی چێژوەرگرێت یان كۆنترۆڵی وەڵامدانەوەی خۆی بكات و لەوكاتەدا دەربیبڕێت كە پیاوەكە چێژوەردەگرێت.

– هەندێك كەس بایەخێكی زۆر بە تێركردنی ئارەزووەكانی

هاوبەشی بەرامبەر دەدەن، ئەویش لەسەر حیسابی فەرامۆشکردنی تەواوی ئارەزووەکانی خۆیان، لەوانەیە ئەم هەڵوێستە لەپێناوی قەرەبووکردنەوەدا compensation گرێی سایکۆلۆژیی یان فیزیکییەکان، بشارێتەوە، هەروەها لەوانەشە گوزارشت لەزانیاری هەڵە بکات، بۆ نموونە پێوەری سەرەکی لەمامەڵەکردندا، بریتییە لەتێرکردنی ئارەزووەکانی سەرگەورە (واتە کەسی خاوەن دەسەڵات).

زۆرجار لەژنندا ترس لەهیوابڕاوکردنی لایەنی یان هاوبەشی بەرامبەر، تێبینی دەکرێت، هەروەها دەشێت ئەم هەڵوێستە گوزارشت لەترس لەبەجێهێشتن Abandon و رەتکردنەوە rejetش بکات کە ئەمانە هەمووی بۆ گیروگرفتی قۆناغی منداڵی دەگەڕێنەوە، بەتایبەتی ئەگەر ئەو کەسە لەمنداڵیدا بەو شێوەیە پەروەردە کرابوو بایەخ بە دڵخۆشکردنی باوانی بدات. ئەو کەسانەی بەشێوەیەکی زیاد لەپێویست بایەخ بە بەختەوەرکردنی کەسی بەرامبەرو دابینکردنی چێژ دەدەن بۆی، دڵەڕاوکێیەکی هەمیشەییان هەیە تا ئەوە بسەلمێنن کە بوونی ئەوان بۆ بەرامبەرەکەیان پێویستە: ئارەزووەکانیان رازیدەکەن تا ئەگەری بەجێهێشتن لەلایەن ئەو هاوبەشەی بەرامبەرەوە کە ئارەزووەکانی تێردەکەن، بەدووربگرن.

## کاریگەری نەخۆشییە سایکۆلۆژیی‌و ئەندامییەکان لەسەر توانای سێکسوال:

لەوانەیە شۆك‌و خەمۆکی‌و ماندووبونی زۆر کاریگەری خراپ بکەنە سەر توانای سێکسوال، چونکە کاتێك ئەو کەسەی تووشی



خەمۆکی دەبێت، سێکس دورترین شتە کە بیری لێبکاتەوە.

ئەو کەسەی دووچاری شۆك بووە بەشێوەیەکی زۆر سەرقاڵی گیروگرفتەکانییەتی‌و هیچ کات‌و هیچ بوارێکی بۆ بایەخپێدانەکانی دیکە نابێت، هەروەها لەوانەیە گیروگرفتە فسیۆلۆژیی‌و هۆرمۆنییە توندەکان کە لەگەڵ خەمۆکی توندو حاڵەتەکانی شەکەتی‌و شۆکدا هاوکاتن رۆڵیان لە لەدەستدانی بایەخی سێکسوالدا هەبێت، ئەویش لەرێگەی کارتێکردنیان بۆ سەر ناوەندە کۆئەندامیی دەمارو گوێزەرەوە دەمارییەکان neurotrans metteurs، هەروەها کاردەکاتە سەر دابەزینی رێژەی ئەندرۆجین لەخوێندا.

لێکۆڵینەوە نوێیەکان جەختیان لەوەکردۆتەوە (ئەو پیاوانەی بەدەست شۆك‌و قەیرانی درێژخایەنەوە دەناڵێنن دابەزینی بەردەوام لەئاستی تستوسترون لەخوێنیاندا هەیەو ئەم ئاستە لەدوای کۆنترۆڵی قەیرانەکان بۆ باری سروشتی دەگەڕێتەوە)[٢١].

هەندێك نەخۆشی، ئارەزووە سێکسوالەکان خامۆشدەکەن، نموونەش وەك: پشێوییەکانی گورچیلەو جگەر، چونکە ئەم پشێوییانە بەشداری دەکەن لەکرداری تێکدانی تۆکسین و کرداری میتابۆلیزم metabogisme و ئستڕۆجین estrogene، لەمەشەوە ئەم پشێویانە لەگەڵ کەمبوونەوەی بایەخپێدانی ژن‌و پیاو بە سێکس هاوکات دەبن، هەروەها تووشبوون بە شەکرە لەتەمەنێکی زوودا کاردەکاتە سەر وەڵامدانەوەی رەپبوون erection لەپیاوداو وەڵامدانەوەی سێکسوال لەژندا.

# چارەسەرکردنی پشێوییە سێکسوالییەکان لەژنو پیاو دا

## ١-چارەسەرکردنی سێکس ساردی لەژندا:

چارەسەرکردنی سایکۆلۆژیی، لەسەرەتادا دەستدەکات بە یارمەتیدانی ژن بۆئەوەی تەسلیمی هەستەکانی ببێت، لەبەرئەوە کەشێك لەئاسوودەییو لێبوردەیی لەنێوان دوو هاوبەشەکەدا دەخولقێنێتو یارمەتییان دەدات بۆ پەیوەندیکردنێکی راشکاوانە، هەروەها کار بۆ راستکردنەوەی بیرۆکە هەڵەکانی تایبەت بە سێکس دەکات کە دەبنە هۆی هەستکردن بە گوناهو دڵەڕاوکێ.

ئەودوو هاوبەشە، سەرباری چارەسەری سایکۆلۆژیی، پەیڕەوی چەند تەکنیکێکی سێکسوالی جیاواز دەکەن، لەگەڵ هەندێك ڕێنماییو ئامۆژگاری تایبەتیدا.

- لەسەرەتادا داوا لە ژنو پیاو دەکرێت پەیوەندی سێکسوالیان بوەستێننو گەیشتن بە ئۆرگازمییان بۆ ماوەی یەك هەفتە لێ قەدەغە دەکرێت.

داوا لەپیاو دەکرێت بەم ڕێنماییانە رازی بێتو پێیانەوە پابەند بێت تا ژنەکەی ئاسودە بێت. ئەم هەڵوێستە یارمەتی ژن دەدات لەئەرکی گەیشتن بە ئۆرگازم رزگاری بێتو هەروەها یارمەتی دەدات بۆ هێورکردنەوەی هەستکردن بە شڵەژاوی باری سایکۆلۆژی. کاتێك



ژنو پیاو پابەندی ئەم ڕێنماییانە بوون داوایان لێدەکرێت دەست بەم راهێنانەی خوارەوە بکەن:

- راهێنانی یەکەم: راهێنانی یەکەم پشت (بە گەڕانەوەی هەستکردن resensibi lisation دەبەستێت، هەروەها بە دانیشتنە وروژاندنە هەستییە ناجێنیتالی(نازاوزێی) non genitale یەکانیش ناودەبرێن، ئەم دانیشتنانە بریتییە لەنزیکبوونەوەی دوو هاوبەشەکە کە تەنیا پشت بە هەستکردن دەبەستێت)[٢٢]. دوو هاوسەرەکە بەوە ئامۆژگاری دەکرێن کە لەدوای خۆشتن لەجێگادا پاڵبکەونو بحەوێنەوە، پاشان بەشێوەی کاوەخۆ دەستبکەن بە ئاڵوگۆڕکردنی گەمەبازی واتە هەردووکیان گەمەبازی لەگەڵ یەکتردابکەن، پیاو لەسەردەم پاڵدەکەوێتو یەکەمجار ژنەکە دەستدەکات بەگەمەبازی لەسەر هەموو لەشییو دەتوانێت دەستەکانی یان ئەگەر ویستی لێوی بەکاربێنێت، لەم حاڵەتەدا داوا لەژن دەکرێت لەکاتی بەرکەوتنی لەگەڵ جەستەی هاوسەرەکەیدا بیرکردنەوە لەسەر هەستەکانی خۆی چڕبکاتەوە.

پاشان ژنەکە لەسەردەم پاڵدەکەوێتو داوا لەهاوسەرەکەی دەکرێت، بەکاوەخۆ گەمەبازی لەگەڵ جەستەی ژنەکەیدا بکاتو داواش لەژنەکە دەکرێت لەبیرۆکە دەرەکییەکان دوربکەوێتەوە، بەتایبەتی ئەوانەی پەیوەندییان بە هاوسەرەکەییو هەستەکانییەوە هەیە، لەمحاڵەتەدا پێویستە هەستو سەرگرتەکانی بە هاوسەرەکەی رابگەیەنێتو پیاوەکەش ژنەکەی لەوە ئاگادار بکات، ئایا گەمەبازییەکانی هێواشن یان توندنو حەز لەچی زیاتر دەکات تا بۆی بکات، هەروەها پێویستە لەسەر پیاو لەکاتی گەمەبازیدا ناوچە

هەستیارەکانی جەستەی ژنەکەی بدۆزێتەوە، کاتێك ژن و پیاو گەمەبازی سەرپشت تەواودەکەن هەمان گەمەبازی لەسەر سك دووبارە دەکەنەوە(واتە لەسەر پشت پاڵدەکەون)، کاتێك ژن لەسەردرککردن بەهەستە چێژ بەخشەکان رادێت، دەکرێت هەندێك راهێنانی سێکسوالی نوێ بخرێتە ناو راهێنانەکانەوە، کە هەمان دانیشتنە وروژێنەرەکانی پێشووترن کە ژن و پیاو پێکەوە پەیڕەویان کردووە، بەلام لەم قۆناغەدا رێگە بە ژن و پیاوەکە دەدرێت گەمەبازی بە ئەندامەکانی زاوزێی یەکتری بکەن، ژنەکەش لەمبارەدا بەرامبەر بە ئەرك و پابەندبوون و ئەنجامەکانی کاری سێکسوال بێخەمە، هەروەها ئەو دڵەڕاوکێیە فەرامۆش دەکات کە بەندە بەتێرکردنی ئارەزووەکانی هاوسەرەکەیەوە، هەروەها ژنەکە فێری ئەوەشدەبێت چۆن بحەوێتەوە (واتە هەست بە خاوبوونەوە بکات)و رووبەڕووی رەخنەش نەبێتەوە ئەگەر داوای لەهاوسەرەکەی کرد هەندێك گەمەبازی تایبەتی و چۆنایەتی، بکات. (لەم دۆخەدا ژنەکە لەوە ناترسێت هاوسەرەکەی رەتیبکاتەوە، بەڵکو درك بەوە دەکات کە بەمشێوەیە هاوسەرەکەی چێژ لەگەمەبازی لەگەڵیدا وەردەگرێت و وروژاندن روودەدات ، وردەوردە چێژە خۆییەکانی یارمەتیدەدەن بۆ تێپەڕاندنی ئەو شەرم و هەستکردن بە گوناهەی بەندە بەمەسەلە سێکسوالەکانەوە)[٢٣].

– نابێت ئەم وروژاندنە جینیتالییانە تەنیا لەسەر شێوازێك بمێننەوە، هەروەها ناشبێت ببنە هۆی گەیشتن بە ئۆرگازم. ماستەرس Masters و جۆنسۆن Jonhson[٢٤] ئامۆژگاری هاوسەرەکان دەکەن بارودۆخی تایبەتی لەم جۆرە راهێنانەدا پەیڕەوبکەن: پیاوەکە لەپشتەوە (واتە لەدوای ژنەکەوە) دەوەستێت



بەشێوەیەك بە ئاسانی دەستی بە ئەندامی زاوزێی ژنەکە بگات و ئەو گەمەبازییانە جێبەجێبکات کە ژنەکەی ئارەزووی دەکات، بێئەوەی بە نیگایەك قەڵسی بکات یان ترسی رەتبوونی چوکی لادروستبکات penetration.

ئەم دۆخە یارمەتی ژنەکە دەدات بۆ چێژوەرگرتن و نەهێشتنی ئەو لەکاروەستان و رێگرییەی inhibition بەندن بەمەسەلە سێکسوالەکانەوە.

لەمحاڵەتەدا پێویستە ئەو بەرهەڵستییانە ئاشکرا بکرێن resistances کە لەکاتی راهێنانەکەدا دەردەکەون، دواتر روونبکرێنەوەو شیکردنەوەیان بۆبکرێت. لەوحاڵەتەدا گەر ئەو دوو هاوبەشە نەگەیشتنە ئەنجامێك ئەوا داوایان لێدەکرێت چارەسەری سایکۆلۆژیی پەیڕەوبکەن، ئەویش بۆ ئاشنابوون بەو ململانێ نەستییانەی کە کاردەکەنە سەر ئەنجامدانی کاری سێکسوالی، هەمیشە هاوسەرەکان ئامۆژگاری دەکرێن تا راهێنانەکانیان دووبارەبکەنەوەو دووربکەونەوە لەو بیرۆکە دەرەکییانەی راهێنانەکان دەشێوێنن. لایەنی کەم بۆماوەی هەفتەیەك ئەم راهێنانە بەردەوام دەبێت.

– راهێنانی دووەم: راهێنانی دووەم پشت بە جووتبوونی coit بێگەیشتن بە ئۆرگازم، دەبەستێت، جووتبوون لەمحاڵەتەدا لەژێر راوێژو سانسۆری ژنەکەدا دەبێت. لەدواییدا ژنەکە دەتوانێت لەخوارەوە بۆ سەرەوە بجوڵێت و ماسولکەکانی دەوروپشتی زێ بە رێکوپێکی گرژ بکات، تا بەشێوەیەکی باشتر هەست بەهەستە جێنیتالییەکانی بکات، دوای ئەوەی ژنەکە لەسەر قۆناغەکانی

گرژبوونی ماسولکەکانی زێ رادێت داوایلێدەکرێت راهێنان لەسەر قۆناغەکانی ریلاکس (خاوبوونەوە) relachement، بکات.

ئەگەر لەکاتی ئەم راهێنانەدا پیاو هەستیکرد پێویستی بە هاویشتنە، ئەوا ئامۆژگاری دەکرێت جووتبوون بوەستێنێت، داوا لەژن و پیاوەکە دەکرێت بۆماوەیەکی دیاریکراو لەیەکتری جیاببنەوە، بۆئەوەی بەخێرایی کۆتایی بە کارە سێکسوالیەکە نەیەت، پاشان چوار جاری دیکە راهێنانەکە دووبارە دەکرێتەوە، ئەم راهێنانە بۆماوەی دوو هەفتە یان زیاتر بەردەوام، دەبێت.

– راهێنانی سێیەم: شێوازێکی دیکە هەیە، پشت بە جووتبوونی پچڕپچڕ interrompu دەبەستێت: لەو دۆخەدا کە ژن بەلایەوە پەسەندترە بە هێواشی جووتبوون دەستپێدەکات و بەخێرایی جووتبوون دەوەستێنرێت، تا وروژاندنی میتکە لەلایەن پیاوەوە جێگەی بگرێتەوە. دەکرێت لەوکاتەدا کە ژنەکە داوادەکات جووتبوون دووبارە بکرێتەوە، بەمشێوەیە چەند جارێك ئەم راهێنانە دووبارە دەکرێتەوە، لەم حاڵەتەدا ژن بەپێی هەستە تایبەتییەکانی، پەیوەندییە سێکسوالیەکە ئاڕاستەدەکات، هەرچی پیاوەکەشە لەباروودۆخێکی نێگەتیڤدا دەمێنێتەوە، ماوەماوە ژنەکەی دڵنەوایی پیاوەکە دەکات تا ئارەزووەکانی بەدیبێنێت و بە حەواوەیی و دوور لەدڵەڕاوکێ یان گرژی، بمێنێتەوە.

هەندێك لەژنان چاکدەبنەوەو لەکاتی چارەسەرکردندا بە ئۆرگازم دەگەن. هەندێکی دیکەیان ئارەزووەکانیان دەبزوێت و وروژاندنە سێکسوالەکانیان باش دەبێت، بەڵام هێشتا ناتوانن بگەنە ئۆرگازم و ئەمەش لەم چارەسەری خوارەوەدا باسدەکەین.



## چارەسەرکردنی پشێوی ئۆرگازم لەژندا:

چارەسەرکردن لەم حاڵەتەدا ئامانجی خوڵقاندنی ئەو باروودۆخەیە کە یارمەتی ژن بدات، تا وەڵامدانەوەی خۆنەویستانەی کرداری ئۆرگازم orgasme،ئازاد بێت، بۆ ئەمەش واپێویستدەکات وروژاندنی میتکە زیادبکرێت و فاکتەرە سایکۆلۆژییە لەکارخەرەکان inhibiteurs کەمبکرێنەوە (یان هێوربکرێنەوە). ململانێی سایکۆلۆژییە نەستییی و ترسەکان دەبنە هۆی گرتنی جڵەوی ئۆرگازم و لێرەدا پێویستە کار لەسەر دوو ئاست بکرێت: لابردنی لەکارخەرە سایکۆلۆژیی و شیکردنەوەی ململانێ نەستییەکان، وێڕای پەیڕەوکردنی هەندێك راهێنان بەمەستی چارەسەرکردن کە ئەمانەن:

– راهێنانی یەکەم: سەرەتا داوا لەژن دەکرێت خۆی وروژاندنی خۆیی (ماستەربەیشن– Masturbation) ئەنجامبدات، بەو پێودانگەی لەوانەیە ئەگەر هاوسەرەکەی لەگەڵیدا بێت رۆڵێکی لەکارخەر(وەستێنەر) ببینێت، یەکەمجار ژنەکە بەهۆی پەنجەکانییەوە میتکە دەوروژێنێت تا لەجەستەیدا بە ناوچەکانی وروژاندن ئاشنابێت و لێیبکۆڵێتەوە. (هەندێجار بۆمان دەردەکەوێت هۆکارەکانی دەرکەوتنی ئەم نیشانەیە "واتە حاڵەتی پشێوی ئۆرگازم" بۆ ترسە نەستییەکان دەگەڕێتەوە، کە بەندە بەئۆرگازم و لەوانەیە هەندێجار ترس لەمردن ئاشکرابکات، "لەهەندێك ژندا ئۆرگازم بەندە بە سووکە مردن (سووکە لەهۆشچوونێك) petite mort" و بە دڵەڕاوکێ بەرامبەر پەرتبوونی کەسێتی

depersonnalisation)[٢٥]. لەمحاڵەتەدا پێویستە چارەسەرکار(دەروونشیکار) لەبایەخی ئەم ترسانە کەمبکاتەوە کە پەیوەستن بە ئۆرگازمو هەروەها کار بکات بۆ گەمارۆی ئەنجامەکانی.

– راهێنانی دووەم: کاتێك ژن وردەوردە لەرێگەی وروژاندنی میتکەوە بە ئۆرگازم دەگاتو لەسەری رادێت، ئامۆژگاری ژن دەکرێت پراکتیزەکردنی جووتبوون لەگەڵ هاوسەرەکەیدا، بکات، هەروەها بۆئەوەی هەست بەبوونی چووك لەناو زێدا بکات، پێویستە بەشوێن چارەسەرکردنی ئەو گیرگرفتانەدا، بگەڕێت کە بەندن بە جووتبوونەوە وەك (ترس لەچووك یان ترس لەدووگیانی) یان بگەڕێت بە شوێن ئەوەدا ئایا ئەو ژنە هەست بە شەڕانگێزی دەکات بەرامبەر هاوسەرەکەی.

ژن پێش دەستکردن بە جووتبوون ئامۆژگاری دەکرێت بگاتە ئاستێکی بەرز لەوروژاندن، ئەویش لەرێگەی ماستەربەیشن– Masturbation ـەوە (واتە بە دەستی خۆی میتکە بووروژێنێت)و گوزارشت لەئارەزووەکانی بکات، پەنا بۆ فەنتازیا ئیرۆسییە وروژێنەرەکانی بەرێت. جووتبوون بەرەتکردنی چووك بۆ ناو زێ دەستپێدەکاتو لەرێگەی جوڵەی هێواشەوە هەستی پێدەکاتو بەدواییدا وچانی بێ جوڵە دێت، کاتێك پیاو هەستی بە نزیکبوونەوەی رووداني هاویشتن(رژاندن) کرد، پێویستە جووتبوون بوەستێنێتو دواتر سەرلەنوێ دەستپێبکاتەوە، ئەم هەوڵانە چەند جارێك دووبارە دەکرێنەوە، لەماوەی دوو هەفتە لەئەنجامدانی ئەم راهێنانەدا ژن لەکاتی جووتبووندا دەگاتە ئۆرگازم.

–راهێنانی سێیەم: راهێنانی دیکە هەن ئامانجی زیادکردنی



هەستیارێتی زێیە بەهۆی گەمەبازییەکی چڕ لەسەر ئاستی دەرچەی زێ، ئەم راهێنانانە لەرێگەی گرژکردنی ماسولکەکانی دەوروپشتی(زێ)وە لەکاتی جووتبووندا و بێگەیشتن بە ئۆرگازم، ئەنجام دەدرێن.

پیاوەکە لەسەر پشت پاڵ دەکەوێت، هاوسەرەکەی لەسەرەوە دەبێت تاکو بتوانێت بەشێوەیەکی باش میتکە بوروژێنێت، لەهەمانکاتدا ئەم دۆخە یارمەتی ژن دەدات بۆ وروژاندنی میتکەو زێ، یارمەتی ژن دەدات بۆ بەستنەوەی وروژاندنی دەرەکیی بە وروژاندنە ناوەکییەکانەوە، کاتێك هەست بە نزیکبوونەوە لە گەیشتن بە ئۆرگازم دەکات دەستبەرداری وروژاندنی میتکە دەبێت، بایەخی لەسەر وروژاندنەکانی زێ چڕدەکاتەوە، تا دەگاتە ئۆرگازمی تەواو.

دوو هاوسەرەکە دەتوانن چەند جارێك ئەم راهێنانانە پراکتیزە بکەن، لەدوای تێپەڕبوونی چوار تا پێنج هەفتە بەسەر ئەم جۆرە راهێنانانەدا کار بۆ بڕواپێهێنانی ژن دەکرێت بە پشتنەبەستن بە وروژاندنی میتکە لەکاتی جووتبووندا و چڕکردنەوەی بایەخ تەنیا لەسەر وروژاندنەکانی زێ.

## چارەسەرکردنی گرژبوونی زێ لەژندا:

چارەسەرکردنی سایکۆلۆژی سەرەتا بە (ئاشکراکردنی ململانێ سایکۆلۆژییە نەستییەکانو شیکردنەوەی ئەو توخمانەی لەپشت ترسی جوتبوونەوەن، دەستپێدەکات، پاشان پێویستە ژن دڵنەوایی بکرێتو هانبدرێت، لەدوای رزگاربوون لەم ترسە دەستدەکرێت بە جێبەجێکردنی راهێنانەکانی لابردنی هەستیاری

(desensibilisation)[٢٦]. ئەم ڕێگەیە پشت بە نەهێشتنی گرژبوونی زێ‌و گونجاندنی، دەبەستێت، ئەمیش لەڕێگەی ڕەتکردنی تەنی قەبارە جیاواز (واتە وردەوردە لە پچوکەوە بۆ گەورەتر) بەناو زێدا، تا ژن بتوانێت ڕەتبوونی چووك وەربگرێت‌و بەرگەی بگرێت.

سەرەتا داوا لەژن دەکرێت بحەوێتەوە واتە خاوبێتەوەو لە ئاوێنەیەدا چاودێری دەروازەی زێی خۆی بکات، پاشان داوای لێدەکرێت پەنجەی ناوەڕاستی بخاتە ناو دەروازەی (زێ)وەو بزانێت هەستی چۆنە، پاشان ئەو هەستانە لەلایەن چارەسەرسازەوە دەپشکنرێن، لەقۆناغی دووەمدا داوای لێدەکرێت پەنجەی بەتەواوەتی ڕەتبکات، پاشان دوو پەنجەی بەیەکەوە، لەدواییدا داوای لێدەکرێت تەنی لاستیکی یان شوشەیی بە قەبارەی جیاواز، ڕەتبکات‌و دەکرێت Tamponیش ڕەتبکات‌و بۆ ماوەی چەند سەعاتێك لەناو زێدا بەجێیبهێڵێت تا هەست بە حەوانەوەی تەواوبکات)[٢٧]. لەوانەیە ژن بەهۆی ڕەتکردنی ئەم تەنانەوە بۆ ناو زێ هەست بەناڕەحەتی یان دڵەڕاوکێ بکات، ئەگەر توانی بەرگەی ئەم هەستانە بگرێت، لەدوای ماوەیەکی کورت ئەم نیشانانە نامێنن‌و هەست بە حەوانەوە دەکات.

لەدوای ماوەیەك لەم ڕاهێنانە بە تەنیا (واتە ژنەکە خۆی بە تەنیا ئەنجامی دەدات)، داوا لەپیاوەکە دەکرێت هاوبەشی ئەم ڕاهێنانە بکات‌و هەمان ڕێگە دوبارە بکاتەوە کە ژنەکەی لەڕاهێنانی یەکەمدا، پەیڕەویکردووە. دەکرێت ماوەی دوو هەفتە لەسەر ئەم ڕاهێنانانە بەردەوام بن، داوا لەپیاوەکە دەکرێت لەماوەی ئەم ڕاهێنانانەدا لەگەڵ ژنەکەدا جووت نەبێت‌و گەمەبازییە سێکسوالییەکان جگە لەئەندامەکانی زاوزێ هەموو بەشەکانی لەش بگرێتەوە، داوا لەدوو



هاوسەرەکە دەکرێت ڕووت بن‌و لەکەشێکی خۆشەویستیی‌و ئاسوودەیدا، گەمەبازی لەگەڵ یەکتریدا بکەن. هەروەها داوا لەژن دەکرێت لەم دۆخەدا خەیاڵ لەکرداری ڕەتبوون، بکاتەوە.

پێویستە ئەم ڕاهێنانە بۆماوەی دوو تا سێ هەفتە جێبەجێبکرێت، تا ئەم قۆناغەی داهاتوو دەستپێدەکات:

ئەم قۆناغە پشت بە ڕوودانی جووتبوون دەبەستێت، بەڵام بۆئەوەی ژنەکە لەهەر نوشوستییەك دوربکەوێتەوە، ئامۆژگاری دەکرێت بەوەی کە ئەو دەستپێشخەری بکات‌و دۆخی سەرەوە لەکرداری جووتبوونەکەدا وەرگرێت، کاتێك توانی ئەمە بکات داوالێدەکرێت لەجوڵە بوەستێت، تا هەست بەبوونی چووك لەناو زێیدا بکات‌و لەسەری ڕابێت، ئەم دۆخە یارمەتی ژن دەدات بەشێوەیەکی تەواو هۆشی لەسەر هەستەکانی چڕ بکاتەوەو بە تێپەڕبوونی کات هەستیارێتی زێ‌و ئەو ترسانەی پێوەی پەیوەستن ڕابماڵێت، ژن‌و پیاو دەتوانن بۆ ماوەی دوو هەفتە یان زیاتر ئەم ڕاهێنانە پراکتیزە بکەن‌و پاشان ئەو دۆخە پەیڕەوبکەن کە خۆیان ئارەزووی دەکەن‌و ئەگەر خۆیان ویستیان بگەنە ئۆرگازم.

## چارەسەرکردنی ئازاری جووتبوون لەژندا:

ئەگەر هۆکاری ئازاری جووتبوون dyspareunie ئۆرگانی (ئەندامی) بوو لەم حاڵەتەدا پێویستە چارەسەرکردن بەشێوەی پزیشکیی یان نەشتەرگەری بێت. بەڵام ئەگەر هۆکاری سایکۆلۆژی بوو ئەوا ئامۆژگاری دەکرێت پشت بەچارەسەری سایکۆلۆژییانە ببەستێت،. هەرچی ڕێگە بەکارهێنراوەکانیشن لەچارەسەرکردنی

ئازاری جووتبووندا، هەمان ئەو ڕێگا بەکارهێنراوانەن کە لەچارەسەرکردنی گرژبوونی زێدا پەیڕەودەکرێن و پێشتر باسمانکرد.

## چارەسەری پەککەوتنی سێکسوال لەپیاودا:

چارەسەری پەککەوتنی سێکسوال impuissance لەپیاودا بەمشێوەیە دەکرێت:

–ڕاهێنانی یەکەم: (لەسەرەتادا داوا لەژن و پیاو دەکرێت دڵدارییەکی هێمنانە ئەنجامبدەن، بەڵام بێ پەنابردن بۆ هیچ کارێکی سێکسوال. پێویستە رووت بن، داوا لەپیاوەکە دەکرێت مەمکی یان کۆئەندامی زاوزێی ژنەکەی نەوروژێنێت، هەروەها داوایلێدەکرێت خۆپەرست بێت و بیری لەسەر هەستەکانی خۆی چڕبکاتەوەو بایەخنەدات بە وەڵامدانەوەی سێکسوالی ژنەکەی).[٢٨]

چارەسەرەکەش ئامانج تێیدا ڕێگەگرتنە لەجووتبوون یان ڕێگەگرتن لەگەیشتن بە ئۆرگازم و لەوێشەوە سڕینەوەی ئەو دڵەڕاوکێیەی کە بەندە بەکاری سێکسواڵەوە، ئەمبارە بۆماوەی دوو یان سێ هەفتە بەردەوام دەبێت، ئەگەر لەم قۆناغەدا ڕەپبوون لەپیاودا ڕوویدا ئەوە مانای وایە کۆئەندامی زاوزێی بەشێوەیەکی باش کاردەکات، ئەگەر هیچ ڕەپبوونێك ڕووینەدا، ئەوا پێویستە پیاوەکە دڵنیابکرێتەوە لەوەی بەشێوەیەکی کاوەخۆیی دەبێت ڕەپبوون هەر ڕووبدات.

لەکاتی ئەم ڕاهێنانانەدا پێویستە بیرۆکەیەك دەربارەی بەرەوپێشچوون و ڕێڕۆیشتنی چارەسەرەکە بە پیاوەکە بدرێت یان بۆی ڕونبکرێتەوەو، هەروەها پێویستە ململانێی سایکۆلۆژیی و



هەستکردن بە گوناه کە پەیوەستن بە کاری سێکسواڵەوە، ئاشکرابکرێن.

–ڕاهێنانی دووەم: لەم ڕاهێنانەشدا داوا لەژن و پیاو دەکرێت پەنا نەبەنە بەر جووتبون تەنانەت ئەگەر ڕەپبوون لەچوکیشدا ڕوویدا، داوا لەژن دەکرێت ئاماژە بەوشوێنانەی جەستەی بدات کە هەستیارن لەجەستەیداو بە هاوسەرەکەی بڵێت کامانەن. پیاو لەم ڕاهێنانەدا دەتوانێت گەمەبازی بە ئەندامەکانی زاوزێی هاوسەرەکەی بکات، ئەگەر ڕەپبوونیش ڕوویدا دەبێت پیاو دڵنەواییی بکرێتەوە، دەتوانن هەردووکیان لەسەر گەمەبازییەکەیان بەردەوام بن، ئەگەر پیاو هەستیکرد لەئۆرگازم نزیکبۆتەوە ئەوا داوای لێدەکرێت گەمەبازی بوەستێنێت و دۆخەکە بگۆڕێت، پاشان لەدوای پشوویەکی کەم، دەستپێبکاتەوە.

پیاو دەتوانێت لەماوەی قۆناغەکەدا، ڕەپبوونی تەواوی دەستبکەوێت، بەڵام پێویستە لەسەری نەگاتە ئۆرگازم یان ڕژاندن و ئەگەر نەیتوانی کۆنترۆڵی خۆی بکات دەتوانێت کرداری ڕژاندن ئەنجامبدات و ئەمەش کارناکاتە سەر بەردەوامبوونی چارەسەرەکە. ئەگەر پیاوەکە لەگەڵ ئەم ڕاهێنانەدا وەڵامدانەوەی نەبوو یان چارەسەری نەبوو، دەتوانرێت بۆزانینی هۆکاری دڵەڕاوکێ و چارەسەرکردنی پەنا بۆ چارەسەری سایکۆلۆژیی ببرێت.

ڕاهێنانی سێیەم: لەماوەی ئەم ڕاهێنانەدا کۆنترۆڵکردنی ڕەپبوونی چووك بەردەوام دەبێت، ڕێگەی پەستان خستنەسەر چوك پەیڕەو دەکرێت(کە لەبابەتی چارەسەرکردنی خێرا ڕژاندن لەپیاودا باسیدەکەین)، پیاو لەم قۆناغەدا دەتوانێت بگاتە ئۆرگازم، بەڵام

پێویسته ئەمه لەدەرەوەی زێ بێت، واته به ڕێگەی جیاواز، جگه لەجووتبوون.

-ڕاهێنانی چوارەم: کاتێك ڕەپبوون ڕوودەدات، پیاو لەگەڵ ژنەکەیدا دەست به جووتبوون دەکات و داوای لێدەکات پەلەنەکات لەجوڵەدا، پیاو لەمبارەدا هەست بەچێژ دەکات و بەکاوەخۆ دڵەڕاوکێی نامێنێت و دەتوانێت کرداری ڕژاندن ئەنجامبدات و بگاته ئۆرگازم ئەگەر خۆی ئارەزووی کرد.

## چارەسەرکردنی ڕژاندنی خێرا لەپیاودا:

چارەسەرکردنی هاویشتنی خێرا (زوو ڕژاندن) Ejaculation premature لەپیاودا بەمشێوەیە ئەنجامدەدرێت: پیاو پاڵدەکەوێت و گەمەبازی به چووکی دەکات، تا ڕەپبوون ڕوودەدات، کاتێك هەستی به نزیکبوونەوەی ڕژاندن کرد پەستان دەخاته سەر لێواری چووکی تا هەستکردن به هاویشتن رابگرێت(بوەستێنێت). هەرچی ڕێگەی پەستان خستنەسەر چووکیشه، بەمشێوەیه ئەنجامدەدرێت: (پیاو چووکی دەخاته نێو لەپی دەستیی و دوو پەنجەی بەرامبەریشی ڕاستەوخۆ دەخاته سەر کڵاوەی چووك glande و به توندی بۆماوەی سێ چرکه فشار دەخاتەوه سەر کڵاوەی چووکیی و بەمه چووك بەشێك لەرەپبوونی لەدەستدەدات، پاشان دووباره هەوڵدەدات گەمەبازی به چووکی بکات، بەهەمانشێوه لەکاتی هەستکردن به نزیکبوونەوه لەرژاندن فشار دەخاتەوه سەر چووکیی، ئەم کرداره چوارجار دووباره دەکاتەوه بێ ڕوودانی



ڕژاندن، واته بێئەوەی بیەڵێت تۆو بڕژێت)[٢٩]

پیاو لەدوای تێپەڕبونی سێ ڕۆژ بەسەر ئەم ڕاهێنانەدا دەتوانێت کۆنترۆڵی گەڕاوەی هاویشتنی تۆو بکات و به قۆناغه یەکبەدواییەکەکانی وروژاندن لای خۆی ئاشنا ببێت.

دوو هاوسەرەکه دەتوانن لەرۆژی چوارەمدا جووتبوون پراکتیزه بکەن، کاتێك پیاو هەست به ئارەزووی ڕژاندن دەکات جووتبونەکه ڕادەگرێت، بۆ ماوەی سێ چرکه پەستان دەخاته سەر چووکی و پاشان دووباره هەوڵی جووتبوون دەداتەوه، بەمشێوەیه دوو هاوسەرەکه دەتوانن لەماوەی هەفتەیەکدا (١٥- ٢٠) دەقیقه ئەم کاره دووباره بکەنەوه. پیاو لەماوەی چەند هەفتەیەکدا دەتوانێت دەسەڵاتی تەواو بگرێت بەسەرکرداری ڕژاندندا، بەڵام کۆنترۆڵی تەواو بەدینایەت لەپێش تێپەڕبوونی چەند مانگێك بەسەر ئەم ڕاهێنانەدا، ژن و پیاو لەم ماوەیەدا ئامۆژگاری دەکرێن هەفتەی جارێك ڕێگەی پەستان خستنەسەر چووك پراکتیزه بکەن.

## چارەسەرکردنی دواکەوتنی ڕژاندن لەپیاودا:

پیاوی تووشبوو به دواکەوتنی ڕژاندن (درەنگ هاویشتن) Ejaculation retardee دەتوانێت لەبارودۆخی دیاریکراودا کرداری ڕژاندن ئەنجامبدات، لەبەرئەوه داوای لێدەکرێت لەژوورێکدا بەتەنیا ماستەربەیشن بکات و پەنا بۆ فەنتازیا ئیرۆسییەکان لەکاتی ئەم پراکتیزەکردنەدا بەرێت.

وا پێویستدەکات پیاو چەند جارێك ئەم کرداره دووبارەبکاتەوه،

**تا دەتوانێت کۆنترۆڵی تەواو بەسەر کرداری رژاندندا بکات. پیاوەکە ئامۆژگاری دەکرێت لەم ماوەیەدا کتێبی سێکسوال بخوێنێتەوە، تەماشای فیلمی سێکسوالی وروژێنەر بکات. ئەو پیاوە لەدوای تێپەڕبوونی ماوەیەك بەسەر ماستەربەیشن– Masturbation دا، کاتێك دەگاتە ئاستێکی دیاریکراو لەوروژاندن، کرداری جووتبوون دەکاتو لەم حاڵەتەدا دەتوانێت لەناو زێدا رژاندنەکە ئەنجامبدات. دووبارە کردنەوەی ئەم هەوڵانە لەماوەیەکی زەمەنی دیاریکراودا، یارمەتی ئەو پیاوە دەدات لەدڵەڕاوکێکەی رزگاری ببێتو توانای کۆنترۆڵکردنی رژاندن لەکاتی جووتبووندا بەدەستبێنێت.**



**پەراوێزەکانی وەرگێڕ:**

(ا) ماستەربەیشن– Masturbation: لەکولتوری کورداندا بە دەستپەڕ ناودەبرێت، زانستییانە دەستبردنو یاریکردن بە ئەندامی زاوزێو وروژاندنی لەپێناوی چێژبینینی سێکسوالیو گەیشتن بە ترۆپی چێژ یان ئۆرگازم دەگەیەنێت.

(ب) ترۆماتیزم یان تراوما:ئەو زامە دەروونیەیە لەئەنجامی رووداني کارەساتێکی ناخۆش بەجێدەمێنێت، بۆ نموونە شایەتحاڵی شەڕو کوشتارەکان ناتوانن یادەوەرییە ناخۆشەکانی جەنگ لەیاد بکەن.

## پەراوێزەکان:

1-VAINIEFF P GONDONNEAU J., Le couple et l,amour, paris, Ed. France Loisirs, 1973, p p. 13-32.
2-DOLTO F., Sexualite feminine, paris, Ed. Scayabee, 1982.
3-CREPAULT C., "Limaginaire etrotique" ,in Sexologie contemporaine, p.u. du Quebec, 1981.
4-GRUYERF., Ce paradis trop violent, paris, Laffont, 1984.
5-KINSEY A.C., Le comportement sexuel de la femme, paris., Dumont, 1954.
6-SHERFEY M.J., The evolution and nature of female sexuality, journal of the American psychanali, 1966.14 p p.88-100.
7-FISCHERS., Le secret, paris, Ed, grasset, 1973.
8-MASTERS et JONHSON., les mesententes sexuelles, paris, laffont, 1971, p.222.
9-Ibid., p.95.
10-ABRAHAM G.porto R., psychanalyse et therapies sexologiqyes, paris, payot, 1978, p.214.
11-TORDIMAN G., La femme et son plaisir, paris, londregs, 1986, pp.346-349.
12-TORDJMAN G., La violence, le sexe et lamour, paris, Ed R. Laffont, 1980.
13-TORDJMAN G., La maladie conjugale, paris, Denoel, 1973.
14-WINNICOTT D.W., Les erocessus de



maturation chez lenfant. Tr. Paris, payot, 1974, p p.40-60.
15-LEMAIRE J-G., Le couple: sa vie, sa mort, paris, pagot, 1979, p. 56.
16-PASCHE F., "L antinarcissisme" in Rev. Franc. Psychoanal, 1965, T. XXIX, No. 5-6,PP.503-518.
17-TORDJMAN G., La femme et son plaisir, paris, Londreys, 1986, p.214.
18-TORDJMAN G., Realites et problemes de vie sexuelle, paris, Hachette 1975.
19-GIRAUD R., "Misandrie, Mysogynie et Misoconfusion" ,in cahiers de sexology chinique, No. 72,1986,p.58.
20-ibid., p. 122.
21-VINCENT J-D., Biologie des passions, paris, seuil, 1986.
22-ABRAHAM G., PORTO R., Psychanalyse et therapies sexologiques, paris, payot, 1978, p. 192.
23-MASTERS et JONHSON., Les reactions sexuelles, paris, Laffont, 1968, pp. 20-30.
24-MASTERS et JONHSON., Les mesententes sexulles, paris, Laffont, 1971, pp.271-287.
25-PASINI W. voir ABRAHAM G., Introdution a la sexology medical, paris, payot, 1974, p.199.
26-PASINI W., "La sexotherapie en 1974" ,in Dialogue, 1976, No. 51, pp. 11-18.
27-KAHN-NATHAN J., Dyspareunie et vaginisme, in Cahiers de sexologie clinique, vol, 3,

1976.
28-MASTERS et JONHSON., Les mesententes sexuelles paris, Laffont, 1971, pp. 181-196.
29-Ibid., p.102-110



## بەشی دوانزەیەم

# گیرگرفتەكانی هاوسەرێتیو پشێوییەكانی منداڵ

### روخساری گواستراوە لەرێگەی نەوەكانەوە: وەسیەتنامەو ئەركەكان:

ئەو خاسیەتەی كە رێكخستنی خێزانی لەسەرجەم رێكخستنە مرۆییەكانی دیكە جیادەكاتەوە، لەبەدوایەكداهاتنی نەوەكانەوە سەرچاوەی گرتووە. ئەم بەدوایەكداهاتنە وادەكات داڕشتنی یاسا لەئاڵوگۆڕكردنی دادپەروەرانەدا ئەستەم بێت، بەتایبەتی ئەوانەی پەیوەندییان بە ئەركو قەرزەوە هەیە، بەرامبەر بەنەوەی پێشوو(واتە خێزان)، چونكە ئاڕاستەیەكی ئاڵوگۆڕنەكراو لەبەخشینەكەدا les dons هەیە: لەقۆناغی منداڵیدا هەموو شتێك وەردەگرین یان پێویستە هەموو شتێك لەدایكو باوكەوە وەربگرینو لەدواییدا بەشێك لەوەی وەرمانگرتووە بۆیان دەگەڕێنینەوە، بەڵام لەواقیعدا ئەوەی وەرمانگرتووە دەیگەڕێنینەوە یان دەیبەخشین بە نەوەی دوای خۆمان (واتە منداڵەكانمان). ئەم رێسایە لەلایەن هەریەكەمانەوە دەبوژێنرێتەوە (دەژێتەوە)و پشت بەكۆمەڵێك پێودانگ دەبەستێت، كە زۆرجار دەوترێت ئەمانە پێودانگی سروشتین.

–چەمکی وەسێتنامە هاوکاتە لەگەڵ ئەو ئەزموونە جیاوازانەی کە تاك تیایانـدا دەژیو لەسـەر ئاسـتی نەسـت بەچـەند دیاردەیـەك لێكدەدرێتەوە، ستێرلن stierlin [١] ئەرکەکان missionو وەکالەت delegation –ی وەك گوزارشـتێك لەچـەمکی وەسـێتنامە داڕشتۆتەوە: کوڕ بەشێوەیەکی نەستیی یان شاراوە لەلایەن باوکەوە، ژمارەیـەك ئـەرك وەردەگرێـت کـە ئـەم ئەرکانـە وەك سـنوورێکی دیاریکراوی هاندەریی یان پاڵنەریی، کاردەکەن.

کوڕ ئەو فرمانە جێبەجێدەکات، وەك بڵێی بەزۆر پاڵی پێوەنراوە بـۆ ئەنجامـدانی ئـەو پەیامانـە یـان ئـەو ئەرکانـە. ئـەم دیاردەیـە دیاردەیەکی گشتییەو مەرج نییە نەخۆشی بێت، چونکە لەوانەیە ئەو کوڕە دڵخۆش بێت کاتێك هەوڵدەدا ئەرکەکەی جێبەجێبکات، بەمە جەختلێکردنەوە لەنارسیزمی چنگ دەکەوێت: دانی پێدا دەنرێت وەك کەسێکی خاوەن بەهاو باش، هەروەها خۆیشی هەستدەکات کە بۆتە بابەتی خۆشەویستی...

بەڵام ئەم پرۆسەیە لەوانەیە لەبەر کۆمەڵێك هۆکار ڕێگەی لێبگیرێتو سەرنەکەوێت، ئەویش وەك:

١– لەوانەیە کوڕ بەهۆی ئەو ئەرکەوە تووشی ماندووبوون ببێت، بەهۆی ئەوەی ئەو ئەرکە لەتوانای خۆی گەورەتر بووە، لەبەرئەوە لەئەنجامدانیدا شکستدەهێنێت.

٢– یان لەوانەیە سەرکەوتن بەدەستنەهێنێت تەنیا لەسەر حیسابی زیانلێکەوتنی لایەنەکانی دیکەی کەسێتییەوە، نەبێت: بۆ نموونە لەتاقیکردنەوەیەکی تایبەتدا سەرکەوتن بەدەستدەهێنێتو جەخت لەخودی خۆی وەك تاکێکی نایابو تێروتەواو دەکاتەوە لەناو



خێزانەکەیدا، بەڵام ئەم کارە لەسەر حیسابی ڕەتکردنەوەی توانا سۆزدارییو داهێنانو هونەرییەکانی دیکەی خۆی، بەڕێوەدەچێت.

٣– هەروەها ئەگەر کوڕ کەوتە ناو ململانێی ئەرکەکانەوە پرۆسەکە شکستدەهێنێت، بەتایبەتی ئەگەر کۆمەڵێك ئەرکی دژبەیەکی خرایەئەستۆ، جێبەجێیان بکات، کە سەرچاوەی ئەو ئەرکانە یەکێك بوو لەباوان، یان هەریەکە لەدایكو باوك بەجیا یان کەسێك بوو لەوانەی کە هەمیشە خێزانەکە پشتی پێدەبەستێت. بۆ نموونە داوای لێدەکرێت ببێتە پاڵەوانێك، پاڵەوانێکی دیاریکراو لەخێزانەکەیدا، یان ببێتە شۆڕشگێڕێك لەپێناوی ئازادیداو لەهەمانکاتدا خاوەنی دەسەڵاتێکی بەهێز بێت تا بتوانێت بەسەر هەمووان‌دا بسەپێنێت یان خۆی ببێتە پاڵەوانو لەپێناوی سەلماندنی ئەو پاڵەوانێتییەدا ببێتە قوربانیو خۆی بەکوشت بدات.

٤– هەروەها پرۆسەکە شکستدەهێنێت ئەگەر کوڕەکە کەوتە ململانێی ئەو ئەرکانەوە کە ئەستەمە دانیان پیادا بنرێت، کە زۆرجار بە چەپێنراوی دەمێننەوە، ئەم ئەرکانە هاوچەشنیکردنی ڕەتکراو recusees Identificationsی نەخواستراو دەسەپێنێت، یان ناتوانێت بەرگەی ئەو ئەرکانە بگرێت (وەك تۆڵەکردنەوەی باوکێکی خراپو بەدڕەفتار)، هەروەها لەوانەیە ئەو پرۆسەیە شکستبێنێت ئەگەر ئەو کەسە جێبەجێکردنی ئەرکێکی نادیاری خرایەئەستۆ کە بێ ئابڕووبردنو شەرم بەدینەیەت یان دانی پیادا نەنرێت (واتە ئەو ئەرکە بەدینایەت ئەگەر ئەنجامدانی نەبووە هۆی ئابڕووبردنو شەرم بۆ ئەو کەسە)... (وەك حاڵەتی تۆڵەکردنەوەی پیاوکوژو لەچارەنووس نووسراو، ئەفسانە oreste, antigone ،... هتد).

## پشێویی پەیوەندییەکانو کاریگەری لەسەر گەشەی منداڵ:

دۆخی پاسۆلۆژیی pathogene کاریگەری لەسەر منداڵ لە (قۆناغی دروستبووندا) دەبێت، کە باوان (دایكو باوك) لەرێگەی شەڕانگێزییەکی ئاڵوگۆڕکراوەوە، ئاشکرایدەکەن (دەیخەنەڕوو)، ئەمە لەوکاتەدایە منداڵ بەشێوەیەکی توند، پەیوەستە پێیانەوە یان ناچارە بەجیا لەگەڵ هەریەکەیاندا هاوچەشنی بکات، لێکۆڵینەوە نوێیەکان ئاشکرایانکردووە ئەو منداڵانەی بە دەست لەبەریەکهەڵوەشانی پەیوەندییە خێزانییەکانەوە یان بوونی ناکۆکی درێژخایەن لەنێوان دایكو باوکدا ناڵاندوویانە، دوچاری پشێوی بوون.

لەم نێوکۆیەدا پێویستە ئاگاداری ئەوەبین شێواوی پەیوەندی لەچوارچێوەی خێزانیدا لەوانەیە رۆڵێکی نەخۆشی یان پاسۆلۆژی دیکە ببینێت، بەتایبەتی لەوەدا کە پەیوەندی بە مەسەلەی رقلێبونەوەی دووانییەوە contraintes double هەیە، کە منداڵی پاشکۆ لەرووی سۆزدارییەوە بێ ویستی خۆی ملکەچی دەبێت، چونکە بە پێچەوانەی گەورەکانەوە، ناتوانێت لەڕێگەی راکردن یان جیابوونەوە، رزگاری ببێت، (واتە راکردن یان جیابوونەوە لەرق)، کەواتە ئەو منداڵە ناچارە دەستبەرداری بوونە سایکۆلۆژییەکەی خۆیی و (من-moi) ببێت، چونکە ناتوانێت خۆی رزگار بکات.

لەبناغەدا ئارەزووی دەستکەوتنی یان بوونی منداڵێك، بۆ قوڵایی



زۆر لەمێژینەی بونەوەری مرۆیی، دەگەڕێتەوە کە خۆشەویستیی و خاوەنداریێتی پەیوەندی زۆر توندییان پێکەوە هەیەو بوونو خاوەنداریێتی بە باشی لێکجیاناکرێنەوە. ئەگەر بەهۆی ئەو منداڵەوە کە خاوەنین پێمان لەسەر بوون داگرتو بەهۆیەوە لەژیاندا مابوینەوە ئەوا ئەمە لەبەرئەو هۆیەیە کە بەنرخترین ئەوەی هەمانە لەودا چڕمانکردۆتەوەو لەسەر ئاستی نارسیزمی وەك پاشکۆیەك بۆ خۆمانو بۆخودی خۆمان annexe دەژین: لەوبارەدا کە ئەم هەڵوێستە درێژەدەکێشێت هەڕەشە لەسەربەخۆیی منداڵ دەکاتو تێکیدەشکێنێت. هەموو خستنەپاڵەکان دەشێت بخرێنەپاڵ ئەو منداڵە بە هەموو دژ بەیەکییەکانی کە پەیوەندیکردنێکی قوڵ لەنەستەوە بۆ نەست وایلێدەکات هەستیپێبکات، بەڵام ناتوانێت روونیبکاتەوەو رەتیبکاتەوە. لەمبارەدا ئازار دەچێژێت، چونکە خاڵی بەیەکگەیشتنی ئەو ئارەزووانەیە کە مەرج نییە هەمیشە ئالودەی یەکتری بن.

-دانیشتنە کلینکییەکان جەختیان لەوەکردۆتەوە هەندێك لەخێزانەکان لەناخیاندا پێکەوەناگونجێن لەنێوان یەکتریدا بەو مەرجە نەبێت یان تەنیا لەسەر حیسابی ملکەچکردنی منداڵ نەبێت بۆ بینینی رۆڵێکی تایبەتی کە زۆرجار ئەم رۆڵ بینینە دەرئەنجامی نەخۆشی یان پاسۆلۆژیی لەسەر منداڵەکە جێدەهێڵێت، بۆ نموونە منداڵ رۆڵی قوربانی دەبینێت (مەقاشی سوتانگە)[*] کە هەڵەکانی دوو هاوبەشەکە (دایك و باوك)-ی خراوەتە ئەستۆ، یان بە دەستەواژەیەکی دیکە کراوەتە نمایندەی representant ی پاڵنەرە رەتکراوەکان، یان ئەو هەڵەو هەڕەشانەی ئەو دایك و باوکە بۆ

دەرەوەی خۆیان فڕێی دەدەن، بە تایبەتی دەیخەنەپاڵ منداڵەکەیان، ئەو شتانەی کە خۆیان ناتوانن بەرگەی بگرن، یان لەقوڵایی خودی خۆیاندا ئاشکرای بکەن.

هەروەها لەم نێوکۆیەدا، هەندێك چاکسازیی دیکە لای خێزان هەن کە منداڵ هاندەدەن بۆ نواندنی رەفتارێکی تایبەتی، کە لەوانەیە ئەم رەفتارە یارمەتیدەر بێت بۆ دەرکەوتنی گیروگرفتو ئەستەمی لای منداڵەکە، کە لەوانەیە ئەگەر ئەم هاندانە induction نەبووایە، بە شاراوەیی بمایەتەوە: بە باشی ئەوە دەزانین زۆربەی منداڵان دووچاری ئەستەمی دەبن لەتێپەڕینی کێشبەندی ئۆدیبی، ئەمەش لەوبارەدا کە باوان (ئەوەیان کە وا پێویستدەکات بەشێوەیەکی سەرەکی هاوچەشنی لەگەڵدا بکات) نەگەیشتۆتە حاڵەتی چارەسەرکردنی کێشەبەندیی خودیی، ئەم باوکە زیاتر وەك دوژمن یان کێبڕکێکار وەڵامدانەوەی دەبێت، نەك وەك باوك، بەمشێوەیە منداڵەکە دەبێتە ئەلتەرناتیڤی ئەو شتانەی کە باوکی رەتیاندەکاتەوەو لەخودی خۆیدا بەرگەیان ناگرێت، یان ئەوانەی کە خۆی ناتوانێت لەخودی خۆیدا بەرگەیان بگرێت بە رێگەیەکی شاراوە یان– تەنانەت دەمامککراو– داوای ئەو شتانە لەمنداڵ دەکرێت، کە ناتوانێت پێی ببەخشرێت.

لەهەڵوێستێکی دیکەدا، منداڵ بێسوود لەچوارچێوەی پەیوەندیی خێزاندا هەوڵدەدات لە دەرگایەکی کڵۆمکراو بدات کە تیایدا بارودۆخی نێوان دایكو باوکەکە لەئەنجامی بەدحاڵیبونێکی درێژخایەن یان حاڵیبوونێکی شاراوەی پەردە پۆشکراو، زیاتر خراپ بووە کە پەیوەندیی نێوانیان لەو جۆرە بووە کە پشتیبەستووە بە



گۆشەگیریو دوورەپەرێزی لەجیهانی دەرەوە کە ئەمەش لەوانەیە منداڵ زیاتر جیابکاتەوەو هیچ کەسێکی دەستنەکەوێت پەنای بۆ بەرێت، یان پەیوەندی لەگەڵدا بکات نە لەناوەوەو نە لەدەرەوە. بەمشێوەیە لەسەر حیسابی کەسانی دیکە بەتایبەتی منداڵان (واتە منداڵەکانیان)، رێککەوتنی ئاشکرا لەنێوان دوو هاوبەشەکەدا بەدیدێت، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت هەمیشە پێکەوەگونجان لەنێوان دووهاوبەشدا وا پێویست بکات رەچاوی ئەم هۆیە بکات یان هەمیشە قوربانییەکی دیاریکراو هەبێت.

## نیشانەکانی بەدگونجان لەمنداڵدا:

دانیشتنە کلینکییەکان جەخت لەوەدەکەنەوە کە زۆربەی نیشانەکان لای منداڵ ("وەك پشێویی و خەوزڕان و دڵەڕاوکێ و شکستهێنان لەخوێندن، نەخۆشی دەروونیی و نەخۆشی دەروون– جەستەیی" تەنیا گوزارشتێکی ئاشکران لەگیرگرفتە سایکۆلۆژییەکان کە لەنێوان دایكو باوکدا روودەدەن: کەواتە ئەو دەرئەنجامەمان دەستدەکەوێت بۆ چارەسەرکردنی منداڵ واپێویستدەکات ئەو ناوەندە چارەسەربکرێت کە ئەو منداڵە تێیدا دەژی، واتە ئەو خێزانەی کە کارلێکی لەگەڵدا دەکات) [٢].

منداڵ بەهەڵچوونو دڵەڕاوکێو پشێوی لەرەفتاردا وەڵامدانەوەی بۆ هەر گرژییەك، دەبێت کە لەنێوان دایكو باوکدا روودەدات، تەنانەت ئەگەر ئەم گرژییە سەرپێیی و کاتیش بێت، لەوبارەشدا ئەگەر گرژییەکە بۆماوەیەکی دوورودرێژ بەردەوامبوو، ئەوا وەڵامدانەوەی

منداڵەکە بەهێزتر دەبێت‌و کەسێتی منداڵەکەش بەشێوەیەکی تەواو تووشی پشێوی دەبێت، هەروەها کردارە سایکۆلۆژیی‌و جەستەییەکانیش لای ئەو منداڵە تێکدەچن. منداڵ ئەم گرژییانە بەشێوەیەکی نیگانمایی درك پێدەکات، تەنانەت ئەگەر دایك‌و باوك ویستیشیان لەبەرچاوی بیشارنەوە، لێرەدا هەندێکیان باسدەکەین:

– **نەبوونی ئاسوودەیی:** شەڕو تۆمەتبارکردنی یەکتریی‌و گوزارشتی زارەکیی‌و هەڵچوونی، کە لەنێوان دایك‌و باوکدا لەکاتی ناکۆکی‌و ئاژاوەکاندا روودەدەن، لەوانەیە دڵەڕاوکێ‌و پشێوی لەمنداڵدا دروستبکەن، ئەو منداڵە هەستدەکات بناغەی جیهان لەدەوروپشتی لەقیوە.چونکە هەستکردن بە ئاسوودەیی پێداویستی سەرەکی لای منداڵ دەنوێنێت، هەروەها فاکتەرێکی پێویستیشە بۆ پەرەسەندنی کەسێتیی‌و تەندروستی ئەقڵی: دارمانی ئەو پاڵپشتە سەرەکییەی کە منداڵ پشتی پێدەبەستێت (واتە هەستنەکردن بە ئاسوودەیی)، لەوانەیە پەرچەکرداری جیاواز لای بوروژێنێت: دڵەڕاوکێ، کاڵفامی، هەڵسوکەوتی گێلانە کە سەرنجڕابکێشێت، خۆخواردنەوە لەسەرخود، نەخۆشییە سایکۆلۆژیی‌و جەستەییەکان، ململانێی لەگەڵ خوشك‌و براکانیدا.

–**ئەستەمی هاوچەشنیکردن:** لەمنداڵدا (من–moi) بەهۆی هاوچەشنیکردنی هەمان توخم لەگەڵ باواندا دروستدەکات، بۆئەوەی ئەم هاوچەشنییە بەدیبێت پێویستە پەیوەندی لەگەڵ ئەم باوانەدا جێگیرو پۆزەتیڤ بێت. چونکە پشێوییەکانی خێزان‌و بەکارهێنانی منداڵ وەك هۆیەك بۆ زەوتکردن یان سزادان (منداڵ وەك ناوەندێك بەکاردێت‌و دەبێتە قوربانی ئامانجی دژبەیەك‌و بابەتی ئارەزووی



یەکێك لە دووهاوبەشەکە لە پێناوی زیانگەیاندن بە هاوبەشەکەی دی) هەروەها دەرکەوتنی ترس‌و گومان، ئەم گیرگرفتانە لەوانەیە ببنە بەربەست لەبەردەم کردارەکانی هاوچەشنیکردن لای منداڵ.

– **تێکدانی وێنەی هاوسەرێتی‌و خێزان:** ئەو ئەزموونانەی منداڵ سەبارەت بە پەیوەندی هاوسەرێتی خێزانەکەی تێیاندا ژیاوەو ئەو کەشە پڕ گیروگرفتەی ناو خێزانەکەی، لەوانەیە لە داهاتوودا ئەم وێنەیە رێسایەکی (نەستی) بۆ وێنەی هاوسەرێتی‌و خێزانیی لادروستبکەن. (ئەگەر خێزان بەمشێوەیە بێت نامەوێت خێزان دروستبکەم) ئەم بیرۆکەیە لەسەر ئاستی نەست پەرەدەسێنێت: بەشێوەیەکی (نەستی) ترس لەهاوسەرێتی گوزارشت لەترسی دووبارەبوونەوەی نموونەی نێگەتیڤی (هاوسەرێتی خێزان) دەکات کە ئازارو مەینەتی دەنوێنێت (واتە کاتێك منداڵ گەورەبوو وێنەیەکی خراپی خێزان لەمێشکیدا دەچەسپێت‌و لەمەوە لەپرۆسەی هاوسەرێتی دەترسێت– وەرگێر). ئەو گیرگرفتانەی رەنگدانەوەی لەسەر دەروونی منداڵ دەبێت، لەوانەیە زۆرێك لەبەها مرۆییەکان بڕمێنێت‌و مانای دواڕۆژ لای منداڵ تێکبدات، ئەم گیروگرفتانە لەوانەیە یەکێك بن لەو هۆکارانەی پاڵدەنێت بە گەنجانی هاوچەرخەوە بەشوێن بەختیاری وەهمیدا بگەڕێن یان پاڵییان پێوەدەنێت بۆ راکردنی تراژیدیایی‌و پەنابردن بۆ ماددە بێهۆشکەرەکان‌و شێوە شازەکانی هاوسەرێتی (هاوسەرێتی بە کۆمەڵ، هاوسەرێتی هۆمۆسێکسوال).

–**کەموکورتی لەکرداری گونجاندنی کۆمەڵایەتی:** فێربوونی رۆڵ‌و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لەچوارچێوەی ژیانی خێزانیداو

**(دواتریش قوتابخانە)دا بەرێوەدەچێت. چونکە رۆڵە نادیارو پەیوەندییە سۆزدارییە ناجێگیرەکان (نەچەسپاوەکان)و کەشی خێزانیی بارگاوی بە گیروگرفت، کە گرژی باڵی بەسەردا کێشاوە، منداڵ ناتوانێت بەلای یەکێك لەباوانیدا پێرابکێشێت (چونکە بە راستی هیچ کامیان ناناسێت)، لەوانەیە بە تێپەڕبوونی کات ئەم بارودۆخە ببێتە هۆی ڕوودانی کەموکورتی یان شکستیی لەدروستکردنی پەیوەندی کۆمەڵایەتی ئارامو جێگیرداو رەتکردنەوەی هەموو کۆمەڵگە لەهەر جۆرو شێوەیەك بێت.**



## پەراوێزەکانی وەرگێڕ:

(*) مەقاشی سوتانگە: منداڵ دەبێتە قوربانی یان وەك مەقاشی سوتانگە بەکاردێت، مەبەست لەوەیە چۆن مەقاش بۆهەڵگرتنی کڵۆ خەڵوزی گەشاوە بەکاردێتو نابێتە هۆی سوتاندنی دەست، بە هەمانشێوە ئەو دایكو باوکانە منداڵ بەکاردەهێنن بۆ دوورخستنەوەی زیان لەخۆیانو هێشتنەوەی پەیوەندی نێوانیان بە ئارامی.

## پەراوێزەکان:

1-SRIERLIN H., Le premier entertien familial, trfr, Paris, Delarge, 1979 PP.43-55

2-MUCCHIELLIR.Psychologie de la vie conjugale, Paris, E.S.F, 1980

## بەشی سیانزەیەم

# کارلێککردن، دەستێوەردانو پشێوی تاکانەیی

### کارلێککردنو فەنتازیاو نەخۆشی:

جەی کۆسنەر J.cosnier[1] کارلێکی بەوە پێناسەکردووە کە پرۆسەیەکە تاك تیایدا کاردەکاتە سەر دەروونی ئەویدی، شیکارە سایکۆلۆژییەکان ئاماژەیان بە بایەخی کارلێکە فەنتازیاکان داوە، چونکە یارمەتیدەر دەبن لەپەرەسەندنی بایەخپێدانی زانستی لەلێکۆڵینەوە شیکارییەکانی کارلێککردنی نێوان ئەندامەکانی خێزانو پەیوەستی زنجیرەی کردارە تاکانەییەکانو بەتایبەتی ئەوانەی پەیوەندییان هەیە بە پەیوەندی ئاڵوگۆڕکراوی نێوان (دایك – کۆرپە) ەوە. کارە نوێیەکانی برازلتۆن Brazelton [2] و وینیکۆت Winnicott دەربارەی منداڵو سێرلس Searles دەربارەی سایکۆسس ئەنجامییانداوە، یارمەتیدەربوون بۆ ئاشکراکردنی کاریگەری کارلێکردنەکان چ لەرووی لایەنە پۆزەتیڤو پاسۆلۆژیی یان لایەنە چاکسازیی و هاندەرەکانەوە: چاکسازیکردن لەهەر کارلێکێکدا کە مەبەستی دروستکردنی ململانێیەکی سۆزداری بێت لای ئەویدی یان ئامانجی گەرمکردنی ململانێ بێت لە نێوان ڕوخسارە جیاوازەکانی کەسێتییدا.



کەواتە پێویستە بەئاگا بین لەتێگەیشتنی کاریگەری کارلێکە قوڵەکان، چونکە مەرج نییە ئەو کاریگەرییە، تەنیا نێگەتیڤو پاسۆلۆژی بێت، بەڵکو لەوانەیە کاریگەرییەکی پۆزەتیڤی هەبێتو زۆرێك لەشیکارکارە سایکۆلۆژییەکانی وەك (وینیکۆت winnicott وبایۆن Bion وستێرلن Stierlin ولیپۆڤیسی Lebovici) [3] ئاماژەیانداوە بە بایەخی کارلێکردنەکانی دەستێوەردانو پێویستبوونی ئەم کارلێکانە.

دەبینین بە گەڕانەوە بۆ بۆچوونەکەی بایۆن Bion [4]: تێپەڕبوون یان چوونە ناو ژیانی سایکۆلۆژییەوە (واتە بۆناو فرمانی ئەلفا Alpha) ڕوونادات، تەنیا لەوحاڵەتەدا نەبێت کە منداڵی شیرەخۆرە فەنتازیاکانی دایکی دەبڕێت Penetre. ئەمەی دواییان واتە ئەو دایکە بەهۆی هاوچەشنیکرنی خستنەپاڵەوە ڕووبەڕووی دڵەڕاوکێو پشێوی منداڵەکەی (ڕەگەزەکانی بێتا Beta) واتە ڕەگەزە ناسایکۆلۆژییەکان دەبێتەوەو سایکۆلۆژییانە وەریاندەگرێتو لەشێوەی سایکۆلۆژیشدا لەهزرو فەنتازیادا (واتە ڕەگەزەکانی ئەلفا Alpha) بۆ ئەو منداڵە شیرەخۆرەیەی دەگەڕێنێتەوە. (فرمانی ئەلفا Alpha)یان توانای فەنتازیاکردنی دایکایەتی ئەوە دەگەیەنێت دایك بتوانێت خەیاڵ بکاتەوەو منداڵەکەی ژیربکات کە توانا سایکۆلۆژییەکانی لەبیرکردنەوەو لێکدانەوەی هێماکاندا لاوازن، دایك لەفەنتازیادا Fantasmer هەڵچوونە زبرو ناخۆشەکان (درکپێکردنە هەستییە جەستەییەکان واتە ڕەگەزەکانی بێتاBetaی ناسایکۆلۆژی) ی ئەو منداڵە شیرەخۆرەیە بۆ نموونەی هزر Protopense، دەگۆڕێت.

ئەم بۆچوونەی کە بایۆن Bion پێشکەشیکردووە لەچارەسەرە خێزانییەکاندا بەکارهاتوون، بەتایبەتی لەپەیوەندییە زووەکاندا (لەنێوان دایك – کۆرپە) کە چارەسەرکار یارمەتی دایکەکە دەدات بۆ ئەوەی بتوانێت کۆرپەکەی ژێربکات penser و وایلێدەکات کە کۆرپەکەی بخاتە چوارچێوەی فەنتازیاکانییەوە.

لەلایەکی دیکەوە ستێرلن Stierlin لەلێکۆڵینەوەکانیدا سەبارەت بە کەسی شیزۆفرینیی و خێزانەکانیان، ئاماژەیداوە بە بایەخی سەرەکیی خاوەنداریێتی (واتە خاوەنداریێتی دایك بۆ منداڵەکەی).
چونکە لەپێش کرداری تاکانەیی و سەربەخۆییدا، تێپەڕین یان چوونە ناو ژیانی سایکۆلۆژیی منداڵ و چالاکیی فەنتازیی و درکپێکردنی جیهانی هێمایی، پێویستە، ئەمەش بەڕێوەناچێت تەنیا لەڕێگەی یەکەمین ئەزموونی خاوەنداریێتییەوە نەبێت بەهۆی وێنەی دایکایەتییەوە: منداڵ لەدایك دەبێت، دایکی دەبێتە خاوەنی و خۆراکی پێدەدات و بەخێوی دەکات، تا هێدی هێدی دەتوانێت جیابێتەوە لێی و خاوەنداریێتیی لەخۆی دابماڵێت و سەربەخۆ بێت (واتە منداڵەکە سەربەخۆ دەبێت).

## کەموکورتی نارسیزمی جێگیر:

لەوانەیە هەندێك لەخێزانەکان، بەڕێگەی جیاواز نەخۆشیهێن یان پاسۆلۆژیی بن Pathologene وەك لەڕێگەی شکستهێنان لەدابینکردنی جەختلێکردنەوە لەنارسیزم بۆ ئەندامانی خێزان. ئەم جەختلێکردنەوەیە پێداویستی سەرەکیی و هەنووکەیی بۆهەر



منداڵێك دەنوێنێت و منداڵ ناتوانێت جەختلێکردنەوە لەنارسیزمی دەستبکەوێت تەنیا لەڕێگەی روخسارەکانی سۆزوخۆشەویستیی و رێزی چاوەڕوانکراوی دایك و باوکەوە نەبێت. منداڵ پێویستی بە جەختلێکردنەوە لەهەستکردن بە ناسنامەی خۆی هەیە، خێزانیش ئەو گروپەیە کە لەکاتی ئەستەمی هەڵچوونەکاندا، پشتی پێدەبەستێت.

هەندێك خێزان هەر لەسەرەتای دروستبوونییەوە ئەم فرمانە جێبەجێناکات (واتە فرمانی دابینکردنی جەختلێکردنەوە لەنارسیزم)، بەجۆرەها هۆکاری جیاواز رێگە لەیەکێك لەئەندامەکانی دەگرێت جەخت لەخودی خۆیبکاتەوە، ئەویش بە رێگەگرتن لەگەیشتن بە کەسانی دی یان رێگەگرتن لەپەرەسەندنی توانا تایبەتییەکانی. هەندێکی دیکە لەم خێزانانە، لای ئەندامانی خێزان، کار بۆ داڕمانی توانای جەختکردنەوە لەخود، دەکەن، هەروەها کار بۆ نەپاراستنی رێزدانانی تاك بۆ خۆیی و خۆشەویستیی بۆ خودی خۆی، دەکەن.

– ئەو کاریگەرییەی لەم جۆرە پەیوەندییانەدا زیاتر پاسۆلۆژیین (نەخۆشیهێنن)، بریتییە لەلەکەدارکردنی متمانەپێکردنی تاك بەرامبەر درکپێکردنە هەستیی و جەستەییەکانی خۆی. ئەم درکپێکردنانە رێسای سەرەکین بۆ هەستکردنی تاك بە بوون و توانای خۆی بۆ تێگەیشتنی واقیع و بەدیهێنانی خودی خۆی. ئەم لەکەدارکردنە لەڕێگەی گومانکردنی تاك لەمتمانە بە هەستی درکپێکردن و هەستە سۆزدارییەکانی رون و ئاشکرا دەبێت و ئەمەش لەوانەیە تاك بەرەو شێتی بەرێت، ئەم هەڵوێستانە تا ئاستێك

لەهەڵوێستەکانی رقلێبوونەوەی دووانی doulde contrainte،
دەچن، ئەو منداڵەی بەشێوەیەکی توندوتۆڵ بە یەکێك لەباوانییەوە
پەیوەستە، ئەو منداڵە لەمبارەدا ناچارە یان ناچارکراوە بۆ
هەڵبژاردنی یەکێك لەمانە:یان ڕەتکردنەوەی درکپێکردنە هەستیە
تایبەتییەکانی خۆیی و نائاشنابوون پێیان تا پارێزگاری
لەخۆشەویستی ئەو باوانەی بکات کە زیاتر پەیوەستە پێوەی، یان
رازیبوون یان دانپێدانان بەو زانیارییانەی لەهەستەکانییەوە
دەردەچن، ئەمەش لەوانەیە ببێتە هۆی سەرچڵی لەلەدەستدانی
خۆشەویستی ئەو باوانە.

لەمکاتەدا ئەم منداڵە لەقوڵایی نارسیزمیدا، دووچاری کردارێکی
لادەر دەبێت هەروەك راکامێر Racamier [٥] لەژێر ناونیشانی
لادانی نارسیزمدا Perversion Narcissique ئاماژەی پێداوە. ئەم
لادانە لەسەر ئاستی لیبیدی وەك لادانە سێکسوالەکان دیاریناکرێت،
بەڵام لەسەر ئاستێکی قوڵتر کردارەکانی بەدیهێنانی خودو تەواوکاری
لەکەسێتیداو ئاشنابوون لەگەڵ خود، هەستکردن بە بەهای
مرۆڤایەتیی خود، دەنوێنێت.

ئەم هەڵوێستە لادەرانە لەم جۆرە خێزانانەدا، دەرئەنجامی
مەترسیداری بۆ سەر گەشەی ئەندامانی خێزانەکە دەبێت، زۆرجار
ئەمە بەشێوەیەکی نەستی (واتە لەنەستدا) پراکتیزە دەکرێت و
بەهۆی میکانیزمی تایبەتییەوە لەرێگەی نەوەکانی پێشووەوە کە
بیریان چۆتەوە، دووبارەدەکرێنەوە. بەمشێوەیە رەخساندنی بوار بۆ
ئەم هەڵوێستانە دەبێتە هۆی دووبارەکردنەوەی روخسارە
رمێنەرەکان: جەلادەکانی ئەمڕۆ بێئەوەی بزانن (یان لەخۆیان
بەئاگابن) ئەوانە دووبارە دەکەنەوە کە پێشتر خۆیان بە دەستییەوە



نالاندویانە یان بونەتە قوربانی ئەو شتانە.

لەم نێوکۆیەدا گیروگرفتێکی جیاواز هەیە، پەیوەندی بەو
هەڵوێستانەوەیە کە تێیدا هەستی سروشتی تاك بەرامبەر رێزدانان بۆ
خود شوێنی پرسیارە، بەتایبەتی ئەو هەڵوێستانەی پەیوەندییان بە
مەسەلەی ئینتمای خێزانییەوە هەیە، مێژووی خێزانەکە بە عەیبوعار
یان ئابڕووچوون، لەکەدار بووە: هەندێجار ئابڕووچوون بەسەر تاکدا
سەپێنراوە ئەویش لەئەنجامی ئاشکراکردنی تاوانێك کە باپیر یان
باوك ئەنجامیانداوە (تاوانێك کە دژی مرۆڤایەتی بووەو سڕینەوە یان
تێپەڕین لێی، ئەستەمە) [٦].

ویڕای ئەمانە گیروگرفتێکی دیکە هەیە ئەویش ئینتمایە بۆ
خێزانێك کە تیایدا دایك یان باوك خۆی کوشتبێت، چونکە ئەو
منداڵانەی باوکیان خۆیکوشتووە، هەستی دووفاقییان بەرامبەر باوك
دوو هێندە دەبێت: لەلایەکەوە، ئەو کەسەی کە خۆیکوشتووە
دەستبەرداری بنەچەو بایەخپێدان و رێزگرتنیان بووە، لەلایەکی
دیکەوە، ئەو بنەچەیە شکستیی و نەبوونی خۆشەویستییان
دەسەلمێنن بۆ ئەو کەسەی خۆیکوشتووە، چونکە هەوڵیاننەداوە
رێگەبگرن لەوەی ئەو کەسە خۆی نەکوژێت.

## پەیوەندییە هاوژیانییە نەخۆشیهێنەکان:

هەرزەکارە سایکۆسسیەکان لەپرۆسەی تاکانەییدا ڕووبەڕووی
ئەستەمی دەبنەوە (تاکانەیی واتە هەستکردن بەوەی کە تاکێکی
سەربەخۆو جیاو خاوەنی بوونێکی تایبەتییە-وەرگێر) چونکە
بوون و مانەوەیان بەشێوەیەکی رێکخراو نەبووە، تەنیا لەرێگەی

هەندێك پەیوەندی هاوژیانی Symbiotique روكار دیارینەكراوەوە نەبێت لەگەڵ خێزانو كەسوكاریاندا. ئەم پەیوەندییانە لەسەر بناغەی پاشكۆیەتی بەهێز دروستبوون كە هەمیشە هاوكات بوون لەگەڵ ئازاری ئاڵوگۆڕكراودا، بەتایبەتی لای ئەو خێزانانەی كە حاڵەتە پشێوییەكان تێیاندا دووبارە دەبنەوەو لای ئەندامەكانی ئەو خێزانانە بەشێوەیەكی بەدوایەكداهاتوو دەردەكەون: لەمجۆرە خێزانانەدا خۆكوشتن بوونی هەیە، یان خەمۆكییەكی ناجێگیر زاڵە بەسەریاندا كە چاكبوونەوەی یەكێك لەئەندامەكانی دەبێتە هۆی نەخۆشكەوتنی ئەوەی دیكەیان. لەئەندامەكانی ئەم خێزانانەدا كەموكورتی نارسیزمیو رەخنەگرتن لەخود لەگەڵ شێوەكانی خۆكوشتندا (سایكۆلۆژییو جەستەیی) تێبینی دەكرێت، هەروەها لەلایەكی دیكەوە تێبینی ئەمانە دەكرێت: پەرچەكرداری نەگونجاوو پەرتبوو لەبەرامبەر رووبەڕووبوونەوەی ئەو حاڵەتانە، سوربوون لەسەر جەختلێكردنەوە لەخود بەشێوەیەكی شەڕانگێزییانە، فەرامۆشكردن یان رەتكردنەوەی ئەوانی دی، رەتكردنەوەی پەیوەندیكردنو خۆبەدوورگرتن لەهەر پەیوەندییەكی بەهێزو توندوتۆڵ، چونكە ئەو كەسانە پێیانوایە ئەو جۆرە پەیوەندییانە هاوكاتن لەگەڵ ئازاری دەروونیو شێوە جیاوازەكانی نەخۆشیی وەك دابڕان یان راكردن كە هەستكردن بە نوشستیو هیوابڕانی لەگەڵدا دەبێت، بە گوزارشتێكی دیكە ئەم كەسانە لەدیاریكردنی سنورەكانی كەسێتیدا كەموكورتییان هەیەو هەوڵەكانیان بۆ جێگیركردنی ئەو سنوورانە بەشێوەیەكی شێواو دەبێت.

دەشێت ئەم تاكانەییە لەهەندێككاتدا بەشێوەیەكی بەهێزو



دەمامككراو یان پەردەپۆشكراو بێت، بەشێوەیەك لە یەكەمین سەرنجدا تێبینی ئەو كەسانە نەكرێت، واتە ئەو تاكانە بەشێوەیەك دەبینرێن كە جەخت لە خودی خۆیان دەكەنەوەو بە سیفەتو مۆركی تایبەتی خۆیان جیادەكرێنەوە، بەمەش لاوازی یان پاشكۆیەتییان بە پەردەپۆشكراوی دەمێنێتەوە. ئاڵوگۆڕكارییە دەركەوتووەكانی ئەم جۆرە خێزانانە (واتە مامەڵەكردنییان) تەنیا لەچوارچێوەی پێویستییە ماددی یان بەرجەستەكراوەكاندا دەمێنێتەوە، یان هەندێجار هاوكاتە لەگەڵ بەتاڵكردنەوەیەكی شەڕانگێزییانەدا.

سروشتی ململانێ بەسەر ئەم جۆرە حاڵەتەدا زاڵە، چونكە پەیوەندییەكان بە سنورداریو رەقی دەمێننەوە، ئەویش بەهۆی بوونی رێسایەكی توندو تۆڵەوە كە حوكمیان دەكات، هەندێجار لەچوارچێوەی ئەم خێزانانەدا تێبینی شێوازێك لەپەیوەندی دەكرێت، كە سروشتی ئەقڵانیو بەرنامەداڕێژراو زاڵە بەسەریدا، بەڵام دوركەوتنەوە distance لەنێوان ئەندامەكانیدا بە سروشتی ئاڵوگۆڕكردنی ئەقڵانییو فۆرمەكەی، دەمامككراوە.

لەم نێوكۆیەدا تێبینی توندوتۆڵییەك دەكرێت سەبارەت بە شێوازی پەیوەندی نێوان ئەندامەكان، بەڵام ئەم توندوتۆڵییە بەشێوەی پاسۆلۆژیی (نەخۆشی) گوزارشتی لێناكرێت، تەنیا لەسەر یەك ئاست نەبێت: بۆ نموونە لەو خێزانانەدا كە یۆ ئەندامەكانیدا كەسانێك هەن تووشی لەدەستچوونی ئارەزووی خواردن بوون، تێبینی دەكرێت، ژیان لەناو ئەو خێزانانە دەربارەی رەفتاری خۆراك دەسوڕێتەوەو زۆربەی قسەو گفتوگۆكانیش سەبارەت بە هونەری

چێشتلێنانە.

بونیادی ئەم خێزانانە تا ئاستێك لەبونیادی ئەو خێزانانە دەچێت کە کەموکورتی هەلاواردەیی ئەندامەکانی (ئەندامە هەڵبـژێراوەکان) پشت بە شکست یان نەخۆشییەکی جەستەیی بەستووە کە هاوکاتە لەگەڵ سوکە پشێوییەکی  نیورۆسسی (دەماریی) یان سایکۆسسیدا: ئەو پشێوییە سێکسوالیەی کە لای یەکێك لەو دوو هاوبەشە یان هەردووکیان بە نۆبە سەرهەڵدەدەن لەبناغەدا ئامانجی خۆبەدورگرتنە لەتوانەوەی هەڵچوونی سۆزداریی بەهێزو تۆقێنەردا.

لەمحاڵەتەدا زۆرجار چاکبوونەوەو نەمانی ئەم نیشانانە هاوکاتە لەگەڵ خۆرێکخستن بۆ دوورکەوتنەوە distance کە دەبێتە هۆی هێورکردنەوەی ئەو دڵەڕاوکێیەی بەهۆی  توانەوە لەنێوان دوو هاوبەشەکەدا روودەدات بەتایبەتی لای ئەو هاوبەشەیان کە بەهۆی نزیکبوونەوەی سێکسوالەوە سنوورە تاکانەییەکانی زیاتر هەڕەشەیان لەسەرە کە هاوکاتە لەگەڵ یەکگرتن و ونبووندا .(کەواتە دەتوانین بڵێین سێکس ساردی و پەککەوتنی سێکسوالی و پشێوییە سێکسوالییەکان و هیوابڕان و سروشتی سارد و رەقی کەسێك، تەنیا هێمان یان نیشانەی ئاشکران بۆ بەرگریکردنی توندوتۆڵی تاك لەخۆی، ئەویش لەپێناوی رووبەڕووبوونەوەی مەترسی ئەو پەیوەندییانەی کە هەڕەشەن بۆسەر سەربەخۆبوون و تاکانەیی خود)[٧]

— هەندێجار دەستێوەردانی توندوتیژو نادیاری نێوان تاکەکان کە بەسەر پەیوەندییە هاوژیانییەکاندا، باڵدەکێشێت دەبێتە هۆی نواندنی رەفتارێکی دژبەیەك لەچوارچێوەی خێزان و دەرەوەی



خێزاندا: بۆ نمونە کەسێك فەرمانبەرێکی ئیدارییەو خاوەنی پلەیەکی بەرزە لەرۆشنبیریدا، دامەزراوەیەکی گەورە بەوپەڕی ورەو چالاکییەوە بەڕێوەدەبات، بەلام ئەم فەرمانبەرە لەچوارچێوەی دۆزەخی خێزانەکەیدا، لەچوارچێوەی پەیوەندی نادیارو تەمومژاوی لەگەڵ ئەندامانی خێزانەکەیدا، وندەبێت. هەموو ئەمانە روودەدەن هەروەك بڵێی تەمومژی نێوان ئەندامەکان و جیاکردنەوەی indistiction کارتێکەرە هەڵچوونییەکان یان ڕاستره بڵێین کەڵەکەبوونی کارتێکەرە توندوتیژو دژ بەیەکەکان لەبناغەدا لەچوارچێوەی ژینگەی خێزانیدا سەرهەڵدەدەن و دەردەکەون.

خێزان لێرەدا ئەو شوێنەیە کە یاسا کۆمەڵایەتییە دەرەکییەکانی تێیدا جێبەجێنابێت و ئەو شوێنەیە تێیدا توندوتیژیی و خۆشەویستیی و داڕمان هیچ سنورێکی دیاریکراو، نازانێت. ئەمەش دەشێت لەهەندێك شێوازی خێزانیدا تێبینی بکرێت: بۆنموونە شێتی لەناوچوارچێوەی خێزانێکدا دەردەکەوێت کە ئەویش لەسەر حیسابی حاڵەتێکی دروست و سروشتی لەدەرەوەی ئەو چوارچێوەیە.

— روخسارێکی دیکە دژ بەم حاڵەتە هەیە کە ئەویش پەیوەندی نێوان ئەندامانی خێزان وشك یان نیمچە لێکهەڵوەشاوە، هەروەك بڵێی ئەو کەسە ئامانجی دوورکەوتنەوەیە لەم تێکەلاوبوون و نادیارییە مەترسیدارو توندوتیژە: ئەگەر ویستت لە رقوکینە بەدوور بیت پێویستە لەسەرت خۆت لەو پەیوەندییە بەدووربگریت کە رقوکینەی تێدایە یان رقوکینە لەخۆدەگرێت، چونکە پەیوەندییەکان لێرەدا سارد و فرمانیی و بابەتین، نمونە لەسەر ئەمە، چاودێری و بایەخێکی تایبەتی بە منداڵ دەبەخشرێت، لەبەرامبەردا داوایلێدەکرێت

شێوەیەکی دیاریکراو لەرەفتار بنوێنێت، کە بە سروشتی دادەنرێت، بەڵام جگە لەمانە هەموو تاکێك هەوڵی بەدەستهێنانی ژیانێکی ئارام و سەربەخۆ دەدات لەگەڵ نزمترین ئاست لەچاوپێکەوتنی پێویست و ناچارکراو کە لەهەموو کارتێکەرێکی هەڵچوونی بەدەرن. بەدڵنیاییی ئەمە ڕێگە دەدات بە ئەنجامدانی شێوازێك لەبوون کە تیایدا هیچ کەسێك ناتوانێت ئاستی ئازارو نەخۆشییەکەی مەزەندەبکات، هەروەها ئەمە یارمەتیدەدات بۆ ژیانێکی کاراو چالاك لەدەرەوەی چوارچێوەی خێزاندا. لەمحاڵەتەدا یەکدەنگی و ڕێککەوتن لەلایەن هەموو ئەندامانی خێزانەوە لەسەر بیرۆکەو هەوڵ و کۆششەکان ڕوودەدات بەمەرجێك لەدەرەوەی چوارچێوەی خێزان چڕببنەوە، کەواتە ئەوەی لەم شێوازە خێزانییە داوادەکرێت "وەڕس نەکردنی" ناوەوەیە (واتە لەناو خێزاندا). ئەگەر پەیوەستی لەنێوان ئەندامانی ئەم جۆرە خێزانانەدا تا ئاستی وروژاندنی رقوکینە یان هەڵچوون چڕوبەتین بوو، ئەوا لەمحاڵەتەدا ئەندامانی ئەو خێزانە کاردەکەن بۆ هێورکردنەوەی پەیوەستییە سۆزدارییەکان و کورتکردنەوەیان تا کەمترین ئاست و تەنیا پەیوەستییە فرمانییەکان دەهێڵنەوە، ئەمەش کاردانەوەیە بەرامبەر مەترسی هەڵچوون.

کەواتە سەبارەت بە چۆنێتی قبوڵکردنی هەڵچوون لەنێوان خێزانەکاندا جیاوازی هەیەو هەروەها ئەم جیاوازییەش دانانی سنورەکانی خێزان دەربارەی چۆنێتی وەرگرتنی کارتێکەرە هەڵچوونییەکان، ئاشکرادەکات. ئەم جیاوازییە کە چۆنێتی نواندنی ڕەفتاری خێزانەکان دیاریدەکات سەرنجی زۆربەی زۆری چارەسەرکارەکانی ڕاکێشاوە لەکاتی دانیشتنیان لەگەڵ هەندێك



لەخێزانەکاندا: لەواقیعدا ڕەفتاری پاسۆلۆژیی (نەخۆشی) لەدەرەوەی چوارچێوەی خێزاندا دەردەکەوێت، واتە لەچوارچێوەی کۆمەڵدا، ئەم کارە بەتایبەتی پەیوەندی بەو ڕەفتارانەوە هەیە کە دژ بە کۆمەڵگەن، زۆرجاریش ڕەفتاری لادەرو مەترسیدارن: زۆربەی جەلادو تاوانبارەکانی جەنگ کە لەماوەی شەڕدا کاری دڕندانەی ڕەنگڕێژکراو بە سادیزمییان ئەنجامداوە، بەڵام کاتێك ئەم کەسانە سۆزو خۆشەویستیی و دڵسۆزی بەرامبەر ئەندامانی خێزانەکانییان دەردەبڕن بەم هەڵسوکەوتەیان لەچوارچێوەی خێزانەکانیاندا، دەوروبەرییان سەرسام دەکەن. ئەم کەسانە لەچوارچێوەی خێزاندا هەڵچوونە توندوتیژەکانیان بەتاڵناکەنەوە، لەوانەیە لەباروۆخێکدا بن خێزان ڕێگەیان پێنەدەن رووبەڕووی ئەم هەڵچوونە تیژانەی ئەمان ببنەوە یان وەریانبگرن یان لەوانەیە توانای گۆڕین tranfert یان شکۆبوون sublimation یان نەبێت. (دەشێت ئەم حاڵەتە سادیزمییە لەهەندێك خێزاندا بەهۆی یارییەوە enjeu یان فەنتازیاوە fantasme گوزارشتیان لێبکرێت)(٨).

## خاوەندارێتیی و دەستێوەردان لەخێزانە سایکۆسسیەکاندا:

"خاوەندارێتیکردنی سایکۆلۆژییانە" ی منداڵ لە لایەن کەسانی دیکەوە (واتە خێزانەکەی) حاڵەتی هەموو ئەو منداڵانە دەنوێنێت کە لەدواییدا دەبنە کەسانی باش، بەڵام لەخێزانە نەخۆشەکاندا بەدرێژایی ماوەی ژیان ئەم خاوەندارێتیکردن و دەستێوەردانە

بەردەوام دەبێت، شایەنی تێبینیکردنە لای هەندێك خێزان بەهۆی هەموو ئەندامانی خێزانەوە ئەم جۆرە دەستێوەردانە سیستماتیك‌و پشتیوانیلێکراو دەبێت، بە پلەیەك یان تا ئاستێك سەرجەم بونیادی خێزانەکە ڕێکدەخات.

– لەواقیعدا بە تێبینیکردنی خێزانە سایکۆسسیەکان، لەم جۆرە خێزانانەدا نواندنی ڕەفتاری شێوە دۆگمایی، دەردەکەوێت، هەروەها ئەو بارودۆخە ئاشکرادەبێت کە بۆتە هۆی ئەوەی ئەو ئەندامە لاوازە لەخێزاندا بەشێوەیەکی رون‌و ئاشکرا بۆ کەسێکی نەخۆش بگۆڕێت: لەجیاتی ئەو (واتە ئەو ئەندامە نەخۆش‌و لاوازە لەخێزانەکەدا) وەڵامدەدرێتەوە، ئەوەی پێویستە ئەو بیری لێبکاتەوەو لەمێشکیدایە لەجیاتی خۆی دەوترێت، کاروبارەکانی دەخرێتەڕوو، هەروەك بڵێی ئەوانی دی لەخۆی باشتر بە هەستەکانی ئاشنابن، ئەگەر ئەو کەسە بێدەنگبوو ئەمە جەخت لەدروستی بیرکردنەوە لەجیاتی ئەو دەکات، ئەگەر ناڕەزایی دەربڕی پێی دەڵێن "ئەوە خۆی نییە"و لەبناغەدا سروشتە باش‌و ڕاستەقینەو قوڵ‌و پەردەپۆشکراوەکەی لەگەڵ خێزانەکەیدا دەگونجێت‌و کاردەکاتە سەر خێزانەکەی‌و خۆیشی کارتێکراو دەبێت.

لەئەنجامی تێبینیکردنی ئەم دیاردەیە، وا پێویستە ئەم گریمانەیە بخرێتەڕوو: جۆرێك لە (پاراستنی خود) هەیە لەنێوان تاکێکی پابەندکراو یان سنودارکراو بەهۆی هاوچەشنیی خستنەپاڵە چڕەکان identification projectifs و پەیوەندییە ئەندەکییەکانی لەگەڵ بابەتەکاندا (واتە پەیوەندی ئەو تاکە لەگەڵ ئەندامانی خێزانەکەیدا، بەتایبەتی لەگەڵ دایك‌و باوکیدا–وەرگێڕ)، هەروەها لە نێو خێزانێکدا



کە بەشێوەیەکی توندوتیژو داپلۆسێنەر کارلێکی دەستێوەردان intrusives بەجێدەهێنرێت‌و ملکەچی یاسایەکی دیاریکراو نابێت. ئەوا لەمجۆرە خێزانانەدا هیچ ئەندامێك بەشێوەیەکی تاکانەیی دروست‌وجیا هەڵسوکەوت ناکات‌و تاکانەیی تێروتەواو individuation لای خێزانی نەخۆشەکە بەدیناکرێت[1].

بیرکردنەوە لەجیاتی هەرکەسێکی دی کەخۆشت بوێت، پێویستی بەبوونی دەستێوەردان هەیە. زۆرکات نواندنی ئەم دەستێوەردانە لەفرمانەکانی پاراستن لەخود–دا ڕێکدەخرێت، بۆ نموونە لەمەسەلەی خۆراکدا: دایکان لەکاتی ئەنجامدانی فرمانی ڕۆژانەیاندا، لەجیاتی منداڵەکەیان بیردەکەنەوەو ئەوە دەڵێن کە منداڵەکەیان هەستی پێدەکات‌و جەخت لەوەدەکەن کە ئەوان بەشێوەیەکی باشتر لەهەستی منداڵەکانیان بەئاگان وەك هەستکردن بە ترس‌و تووڕەیی‌و برسێتیی‌و سەرماو خەو ...هتد.

لای هەندێك خێزان هەڵخەڵەتاندن‌و فرت‌و فێڵ لەهەندێك وێنەی وەك "کۆتر" دا سنوردار دەکرێت ئەو کۆترەی هەموو شتێك دەزانێت (لەوە دەچێت لێرەدا مەبەستی لەو چۆلەکەیە بێت کە دایك‌و باوك منداڵەکانیانی پێدەترسێنن گوایە ئەو چۆلەکەیە هەموو شتێکیان بۆ دەگێڕێتەوە–وەرگێڕ)، ئەم وێنەیە بابەتی گاڵتەوگەپییە لای هەموو ئەندامانی خێزانەکەو بەمەش ڕێگە بەگومان‌و ڕەخنە دەدات، ئەم وێنەیە لای هەندێك لەو خێزانانەی کە ئەندامانی بەدەست کەموکورتی تاکانەییەوە دەناڵێنن، بۆتە میتۆلۆژییەکی خێزانی‌و هەمیشە بەکاردێت، لەبەرئەوەی وێنەیەکی کارایەو بەمشێوەیە ئەم وێنە کۆمیدییە بۆ بیروباوەڕێك دەگۆڕێت‌و دوایی بۆ یەقینێکی

راشكاوی بەڵگەنەویستو لەنێوان ئەندامانی خێزانەكە دابەشدەبێت.
كەواتە بەمشێوەیە هەموو شتێك بۆ بەجێهێنانی فرمانێكی نادیارو شێواوو رێگە ونكەر ئامادەدەبێت كە تیایدا توانای تێبینیكردنی دایكو باوك شوێنی عەفەوییەتی منداڵ دەگرێتەوە. خۆشەویستی باوان (دایكو باوك) دەیەوێت كاری دابینكردنو تێربوونی منداڵەكانی بەجێبێنێت پێشئەوەی یان بێئەوەی ئەو منداڵە یان ئەو هەرزەكارە خۆی گوزارشتی لەبرسێتیی یان ئارەزووەكەی، كردبێت.

- خۆشەویستی زیادو پڕ لەسۆزداریی و نەرمیی، واتە ئەو خۆشەویستییەی پێش پێداویستیی و ئارەزووەكان دەكەوێت، لەوانەیە ببێتە خۆشەویستییەكی پاسۆلۆژی (نەخۆشیهێن)و مەترسیی بۆسەر ئەو بونەوەرە لاوازە (واتە منداڵەكە یان هەرزەكارەكە) دروستبكات كە نازانێت چۆن بەرگری لەناسنامەی خودێتی خۆی، بكات.

وینیكۆت Winnicott (٩) لەچوارچێوەی چەمكی دەستێوەرداندا ئاماژەی بەم جۆرە خۆشەویستییە داوە: ئەو دایكەی كە عەفەویی نییە، نائارامەو دەترسێت لەوەی توانای بەخشینی تەواوی نەبێت یان ئەو دایكەی نازانێت چۆن توانای بەخشینی بخاتەگەڕو هەستكردن بەگوناه، هەستەكانی دەبزوێنن، ئەم دایكە پێش ئارەزووەكانی منداڵەكەی دەكەوێت: ئەم دایكە لەوكاتەدا كە منداڵەكەی برسی نییەو لەوكاتەدا گرفتی نییە یان ئارەزوو ناكات، خۆراك بە منداڵەكەی دەدات: مەمكی دایك یان ئەو ئەلتەرناتیڤەی كە دەچێتە دەمی منداڵەوەو كرداری شیرپێدان دەهەژێنێت، بەهۆی ئەم دەستێوەردانەی دایكییەوە ئارەزوو پێویستیی و داواكردنی



شیرخواردن لای منداڵەكە، دەوەستێت.

ئەم دەستێوەردانانە كە دواتر زۆربەی چارەسەركارەكان تێبینیان كرد، لەرێگەی رەفتاری ئالودەبوون بە مادده بێهۆشكەرەكان، قەڵەوی یان لەدەستدانی ئارەزووی خواردن یان لەدەستدانی ئۆرگازمو سێكس ساردی یان پەككەوتنی سێكسوال، رونو ئاشكرا دەردەكەوێت .

لەواقیعدا باردۆخی دیكە هەن كە ئەم دەستێوەردانە تێیاندا مەترسیدارترن: ئەو هەڵسوكەوتانەی- كەسێكی تایبەتی - ئەنجامییان دەدات كە ئامانجی تێكشكاندنی توانای بیركردنەوەو پشتبەخۆبەستنە لەمنداڵدا، هەروەها سڕینەوەی هەموو سەلمێنراوو بەڵگەو تێبینی یان هەستە جەستەییەكانی منداڵو هەموو ئەو زانیارییانەی منداڵ خاوەنین یان دەستیدەكەون، ئەو كەسە ئەو زانیارییانە لەنێوان یەكتریدا رووبەڕووی دامالێنو دژایەتیی دەكاتەوە، هەروەها ئەو منداڵە هەڵدەخەڵەتێنێتو دەیخاتە حاڵەتێك لەشێواندن تا وایلێبكات بەشێوەیەكی هەمەكی هەموو تواناكانی بۆ ژیانو خۆشەویستی، لەدەستبدات، بەداخەوە ئەم جۆرە هەڵسوكەوتە كوشندەیەی كە مایەی سەرشۆڕییە زۆرجار بەشێوەیەكی نەستی (لەبێ ئاگاییدا) روودەداتو هەندێك لەخێزانەكانیش بەسەر منداڵەكانیاندا، پراكتیزەی دەكەن.

هەندێك لەم خێزانانە، ئەندامی سایكۆسس لەخۆدەگرن (واتە هەندێك لەئەندامەكانی تووشی حاڵەتی سایكۆسس بوون) لەكاتێكدا ئەم ئەندامە نەخۆشانە ئارەزووی تێكشكاندنی بەهێز یان ئارەزووی تێكشكاندنی خود لەنێوانیاندا زاڵەو بەزۆری ئەم ئارەزووانە نەستین،

راکامێر Racamier [10] لێکۆڵینەوەی لەسەر ئەم جۆرە خێزانانە ئەنجامداوە بەتایبەتی ئەوانەی کە ململانێی نارسیزمییەکان باڵی بەسەرداکێشاون، لەم کەسانەدا تێبینی دەکرێت کە هیچ تاکێکیان بوونی خۆی بەدیناهێنێت تەنیا لەسەر حیسابی وێرانکردنی سایکۆلۆژی ئەویدی نەبێت و ناتوانێت ئارەزووە نارسیزمییە زیندووەکانی تێربکات، تەنیا لەسەرحیسابی زەوتکردنی هەستکردن بە بەهای خودێتی ئەویدی نەبێت (واتە کەسێکی دیکە). بەپێی گوزارشتی سێرلس Searles [11] ئەم کۆششەی کە تاك دەیکات بۆ ئەوەی ئەویدی بکاتە کەسێکی شێت یەکسانە بە ئارەزووی خۆکوشتنی سایکۆلۆژیی ئەو تاکەو فاکتەرێك دروستدەکات کە تاك بەرەو خۆکوشتنێکی عەفەوی ئاشکرا ئاڕاستە دەکات و دەتوانرێت وەك خۆکوشتنێکی ناڕاستەوخۆ، وەسفبکرێت.

ئەم روخسارە پاسۆلۆژییانە دەرئەنجامی رقوکینەیەکی توندوتیژن، رقوکینەیەکی کوێرو وێرانکەر، لەئەنجامی ئەو خۆشەویستییە پاسۆلۆژییەوە کە پێشتر باسمانکرد دروستدەبێت، ئەوە رقوکینەیەکی شاراوەیە لەپشت خۆشەویستییەوە، کە پاڵنەرەکانی فرەلایەنن: زۆرکات ئەم نەخۆشییە لەبێئاگاییدا روودەدات و کوشندەو بەرگریکارانەیەو پەیوەستە بەهەوڵی ئومێدبڕاوانەوە کە تەنیا لەسەرحیسابی زیانپێکەوتنی ئەویدی بەدیدێت، بێئەوەی ئەو کەسە مەبەستی کوشتنی ئەویدی (واتە ئەوی بەرامبەری) هەبێت، ئەم حاڵەتە لەکەسانی نەخۆشدا روودەدات بێئەوەی خۆیان درك بە نەخۆشییەکەیان بکەن، چونکە مانەوەیان پشت بەم نرخە دەبەستێت (واتە زیان پێگەیاندنی ئەویدی). ئەوەی



لێرەدا بەلامانەوە گرنگە تێبینی ئەو شێوانەی خۆشەویستییە کە توانای بڕینی سایکۆلۆژی ئەویدیکەی، هەیە یان تێپەڕبوون بە سنورەکانی کەسێتی ئەویدیدا، هەیە. بێگومان ئەمانە روخساری پاسۆلۆژین و دەتوانرێت لەگەڵ ئەو شێوە سایکۆسسیە بەراوردبکرێت کە مەرج نییە جۆری ئەو سایکۆسسیە وڕێنەیی بێت، بەلام پشتەبەستێت بە دابەشبوون و رەتکردنەوەی واقیع و هاوچەشنی خستنەپاڵی چڕ، کەسی شیزۆفرینی هەوڵدەدات بەمشێوەیە لەناڕەحەتی یان دڵەڕاوکێکەی رزگاری ببێت، لەرێگەی دەرکردن Externalisation لەناو خۆیی و پەخشکردن و خستنەناو کەسێکی دیکە: ئەم تەکنیکە لەمانەوە یان پەیڕەوکردنی ئەم تەکنیکە لەپێناوی مانەوە، بەدینایەت تەنیا بەهاوبەشیکردنی خێزان یان کەسێکی دیکە نەبێت کە توانای بەرگەگرتنی ئەم خستنەناوەو پێکەوەنوسانەی لەخودی خۆیدا هەبێت، سەرەڕای توانای بەرگەگرتنی هەموو ئەو شتانەی ئەم خستنەناوەوەیە دەیخوازێت وەك لەدەستچوونی سنووری تاکێتیی و ناسنامەی خودێتی.

– زانستی نەخۆشیی (پاسۆلۆژی) شێوەی توندوترو سیستماتیکراوی لەوڕێنەی دوانی delire adeux بۆ ئاشکراکردووین، کە تاك چۆنێتی بەجێهێنانی کردارە فیکرییەکانی کەسە نەخۆشەکە دەبڕێت یان دەچێتە ناوی، لێرەدا ئەزموونی دڵڕاوکێی دەبێتە ئەزموونێکی هاوبەش و ئەو بەهانەو بیانووە بەرگرییانەی کە نەخۆشیش دەیانخاتەڕوو، دەبنەهۆی روودانی جۆرێك لەوڕێنە کە تێیدا کەسە سروشتییەکەو کەسە نەخۆشەکە پێکەوە وڕێنەیەکی هاوبەش دروستدەکەن.

– لەهەندێك خێزاندا لەسەر هەموو ئاستەكان جۆرێك لەهاوكاری لەگەڵ نەخۆشدا تێبینی دەكرێت، تەنانەت لەسەر ئاستی نەخۆشییەكەش، بەمشێوەیە پێكەوە پەرژینێك دروستدەكەن، نەخۆش لەجیهانی چەوسێنەری دەرەوە دەپارێزن. وەك ریچەر Richter وەسفیكردووە ئەم (خێزانە پارێزەرە) هەموویان هاوكاری ئەو ئەندامە دەكەن كە لاوازترین ئەندامی خێزانەكەیە، بەمەش قەڵغانێكی بۆ دروستدەكەن كە یارمەتی داپۆشینی تاكانەیی نەخۆشییەكە دەدەن: ئەم جۆرە هاوكارییە پێویستی بە هاوچەشنیكردنی ئاڵوگۆڕكراو– (هاوچەشنی خستنەپاڵی و پێكەوە نوسان)– هەیە كە تێیدا سەرلەنوێ چاو بە سنورەكانی هەر تاكێكدا دەخشێنرێتەوە. ئەو مەترسییەی هەر تاكێك لەم جۆرە پرۆسەیەدا رووبەڕووی دەبێتەوە لەحاڵەتێكەوە بۆ حاڵەتێكی دیكە، جیاوازی هەیە. لێرەدا "نمونەی من" ی بەهێزو هاوبەش لەلای هەموو ئەندامانی خێزانەكە هەیەو زۆرجار ئەمە نەستییەو دەكرێت ناوی "ئێمە un nous" لێبنرێت (واتە هەموو خێزانەكە هەوڵدەدات هاوكاری ئەو كەسە نەخۆشە بكەن و لەڕێگەی فەرامۆشكردنی خۆیانەوە باری دەروونی نەخۆشییەكەی لەسەر هێواش بكەن، تەنانەت هەندێجار ئەم هاوكارییە دەبێتە هۆی سڕینەوەی (من– moi) لەنەستداو لەجیاتی ئەوە وشەی "ئێمە" چالاك دەبێت و كاردەكات– وەرگێڕ).

– لەبەرامبەر ئەم شێوازە لەنواندنی خێزانیدا، بەپێچەوانەوە شێوەیەكی دیكە لەدابەشبوون، وێنا دەبێت و باش و خراپەكان لەیەكجیادەكاتەوە. ریچەر Richter [١٢] ئەم شێوە دابەشبوونەی



ناوناوە "نیورۆسسی خێزانی بەرامبەر نیشانەی نەخۆشی" كە یەكێك لە ئەندامانی خێزانەكە هەڵگری نیشانەیەك یان نەخۆشییەكەیە لە كاتێكدا هەموو ئەندامانی دیكەی خێزانەكە هەوڵدەدەن خۆیانی لێجیابكەنەوە. ئەندامەكانی دیكەی خێزانەكە كە خاوەنی تەندروستی و هاوسەنگی و ورەی خۆیانن، هەوڵی پاراستنی خۆیان دەدەن و كۆششدەكەن بۆئەوەی لەهەڵگری نەخۆشییەكە نەچن. لێرەدا هەمووان هەوڵدەدەن هاوكاری لەگەڵ ئەندامە نەخۆشەكە یان لادەرەكە نەكەن و دەگەڕێن بەشوێن هۆیەكانی پاراستن و پارێزگاریكردنی تەندروستی ئەقڵییان و تەنانەت پاراستنی ناسنامەی خودێتییان، ئەویش لەرێگەی خۆجیاكردنەوەیان لەم كەسە نەخۆشە یان لاوازە: لەرێگەی رەتكردنەوەی هاوچەشنیكردن لەگەڵ ئەو نەخۆشەدا هەر ئەندامێكی ئەو خێزانە هەوڵدەدات رێزی خۆی بپارێزێت.

## ئەركی نەخۆشیهێن و دابەشبوونی خێزانی لەتاكانەیی كەموكورتدا:

ئامادەنەبوونی تاكانەیی individuation لەنێوان ئەندامانی خێزانێكی (سایكۆسسی)دا (واتە ئەو خێزانەی هەندێك لەئەندامەكانی تووشی حاڵەتی سایكۆسسی بوون–وەرگێڕ)، دەشێت لەرێی كارلێكردن لەنێوان یەكتردا، دركیان پێبكرێت، دەكرێت ئەمەش تێبینی بكرێت و لەگەڵ چەندەها رووداو و بۆچووندا بەراوردبكرێت:

١- ئەكیرمان Ackerman [١٣] یەكەم كەس بوو باسی بیرۆكەی ئەركی نەخۆشیهێن Pathogene Potentiel[ب]-ی خێزان و دابەشبوونی لەنێو ئەندامانی خێزاندا كردووە. ئەم دابەشكردنە ملكەچی كۆمەڵێك هەڵگەڕانەوەو گۆڕانە كە بەندن بە مێژووی خێزانەوە، دابونەریت و میتۆلۆژیی و گۆڕانە هەنوكەییەكانی ئەم دابەشكردنە بەندن بە پەرەسەندنی ژیانی خێزانییەوە. هەر ئەندامێك روخسارێك لەروخسارەكانی ئەم ئەركە دەگرێتەئەستۆی: یەكێك لەئەندامانی خێزانەكە پێكەوەنووسان interiorise لەگەڵ ململانێیەكی ئاشكرانەكراوو بێچارەسەردا دەكات، لەكاتێكدا ئەندامێكی دیكەیان ئەم ململانێیە ئاشكرادەكات و دەیخاتەروو، هەوڵدەدات بیداتە پاڵ كەسانی دیكە ... بەمشێوەیە گشت ئەندامانی خێزان رێكدەكەون لەسەر دابەشكردنی رۆڵە چاوەڕوانكراوەكان: رۆڵی نەخۆش، فریادڕەس، پاڵەوان ...

ئەم جۆرە رێكخستنە پێویستی بە هاوكاری سەرجەم ئەندامانی خێزانەكەیە تا ئەندامە لاوازەكە بپارێزن یان بە پێچەوانەوە، خۆیان لەو ئەندامە لاوازەی خێزانەكە دەپارێزن و دەیخەنە لاوەو وەك نەخۆش ئاماژەی پێدەدەن یان یارمەتیدەر دەبن لەفەرامۆشكردنی و پشتگوێخستنیدا.

٢- ئەكیرمان Ackerman، لەم چوارچێوەیەدا نەخۆشی ئەقڵی بەمشێوەیە دیاریكردووە، بەیەكداچوونی ئامادەباشییەكانە بۆ تووشبوون بە نەخۆشیی ئەقڵی لای ئەندامە جیاوازەكانی خێزانێك، كە ئەمبارە دەرئەنجامی دەركەوتنی پشێویی تاكێتییە لای یەكێك لەئەندامانی خێزان یان كەسێكی دیكە لەدەرەوە. دەتوانرێت



بەشێوەیەكی تایبەتی لەمنداڵدا ئەم چەمكە لەسایكۆلۆژیی نەخۆشیدا ئاماژەی پێبدرێت، كە پەرچەكرداری خێزان بە یەكێك لەم شێوازانە دەبێت: بەرهەڵستیكردن بەرامبەر شیكاری سایكۆلۆژیی منداڵە نەخۆشەكەو رەتكردنەوەی چارەسەركردنی یان بە پێچەوانەوە، خێزان بەشێوەیەكی بەهێزو بەدڵسۆزی پشتیوانی لەچارەسەركردنی منداڵەكە دەكات و پشێوییەكەش لەنێوئەندامەكانیدا دابەشدەكات و...هتد، هەموو ئەمانە كۆمەڵە دیاریدەیەكن، بەشێوەیەكی ئاشكرا لەو خێزانانەدا دەردەكەون كە ئەندامێكیان نەخۆشە، بەتایبەتی كاتێك ئەو ئەندامە نەخۆشە چاكدەبێتەوە، خێزانەكە ئەندامێكی دیكەی دەخاتەبەر چارەسەركردن.

٣- بۆ راڤەكردنی چەمكی (ئەركی نەخۆشیهێن) ی خێزان (واتە دابەشكردنی رۆڵی نەخۆشیی لەنێو ئەندامەكانیدا-وەرگێڕ) واپێویستدەكات بۆ ئەو هۆكارە بگەرێینەوە كە لە پشت نەخۆشییەكەوەیە بەو شێوەیەی دەركەوتنی ئێستای: بەباشی ئەوە دەزانین هەموو بونیادێكی خێزانی وردەوردە لەرێگەی ئەزموون و هەڵەوە رێكدەخرێت و ئەم رێكخستنە زیاتر لەرەفتاردا رون و ئاشكرا دەبێت، نەك لە یادەوەریدا.

بۆتێگەیشتن لەم پرۆسە هەنوكییە پێویستە لەپەرەسەندنی نەوەكانی پێشوو تێبگەین، م. بۆن M.Bowen بایەخی بەم مەسەلەیە داوە، كاتێك بۆچوونی خۆی بەرامبەر سەرهەڵدانی نەخۆشییەكی تایبەتی لەپێش سێ نەوەی پێشووەوە (نەخێر تەنانەت لە پێش دە نەوەی پێشووەوە)، خستەڕوو. تێبینی ئەوەیكرد ئەركی نەخۆشیهێن (بینینی رۆڵی نەخۆشی) بە یەكسانی بەسەر

ئەندامانی خێزاندا دابەشنابێت، هەروەها بەهەمان شێوە تاکانەییش هەروایە. هەندێك تیرە یان نەوە کەمتر جیاکاری بە خۆیانەوە دەبینن differencies (واتە لەرووی سایکۆلۆژییەوە کەمتر سەربەخۆن)، ئەوکەسانە لە بەستنی پەیوەندی لەگەڵ کەسانی فرە جیاکراوەو تاکانەییدا، وەڕسدەبن یان دووچاری ئەستەمی دەبنەوە، لەبەرئەوە ئەم جۆرە کەسانە بەهۆی کەسانی دیکەوە هاوبەشی ژیانیان هەڵدەبژێرن کە کەمتر جیاکراوەو تاکانەییان پێوەدیاربێت، جۆرە خێزانێك دروستدەکەن کە کارلێکردنەکان تێیاندا سنوردارو جۆری بن و جیانەکردنەوەی ڕێژەیی indifferenciation دەبێتە ڕێسا لەو خێزانەدا، یەکێك لەئەندامەکانی کە زیاتر لاوازە یان بۆتە قوربانی بارودۆخێکی تایبەتی (بایۆلۆژی، سایکۆلۆژی یان سۆسیۆلۆژی) لەتێکەڵی ئەو خێزانە ئاڵۆزو نادیارەدا دەستبەرداری هەموو جیاکاریی و ناوازەییەك یان تاکانەیەکی خۆی دەبێت، ئەویش لەبەرئەوەی کە (منی تاکانەیی) لەو کۆمەڵەیەدا یان لەو خێزانەدا کە ئەو تاکە تێیدا دەژی بریتییە لەکۆمەڵە یان گروپێك لە (منی تاکانەیی) کە دەبێتە هۆی ڕودانی ئەستەمی لەگەیشتن بە هاوچەشنی تایبەتی و ورد (واتە ئەو کەسە لاوازە ناتوانێت هاوچەشنی بکات، ئەویش بەهۆی ئەو منە جیاکراوەو سەربەخۆیەیی ئەندامەکانی دیکەی خێزانەکە خاوەنین– وەرگێر).



## جیاکردنەوەی ناتەواو: هەڵەی تاك یان هەڵەیەکی خێزانییە؟

مەسەلەی جیاکردنەوەی ناتەواو یان نەگەیشتن بە تاکانەیی لەنێوکۆی خێزانێکی ئاڵۆزدا، لێکۆڵینەوەی لەسەر ئەنجامدراوەو لەگەڵ زۆر لێکۆڵینەوەی شیکاری دیکەدا، بەراورد کراوە کە پەیوەندییان بە گۆشەگیریی و خۆخواردنەوەو هاوژیانی و سایکۆسسەوە، هەیە. فرۆید یەکەم کەس بوو کە دەستی بەم کارانە کردووەو بە دوایدا میلانی کلاین M.Klein و کەسانی دیکەش. وا پێویستدەکات لەکاتی کارکردن لەگەڵ سایکۆسسیەکان (واتە ئیشکردن لەسەر ئەو کەسانەی تووشی سایکۆسس بوون ) بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ، تێبینی خێزانییەکانیان بکرێت، سێرلس Searles[١٤] لەکاتی چارەسەرکردنی نەخۆشە سایکۆسسەکاندا توانی تێبینی ئەو ڕوخسارانە بکات کە لای ئەو نەخۆشانە دەبوژێنەوە وەك: کارتێکەرە هەڵچوونییە توندوتیژەکان، کارلێکردنی توندو بەکارهێنانی زنجیرەیەك لەکرداری پاشکۆیەتی توند، وەك بەرگریکردن دژی ئارەزووەکانی مردن، تۆڵەکردنەوەو کوشتن یان ئارەزووکردنی ئەوەی بەرامبەرەکەت بە شێت دابنێیت. سێرلس Searles لەرێگەی ئەم لێکۆڵینەوەیەوە توانی لەپێداویستییەکانی پاشکۆیەتی (واتە پاشکۆبوون) dependence لای نەخۆش تێبگات، هەروەها لەپاڵنەرو ڕەفتاری پاسۆلۆژیانەی ژینگە تێبگات کە دەبنە هۆی دروستکردنی باری نەخۆشی، ئەویش

لەرێگەی هێشتنەوەی بەرامبەرەوە (کەسی بەرامبەر کە پەیوەندی لەگەڵدا هەیە) لەحاڵەتی پاشکۆیەتیدا، هەڵخەڵەتاندنی لەرێی خۆشەویستییەوە، رێگە لێونکردنیو بردنی بەرەو پشێوییو هێشتنەوەی لەبارێکی شێواودا، زیادەڕۆیی بایەخپێدانی. ئەو کارلێکانەی لەم جۆرە خێزانەدا دەبنە هۆی دروستبوونی نەخۆشی، وادەکەن سنوری نێوان ئەندامەکان نادیارو شێواو بن، لێرەدا پێویستە لەکەسانی شیزۆفرینییدا ئەو کارلێکانەی دەبنە هۆی نەخۆشی لەگەڵ کردارە ئەقڵییەکاندا بەراوردبکرێن: چونکە لای کەسی شیزۆفرینی گەڕانەوە regression (واتە گەڕانەوە بۆ قۆناغی پێشتری تەمەن –وەرگێر) تەنیا بە جێگیرکردنی پلە–کانەوە ناوەستێت کە یارمەتی ئاشکراکردنی باکگراوەندی کەسەکە دەدات، بەڵکو تاك بەرەو جیاکردنەوەی بنەڕەتی هەڵچوونەکان دەبات، واتە بەرەو نواندنەکانی خودو بابەتو بەشەکانی کۆئەندامی سایکۆلۆژی تاك.

ئەم جۆرە جیاکردنەوەو ئامادەنەبوونی تاکانەییە پێویستی بەجۆرە پەیوەندییەکە کە مەرج نییە هەمیشە دووفاقی بێت، بەڵکو پەیوەندییەکی بەر لەدووفاقی Preambivalent یە: ئەم نەخۆشانە وەك کەسانی دیکە ناتوانن روخسارە دژ بەیەکەکان وەك خۆشەویستییو رق پێکەوە لەسەر بابەتەکە (واتە پەیوەندی نێوان کەسە نەخۆشەکەو هاوبەشەکەی–وەرگێڕ) کۆبکەنەوە. ناکرێت ئەم هەڵچوونو خەسڵەتانە سەرلەنوێ تاك تیایاندا بژێتەوە (واتە ناکرێت بەرجەستەبکرێن یان گوزارشتیان لێبکرێت) بێ هاوبەشیکردنی ئەندامانی خێزان (واتە خێزانی نەخۆشەکە) کە بەدیهێنانی بەشێك



لەم هەڵچوونو خەسڵەتانە دەگرنە ئەستۆیان.

بەمشێوەیە خستنەپاڵەکان لەپایەی یەکەمدا دەبن، بەتایبەتی میکانیزمەکانی هاوچەشنیکردنی خستنەپاڵ، کە نەخۆش بە هۆیانەوە بەشێکی خۆی (باش یان خراپ) دەخاتە پاڵ ئەوی دیکە، بەمەش بابەتی ئەندەکیی– واتە کەسوکارەکەی – ناچاردەکات بۆ رازیبوون بە وەرگرتنی بەشێك لەو بابەتانەی کە ناتوانێت خۆی لەناو خۆیدا بەرگەیان بگرێت. "ببیت بە کەسێکی شیزۆفرینی"، ئەمە راکامێر Racamier [١٥] نوسیویەتی کە سەرکێشییەکە باس لە ژیانو کارکردن دەکات وەك بەشێك لەجەستەیەکی ئۆرگانی یان ئەندامی، کە دایك یان هەر شتێك کە زیندووە لەخۆیدەگرێت .. لەسەر بناغەی پەیوەستبوونی بەشێك لەگەڵ بەشێکی دیکە لەناو یەك جەستەی ئەندامییدا، پەیوەندییەکانی نەخۆش لەگەڵ بابەتەکەیدا دروستدەبێت (واتە پەیوەندی تاکی نەخۆش لەگەڵ ئەو کەسەدا کە بەشێکی خۆی لەناودا هەڵدەگرێت–وەرگێڕ). پەیوەستبوونی ئەندامیی ناوەکی واتە (هەر بەشێك کاردەکاتە سەر ئەویدیکە)، چونکە پەیوەستییەکان لەچوارچێوەی پەیوەندی ئەندامیدا، بریتین لەپەیوەستی ئینتیمابوونێکی ئاڵوگۆڕکراو.

ئەم مەسەلەیە سەرنجی وینیکۆت Winnicott [١٦] ی راکێشاوەو دەڵێت: " نەخۆش ناتوانێت بەتەنیا بەرگەی ئەم فەنتازیا رێکخراوە بەرامبەر بوونی کەسی شیزۆفرینی، بگرێت، نەخۆش لەم فەنتازیایەدا دەژی کە بەهۆی زۆر کەسانی دیکەوە، رێکدەخرێت. کەسی شیزۆفرینی بۆ بەشە گشتییە سەرەکییەکە واتە (دایك – منداڵ) دەگەڕێتەوە ..ئەم کەسە نەخۆشە، دەروونی خۆی

**دابەشدەکات بەسەر کەسانی چواردەوریدا، بۆنموونە (لە نێوئەندامانی خێزانەکەیدا).**

**رەفیۆت** Rufiot [١٧] **ئەم جیانەکردنەوە پێکهاتییەی لەخێزانە سایکۆسسیەکاندا باسکردووەو وتویەتی: "شوێنێکە بۆ ئاڵوگۆڕی فەنتازییەکان، نەرێکخستنو نەیاسای نهێنیی تیادایە"، هەروەها سلڤانی** Selvini **ئاماژەی بەم دیاردەیە داوەو وتویەتی: "رەتکردنەوەی ئۆدیب، گەڕانەوەیە بۆ بەر لەئۆدیب واتە بۆ ئەنجامدانی کارە تابۆکان یان نیمچە بەدیهێنانێکی ئەم کارە تابۆیانەیە"** [١٨]**. ئەم جیاکردنەوەیە یان ئەم ئامادەنەبوونی تاکێتییە رووداوێکی تاکانەیی جیاکراوە نییە، بەڵکو تا ئاستێك، خەسڵەتێك لەخەسڵەتەکانی هەموو بونیادی خێزانەکە پێکدێنێت، ئەم خەسڵەتە هەمەکییە بە کارلێکردنی نێوان ئەندامانی خێزانەکەوە پەیوەست دەبێت، کە هاوچەشنییە خستنە پاڵییەکان بەشێوەیەکی چڕ بەکاردێنن.**



## پەراوێزەکانی وەرگێڕ:

(ا) لەو خێزانانەدا کە ئەندامێکیان نەخۆشە رێگەنادرێت هیچ ئەندامێکیان بەشێوەیەکی سەربەخۆ خاوەنی بوونی تایبەتی خۆی بێتو بەردەوام خێزان لەڕێگەی یاسایەکی تایبەتی خۆیەوە دەستدەخاتە کاروباری هەموو ئەندامەکانییەوە بە ئەندامە نەخۆشەکەشەوە.

(ب) لێرەدا ئەرکی نەخۆشیهێن مەبەست لەدابەشکردنی رۆڵی نەخۆشییو رۆڵەکانی دیکەیە بەسەر ئەندامانی خێزاندا کە هەموویان پێکەوە لەسەر ئەوە رێکدەکەون کە یەکێکیان رۆڵی نەخۆش ببینێت، بۆ نموونە بە هەموویان سیفەتی گێلیی یان ترسنۆکی دەخەنەپاڵ ئەندامێکی خێزانەکەیان.

## پەراوێزەکان:


1-COSNIER J., Theories de la communication in. Encyl.med.Chir.Paris 1981,Psychiatr,II,PP,1-11.

2- BRAZELTON T.B.,CRAMER B.,La dynamique du nourrisson.Paris,E.S.F, 1981.

3- LEBOVICI S.,Les interactions Prococes,Paris ,Centurion,1983,PP.42-55.

4- BION W-R.,L’attention et I’ interpretion ,tr fr ,Paris ,Payot,1974 , PP.25-40.

5-RACAMIER P.C., "Les Schizophrenes et Leurs familles",in L’ evol Psychiatr.1975,T,XL.,PP.341-356.

6-ABRAHAM N.,TOROK M.,L, ecorce et le noyau ,Paris,Aubier Flammarion,1978.

7- LEMAIRE J-G.,Famille,Amour ,Folie,Paris,Centurion,1989,P.257.

8-WINNICOTT D.W.,Jeu et realite,Paris.,Gallimard,1975,PP.28-35.

9-WINNICOTT D.W.,De la pediatria a la Psychanalyse,Paris.Payot ,1975,PP.122-130.

10- RACAMIER P-C., "L, interpretation Psychanalytique des scgizophrenise",in Encyclo med-chir,A.10,1976,PP.5-12.

11-SEARLES H-F.,L, effort pour render l,autre fou,in Nov.Rev.Psychanal,Paris,Gallimard,1976,12,PP.23-47.

12-RICHTER H.F.,Psychanalyse de la





famille,Paris,Mercure de France ,1971,PP.69-101.

13-ACKERMAN N.W.,L,enfant dans la famille,Vol 1,Paris ,Masson,1970,PP.218-241.

14-SEARLES H-F., "Le contre transfert ",in Psychotherapies familiales,Paris,P.U.F,1980.PP.378-383.

15-RACAMIER P-C.," Les Schizophrenes et leurs familles ",in Lerol Psychiatr.1975,T.XL,PP.341-356.(16- WINNICOTT D.W.,Le corps et le self,in Nov Psychanal,1971,PP.37-48.

17-RUFFIOT A.,EIGUER A.,La therapie familiale Psychanalytique ,Paris,Dunod,1990,P47.

18-SELVINI P.M.,Paradoxe et contre paradoxe,Paris ,E.S.F,1975.

## بەشی چواردەیەم

# گواستنەوەی توندوتیژیی خێزانی لەرێگەی نەوەکانەوە

ئەو توندوتیژییەی لەلایەن هەندێك خێزانەوە بەسەر منداڵەکانیاندا پراکتیزە دەکرێت بەچەندەها شێوە دەردەکەوێت، ئەم توندوتیژییە تێکشکێنەرە لەوانەیە سەرچاوەکەی لەمانەدا بدۆزێتەوە:

ا– ئامادەنەبوونی ئەو بیرۆکەیەیی بەندە بە توندوتیژییەکەوە.

ب– بوژاندنەوەی هەستی نائومێدیو تووڕەیی لای خێزان کە لەئێستادا لاوازنو بۆ قۆناغی منداڵی دەگەڕێنەوە.

ج– بۆچوونە شەڕانگێزییەکان کە ئامانج دروستکردنی ئازارە لەویدیدا (هەروەك لەمەیلە سادییەکاندا).

بەر لەگەڕان بەشوێن هۆکارەکانی توندوتیژیدا، پێویستە ئاماژە بەمەسەلەی ترۆماتیزم traumatisms بدەین: ترۆماتیزم هەر رووداوێکە کە ببێتە هۆی وروژاندنی (من– moi le) کاتێك وروژاندنەکان لەتواناکانی من تێپەڕدەبن، ئەوکاتە لەڕووی سایکۆلۆژییەوە (من– moi) ناتوانێت لەگەڵ کۆی وروژاندنەکاندا کۆنترۆڵیان بکات. دەشێت ئەم وروژاندنانە بەهۆی سەرچاوەیەکی



دەرەکییەوە بێت، هەروەها لەوانەشە سەرچاوەکەیان ناوەکی بێت (هەروەك لەباری فشار خستنەسەر پاڵنەرە ناتێرەکان)دا روودەدات.

ئەم وروژاندنانە کاتێك بەهێزدەبن گەر بەشێوەیەکی کتوپڕ روودەن (واتە کتوپڕ روودەنو کۆئەندامی ئۆرگانی یان سایکۆلۆژی بۆ پێشوازیکردنیان ئامادە نەبێت) ئەمەش دەبێتە هۆی دروستکردنی فۆبیاو ئازارو تێکەڵاوبوون.

بەدیوێکی دیکەدا دەتوانین بڵێین (ترۆماتیزم) هەر شتێکە (من– moi) ببڕێتو لەوەوپێش نەبووبێت واتە شیاو pense یان داهێنراو cree نەبێت بەهۆی تاکەوە کە لەتواناکانی (من– moi) لەنواندندا representation تێپەڕی بێت. توندوتیژی شیاو pensable ئەو توندوتیژییەیە (کە لەڕووی چەندایەتییو چۆنایەتییەوە) لەکاتێکدا روودەدات تاك (منداڵ یان نەرزەبوو) لەتوانایدا بێت درکی پێبکات یان ئارەزووی درکپێکردنی هەبێت. کەواتە پێویستە ئەم توندوتیژییە دەربکەوێتو بەرێگەیەك بنوێنرێت تا رێگە بەتاك بدات لەجوڵەیەکی دووفاقیدا پێکەوەنووسانی integrey لەگەڵدا بکات: (دژی ئەمە دەوەستم "ناڕازیم" بەڵام لەهەمانکاتدا ئەوەش دەزانم ئەم ئەرکە یان ئەم بێبەشکردنە لایەنی باشەشی تێدایە). لەمحاڵەتەدا منداڵ لەدۆخێکدایە بەوکارە ئاشنایە کە (من–moi son)کەی ئەنجامیدەدات، ئەویش لەپێناوی گۆڕینی ئەو درکپێکردنو هەستانەی کە سەرچاوەیەکی ناوەکی یان دەرەکیان هەیە بۆ نواندن representation، ئەمەش کارێکی نواندنی–خودییە.

دەتوانین بەکورتی بڵێین توندوتیژیی شیاو pensable ئەو توندوتیژییەیە کە رێگە بەتاك دەدات نیشتەجێی ئەو توندوتیژییە

بكات كە سەرچاوەكەی ناوەكییە، هەرچی توندوتیژی نەشیاوە impensable ئەو توندوتیژییەیە كە (من–moi ) تێكدەداتو لەژێر كاریگەریی ئەو هەستانەی بۆ نواندن نەگۆڕاون (من– moi) بەجێدێڵێت بەمەش ئەوجۆرە توندوتیژییە نەشیاوە (من– moi) لەدۆخێكی لاوازو ملكەچدا، بێ هیچ دەروازەیەك بۆ رزگاربوون، دەیهێڵێتەوە.

## پراكتیزەكردنی توندوتیژیی لەسەر منداڵی شیرەخۆرە:

هەندێك خێزان توندوتیژیی جەستەیی یان دەروونی لەسەر منداڵی شیرەخۆرە پراكتیزەدەكەن، لەكاتێكدا جگە لەوەی هەندێك شێوازی پەروەردەیی زۆرەملێو شاز پەیڕەودەكەن، هەروەها لەوانەیە منداڵ شایەتحاڵ بێت بەسەر ئەو توندوتیژییەی كە لەنێوان باوانیدا روودەدات، لەزۆركاتدا ئەنجامدانی ئەم جۆرە توندوتیژیانە دووبارە دەبنەوە.

ملكەچنەبوون (یان بەگوێنەكردنی) منداڵی شیرەخۆرە بۆ ئارەزووەكانی خێزان، لەوانەیە بەشێوەیەكی بەردەوام ببێتە سەرچاوەیەك بۆ پراكتیزەكردنی توندوتیژی بەسەریدا. نموونەیەكی ساكار باسدەكەین (گریانی منداڵی شیرەخۆرە) لەشەودا كە هێشتا تەمەنی دوو یان سێ مانگە لای زۆربەی منداڵان روودەداتو ناكرێت بە نەخۆشی دابنرێت. زۆربەی خێزانەكان لەمبارەدا منداڵەكە لەئامێزدەگرن بۆئەوەی هێمنو ژیربێتەوە، بەڵام ئەم كارە لەهیلاكییو قەڵسبوونی دەروونی بەدەر نییەو ئەمەش وایانلێدەكات لەدەستی



وەڕس بن، چونكە لەهەندێككاتدا گریان یان هەڵسوكەوتەكانی بەرگەی ناگیرێت (واتە خێزان تەحەمولی ناكات) چونكە منداڵی شیرەخۆرە لەو تەمەنەدا بەهۆی لاوازییو هۆگربوونی بەخێزانەكەیەوە ئەستەمە وەك منداڵێكی تەمەن دوو ساڵ ملكەچبكرێت.

لەم تەمەنەدا ملكەچنەبوونی منداڵی شیرەخۆرە لەوانەیە لەلایەن خێزانەوە ببێتە هۆی دروستبوونی هەندێك كرداری خستەپاڵ projections، لەبەرئەوە لەوانەیە جۆرە باوكێكی دیاریكراو هەبێت هەست بەتووڕەیی بكاتو رقی لەكوڕە شیرەخۆرەكەی ببێتەوە، چونكە ماوەیەك دوای لەدایكبوونی، شیرخواردنی مەمكی دایكی رەتكردووەتەوە (واتە شیری دایكی لەبەرچاو كەوتووەو نەیخواردووە). ئەم باوكە هەر خێرا لەكوڕەكەی دەداتو لەدوایشدا سیستمێكی خۆراكییو پەروەردەیی دژواریی بەسەردا دەسەپێنێت. ئەم باوكە خۆی لەچوارچێوەی خێزانێكی هەژارو فرە ژمارەدا گەورە بووە كە خۆییو خوشكو براكانی خۆراكی پێویستییان نەخواردووەو لەژیانیشیاندا هیچ دیارییەكیان بەدەستنەگەیشتووە، لەمبارەدا كوڕەكەی وادێتەبەرچاوی كە كەسێكی دەستبڵاوی پەروەندە[1]و سەركێشە. لەوانەیە ئەم شرۆڤەكردنە لای هەر باوكێك دروست بێت كە توندوتیژی بەسەر كوڕەكەیدا پراكتیزەكردبێت.

زۆربەی ئەو منداڵە شیرەخۆرانەی تەمەنیان لەنێوان (٢–٤) مانگیدایەو شێوازی كارلێككردنی تێكدەرو شێواو بە خێزانەكانیانەوە دەیانبەستێت، لەوانەیە لەدواییدا ئەو هەڵسوكەوتانە لەژینگەی چواردەوریاندا دووبارەبكەنەوە، كەئامانجیان وروژاندنی توندوتیژییە لای كەسانی دیكە. لەم

نێوکۆیەدا رووخسارێکی دیکە هەیە پەیوەستە بەو رێگەیەوە کە ئەم توندوتیژییە چۆن بەسەر منداڵەکەدا پراکیتزەدەکرێت، یان ئەو خێزانە لەئامادەبوونی منداڵەکەدا دەیگۆڕن، ئەمەش لەوانەیە ببێتە هۆی رێگری لەبەردەم ئەوەی منداڵەکە بگاتە نواندنی چالاکی دروست.

لێرەدا نموونەیەك دەخەینەڕوو کە ئەم پراکتیزەکردنە ڕووندەکاتەوە:

N.A کچێکی تەمەن پێنج ساڵە بەقۆناغێکی منداڵی ناخۆشدا تێپەڕیوە، چونکە هێشتا تەمەنی دوو مانگ بوو کەباوکی کۆچی دوایی کرد، هەرچی دایکیشی بوو لەدوای زنجیرەیەك هەڵسوکەوتی شاز خرایە زیندانەوە، N.A لەمانگی چوارەمی تەمەنیدا بوو کاتێك دایکی دەستی بە نواندنی ئەم هەڵسوکەوتانە کرد، لەشوقەکەیدا میوانداری دۆستەکانی دەکرد، کە لەدوو ژووری بچووك پێکهاتبوو، بە دەگمەن رۆشناییان پێدەگەیشت. ئەم منداڵە لەگەڵ هەموو ئەو سەرکێشیانەی کە بەسەر دایکیدا روویاندا، لەگریان و گیروگرفتدا دەژیا، وێڕای فەرامۆشکردنی لەڕووی تەندروستیی و خۆراکییەوە. ژنەکە لەدوای ئەوەی ژمارەیەك کرداری دژی ئەنجامدا، دەستگیرکراو خرایە زیندانەوە، لەوکاتەدا منداڵەکە کە تەمەنی دە مانگ بوو، درا بەخێزانێکی دیکە.

ئەندامانی ئەو خێزانە لەرابردووی دایکی ئەم منداڵە ئاگاداربوون، بۆیە بەشێوەیەکی خراپ مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرد، ماوەیەك بەلێدان و ماوەیەك بەپشتگوێخستنی.

ئەم منداڵە لەدوای ئەوەی بەدەست کۆمەڵێك نیشانەی دەروونی و



جەستەییەوە ناڵاندی خرایە نەخۆشخانە.

هەڵسوکەوتەکانی ئاماژەیان بەگرژی و نائارامی باری دەروونیی دەدا، وێڕای ئەوەی وەڵامدانەوەی بۆ نزیکبوونەوەی پەرستیارەکان لێی نەبوو، هەروەها نانخواردنیشی رەتدەکردەوە.

لەدوای ساڵێك لەئازادبوونی دایکەکە چوو بۆ نەخۆشخانە تا کچەکەی ببینێت، بەڵام منداڵەکە خامۆش بوو، یەك جوڵەی نەکردو هیچ وەڵامدانەوەشی بۆ قسەکردن و خۆشەویستی دایکی نەبوو.

لەمکاتەدا وەڵامدانەوەکانی منداڵەکە گوزارشتییان لەپەرچەکردارێکی ئاشکرادەکرد بەرامبەر بەهەڵسوکەوتەکانی پێشووی دایکی، کاتێك ئەم لەمانگەکانی سەرەتای تەمەنیدا بوو واتە لەوکاتەدا کە درکی بەهیچ نەدەکرد، تەنیا دەیقیژاندو هاواری دەکرد، تەنیا رووخساری توڕەو بابەتی ئامادەنەبووی دەبینی (بابەتی ئامادەنەبوو واتە ئامادەنەبوونیی دایکی)، ئەمانە وێڕای هەستکردن بەبرسێتی و ئازار کە بەرگەیان ناگیرێت. بەکورتی (دەتوانرێت بوترێت ئەو منداڵە خۆی لەجیهانێکی درکپێکراوی- وڕێنەیی ناخۆشدا (perceptions-hallucinations)[1] بینیەوە.

-منداڵی شیرەخۆرە لەمانگەکانی یەکەمی تەمەنیدا تارادەیەك هەست بەسۆزێکی وروژێنەر دەکات، کە لەوانەیە ئەمانە دەرئەنجامی ئەزموونی هەستە ناخۆشەکانی (وەك برسێتیی یان تێری) بن، یان وێنەو وڕێنە (وەك وێنەی باوکێکی تۆقێنەر یان باوکێکی بەسۆز). لەتێڕوانینی منداڵە شیرەخۆرەدا، هیچ جیاوازییەك لەنێوان ئەزموونی هەستی یان وڕێنەیدا نییە، چونکە هەردووکیان بەدوو شێوەی نواندنی جیهانی دەوروبەری منداڵ دادەنرێن: (چونکە جیهانی

دەوروبەر ناخۆشە  بە بوونی ئازارێك لەگەڵدا یان لەگەڵ باوكێكی
تۆقێنەردا) یان (جیهانی دەوروبەر خۆشە لەكاتی هەستكردن
بەگەدەیەكی پڕ یان لەگەڵ باوكێكی بەسۆزدا).

-هەڵوێستی باوك یان ئەلتەرناتیڤی، یارمەتی منداڵ دەدات بۆ
جیاكردنەوە لەنێوان واقیعو ئەو دركپێكردنە وڕێنەییانەی كەمنداڵ
دەیخاتە پاڵ جیهانی دەوروبەری، هەروەها ئەم هەڵوێستە یارمەتی
منداڵ دەدات بۆ دركپێكردنی ئەوەی كە ئەم خستنەپاڵانە، تەنیا
نواندنی خۆی بنو مەرج نییە واقیعیی بن (واتە لەوانەیە تەنیا خۆی
بەو شێوەیە هەستییان پێبكات نەك لەواقیعدا خۆیان وابن-وەرگێڕ).

-كەواتە چی ڕوودەدات، كاتێك منداڵی شیرەخۆرە دركپێكردنی
وڕێنەیی تۆقێنەر دەخاتەپاڵ جیهانی دەوروبەروو و خێزانیش
لەڕێگەی هەڵسوكەوتیەوە جەخت لەم خستنەپاڵە projection
دەكات.

ئەو دایكەی واز لەمنداڵەكەی دەهێنێت كە بەردەوام لەبرسا بگری
یان ئەو باوكەی بە توندوتیژی مامەڵە لەگەڵ منداڵەكەیدا دەكات، ئەم
هەڵسوكەوتانە ڕێگە لەمنداڵ دەگرن جیاكاریی لەنێوان
خستنەپاڵەكانی خۆیو واقیعدا، ئەنجامبدات. بەمشێوەیە
خستەپاڵەكان بەشێوەی دركپێكردنی وڕێنەیی، دەمێننەوە.

N.A لەحاڵەتی (تۆقینی- وڕێنەییدا) دەژیا، چونكە دایكی
لەڕێگەی هەڵسوكەوتەكانییەوە جەختی دەكرد لەسەر
خستنەپاڵەكانی كچەكەی بۆ سەر جیهانی دەوروبەری، كە دایكی
ڕێگەی دەگرت كچەكەی جیاكاری لەنێوان خستنەپاڵەكانیو واقیعدا
بكات، چونكە دایك بەلای كچەكەوە وەك دایكێكی واقیعی بوونی



نەبوو، هەروەها وەك بابەتێكی ناوازەی جیاكراوە ئامادەبوونی نەبوو،
بەڵكو تەنیا كۆمەڵێك دركپێكردنی وڕێنەیی لەقیژەو لێدانو
هەستكردن بەبرسێتییو هەستكردن بە بەجێهێشتنو وێرانكاری،
دەنواند (واتە وێنەی دایك یان بابەتی دایك تەنیا ئەو حاڵەتە
ناخۆشانەی دەگەیاند-وەرگێڕ).

لێرەدا پێویستە ئاگامان لەوەبێت دەتوانرێت ئەم جۆرە منداڵانە
چارەسەربكرێن ئەگەر گەیشتینە ئەوەی بتوانین هۆیەكانی ژیانیان
لەگەڵ رابردوودا پێببەخشین، بەڵام بەتەواوەتی چاكنابنەوە، چونكە
كاریگەریی ئەو ترۆماتیزمەی كە لەمنداڵیدا ڕووبەڕووی بوونەتەوەو
ئەو كردارە بەرگرییانەی لەدژی گەڕانەوەی بەكارهێنراون، هیچ كاتێك
لاناچنو ناتوانرێت بنوێنرێن، توندوتیژیش لەم حاڵەتەدا هەر
بەوێناكراوی دەمێنێتەوەو بەشێوەیەك كە ناتوانرێت بسڕێتەوە.

## پەیوەندییەكانی نێوان كاریگەریی و توندوتیژی:

- فرۆید یەكەم كەس بوو كەبانگەشەی بۆ گریمانەی پاڵنەری
كاریگەریی Emprise ناسێكسوالی، كرد كە ئامانج تێیدا ئازاردانی
بەرامبەرە، جی بێرگد J. Bergert [٢] سەرلەنوێ توێژینەوەی لەسەر
ئەم گریمانەیە لەكتێبەكەیدا بەناوی (توندوتیژی سەرەكی)
ئەنجامداوە.

لای هەر تاكێك پێویستییەك هەیە بۆ كاركردنە سەر: گروپ،
جەستەی تایبەتی خۆی، منداڵەكەی، پەیوەندیی لەگەڵ
هاوبەشەكەیدا، ئەم كێشبەندییە پاڵمان پێوەدەنێت بۆ خستنەڕووی

مەسەلەی پەرەسەندن و گەشەی ئەم پاڵنەرە لەگەڵ ئەو توندوتیژییەدا، كە لەخۆیدەگرێت.

-ژمارەیەك لێكۆڵینەوەی شیكاری جەختیان كردووە لەسەر گریمانەی بوونی پاڵنەری كاریگەریی لای منداڵ هەر لەمانگی یەكەمی ژیانییەوە،. منداڵ لەم قۆناغەدا هەست بەجیهانێكی نەرم maleble دەكات تا بتوانێت كاری تێبكات. لەوكاتەدا منداڵ داوای مەمكی دایكی دەكات و دەچێتە ناو دەمییەوە هەستدەكات دەتوانێت شتەكان بدۆزێتەوەو دروستیان بكات، كاتێك دایكی لەگەڵ ئارەزووەكانیدا تەباو گونجاو دەبێت، ئەمە سەرگرتە[ب] یەك لای منداڵ دروستدەكات كە خاوەنی توانایەكی هەمەكییە. رۆسیلۆن Roussillon[٣] قسەی لەسەر قۆناغی گواستنەوەی- كارتێكەریی كردووەو جەختی لەوەكردۆتەوە بەپێی پێویست منداڵ پێویستی بە ژینگەیەكی گونجاو هەیە، واتە ژینگەیەكی گوێڕایەڵ و نەرم، بەو مانایەی ژینگەیەك ملكەچی داواكارییە پێداگریی و توندەكانی منداڵ بێت (واتە ژینگەیەك هەموو داواكارییەكانی منداڵ جێبەجێبكات - وەرگێڕ).

بەشێوەیەكی گشتیی دەتوانین بڵێین، جوڵە یەكەمین نواندنی منداڵە بۆكاركردنە سەر جیهانی دەوروبەر لەسەرەتای ژیانیدا (وەك دەستێكی دەروونی)، لێرەدا بۆ پاڵنەری كاریگەریی، دەست ئەو ئەندامەیە رێگە بەمنداڵ دەدات كۆنترۆڵی ئەزموونەكانی بكات. ئەم كارە واپێویستدەكات رووبەڕووی ژینگەیەكی ناوەندو نەرم بێتەوە كە قابیلی گونجان و گۆڕان بێت، هەستپێكراوو زیندوو بێت، پێویستە ئەم ژینگەیە بەوەش رازی بێت كە ببێتە بابەتێك بۆ بەتاڵكردنەوە



decharges توندوتیژەكانی منداڵ و رەچاوی سیستم یان ریتمی تایبەتی ئەو بكات.

-ئەم دۆخە چۆن پەرەدەستێنێت؟ بەپێچەوانەی ئەوەی خراوەتەڕوو یان پێشكەشكراوە، تێپەڕنەبوونی منداڵ بە دۆخی نارسیزمی یەكەمدا narcissime primaire ، بەهۆی ئەوەوە نییە منداڵ ئەو شكستییانەی تێنەپەڕاندووە كە بابەتە دەرەكییەكان (واتە ژینگەی منداڵ) بوونەتە هۆی دروستكردنی، بەڵكو بەهۆی بەرهەڵستیكردنی ئەو بابەتانەیە بەرامبەر دەستدرێژییەكانی منداڵەكە (واتە نەیتوانیوە كاریگەری لەسەر جیهانی دەوروبەری دروست بكات).

لەم نێوكۆیەدا، ئەنگێزەی وێرانكاریی كە وینیكۆت Winnicott[٤] قسەی لەسەركردووە بەم شێوەیە ئاماژەی پێدراوە: (كاتێك ژینگە بەرهەڵستی ئەو توندوتیژیەی منداڵ دەكات، كە لەشێوەی گازگرتن و قژراكێشان و شتی دیكەدا، پراكیتزەی دەكات، منداڵ هەست دەكات ناتوانێت كاربكاتە سەر بابەتەكانی "واتە جیهانی دەوروبەری"، چونكە بەرهەڵستی دەستدرێژییە فیزیكیی و هزرییەكانی دەكات) كەواتە هەستدەكات ئەم بابەتانە جیاكراوەن لەم و لەوانەشە لەگەڵیدا بن. لەسەر ئەم بناغەیە بابەتی منداڵ"واتە جیهانی دەوروبەری" هەر لەسەرەتاوە لەكەشێكی رقوكینەدا، دروستدەبێت.

ئەگەری پراكتیزەكردنی ئەو كاریگەرییەی emprise كە هەندێك توندوتیژی لەخۆدەگرێت لەسەر دەوروبەر، یارمەتی دروستكردنی دوو خاسیەتی سەرەكی دەدات لەبەجێهێنانی هزری منداڵدا: یەكەمیان ئاشنابوون لەگەڵ واقیعدا دەنوێنێت، هەرچی دووەمیشە

وەرگرتنی توانای خۆنواندنە representation (ئەو ئەزموونانەی ئەو هەستە بەمنداڵ دەبەخشن کە توانای دروستکردنی گۆڕانکاری لەجیهاندا هەیە، لەدواییدا یارمەتی دەدەن بۆئەوەی ئەو وێنانەی کە خۆی دەینوێنێت، بیانگۆڕێت بۆ هزرو وێنەی زیندوو، کەقابیلی بەکارهێنان بن)[٥].

کاتێك منداڵ دەچێتە قۆناغی کۆمییەوە Anal کودەتایەکی بنەڕەتی لای دروستدەبێت، چونکە ئەو پاشکۆبوونەی لەپێشوودا بەرامبەر بابەتەکەی (دایك) هەیبوو بۆ جیابوونەوە دەگۆڕێت. لەم قۆناغەدا بابەت (واتە دایك) پاڵ بە منداڵەوە دەنێت لەپاشکۆبوون و چاوەڕوانیدا بڕی، لەکاتێکدا پێشتر لەپەیوەندی لەگەڵ دایکیدا ملکەچیان بووە. بەمشێوەیە پاڵنەری هۆگربوون بەم بابەتەوە (دایك) بۆ پاڵنەری دوورکەوتنەوە دەگۆڕێت. توندوتیژی سایکۆلۆژی کە منداڵ لەم قۆناغەدا پراکتیزەی دەکات لەشێوازی کۆنترۆڵکردنی ماسولکەییدا روون و ئاشکرا دەردەکەوێت، بەتایبەتی لەکاتی کرداری پیساییکردندا.

دواجار دەتوانرێت بوترێت منداڵ کاتێك ناتوانێت هەموو جارێك لەنزمترین ئاستدا کاربکاتە سەر دەوروپشتیی، بە تایبەتی باوانی، توندوتیژییەکی پاسۆلۆژیانە پراکتیزەدەکات، ئەم کاریگەرییە دەشێت شکست بهێنێت:

١- ئەگەر بابەتی (باوك یان باوان) بەشێوەیەکی فیزیکی یان سایکۆلۆژی ئامادەنەبوو یان هیچ پەرچەکردارێکی زیندووی نەبوو.

٢- ئەگەر هەستیکرد بەهۆی ئەم توندوتیژییە سەرەتاییەوە کەسێکی تێکشکێنەرە یان (وێرانکەرە)، ئەوکاتە تووشی خەمۆکی



دەبێت یان دوورەپەرێز دەبێت و بەدەست شێوەیەك لەشێوەکانی بەجێهێشتنەوە، دەناڵێنێت.

٣- ئەگەر ئەو توندوتیژییەی لێوەرگیرا، بەڵام بەهەمان شێوە بەتۆڵەکردنەوە یان بەمەجازی لەلایەن باوکەوە توندوتیژی بەرامبەر کرایەوە (ئەگەر بەتوندی ئازارم بدەیت، بەتوندی ئازارت دەدەم) ئەمەو بێئەوەی ئەم باوکە رەچاوی جیاوازی کامڵبوون و درکپێکردن لەنێوان خۆی و منداڵەکەیدا بکات.

٤- ئەگەر توندوتیژی باوك ئەوەند بەتین بوو کە منداڵ نەتوانێت هیچ بەرامبەری بکات، تەنیا پاراستنی خۆی نەبێت.

٥- ئەگەر باوك رێگەی لەهەندێك چالاکی جوڵەیی منداڵ گرت یان قەدەغەیکرد.

-کەواتە ئەو دەرەنجامەمان دەستدەکەوێت جۆری وەڵامدانەوەی دەورووبەر واتە (ژینگە) بەرامبەر بە هێزی پاڵنەرەکانی منداڵ، بەشێوەیەکی فراوان ئەم پاڵنەرانە لەمنداڵدا دیاریدەکەن و خێزانیشە کە توندوتیژی منداڵ دروستدەکات یان بەرهەمدێنێت.

## توندوتیژیی نەشیاو impensable:

بۆئەوەی توندوتیژی شیاو بێت pensable (واتە رێگەپێدراو بێت)پێویستە دوو رووخساری تێدابێت، یەکەمیان، منداڵ بەشێوەی ترۆماتیزمییانە ملکەچی نەبێت(واتە ئەو توندوتیژیە تراوما یان زامێکی لەلا جێنەهێڵێت-وەرگێڕ)، دووەم منداڵ توانیبێتی بەشی پێویست لەتوندوتیژی پراکتیزەبکات ئەویش (لەشێوەی هەژمون و

کاریگەریدا یان لەشێوەی بەتاڵکردنەوەی پاڵنەرەکانیدا، بەو مەرجەی خێزان بەشەڕانگێزییەکی توندوتیژیانە بەرپەرچی نەداتەوە).

بەلاّم لەوبارەدا کە خێزان بەشێوەیەکی توندوتیژ پەرچەکرداری دەبێت لەبەرامبەر ئەو کارتێکەرانەی بەهۆی منداڵەکەوە دروستبوون و منداڵەکەش فرسەتی ئەوەی بۆ نەڕەخساوە ژیرو ئاقڵ بێت یان توندوتیژی خێزانەکەی بنوێنێت، ئەوکاتە بەچەندەها شێوە، دانەوەی ئەم توندوتیژییە لەسەر پەرەسەندنی سایکۆلۆژی منداڵەکە ئاشکرادەبێت، لێرەدا هەندێکیان دەخەینەڕوو:

١- گەڕانەوەی ئەو توندوتیژییە لەسەر خود (منداڵەکە) بەشێوەی جیاواز دەردەکەوێت: وەك پشێوی لەدرککردنداو ئەستەمی لەفێربووندا کە بەشێوەیەکی تایبەتی لەبیرۆکەی گەستندا morsure de la pense(ج)دا ئاشکرادەبێت کە م.بیرگر M.Berger (٦) قسەی لەسەرکردووە.

دانەوەی ئەم توندوتیژییانە بەشێوەیەکی ئاشکرا لەو منداڵانەدا دەردەکەون کە لەدایەنگادا گەورەبوون یان بۆ چەند شوێنێك گواستراونەتەوە بێئەوەی ڕێگەیان پێبدرێت نزمترین ئاست لەتوندوتیژی سەرەکی بەرامبەر ئەو پەرستیارو دایەنانە ئاشکرابکەن کەچاودێرییان کردوون. ئەم منداڵانە تەنیا یەك چارەسەر لەبەردەمیاندا بووە ئەویش گواستنەوەی ئەو توندوتیژییە بووە بۆ خۆیان.

٢- لەنموونە باوەکانی گەڕانەوەی توندوتیژی بۆ سەر خود (خۆکوشتن)ە، بەتایبەتی خۆکوشتنی چاوەڕواننەکراوی هەندێك لەهەرزەکاران کە بێ دەربڕینی ناڕەزایی، گیروگرفتە سایکۆلۆژیی و



نەخۆشییەکانی خێزانەکەیان قبوڵکردووە (واتە بەرگەیان گرتووە). بەپێچەوانەی خوشك و براکانی دیکەیانەوە کە بەجۆرەها ڕێگە سەرکێشیان کردووە لەبەرامبەر هەر شتێك بەلایانەوە شازبووە یان بەرگەیان نەگرتووە سەبارەت بەخێزانەکەیان (یان لەلایەن خێزانەکەیانەوە).

٣- هەستکردن بەگوناهێکی قووڵ لای تاك بۆئەوە دەگەڕێتەوە کە هەر توندوتیژییەك لەلایەن ئەوانی دیکەوە دەردەچێت، بۆخۆی دەگەڕێنێتەوە و بەمەش هەستدەکات گوناهکارو خراپە، پاشان لەڕێگەی ئەو کارانەوە کەدەیانکات دەبێتە کەسێکی خراپ بۆئەوەی سزای پێویست وەربگرێت.

٤- چەندە باوك نەتوانێت ئیحتوای ئەو توندوتیژییە بکات کە ئاڕاستەی کوڕەکەی دەکات، ئەوەندە ئەو کوڕە هۆگری دەبێت: وێنەکە لێرەدا لەو بۆکسوەشێنە هیلاکە دەچێت کە ڕووبەڕووی بۆکسوەشێنی بەرامبەری دەبێتەوە و خۆی پێوەدەنوسێنێت تا لەپێداکێشانەکانی بەدوور بێت یان خۆی دووربخاتەوە تا رزگاری ببێت.

٥- هەستکردن بەزوڵم و چەوساندنەوە: منداڵ لەباوانییەوە، لەبەرامبەر هەر کارێکدا کە ئەنجامیدەدات و هەر وتەیەك کە دەیڵێت و هەر شتێك کە بیری لێدەکاتەوە، تیۆرێکی ڕەخنەیی oeil critique وەردەگرێت (یان فێری دەبێت) دەتوانین لەمبارەدا ئەوە بڵێین هیچ کاتێك منداڵ ناتوانێت بگاتە ئاسوودەیی لەگەڵ منی بالاّ sur moi ی توندو دڵرەق کە ملکەچبوونێکی ڕەهای بەسەردا دەسەپێنێت و هیچ هەڵبژاردنێکی دیکەی لەبەردەمدا جێناهێڵێت تەنیا خۆکوشتن

نەبێت. ئەم تیۆرە رەخنەییە لەوانەیە رێچکەیەکی وڕێنەیی (وڕێنەی چەوسانەوە) وەربگرێت، کاتێك تاك بەکاریدەهێنێت بۆئەوەی قەرەبووی فەرامۆشکردنی خێزانەکەی بگرێتەوە کاتێك بایەخ بە بەمنداڵێکی دیکە دەدەن: (تەنانەت بەنیگاکانیشیان بەسەرم ناکەنەوە) دەبێت بە(چاوێکی شەڕانگێز بەدوامەوەیە یان شوێنم کەوتووە). منداڵ ئەوەی بەلاوە باشترە ئەو بۆچوونە لەمێشکیدا بێت کەچاوێکی شەڕانگێز بەدواوەیەتی وەك لەوەی درك بەوە بکات کە هیچ کەسێك چاودێری ناکات یان بایەخی پێنادات، کاتێك منداڵ هەستدەکات لەچاودێریی و بایەخی خێزانەکەی دوورخراوەتەوە، لەبەرئەوەی بایەخ بەبرایەکی دیکەی دەدەن یان ئەو لەبیرچۆتەوە، ئەوا ئەگەرێکی گەورە هەیە لەدوایدا پراکیتزەی توندوتیژی لەسەر دەوروبەرەکەی بکات و ئەمەش بەئاشکرایی لەڕێگەی قسەکردن و پراکیتزەکردنەوە دەردەکەوێت.

فرۆید ئاماژەی بەتوندی کێبڕکێ داوە لەنێوان خوشك و برا- دا: (پەیوەستنامەی خۆشەویستی کە منداڵ رادەکێشێت بۆ باوانە دژەکەی "واتە کچ بۆ باوك و کوڕ بۆ دایك" رووبەڕووی بێهیوایی و غیرە دەبێتەوە کە لەدایکبوونی منداڵێکی نوێ لەخێزاندا دەیوروژێنێت، ئەم باوکە خیانەت و بێ وەفاییەکی روون بەرامبەر منداڵەکەی ئاشکرادەکات لەکاتێکدا پێشتر لای باوکی خۆشەویست بووە، ئەمانەو وێڕای ئەو پێداویستییانەی کە پەروەردەیەکی توندوتیژ بەسەر باوکدا دەیسەپێنێت و هەروەها ئەزموونی شکستهاتووی لەهێنانەئارای منداڵ بەدەستی خۆی، کەڵەکەبوونی ئەمانە گەورەیی ئەو رقلێبوونەوەیە بۆ منداڵ ئاشکرادەکەن کە ئەم



باوکە لای خۆی حەشاریداوە)[٧] هیچ کاتێك ئەوە لەیادناکەین لەسەردەمی دێریندا یەکەمین پیاوکوژ قابیل بووە کەهابیلی برا بچووکی خۆی کوشت، چونکە هابیل لای ئادەم خۆشەویستتر بوو. کاتێك منداڵ هەستدەکات بابەتی سەرنجڕاکێشانی دایکی Seduction maternelle نییە یان لەپێشەوەی ئەو بابەتە چێژ بەخشانەدا نییە کە بایەخیان پێدەدات، روخسارێکی دیکەی هەستکردن بەچەوساندنەوە بە روون و ئاشکرایی دەردەکەوێت، چونکە کاتێك هەست یان درك بەوەدەکات کە ئەو لەبناغەی ئەم بایەخپێدانانە نییە، هەستدەکات کەجیهان تێکیدەشکێنێت یان وێرانیدەکات.

لێرەدا جۆرێك لەچەوساندنەوە دەردەکەوێت کە بەمشێوەیە شرۆڤە دەکرێت: منداڵ هەستدەکات ئەو جیهانەی دەوروپشتی جیهانێکی نەرم نییە، لەبەرئەوە بە تایبەتی واپێویست دەکات بەردەوام خۆی لەگەڵدا بگونجێنێت.

لێرەدا جیهانی دەوروبەر دەبێتە بابەتی منداڵ کە بابەتێکی چەوسێنەرە و فەرمانی هەڕەشەلێکردن بە منداڵ دەبەخشێت، چونکە جیهانی دەوروبەر وشەو ژمارە رێسای دیاریکراوی خۆیان هەیەو پێویستە منداڵ پابەند بێت پێیانەوە بێئەوەی هۆکار یان پاڵنەری پابەندبوونی بزانێت، لەوانەیە لەدواییدا ئەم شێوازە لەمامەڵەکردن منداڵ رووبەڕووی پشێویی بێشومارو دووبارەبووە لەپرۆسەی فێربوون و درکپێکردندا بکات، هەروەها هاوکات دەبێت لەگەڵ خستنەوەبەرفرمانێکی چڕی کرداره بەرگرییەکاندا، کە دەبنە رێگر لەبەردەم ئەنجامدانی هەر پەیوەندییەك لەگەڵ ئەوانی دیکە، لەهەر

جۆرێك بێت.

٦– دوورکەوتنەوە لەواقیعی توندوتیژ بەهۆی میکانیزمەکانی دابەشبوون و رەتکردنەوە: (ئەمە قەد ناشێت، ئەمە قەد رووینەداوە)، لەئەنجامی ئەو ترس و تۆقینەدا تاك بەلایەوە باشترە حەقیقەت تێکبدات لەجیاتی ئەوەی بینوێنێت و رووبەڕووی توندوتیژی ببێتەوە.

٧– دووبارەبوونەوەی ئەو هەڵوێستانەی کە منداڵ ملکەچی توندوتیژی ئەوانی دیکە بووە یان دووبارەبوونەوەی ئەو هەڵوێستانەی کە کارەکانی توندوتیژی تێیدابوون. ئەم کردارە پێویستی بەهەندێك روونکردنەوە هەیە: پرسیاری یەکەم کە لێرەدا دەخرێتەڕوو، بۆچی لای هەندێك کەس دووبارەبوونەوەی وڕێنەیی reproduction بەرامبەر هەڵوێستێکی ناخۆش بەدیدەکرێت؟ بەپێی فرۆید وەڵامەکە ئەوەیە (بۆئەوەی بتوانن کاربکەنە سەر بابەتەکە"بابەت هەر شتێك کە هەڵوێستی ناخۆش لای تاك دروستدەکات– وەرگێڕ")[٨] واتە بەو مانایەی سەرلەنوێ ئەو بابەتە بگەڕێنرێتەوەو بڕوا بەوە بهێنرێت کە تائێستا بوونی هەیە، کەواتە ئەم دەرەنجامەمان دەستدەکەوێت. نواندنی وڕێنەیی ئامانجی بەیەکگەیشتنە لەگەڵ بابەتەکەو هۆگربوونە لەگەڵیدا. بۆنموونە منداڵ بە بابەتێکەوە ئالوودە دەبێت ئەگەر بەشی پێویست چێژی لەو بابەتەوە وەرنەگرتبێت "لێرەدا بابەت پەیوەندی منداڵە لەگەڵ ئەو کەسەی لێوەی نزیکە واتە دایك و باوکی یان ئەلتەرناتیڤەکانییان– وەرگێڕ" .

ئەم بەیەکگەیشتنە لەگەڵ بابەتدا بەردەوام دووبارە دەبێتەوە،



چونکە ئەم هەڵوێستە لەشێوەی درکپێکردنی وڕێنەیی (ترۆماتیزمی)دا بەڕێوەدەچێت و ناتوانرێت بنوێنرێت یان بهێنرێتەوە یاد. دووبارەبوونەوەی ئەزموونە خەماوییەکانی بەهۆی تاکەوە دەبوژێنرێنەوە، رێگە بەتاك دەدەن کاریان تێبکات و بەشێوەیەکی نێگەتیڤانە تاك ملکەچیان نەبێت. لێرەدا رووبەڕووی یەکێك لەرێسا ئەستەمەکانی بەجێهێنانی دەروونی دەبینەوە:

دەشێت جیابوونەوە لەم بابەتە دڵخۆشکەرە رووبدات، چونکە پەیوەندی لەگەڵ ئەم بابەتەدا شادی بەخش دەبێت و رێگە بەتاك دەدات پارێزگاری لەنواندنی ئەو بابەتە لەناخیدا بکات و بەئاسوودەیی لێی دووربکەوێتەوە، بەڵام پەیوەندی ناشادی بەخش لەگەڵ بابەتەکەدا واز لەتاك دەهێنێت لەهەڵوێستێکی ئازاراوی هەمیشەییدا بژی و بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی وەڵامێك بکات کە زیاتر لەگەڵ بۆچوون و پێداویستییەکانیدا رێبکەوێت یان بگونجێت.

– دەتوانین ئەمە زیادبکەین بۆ ئەو بۆچوونەی لەسەرەوە باسمانکرد، ئەو لێکدانەوەیەی ئەی. گرین A.Green لەکتێبەکەیدا (لۆجیکی نائومێدی) باسیکردووەو دەڵێت: (تاك بەسووربوونەوە داوای "رەتکردنەوە le rejet" لەکەسانی دیکە دەکات، چونکە دەیەوێت ئەو سەلمێنراوانە بخاتەڕوو کەبەراستی بابەتەکە " بابەت پەیوەندی تاکە لەگەڵ کەسانی دیکە–وەرگێڕ" بابەتێکی خراپە، کاتێك دەگاتە ئەو مەرامەی، ئەوە دەسەلمێنێت کەخۆشەویستی کەسانی دیکە تەنیا روخسارێکی هەڵخەڵەتێنراو بووەو لەپشتییەوە رقوکینە خۆی حەشارداوە)[٩] کەواتە خۆشەویستی بابەتێکە هەمیشە جێگەی گومانە، هەرچی رقوکینەیە بابەتێکە بەشێوەیەکی هەمیشەیی

جەختیلێکراوە، بەگوزارشتێکی دیکە دەتوانین بڵێین: دەستبەرداربوون لەتوندوتیژی واتە دەستبەرداربوون لەدەربڕینی رق بەرامبەر ئەو توندوتیژییە، بەڵام ئاشکراکردنی توانای دروستبوونی خۆشەویستی لەگەڵ بابەتێکی دیکەدا بەمانای وشە داماڵینی بابەتی رقلێبوونەوە لەخود دەگەیەنێت، یان بەشێوەیەکی دیکە ئیبادەکردنی.

تاك هەست بەگوناه دەکات کە رقی لەبابەتەکەی دەبێتەوە، بەڵام ئەگەر تاك وازی لەرقلێبوونەوە هێناو هۆگری خۆشەویستی بابەتێکی دیکە بوو، ئەوا ئەم هەستە دوو هێند دەبێت. کەواتە تاك بەلایەوە باشترە پارێزگاری لەم پەیوەستییە ناوەکییە لەگەڵ بابەتی رقدا بکات: چونکە تاك ئەوەی بەلاوە باشترە پارێزگاری لەبابەتێکی ناوەکی بکات کە رقیلێدەبێتەوە وەك لەوەی ئەو سەرچڵییە بکاتو بۆ هەمیشە ئەو بابەتە لەدەستبدات.



## ئەو منداڵەی رووبەڕووی توندوتیژیی دەبێتەوە کاتێك دەگاتە تەمەنی نەرزەبوون توندوتیژی پراکتیزەدەکات

لەو خێزانانەدا کە بەخراپی مامەڵە لەگەڵ منداڵەکانیاندا دەکەن، تێبینی دەکرێت دووبارەبوونەوەی ئەم مامەڵەکردنە نەوە بە نەوە لەناویاندا دەمێنێتەوە، چۆن لەوە تێبگەین ئەو منداڵانە لەلایەن خێزانەکانیانەوە رووبەڕووی هەڵسوکەوتی توندوتیژ بوونەتەوە، ئەم منداڵانە کاتێك دەبن بە باوك، بێ ویستی خۆیان ئەم توندوتیژییە لەگەڵ منداڵەکانیاندا دووبارەدەکەنەوە؟

لێرەدا هەوڵدەدەین ئەم مەسەلەیە روونبکەینەوە لەڕێگەی لێکۆڵینەوە لەو سوڕەی کە خراپ مامەڵەکردنی منداڵ بۆ تەمەنی نەرزەبوون پەرەدەسێنێتو ئەو منداڵەش کە گەورە بوو بە خراپی مامەڵە لەگەڵ کەسانی دیکەدا دەکات.

**ئارەزووە بەرگە نەگیراوەکانو هاوژیانی Symbiose:**

لێرەدا لەڕێگەی پشکنینی (جاك)و (ڤیرا)ی خێزانییەوە بابەتی دووبارەبوونەوەی مامەڵەکردنی خراپو بەردەوامی لەنەوەکاندا، دەخەمەڕوو.

جاك بەدەست دەسەڵاتی دایکییەوە، دەینالاندو هەرچی ڤیراشە لەقۆناغی یەکەمی منداڵیدا رووبەڕووی لێدان بوو بۆوە.

ئەم گیروفتەی لێرەدا دەخرێتەڕوو بەندە بەخراپ مامەڵەکردنی ڤیرا لەگەڵ کچە تەمەن چوار ساڵەکەیدا، لەو زانیاریانەوە کە دەستم کەوتوون، دەرکەوت ئەم گیروگرفتە بۆ زیاتر لەسێ ساڵ لەمەوبەر دەگەڕێتەوە، هەر لەوکاتەوە دەستیپێکردووە کە تەمەنی منداڵەکە سێ مانگ بووە، هەرچی زنجیرەی ڕووداوەکانە بەمشێوەیە بەڕێوەچوو: لور (واتە کچەکەی جاك و ڤیرا) خەریکبوو خەو لەچاوی دەکەوت، لەناکاو ڤیرا هەستدەکات پێویستی بەوەیە لور لەئامێزبگرێت، لەبەرئەوە بەئاگای دێنێت، بەڵام لور بەهێمنی دەمێنێتەوە، پاشان ڤیرا هەوڵدەدات بیوروژێنێت، منداڵەکە دەگری و دایکیشی هەست بەهیوابڕاوی دەکات، بەم هەڵسوکەوتەی لور تووڕە دەبێت و بەتوندی سەرزەنشتی دەکات و منداڵەکە سەرلەنوێ دەستدەکاتەوە بەگریان و دایکی زیاتر توڕەدەبێت و لێی دەدات، پاشان دووبارە دەیخەوێنێتەوە، پاش ئەوەی ماندوێتی منداڵەکەی هیلاك کردووە، دەخەوێت، دایکەکە لەدوای ئەوە ڕووبەڕووی جاك دەبێتەوە و بەتوندی لۆمەی دەکات، چونکە نازانێت چۆن بایەخ بەمنداڵ بدات.

لەسەرەتادا لەسروشتی پەیوەندی نێوان دایك و منداڵەکە دەکۆڵینەوە: خەوەنوچکەی منداڵ و نووستنی، دایك لەفەنتازیای fantasme (نواندنی مردن) بەئاگادێنێتەوە. لەبەرئەوە بەمەبەست منداڵەکە بەئاگادێنێتەوە تا بەرهەڵستی ئەو فەنتازیایە بکات. دایك بەشێوەیەك لەشێوەکان لەم فەنتازیایەدا دەژی، بەڵام ئەم ڕەفتارەی دایك لەگەڵ پێداویستی منداڵەکەدا ناگونجێت، وەڕسبوونی منداڵ بەهاوارو گریان گوزارشتی لێدەکرێت و ئەمەش لەوانەیە شەڕانگێزی



دایکەکە بوروژێنێت و هەڵسوکەوتی شەڕانگێزیانە بەرامبەر ڕەفتاری ئەو منداڵە بنوێنێت.

بەمشێوەیە پاڵنەری شەڕانگێزی لەلایەن دایکییەوە دەردەچێت و ئارەزووی دەستدرێژیکردن دەخرێتە پاڵ projete منداڵەکە، لەمبارەدا دایکەکە هەستدەکات بۆتە قوربانی دەستی منداڵێکی خراپ و خۆی بەنمایندەی دەربڕینی ئارەزووی شەڕانگێزی دادەنێت.

–زۆرکات تێبینی دەکرێت لاوازی منداڵ و پاشکۆبوونی تەواوی، نائارامی لای باوك دروستدەکەن بەتایبەتی ئەگەر باوك بەدەست ئەستەمی ئیحتواکردنی ئارەزووەکانی منداڵەکەیەوە بناڵێنێت. باوکی درك بەوە دەکات کە خاوەنی توانای ژیان یان مردنە بەسەر ئەم بوونەوەرە بچووکەدا کە ناتوانێت بەرگری لەخۆی بکات. ئەم توانایە ئەو باوکە نائارام دەکات و لەمەترسییەکی هەمیشەییدا دەیهێڵێتەوە. فرمانە زیندەییەکانی منداڵی شیرەخۆرە وەك نووستن و برسێتیی و پیساییکردن، ئەو وروژێنەرانەن کە دەبنە مایەیی دڵەڕاوکێ بۆ باوك.

باوك لەمبارەدا بەشێوەیەك دەژی هەروەك بڵێی لەلایەن منداڵەوە دووچاری دەستدرێژیکردن بۆتەوە و ئەمەش پاڵی پێوەدەنێت بۆ زیادکردنی ئارەزووەکانی شەڕانگێزی بەرامبەر منداڵ، سەرەتا باوك هەوڵدەدات دەسەڵات بەسەر منداڵەکەیدا بگرێت بۆئەوەی بتوانێت دەسەڵات بەسەر ئەو وروژێنەرانەدا بگرێت کە لەئارەزووە تایبەتیەکانییەوە دەردەچن، تا کۆنترۆڵی ترس و ئارەزووەکانی بکات کە ناتوانێت ئیحتوایان بکات، باوك هەوڵدەدات بۆ ئەنجامدانی ئەمانە: لەمنداڵەکە دەدات و بەتوندی هەژموون دەگرێت بەسەریدا تا کۆنترۆڵی ئەو ئارەزووە ڕەتکراوانە لەناو خۆیدا بکات کە دەیانخاتە

پاڵ منداڵەکەی.

– لێرەدا بەو پێشەکییە لۆژیکییانە ئاشنادەبین کە جەی. بلیگەر J.Bleger [١٠] قسەی لەسەرکردوون و ناوی ناون هاوژیانی symbiose کە ئەمانە درێژبوونەوەی تیۆرەکانی میلانی کلاین M.Klein [١١] بوون سەبارەت بەهاوچەشنیکردنی خستەپاڵ projective identification. هاوژیانیش بریتیە لەزنجیرەیەک کرداری بەرگریکردن و کارلێکردن کە تاک:

١– بەشێکی پێکەوەنەنووساو لەخودی خۆی یان ئارەزوویەکی بەرگەنەگیراو "تەحەمولنەکراو" دەخاتەپاڵ کەسێکی دیکە کە پێی دەوترێت باوەڕپێکراو depositaire "یان کەسی متمانەپێکراو".

٢– کەسێکی دیکە هاندەدات بۆ بەدیهێنانی ئەو ئارەزووە بەرگە نەگیراوە.

٣– ئەو کەسە باوەڕپێکراوە لەم رۆڵەدا دەهێڵێتەوە تا دووبارە یان سەرلەنوێ پێکەوەنووسان reintrojecter بۆ ئەو سیفەتانە روونەداتەوە کەپێشتر خستوویەتیە پاڵ ئەو کەسە.

٤– رەفتاری کەسی باوەڕپێکراو بەرامبەر بەدیهێنانی ئارەزووەکانی مەحکوم دەکات، چونکە وایدادەنێت بەرگەی ئەو ئارەزووانە ناگرێت.

تاک (باوک) لەڕێگەی پرۆسەی کارلێکردن لەگەڵ کوڕەکەیدا، دەتوانێت گوزارشت لەئارەزووەکانی بکات و لەهەمانکاتیشدا مەحکومیان بکات، چونکە هاوژیانی شیاوترین میکانیزمە بۆ خراپ مامەڵەکردن و دەتوانرێت بەتەواوەتی لەڕێگەی پەرەسەندنەوە تێبینی بکرێت.



## ئەو منداڵە شیرەخۆرەی ناتوانێت چێژ لەوەڕسبوون جیابکاتەوە:

ئەو منداڵە شیرەخۆرەی کەڕووبەڕووی توندوتیژی و خراپی مامەڵەکردن بۆتەوە ناتوانێت جیاوازی لەنێوان چێژو وەڕسبووندا بکات، منداڵ لەم بارەدا لەپەیوەندی لەگەڵ دایکیدا نەک تەنیا بەچێژ ئاشنانەبووە، بەڵکو بە (چێژ – وەڕسبوون)یش ئاشنانەبووە (واتە هاوکاتبوونی چێژی تێربوونی پاڵنەرەکان، لەگەڵ وەڕسبوونی پەیوەندی لەگەڵ دایکیدا): دووبارەبوونەوەی ئەزموونەکانی پەیوەندی کە هاوکات پێکەوە لەسەر بناغەی نەرمونیانی و رەتکردنەوە دامەزراون لای منداڵ ئەستەمی دروستدەکەن لەجیاکردنەوەی ئەوەی چێژبەخشە یان ناچیزە[د] لەگەڵ ئەوەی باشە یان خراپە.

ئەم ئەستەمییە لەجیاکردنەوەدا بلیگەر Bleger ناوی ناوە (نادیار) Ambiguite ئەم نادیارییە جیادەکرێتەوە بەکەموکورتی لەجیاکردنەوەداو بەبوونی رەگەزو هەڵوێستی جیانەکراوە لەنێوان یەکتریدا بەشێوەیەک وا لەتاک دەگەیەنێت کەدژایەتی لەئارادا نییە.

ئەگەر لەقۆناغی یەکەمی منداڵیدا نەبوونی ئەم جیاکردنەوە حاڵەتێکی سروشتی بنوێنێت، ئەوا نادیاری لای یەکێک لەباوان (پەیوەندی هاوژیانی لەگەڵ کوڕەکەیدا) لەوانەیە نادیاری لای منداڵ بەهێزبکات و بەتایبەتی ئەگەر ئەم باوکە نەیتوانی جیاکردنەوە لەنێوان ئارەزووەکانی منداڵ و ئارەزووەکانی خۆیدا بکات. چونکە

بێ جیاکردنەوەی پێویست، منداڵ لەجیاکردنەوەی بابەتی دەرەکییدا (دایک) ئەستەمی بەدیدەکات. ئەمەو لەبەرئەوەی دژ بەیەکی contradiction لەئارادا نییە ئەستەمە ئەو منداڵە دووکەرتبوون یان دابەشبوونی clivage تەواو لەنێوان بابەتی باش‌و بابەتی خراپدا بکات، هەروەها لەئاشکراکردنی هەستی دژبەیەکی خۆی بەرامبەر ئەو بابەتە (باوان) دووچاری ئەستەمی دەبێت.

دابەشبوون بەهۆی نەبوونی جیاکردنەوە لەکاردەکەوێت، لەبەرئەوە بوونی هەر کەموکورتییەك لە نێوان کرداری دابەشکردنی بابەتی باش‌و بابەتی خراپ منداڵ لەتوانای زامنکردنی دڵنیایی بۆ (من – son moi)ـەکەی بێبەشدەکات: ئەمەو لەبەرئەوەی منداڵ بە بابەتی باش ئاشنانەبووە تا بە خودی خۆیەوە بنووسێنێت‌و هاوچەشنی لەگەڵدا بکات، ئەوا کرۆکی رێکخەر بۆ (من–moi)و پاشان بۆ (منی باڵا– sur moi) لەدەستدەدات، کەواتە منداڵ کرۆکی سەرەکی بۆ جیاکردنەوەو رێکخستن، لەدەستدەدات.

لێرەدا دەمەوێت بایەخ بەخاڵێکی سەرەکی بدەم، ئەویش ئەمەیە: نادیاری، شکستهێنان frustration لای منداڵ پەردەپۆش ناکات یان ناشارێتەوە، نەخێر بەڵکو بەپێچەوانەوە منداڵ لەجیاکردنەوەی نێوان چێژو وەڕسبووندا ئەستەمی بەدیدەکات، هەمیشە لەباری برسێتیدا دەمێنێتەوەو هیچ کاتێك هەست بەتێربوون‌و خامۆشی ناکات. چونکە شکستهێنان شەڕانگێزی دروستدەکات (بەرچاوتەنگی Avidite [ت]دەوروژێنێت، واتە بەو مانایەی ئارەزووی وێرانکاری بۆ کرداری گەڕان بەشوێن تێربووندا دزە دەکات، لەم حاڵەتەدا ئارەزووی وێرانکاری باڵدەکێشێت بەسەر کرداری گەڕان بەشوێن تێربووندا)[12].



لێرەدا منداڵ دەکەوێتە بازنەیەکی بەتاڵەوە: شکستهێنان رقوکینەو هەستنەکردن بەتێربوونی لادروستدەکەن کاتێك ئەو تێربوونە بەدەست دەهێنێت. رقوکینە هەژموون بەسەر منداڵدا دەگرێت، وێڕای ترس لەو بابەتە کە منداڵەکە شکستی تیادا هێناوە. درکپێکردنی تێکچوو لەمنداڵدا دەبێتە هۆی دروستکردنی وەهم لای سەبارەت بەبابەتەکە (باوك) کە وەك چەوسێنەرێك دەیبینێت، تەنانەت ئەگەر ئەو بابەتە زامنی تێربوونیشی بۆکرد. لەجیاتی ئەوەی ئەو بابەتە ئاسوودەیی‌و خامۆشی بۆ زامنبکات، لەم حاڵەتەدا دڵەراوکێ‌و رقوکینە لای دوو هێند دەکات. بەرچاوتەنگی Avidite منداڵ دەبێتە هۆی ئەوەی وایلێبکات نەتوانێت چێژ لەتێربوون وەربگرێت‌و رێگەی لێدەگرێت بۆ بەستنی پەیوەندییەکی باش لەگەڵ بابەتەکەیدا (بابەت لێرەدا مەبەست لەو باوانەیە کە زیاتر لەمنداڵەکەوە نزیکە، یان ئەلتەرناتیڤەکەی–وەرگێڕ–)، هەروەها هەستێکی بەهێزی لادروستدەکات بۆ هەستکردن بەشکستهێنان‌و رق بەرامبەر هەر بێبەشبوونێك، تەنانەت ئەگەر ئەو شتەی لێی بێبەش دەبێت، زۆر پڕوپوچیش بێت.

بەرچاوتەنگیی‌و خراپ مامەڵەکردن بازنەیەکی داخراو retroaction دروستدەکەن‌و بەمە هەریەکەیان بەشێوەیەکی ئاڵوگۆڕکراو بەهێز دەبن: بەرچاوتەنگی منداڵ دەبێتە هۆی شکستهێنانی باوك لەرۆڵی تێرکردنی منداڵدا. لێرەوە باوکی شکستهاتوو بەمەبەست دەستدرێژی دەکاتە سەر منداڵەکەو ئەمەش لەوانەیە بەرچاوتەنگی لەمنداڵەکەدا، زیادبکات.

## منداڵ چۆن شەڕانگێزی وەردەگرێت:

با بگەڕێینەوە لای پشکنینی حاڵەتی جاك‌و ڤیرا، دەبینین کاتێك ڤیرا منداڵ بووە چۆن رووبەڕووی شەڕانگێزی دایکیی‌و بەرچاوتەنگی بۆتەوە (لەبەرئەوەی دایکی شەڕانگێز بوو ڤیرا هەستی بە خۆشەویستی نەدەکرد، بۆیە بەرچاوتەنگ بوو لەخۆشەویستی تێر نەدەبوو–وەرگێڕ).

ڤیرا ئەوەی دێتەوەیاد کاتێك دووچاری لێدان بووە، درکی بەشەڕانگێزی دایکی کردووە، بەڵام ئەستەم بوو بۆی، دایکێك بێنێتە بەرچاوی خۆی، کەخراپ بێت لەگەڵیدا یان بێ هۆ ئازاری بدات، بەلای ڤیراوە ئاشنابوون بەئارەزووی وێرانکاری دایکی مەسەلەیەکی نەشیاو impensable بوو، تەنانەت ئەمە دووچاری تۆقینی دەکرد. کە منداڵ بوو هەموو کۆششێکی دەخستەکار بۆئەوەی بە ئارەزووی وێرانکاری دایکی ئاشنا نەبێت، تا لەو دڵەراوکێیە رزگاری بێت کە لەوانەیە ئەم ئاشنابوونە، بیوروژێنێت‌و هەروەها بۆئەوەی کۆنترۆڵی بەرچاوتەنگی خۆی بکات.

لێدان‌و هەستکردن بەئازار وایان لێدەکرد هەست بەشەڕانگێزی شاراوە، بکات. ئەم شەڕانێگزییە رەنگدانەوەی شەڕانگێزی دایکی بوو. بەڵام نادیاری‌و بەرچاوتەنگیی خۆی وایان لێدەکرد ئەو وەهمەی لا دروست ببێت، کە شەڕانگێزییەکەی حەقیقەتێکی واقیعیە، وا خەیاڵی دەکردەوە کە بەواقیعی دەستدرێژی دەکاتە سەر دایکی‌و درکی بەوە دەکرد کە شەڕانگێزی دایکی تەنیا وەڵامدانەوەیە



بەرامبەر هەڵسوکەوتەکانی ئەم (واتە ڤێرا).

لەبەرئەوەی هەستی بە شەڕانگێزی بەرامبەر دایکی دەکردو ئەم شەڕانگێزییەش لەرێگەی قسەو کارەکانی دایکییەوە بەرێوەدەچوون، ڤیرا بەوە رازی بوو پێناسەی خۆی وەك منداڵێکی خراپ، بکات. رازیبوونیشی بەم پێناسەیە لەدانپێدانان بەوەی دایکی شەڕانگێزە دووردەکەوتەوە یان خۆی بەدووردەگرت‌و بەمەش لەبەرچاوتەنگیی خۆی دووردەکەوتەوە.

زۆرجار منداڵ ناتوانێت خراپ مامەڵەکردنی خێزانەکەی، جیابکاتەوە، منداڵ ئەوە جیاناکاتەوە چی لەخۆیەوە دەردەچێت‌و چی لەوی دیکەوە یان لەکەسێکی دیکەوە، وا خەیاڵ دەکاتەوە کەخۆی شەڕانگێزی خێزانەکەی دەوروژێنێت، خۆی وەك منداڵێکی خراپ دەنوێنێت (دێتەبەرچاو) ئەمەش لەهەوڵدانیدا بۆ کۆنترۆڵکردنی شەڕانگێزی خێزانەکەیی‌و شەڕانگێزی خۆی.

منداڵ لەپێناسی خۆیدا وەك منداڵێکی خراپ، شەڕانگێزیی خۆی بەسەر خود–دا رەنگدەداتەوەو هەوڵدەدات باوکی بپارێزێت، لەبەرئەوەی منداڵێکی خراپە هەست بەگوناه دەکات، ئەمەو بۆئەوەی لەهەستکردن بەگوناه رزگاری بێت‌و بەرچاوتەنگیی لە نەستیدا بەدەستبێنێتەوە، بەمەبەست دەستدرێژی دەکاتە سەر باوکی تا سزاو هەستکردن بەگوناه بەدیبکات کە لەبەرچاوتەنگی دەیپارێزن.

خێزان‌و منداڵ لەرێگەی پەیوەندی هاوژیانیی Symbiotique لەگەڵ یەکتریدا یارمەتیدەر دەبن لەپشتیوانی‌و سیستیماتیککردنی بەرگریی‌و ناهێڵن پێکەوەنووسانی ئارەزووە شەڕانگێزییەکانیان بگەڕێتەوە: باوك بەشێوەیەك رۆڵ دەبینێت کە بۆتە قوربانی دەستی

منداڵێکی خراپ بۆئەوەی دانبەوەدا نەنێت کە خۆی دەستدرێژیکارە، هەرچی منداڵە وەك کەسێکی خراپ رۆڵ دەبینێت بۆئەوەی دانبەوەدا نەنێت بۆتە قوربانیی و هەروەها بۆئەوەی بەرچاوتەنگی خۆی رەتبکاتەوە.

خێزان وەك سزایەك کە منداڵ شایەنیەتیی و بۆ سەلماندنی خۆشەویستیی و بایەخپێدانی بەرامبەر بە منداڵ وەڵامدانەوەکانی توندوتیژ دەبن، ئەو باوکەی دەستدرێژی دەکات دەستدرێژی ناکرێتەسەر، ئەوەش کە لای منداڵ بە نەشیاوی دەمێنێتەوە، ئاشنابوونیەتی بەئارەزووی وێرانکاری خێزان و بەرچاوتەنگی خۆی.

## چۆن منداڵ دەبێتە کەسێکی غیرەکار:

لای هەندێك لەهاوسەرەکان جۆرێك لەغیرە بەرامبەر هاوبەشەکانیان دروست دەبێت، بەڵام ئەم غیرەیە ناگاتە ئاستی وڕێنە delire، چونکە ئەو تاکە بەباشی دەزانێت کە هاوبەشەکەی لەرووی سێکسوالەوە خیانەتی لێنەکردووە، بەڵام ناتوانێت بەرگەی هیچ پەیوەندییەکی بەکەسانی دیکەوە بگرێت، چونکە هەستدەکات ئەو پەیوەندییە لەوانەیە ئەو دووربخاتەوە یان رەتیبکاتەوە، لەم حاڵەتەدا جۆرێك لە(شێتی تایبەتی)[13] لای تاك دروستدەبێت کە بەشێوەیەکی جیاکراوە بەندە بە پەیوەندی دوالیزمییەوە، ئەم غیرەیە چەندەها سیفەتی، هەیە، لێرە هەندێکیان دەخەینەڕوو:

١- بەشێوەیەکی توندوتیژ ئاشکرادەبێت و ناڕێکوپێك دەردەکەوێت، لەگەڵ قسەدا هاوکاتە و دەگاتە سنووری کوشتن.



٢- هەستکردن بەگوناه لەگەڵیدا هاوکات نییە: چونکە تاك بڕوای بەوەیە هەڵسوکەوتی خۆی راستە، بەڵام کاتێك تێبینی دەکات هاوبەشەکەی برینداربووە یان لەوانەیە لەدەستیبدات، بەوە وەرس دەبێت.

٣-ئەم غیرەیە دەبێتە هۆی پێکەوەلکان لەگەڵ ئەوی دیکەدا (هاوبەشەکەی)و رێگەگرتن لەدوورکەوتنەوە لێی، تەنیا لەحاڵەتی زۆر پێویستدا نەبێت (هەموو شتێك پێویستە پێکەوە ئەنجامی بدەین)، چونکە تاك دەیەوێت پەیوەندییەکە بمێنێتەوەو لەهەمان کاتیشدا تێکیبشکێنێت.

٤- ئەگەر ئەو هاوبەشەی دی، هەوڵیدا بەرامبەر ئەم هەڵسوکەوتەی هاوسەرەکەی بۆڵە بۆڵ و گلەیی بکات، لەوانەیە رووبەڕووی لۆمەو سەرزەنشت بێتەوە، لەبەرئەوە بێدەنگی بەلاوە باشترە، لەواقیعدا غیرە لەچوارچێوەی حاڵەتێکی نیمچە وڕێنەدا دەردەکەوێت و ناتوانرێت لەلایەن تاکەوە بنوێنرێت representer.

٥- ژیاننامەی تاکی غیرەکار ئاشکرایدەکات، کە پەیوەندی نێوان دایك و باوکی شێوازێکی نارسیزمی هەبووە (واتە پەیوەندییەکە لەسەر خۆیان مۆڵگەی بەستووە) ئەم تاکە (کاتێك منداڵ بووە) لەوکاتە خۆشانە کە دایك و باوکی پێکەوە بەخۆشی بردویانەتە سەر دوورخراوەتەوەو ئەمەش وایکردووە لەدۆخی بینەرێکدا بژی کە ئیرەیی بە دایك و باوکی بردووە. هەروەها ئەوەش دەردەکەوێت کەمنداڵ هەندێجار بەشداری ئەو چێژانەی کردووە کاتێك دایك و باوکی رێگەیان پێداوە جۆری ئەو پەیوەندییە سێکسوالەی کە لەنێوانیاندا روودەدات، ئاشکرابکات.

ئەم تووڕەییەی منداڵ کە لەشێوەی ئیرەییدا دەردەکەوێت زۆرجار منداڵ بەرامبەر کەسانی دیکە لەشێوەی رقلێبیوونەوەیەك دەریدەبڕێت کە (ئامادەیە بۆ گوزارشتکردن) هەر کاتێك رووبەڕووی کەموکورتییەك یان سەرشۆڕیەك لەلایەن کەسی بەرامبەرەوە دەبێت.

٦- تێکشکاندنی بواری سایکۆلۆژیی هاوبەشەکەی دی لەگەڵ ئەم رەفتارەدا هاوکات دەبێت: ئەم هاوبەشە لەگەڵ وەسواسییەکی هەمیشەییدا دەژیو لەبەستنی هەر پەیوەندییەك لەگەڵ کەسێکی دیکەدا سڵدەکاتەوە، چونکە پەرۆشی ئەوەیە هاوبەشە غیرەکارەکەی ئەشکەنجە نەدات، ئەم هاوبەشە تابۆکردنی interdit هەر پەیوەندییەك لەگەڵ کەسێکی دیکەدا وەردەگرێت (واتە لەقەدەغەکردنی پەیوەندی بەستن لەگەڵ کەسێکی دیکەدا تێدەگات) تەنانەت ئەگەر ئەو پەیوەندییە مۆرکێکی ئایدیالیشی هەبوو، هیچ نیازێکی سێکسوالیشی لەخۆنەگرتبوو، ئەم هاوبەشە هەستدەکات بەکەڵکی هیچ نایەتو ئەگەر هەوڵی بیرکردنەوەشیدا ئەوا ئەم کارە تەنیا ئازارو ئەشکەنجەی بۆ زیاد دەکەنو درك بەوە دەکات خۆشەویستی بۆئەوی دیکە (هاوبەشەکەی) تەنیا داوێك بووەو بەهۆیەوە کەوتۆتە ژێر دەسەڵاتیی.

پشکنینە کلینکییەکان کە لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لەکەسانی غیرەکاردا ئەنجامدراون، ئاشکرایدەکەن، ئەو کەسانە بەدەست نەبوونی بایەخپێدانی پێویست لەلایەن دایکییانەوە ناڵاندویانە، دایك بەفیزیکی لە نزیك منداڵەوە بوونی هەبووە، بەڵام بەسایکۆلۆژی ئامادەنەبووە (لەم حاڵەتەدا ئەرکی پشتیوانی پەیوەندیکردن لەگەڵ دایکیدا بۆ منداڵ لەشێوەی بەئاگاییەکی زۆردا Hypervigilanc دەگەڕێتەوە، کە غیرە بەشێکی دروستدەکات)[١٤] تا بەدەست



هەستکردن بەوەی کەوتۆتە ناو بۆشاییەوە نەناڵێنێت، ئەو بۆشاییەی کە بەندە بەئەزموونی دووبارەبۆوەی لەدەستدانی بابەتەکە یان فەرامۆشکردنی: (لەبەرئەوەی ئەم بابەتە لەبیرکردنەوە لەمن شکستیهێناوە یان ئامادە نییە بۆ پاراستنی من: ئەوا لەو بارەدا ئەگەر وازم لێهێنا لەبەرچاوم ونبێت دەترسم لەدەستی بدەم، بەڵام ئەگەر بابەتەکەم لەئاوەزمدا نواند لەجیاتی ئەوەی بەچاو چاودێری بکەم، ئەوا لەم کاتەدا فرسەت دەقۆزێتەوەو لێم وندەبێت تا لەیادم بکات) "بابەت مەبەست لەپەیوەندی ئەو کەسەیە بەهاوبەشەکەیەوە یان ئەو کەسەی ئالودەیەتی-وەرگێڕ".

لەکاتێکی دیکەدا منداڵ هۆکاری کەوتن یان مانەوەی خۆی لەدەرەوەی بواری سایکۆلۆژی دایکیدا بەمشێوەیە لێکدەداتەوە: ئەگەر دایکی (یان دایكو باوکی هەردووکیان) وازی لێهێنا ئەوا لەبەرئەوەیە کە دایکی پەیوەندییەکی سێکسوالی بەستووە یان بیر لەپیاوێك دەکاتەوە.

-رێکخستنی سایکۆلۆژی منداڵ هەندێجار رێچکەیەکی تراژیدی وەردەگرێت: بۆنموونە کچێکی تەمەن بچووك بەدەست جیاوازییەکی گەورە لەنێوان حەزو ئارەزووە درکپێکراوەکانیدا، دەناڵێنێت: لەلایەکەوە ئارەزووە سێکسوالەکانی تەریبە لەگەڵ ئارەزووەکانی ژنێکی پێگەویشتوو لەڕووی هێزو پێکهاتەوە لەلایەکی دیکەوە، بەباشی درك بەوە دەکات کە جەستە بچکۆلەکەی مەمکی نییە، بەکورتی دەتوانریت ئەوە بوترێت کچی بچووك درك بەوە دەکات خاوەنی جەستەیەکە وەك جەستەی دایکی، نییە.

لەم نێوکۆیەدا تێبینی دەکرێت رێکخستنی جێنتالی قۆناغی منداڵی لەکچێکی بچووکدا، لەشێوەی غیرە بەرامبەر دایكو هەر شتێك

بەرامبەریەتی یان هاوتایەتی، ئارام دەگرێت، لەم غیرەیەدا نەبوونیی هاوبەشی ژیان واتە (پیاو) مۆرکێکی سێکسوالی، وەردەگرێت.

کەواتە لای تاك (بەئاگاییەکی زۆر) بەرامبەر بابەت "مەبەست لەپەیوەندی تاکە لەگەڵ هاوبەشەکەیدا–وەرگێڕ" پەرەدەسێنێت، بەلام بەشێوەی شێوازێکی منداڵی لەهۆگربوونو پشتیوانی لەپەیوەندیکردن لەگەڵ ئەوی دیکەدا دەبێت، ئەمە لەو دەستە دەچێت کە هەوڵدەدات کەسانی دیکە لەیەکتری جیابکاتەوە، بەلام لەهەمانکاتدا هەوڵدەدات بۆ پێکەوەلکان لەگەڵ شتەکانداو هۆگربوون، پێیانەوە.

## منداڵ چۆن یەکەم دیمەن دەنوێنێت scene primitif:

لای ڤیرا نواندنی شەڕانگێزی خێزان زۆر ئەستەم بوو، هەروەها ئەستەمیشی بەدیدەکرد لەوەرگرتنی یان زانینی رەچەڵەکی خۆی (واتە چۆن هاتۆتەدنیاوە)، بەردەوام دەیوت "نەمدەتوانی قەد ئەو بیرکردنەوەیەم هەبێت کە باوكو دایکم پەیوەندی سێکسوالی لەنێوانیاندایە، ئەم مەسەلەیە لای منە تۆقێنەرو ترسناك بوو، چونکە لەوانە بوو بەم کارە یەکتری تێکبشکێنن".

"کە منداڵ بووم وا بیرم دەکردەوە کە ئەوان دایك و باوکم نین یان من هیچ خێزانێکم نییەو هەر بەم شێوەیە لەهیچ لەدایك بووم".

منداڵێکی لەم جۆرە بێننە بەرچاوی خۆتان کە هەوڵدەدات کۆنترۆڵی شەڕانگێزیی خۆیو شەڕانگێزیی خێزانەکەی بکات. وا بیر لەخۆی دەکاتەوە منداڵێکی خراپەو دانبەمەشدا دەنێت، کەواتە چۆن ئەم منداڵە دەتوانێت دیمەنی خۆشەویستییەکی بەبرەو، بنوێنێت



کەخۆی بەروبوومەکە بێت؟ لەخێزانێکدا بەردەوام روخسارەکانی شەڕانگێزی تێدا دەرکەوێت، جگە لەشەڕانگێزی هیچی دی لێناپاڵێورێت، ئەو منداڵەی لەم جۆرە خێزانانەدا گەشەدەکات، تەنیا دەتوانێت شەڕانگێزی بنوێنێت: (پەیوەندی نێوان دایكو باوکی وا دێتە خەیاڵ کە دیمەنێکی شەڕانگێزییە).

بەلام نواندنی یەکەم دیمەنی تێکشکێنەر (واتە بینینی دیمەنی پەیوەندی سێکسوالی دایكو باوکی)، هەر دەرەنجامی ئارەزووی شەڕانگێزیی منداڵە، چونکە منداڵ هەستدەکات لەو پرۆسە نەرمونیانییە دوورخراوەتەوە کە لەنێوان دایكو باوکیدا روودەدات کاتێك ئەو چێژانە لەگەڵ یەکتریدا دەگۆڕنەوە کە لەم حەرامکراوە. هەستی رقوکینە باڵی بەسەردا دەکێشێت کە هاوجێیە لەگەڵ بەرچاوتەنگییەکەی، لەبەرئەوە هەوڵدەدات ئەو خۆشەویستییەی نێوان دایكو باوکی تێکبشکێنێت، لەمبارەدا ئەنگێزەی وێرانکاریی دەخاتەپاڵ دیمەنی یەکەم، کەواتە منداڵ بەشێوەی بکوژێك دیمەنی یەکەم دەنوێنێت، چونکە ئەو ئارەزووە شەڕانگێزییەی کە دەرەنجامی بەرچاوتەنگیو شکستییەکەیەتی خستوویەتیە پاڵ ئەو دیمەنە: (لەوانەیە یەکتری بکوژن) ڤیرا بەبەردەوامی جەختی لەم دەستەواژەیە دەکردەوە.

شەڕانگێزی خێزان سەرلەنوێ لەگەڵ شەڕانگێزی منداڵدا کارلێکدەکەنو بەمشێوەیە فەنتازیای وێنەی خێزان بەپێکەوەلکاوی confondus لای منداڵ فۆرمەلە دەبێت: وێنەیەك کە خێزان (واتە دایكو باوك) لەیەکەمین دیمەنی درکپێکراودا بە پێکەوەلکاوی وەك دیمەنی تێکشکاندنی یەکتر لای منداڵ دەبینرێت.

ئەم وێنە تۆقێنەرە پێکەوەلکاوەی دایكو باوك، تاك بەرەو جیاکردنەوەی باوانو ڕێگەگرتن لەنزیکبونەوەیان لەیەکتری دەبات. ئەم ئارەزووی جیاکردنەوەیە لەیەکتری دەرەئەنجامی کێبڕکێیەکی ئۆدیبی نییە، بەلاّم لەئەنجامی ترس لەنزیکبوونەوی تێکشکێنەرانەی سێکسوال لەنێوان دایكو باوکیدا سیستماتیککراوە.

منداڵ بەخەیاڵ هەوڵدەددات دایكو باوکی لەیەکتری جیابکاتەوە تا یەکتری تێکنەشکێننو بەزیندوویی لەژیاندا بمێننەوە.

زۆرجار تێبینی دەکرێت توندوتیژی دایكو باوك ڕێگە بەمنداڵ نادات لەوێنەی پێکەوەلکاوی خێزان تێپەڕببێتو ڕێگەی لێدەگرن بگاتە پێکهاتەیەکی سیانی ڕێکخراوو پێکهاتوو لە(دایك و باوك و منداڵ). توانای شەڕانگێزی ڕەها دەبێتە ڕێگر لەبەردەم گەیشتن بەئۆدیب. لەجیاتی ئەوەی پێکهاتەیەکی ئۆدیبی لای منداڵ دروست ببێت، تێبینی دەکرێت جۆرێك لەدژە ئۆدیبی یان پێش ئۆدیبی دروستدەبێت.

بۆچوونی هەمیشەیی منداڵو بیرکردنەوەی لەوێنەی پێکەوەلکاوی دایكو باوك، لەدواییدا تاك بەرەو ترس لەنزیکبوونەوە rapprochemet دەبات. لەلایەکەوە (ئەم ترسە لەڕێگەی هەندێك نیشانەوە گوزارشتی لێدەکرێت وەك خۆبەدوورگرتن evitementو دوورکەوتنەوە distanciation لەهاوبەشی ژیانو دەرکەوتنی هەندێك نیشانەی پشێوی توند لەسەر ئاستی سێکسوال، هەروەها تاك دوورییەك لەنێوان خۆیو هاوبەشەکەیدا دەهێڵێتەوە، چونکە سڵ لەوە دەکاتەوە ئەگەر لێی نزیك بێتەوە لەوانەیە تێکیبشکێنێت، یان لەدەستی بچێت)[١٥].

بەشێوەیەکی هاوتەریب تێبینی دەکرێت ئەم تاکە کاتێك گەورە



دەبێت ئارەزووی نزیکایەتی لەگەڵ کوڕەکەیدا دەکات ئەویش لەڕێگەی هاوپەیمانێتییەکەوە کە کەمتر لەهاوبەشەکەی جێگەی مەترسییە، تاك لەڕێگەی ئەم دوورکەوتنەوەیەوە دەتوانێت خۆی لەوێنەی پێکەوەلکاوی دایكو باوکی، بپارێزێت.

کاتێك لەنێوان ژنو پیاودا تێبینی نەبوونی پەیوەندیی سۆزداریيو سێکسوالی دەکرێتو لەنەستدا پەیوەندی نێوانیان وەك پەیوەندییەکی نیمچە خوشكو برایانەی لێدێت بۆئەوەی بەرگریو بەرهەڵستی لەوێنەی هەڕەشەلێکراوی خێزانەکانیان بکەن، پەیوەندی هاوسەرێتیی لەم خێزانانەدا بەشێوەیەکی تایبەتی ڕێکدەخرێتو بەخراپی مامەڵەی منداڵەکانیان دەکەن.

تێبینی دەکرێت هەڵبژاردنی هاوبەشی ژیان "واتە کاتێك دوو کەس بە مەبەستی بەستنی پەیوەندی هاوسەرێتی یەکتری هەڵدەبژێرن–وەرگێڕ" لەسەر ڕێسای دوو وێنەی شڵۆق یان جولاّو (لەقە لەقکەر) بەڕێوەدەچێت، باوکێکی دەستدرێژیکەر کە دەستدرێژی ناکرێتە سەری، دووەمیشیان وێنەی دایك و باوکێکی پێکەوەلکاو لەگەڵ یەکتریدا، ئەم دوو وێنە هەڕەشە لێکراوە پشتدەبەستن بەترسە نەشیاوەکانی impensble منداڵ.

ئەو دایكو باوکەی بەخراپی مامەڵەی منداڵەکانیان دەکەن ناتوانن بێ بوونی ئەم جۆرە منداڵانە پەیوەندی نێوانیان بەردەوام بێت، چونکە ئەو منداڵە ناوەندی سەرەکی لەچوارچێوەی پەیوەندییەکەدا داگیردەکات. منداڵ تەوەرەی خستنەوە بەفرمانەکانیان دەنوێنێتو هەڵگری ئارەزووە نەستیەکانییانەو دەبێتە ئەو کۆمسیۆنەی ئارەزووەکانی قۆناغی منداڵی دایكو باوك، بەدیدەهێنێت.

کەواتە منداڵ دەبێتە ئەو پاڵەوانە تۆڵەسێنەی کە ئارەزووە

نەستیەکانی خێزان دەخرێتەپاڵی لەوێنەی خێزانەکەی دایكو باوکیدا "واتە دایكو باوك ئارەزووە نەستییەکانی خۆیان بۆ دەستدرێژیکردنە سەر وێنەی خێزانەکانیان بەهۆی منداڵەکەیانەوە دەهێننەدی–وەرگێر". هەروەها منداڵ دەبێتە ڕێکخەرێك بۆ دوورکەوتنەوەی نێوان دایكو باوك، هەروەها لەلایەن ئەوانەوە (واتە دایكو باوك) منداڵ بەکاردەهێنن بۆ پاراستنی پەیوەندیی نێوانیان لەمەترسی نزیکبوونەوە کە بەندە بە وێنەی پێکەوەلکاوی دایكو باوکی خۆیانەوە.

## منداڵی تۆڵەسێن:

لەسەرەتادا لەوە دەکۆڵینەوە چۆن شەڕانگێزی بەرامبەر وێنەی باوان بەڕێوەدەچێت: لەهەستدا دایكو باوك خوازیاری ئەوەن منداڵەکەیان ژیانێکی باشتر لەخۆیان بژی، هەروەها لەنەستدا خۆزگە دەخوازن منداڵەکەیان تۆڵەیان بۆ بکاتەوەو هێرش بۆ ئەو وێنەیەی باوان بەرێت کە بە قەدەغەکراوی ماوەتەوەو بەر لێدان نەکەتووە، لەبەرئەوەی دایكو باوك شکستهێنانو شەڕانگێزی لەیەکتر جیاناکەنەوە لەوە دەترسن دەستدرێژی بکەنە سەر منداڵەکەیان ئەگەر ڕێگەیان بەخۆیاندا منداڵەکە دووچاری شکستهێنان ببێت، لەبەرئەوە پێش داواکارییەکانی دەکەونو تەنانەت کەمترین ئارەزووەکانی تێردەکەنو ئەو هەستەی لادروستدەکەن کەتوانا هەمەکیە ommipotence (یان خاوەنی توانایەکی هەمەکییە).

لەواقیعدا لور واتە کچەکەی جاكو ڤیرا کە تەمەنی ٤ ساڵان بوو، حوکمی ماڵەکەی دەکرد، دایكو باوکی ئازادییان پێدابوو بۆ



دیاریکردنی کاتەکانی نانخواردنو ئەنجامدانی چالاکییەکانی قوتابخانە، هەروەها بەئارەزووی خۆی یارییەکانی لەهەموو ژوورەکاندا بلاودەکردەوەو دەستدرێژی دەکردە سەر برا بچوکەکەیی و گاڵتەی بە باپیرەو داپیرەی دەکرد.

دایكو باوکی لەتوانایاندا نەبوو بەرپەرچی بدەنەوە تا وایلێهات بەرگەی هەڵسوکەوتەکانیان نەدەگرت، لەمکاتەدا توندوتیژی بەشێوەی جیاواز دەردەکەوت.

دایكو باوکی لەکاتی پشکنینەکاندا بەوپەڕی خۆشییەوە باسی هەڵسوکەوتی کچەکەیان (واتە لور) دەکردو دەیانوت: سیفەتی باشی هەبوو، ئاشکرایە دایكو باوکی فۆکسیان خستووەتە سەر کچەکەیان (واتە بیریان لەسەر کچەکەیان چڕکردۆتەوە)و ئارەزووەکانی خۆیان خستووەتە پاڵی و وایانلێکردووە بەشێوەیەك هەڵسوکەوت بکات کە دڵی ئەمان خۆشبکات. لێی گەڕابوون هەڵسوکەوتی بێزراوو تۆڵەسێنو توانا هەمەکی لای پەرەبسێنێت، ئەویش لەپێناوی ڕووبەڕووبوونەوەی وێنەی شەڕانگێزی خێزانەکانی خۆیانو لەبەرئەوە لەرۆڵی پاڵەوانێکی تۆڵەسێندا پابەندیان کردبوو، بەڵام کە منداڵەکەیان کرد بەجێگرەوەی خۆیان تا رۆڵی دەستدرێژیکار ببینن لە سەر وێنەی باوانیان، بینیان خۆیان بوونەتە ئامانجی ئەو دەستدرێژییە، بەشێوەیەکی نەستی ئەم دەسەڵاتەیان بۆ وەرگرتنی ئەو رۆڵە پێبەخشیبوو، بەڵام ئەم حوکمو دەسەڵات وەرگرتنە لەلایەن منداڵەکەیانەوە بەسەر خۆیاندا شکایەوە. دەیانویست دایكو باوکێکی باش بن، بەڵام بینیان خۆیان بوونەتە ئامانجی دەستدرێژی بەمشێوەیە ئەو هەستی رقوکینەیەیان گەڕاندەوە کە دەیانویست بە

زەبر پەردەپۆشی بکەن و بیشارنەوە. ئەو رقوکینەیەیان گەڕاندەوە کە دایك و باوکیان لەمنداڵیدا خستبوویانە پاڵ ئەمان.

گەڕانەوەی پێکەوەنووسانی reintrojection توندوتیژی بەرگە ناگیرێت، لەبەرئەوە لەرێگەی کارکردن یان هەڵسوکەوتەوە دزە دەکات: باوك لەکردەوەدا lagir بەشی نەشیاو impensable، ئەو بەشەی کە دەرەنجامی مامەڵەکردنی خراپی خێزانەکەین لەگەڵیدا لەخودی خۆی دەکاتە دەرەوەو بەمەبەست مامەڵەی منداڵەکەی بە خراپی دەکات.

دووبارەکردنەوەی مامەڵەکردنی خراپ لەگەڵ منداڵدا لەرێگەی میکانیزمی هاوچەشنیکردن لەگەڵ دەستدرێژیکار identification lagresseur دا بەرێوەدەچێت کە ئانا فرۆید Anna freud (١٦) پێناسەی کردووە: باوك دەستدرێژی دەکات بۆئەوەی ئەو راستییە نەزانێت کە باوکی خۆی دەستدرێژیکار بووە، پێویستە لێرەدا ئەوە روونبکەینەوە هاوچەشنیکردن لەگەڵ دەستدرێژیکاردا نابێتە هۆی دووبارەبوونەوەی خراپ مامەڵەکردن، بەڵکو زۆر بەسادەیی هاوچەشنیکردن لەگەڵ دەستدرێژکاردا ئەو کردارەیە کە لەرێگەیەوە دووبارە کردنەوەی خراپ مامەڵەکردن بەرێوەدەچێت.

## هاوچەشنیکردن لەگەڵ دەستدرێژیکارو گواستنەوەی توندوتیژی:

دواجار ئەو دەرەنجامانەمان دەستدەکەوێت ئەو باوکەی لەگەڵ منداڵەکەیدا بەخراپی مامەڵە دەکات ناتوانێت رەگەزە پاڵنەرە بەرگە



نەگیراوەکان لەخودی خۆیدا بنوێنێت، بەڵام دەتوانێت سەرلەنوێ لەرێگەی منداڵەکەیەوە لەم رەگەزانەدا بژێتەوە.

هەوڵدەدەین چارەسەری ئەم مەسەلەیە بکەین ئەویش بەگەڕانەوە بۆ ماوەی قۆناغی منداڵی: ئەو منداڵەی دووچاری خراپ مامەڵەکردن بووە، لەدوو نواندن خۆی بەدووردەگرێت: یەکەمیان نواندنی باوکی خراپ و دووەم نواندنی منداڵێکی خراپ کە شایستەی دەستدرێژیکردنە سەر بێت. بەڵام چۆن لەم دوو وێنەیە رادەکات؟ کریڤیل criville (١٧) پێشنیازدەکات ئەم راکردنە لەرێگەی میکانیزمێکی بەرگرییەوە دەبێت، کە ئەویش هاوچەشنیکردنە لەگەڵ دەستدرێژیکاردا identification a lagresseur واتە بەمانای رەتکردنەوەی هەر دوورکەوتنەوەیەك لەگەڵ بابەتی دەستدرێژیکاردا: ببێت بەوی دیکە، وەك ئەو کاربکەیت، لەگەڵیدا پێکەوەنووسان بکەیت، ئەمانە یارمەتیت دەدەن بۆئەوەی نواندنی ئەو کەسە نەکەیت، ئەگەر منداڵ ئەم میکانیزمی بەرگرییەی بەکارنەهێنا ئەوکاتە شەڕانگێزی باوکی دێتە ناو باری هۆشیارییەوە (هەستییەوە).

لەبەرئەوە توانەوە لەگەڵ دەستدرێژیکاردا لەم نواندنە بەدووری دەگرێت، هەروەها بۆئەوەی منداڵ ئەو نواندنە بچەپێنێت کە لەرووی نارسیزمیەوە بەرگەی ناگرێت (چونکە باوك درێژبوونەوەیەکی نارسیزمی ئەو دەنوێنێت) ئەوا بەدرێژایی ژیانی مەحکومە بە کردەوەی دەستدرێژیکردن (واتە دەستدرێژیکردنە سەر منداڵێکی دیکە) ئەمەو لەبەرئەوەی ناتوانێت شەڕانگێزی باوکی بنوێنێت ئەوا سەرەنجام دەتوانێت دەستدرێژی بکاتە سەری، لەبەرئەوەی ئەو

توندوتیژییە لەناخیدا رەتدەکرێتەوە، ئەوا بۆ کەسێکی دیکە دەگوازرێتەوە.

ئەم منداڵە کاتێك خۆی دەبێتە باوك کوڕەکەی دەبێتە بابەتی شەڕانگێزیی. بۆتە باوکێکی خراپ بۆ کوڕەکەی، چونکە خۆی کاتێك منداڵ بووە، دووچاری مامەڵەکردنی خراپی باوکی بۆتەوە، هەروەها تا ئێستا نواندنی مامەڵەکردنی خراپی باوکی رەتدەکاتەوە.

لەبەرئەوەی ئێستا لەگەڵ کوڕەکەیدا توندوتیژە، چۆن دەتوانێت توندوتیژییەکەی ئێستای بنوێنێت کەخۆی بەردەوام دەڵێت: (نامەوێت کوڕەکەم وەك خۆم بژی)، لەکاتێکدایە لێدانەکانی بەوپەڕی توندوتیژی جەستەی کوڕەکەی گرتۆتەوە؟

باوك لەڕێگەی پەیوەندیی هاوژیانی symbiotique یەوە خۆی لەم نواندنە نوێیە بەدووردەگرێت (واتە بوون بەباوکێکی خراپ) بەمە کوڕەکەی دەبێتە دەستدرێژیکار لەسەر باوکی. لەمبارەدا باوك لەڕێگەی کوڕەکەیەوە شەڕانگێزیی باوکی خۆی، دووبارەکردووەتەوە. ئەو شەڕانگێزیەی کە هەمیشە خۆی لێ بەدووردەگرێت و هەوڵی نواندنی نادات. باوك لەڕێگەی ئەم شەڕانگێزییەوە دەتوانێت لێدان و زللەکانی بنوێنێت، هەروەك بڵێی پەرچەکردارێکی retroaction دادپەروەرو شەرعییانەیە بەرامبەر ڕووبەڕووبوونەوەی کوڕەکەی لەگەڵیدا کە لەلایەك بەرگەی ناگرێت، لەلایەکی دیکەوە دواجار بەهۆی هاوچەشنیکردن لەگەڵ کوڕەکەیدا identification خۆی دەبێتە دەستدرێژیکار بۆ سەر باوکی، ئەو باوکەی هیچ کاتێك نەدەبوو دەستدرێژی بکاتە سەری: ئەو شەڕانگێزییەی کە پێشتر نەیدەتوانی ئاڕاستەی باوکی بکات،



لەمڕۆدا بەهۆی کوڕەکەیەوە کە بۆتە ناوەندێك و جێگەی باوکی گرتووەتەوە، بەئاسانی ئەم شەڕانگێزییە بەدیدێت.

کەواتە دەگەینە ئەو دەرەنجامەی پراکتیزەکردنی توندوتیژی بەسەر منداڵدا روویداوە لە ئەنجامی پەیوەندی هاوژیانی لەنێوان باوك و کوڕدا. ئاشکرابونی ئەم کرداری شەڕانگێزییە لەئەنجامی نەتوانینی باوکەوەیە بۆ خۆسازدانێکی ناوەکی elaboration، بەدیوێکی دیکەدا، دەتوانرێت بوترێت، کاتێك میکانیزمی چەپاندنی لاوەکی لەچەپاندنی رەگەزە قەدەغەکراوەکاندا نوشوستی دەهێنێت، لەم کاتە ئەو پاڵنەرانەی هەرەشەیان لەسەرە باڵ بەسەر هۆشدا دەکێشن بێ هیچ خۆسازدانێك واتە دەکەوێتە بارێکی خراپەوە، ئەو تاکەش ناتوانێت هیچ شتێك بۆ چەپاندنی ئەو شەڕانگێزییەی بکات، تەنیا بەتاڵکردنەوەی یان گواستنەوەی نەبێت بۆ کەسێکی دیکە لەڕێگەی پەیوەندییەکی هاوژیانییەوە یان بەدیهێنانی لەڕێگەی کردارەوە. ئەم میکانیزمی بەرگرییە لای زۆربەی ئەو خێزانانە هەن کە بەخراپی مامەڵەی منداڵەکانیان کردووە.

## دانوستانی نێوان هاوبەشەکان بۆ نواندنی توندوتیژیی:

زۆرجار تێبینی دەکرێت میکانیزمی هاوچەشنیکردن لەگەڵ دەستدرێژیکاردا لەچوارچێوەی پرۆسەیەکی هاوژیانی لەنێوان باوك و کوڕ یان دوو هاوبەشدا، روودەدات.

هەندێجار ئەوە لەنێوان دوو هاوبەشدا روودەدات کە بۆ نواندنی شەڕانگێزی یەکێکیان بەمەبەست ئەویدیکەیان دەکاتە خاوەن

دەسەڵات (دەکاتە حاکم): یەکێك لەودوو هاوبەشە هاوبەشەکەی دی بۆ جێبەجێکردنی ئارەزووەکانی شەڕانگێزی دەکاتە حاکمو بەشێوەیەکی نەستی هانی دەدات شەڕانگێزی دژی منداڵەکە بنوێنێت، کاتێك ئەو هاوبەشەی دووەم شەڕانگێزیەکە جێبەجێدەکات، هاوبەشی یەکەم لۆمەو سەرزەنشتی دەکات.

بۆنموونە ئەم هاندانە نەستییە لە قسەی ژنێکەوە کە بەهاوسەرەکەی دەڵێت، ئاشکرادەبێت: نابینیت چەند خراپە، نابێت وازی لێ بێنیت بەئارەزووی خۆی هەڵسوکەوت بکات، هیچ دەسەڵاتو پلەوپایەیەکت نییە، کاتێك پیاوەکە دەستتێوەردان دەکاتو لەمنداڵەکە دەدات، ژنەکە وەڵامدەداتەوە: تۆ چەند توندوتیژی؟، نازانیت چۆن هەڵچوونەکانت کۆنترۆڵ بکەیت؟ وا پێویست بوو لەسەرت وازی لێ بێنیت ئەوە بکات کە ئارەزووی دەکات.

لەپەیوەندی نێوان جاك و ڤیرادا، جاك لەهەڵوێستە قورسەکاندا وازی لەڤیرا دەهێنا کە بڕیاربدات، بەرەتکردنەوەی دەستێوەردان لەو هەڵوێستانە رایدەکرد کەپێویستییان بەپراکتیزەکردنی دەسەڵات هەبوو، جاك ڤیرای ناچاردەکرد پراکتیزەی سزادانی منداڵەکەیان بکات، لەدوای ئەوەش کە ڤیرا سزادانی پراکتیزەدەکرد جاك لۆمەو سەرزەنشتی دەکرد کە دڵرەقو دیکتاتۆرە، لەکاتی دانیشتنەکەدا ئەم گفتوگۆیە بەمشێوەیە بەڕێوەچوو: جاك بەڤیرای دەوت: (ئەگەر تۆ نەبوویتایە من دەمامەوەو دەستێوەردانم لەسزادانی منداڵەکەماندا دەکرد، هەرچی ڤیرایە وەڵامیدەدایەوە "ئەگەر بمایتایەتەوەو بەرپرسیارێتی خۆتت لەئەستۆ بگرتایە، هیچ ناڕازی نەدەبووم یان



توندوتیژیم بەسەر منداڵەکەدا پراکتیزە نەدەکرد".

ئەو هاوبەشەی هەمیشە جێبەجێکردنی شەڕانگێزی بەرامبەر منداڵەکەی ئەنجامدەدات هەمیشە بەباوانێکی خراپ دەناسرێت، هەرچی هاوبەشەکەی دیکەیە کە ئەو دەسەڵاتەی داوەتە هاوبەشەکەی بۆ جێبەجێکردنی شەڕانگێزی، بەباوانێکی باشو خۆشەویست دادەنرێت، لەمبارەدا کاوەخۆ هاوپەیمانێتییەك لەنێوان باوانی باشو منداڵدا روودەدات، هاوپەیمانێتیەك ئامانجی پاراستنی منداڵەکەیە لەشەڕانگێزی، بەڵام هاوبەشەکەی دی لەتواناکانی دادەماڵێتو شەڕانگێزییەکەی بەهێزدەکات، لەسەر ئەم بناغەیە دوورکەوتنەوەی پێویست لەنێوان دوو هاوبەشەکەدا پشتیوانی لێدەکرێت.

کەواتە ئەو دەرەنجامەمان دەستدەکەوێت، لەنێوان دوو هاوبەشدا پەیوەندی هاوژیانی دوو ئامانج بەدیدەهێنێت: لەلایەکەوە کۆنترۆڵکردنی شەڕانگێزییە بەرامبەر منداڵو ئەویش بەهاندانی هاوبەشەکەی دی بۆ ئەنجامدانی شەڕانگێزیو پاشان رەتکردنەوەی ئەو شەڕانگێزییە، لەلایەکی دیکەوە پشتیوانی لەدوورکەوتنەوە distanciationی نێوان دوو هاوبەشەکە دەکات بۆئەوەی هاوجێبوون یان بەراوردکاری لەگەڵ وێنەی پێکەوەلکاوی باواندا ئەنجامنەدرێت.

لێرەدا پێکهاتەیەکی پتەوو تایبەتی بەدیدەکەین، چونکە هاوژیانی لەگەڵ منداڵو هاوژیانی لەنێوان دوو هاوبەشدا بەشێوەیەکی ئاڵوگۆڕکراو پشتیوانی دەکرێن: بەو هێندەی ڤیرا بێئاگابوو لەو توندوتیژییەی کە بەسەر منداڵەکەدا پراکیتزەی دەکرد ئەوەندە دوورکەوتنەوە لەنێوان دوو هاوبەشەکەدا (ڤیراو جاك)

جێگەی دەگرتەوە، هەروەها چەند ڤیرا لەجاک نزیکدەبووەوە، ئەوەندە جاک هانی منداڵەکەی دەدا بۆ گوێنەگرتن و سەرکێشی و ئەمەش شەڕانگێزیی ڤیرای زیاتر دەوروژاند، دواجار دەتوانرێت بوترێت چەندە جاک و ڤیرا، سەبارەت بەمامەڵەکردنی منداڵەکەیان ناکۆکبوون ئەوەندە لەهەستدا لەیەکتری دووردەکەوتنەوەو نزیکایەتی نەستییان دەگەڕاندەوە (واتە لەنەستدا نزیکدەبوونەوە لەیەکتری).

## گواستنەوەی توندوتیژی لەدایکەوە بۆ کچ:

ئەو دایکانەی توندوتیژی بەسەر کچەکەیاندا پراکتیزەدەکەن، بەوە دەناسرێن کەسایەتییەکی لاوازو ناکامڵیان هەیە، دەرکەوتووە زۆربەی ئەو دایکانە لەلایەن دایکی خۆیانەوە رووبەڕووی توندوتیژیی بوونەتەوە، بوونی منداڵێک کە دەبێتە قوربانی توندوتیژی یارمەتی گەڕانەوەی پەیوەندی دایک لەگەڵ دایکی خۆیدا دەدات.

خراپ مامەڵەکردنی ئەم دایکانە لەگەڵ کچەکانیاندا بەندە بەئەزموونی ئەستەم و ناخۆشەوە کەتیایدا ژیاون هەروەها بەندە بەفەنتازیای fantasmes کوالێتییەوە (جۆرییەوە) کەبایەخدەدات بەلێکچوونی جەستەیی و بەتایبەتی ئەو بۆشاییانەی کە لەڕووی توێکارییەوە هەردووکیانی پێ جیادەکرێنەوە، لەم نێوکۆیەدا کچ رووبەڕووی ئەستەمی دەبێتەوە لەهاوچەشنیکردن لەگەڵ دایکیداو هەروەها دانانی وەک ئایدیالێک کە یارمەتیبدات بۆ بەدیهێنانی تاکانەیی خۆی و ئەم ململانێیە شینابێتەوە، تەنیا لەڕێگەی کوشتنی



سیمبولی دایکەوە نەبێت کە جولیا کریستیڤا J.Kristeva[18] باسیکردووە، چونکە بەکوشتنی دایک، واتە ئەو کچە خۆی کوشتووە.

لێکۆڵینەوەی قوڵی ئەو کچانەی رووبەڕووی خراپ مامەڵەکردن بوونەتەوە ئاشکرایدەکات کەشەڕانگێزییان بەرامبەر بەدایکیان هەیە. ئەم پاڵنەرە زۆر بەتوندی بەرجەستە دەبێت، بۆنموونە لەو کاتەدا کە کچ لەگەڵ دایکیدا لەپێناو گەیشتن بە باوکی کێبڕکێ دەکات، نابێت لێرەدا نموونە کۆمەڵایەتی و ئەو بارودۆخە سەپێنراوە لەهەندێک لەو کولتورانەدا لەیادبکەین کەپشتیوانی لەهەژموونی پیاو بەسەر ژندا دەکەن، چونکە ئەم نموونانە کاریان کردووە بۆ گەرمکردنی ململانێ یان (خۆشکردنی ململانێ) لەنێوان ژناندا ئەویش لەشێوەی شەڕی ئاشکراکراوداو غیرە لەناویاندا بلێسەی سەندووە، هەروەها کێبڕکێی هەمیشەیی و کارتێکردن لەلایەن پیاوەوە (یەکەمجار باوک و بەدواییدا براو پاشانیش مێرد)ی بەسەریاندا سەپاندووە، ئەم کێبڕکێیەی لەلایەن نموونە کۆمەڵایەتییەکانەوە گەرمتر دەکرێت، زۆربەی دایکانیش پشتیوانییان لێکردووە، هەروەها ئەو دایکانە ئارەزووی بەرهەڵستیکردنی کچەکانیان و ناچارکردنیان دەکەن بۆ لەئەستۆگرتنی ئەوانەی خۆیان لەئەستۆیان گرتووە، هەروەها تووڕەیی لای ئەو دایکانە بەرامبەر کچەکانیان دەبوژێتەوە، لەبەرئەوەی کچەکانیشیان سەر بەرەگەزێکی (ریسوا)و بێزراون.

توندوتیژی لەم جۆرە دایکانەدا دەیانگەیەنێتە ئاستێک لەکچەکانیان دەدەن و سوکایەتیان پێدەکەن، ئەم توندوتیژییە لەسەر جەستەی کچ بەرجەستە دەبێت، هەموو ئەمانە روودەدەن هەروەک بلێی دایکەکە شکستە لەبەردەم درکپێکردنی هەر جیاوازییەک

لەنێوان خۆیو کچەکەیداو لەو بارەشدا کەدرك بەو جیاوازییە دەكات ناتوانێــت بەرگــەی بگرێــت (لەئەســتۆی بگرێــت)و ئەوپــەڕی هەوڵوکۆششی دەخاتەگەڕ بۆ رزگاربوون لێی. ئەم شکستییە هەر لەیەکەم رۆژی لەدایکبوونی ئەو منداڵە کچەوە دەردەکەوێتو لەئەستەمییەکانی پەیوەندی نێوانیاندا روونو ئاشکرا دەبێت.

## توندوتیژی دایکایەتیو سیمبولەکانی:

فەنتازیاکانی ئەو دایکەی کە بەخراپی مامەڵە لەگەڵ کچەکەیدا دەکات، شێوەی جیاواز لەخۆدەگرێت، بۆ نموونە وەك روشاندنو گازگرتنو برینداركردن، کە لەسەر جەستەی کچ پراکتیزەدەکرێت، هەروەها دەشێت دایك خەون بەئازاردانی بەشەکانی ناوەوەی جەستەی کچەکەیەوە ببینێت بەتایبەتی ئەندامی سێکسوالی کچ، لەهەندێك حاڵەتی جیادا تێبینی دەکرێت فەنتازیای رق و شەرانگێزی لەهێزەوە بۆ کردار دەگۆڕێت، کە دایك دەستدرێژی دەکاتە سەر کچەکەی بەتایبەتی ئەگەر ئەو دایکە لەدوای منداڵبوون تووشی خەمۆکی رەشبینانە بوو بوو، یان لەدوای منداڵبوون لەکۆرپەکەی جیاکرابۆوە، (ئەم جیاکردنەوەیە لەوانەیە توانای دایك بۆ هۆگربوون لەگەڵ منداڵدا بووەستێنێتو جۆرە هەستیارییەك بەرامبەری، دروستبکات)[۱۹] لە هەردوو حاڵەتەکەدا ئەم ژنانە هەستدەکەن جیابوونەوەی فسیۆلۆژی لەو بوونەوەرەی کە چەند مانگێك بە پێستی سك هەڵیانگرتووە وەك لەدەستچوونێك وایە کە بەرگەی ناگرن، چونکە لەدەستچوونی بەشێك لە خۆیان دەنوێنێت،



لەبەرئەوە هەستێکی نێگەتیڤ هەژموونیان بەسەردا دەگرێتو هەستدەکەن لەبەهای خۆیان داماڵراون.

ئەم دایکانە درك بەدایکی خۆیان دەکەن لەشێوەی وێنەیەکی شکستهاتوو تێکچوودا، ئەم درکپێکردنە بەرامبەر خۆیان وایان لێدەکات لەجیهان دەوورەپەرێز بنو خۆیان بخۆنەوە، تەنانەت وایانلێدێت لای کەسە نزیکەکانیشیان ناتوانن ئەوەی هەستی پێدەکەن بیدرکێنن، کارتێکەرە هەڵچوونییەکانی لەشێوەی زوڵمدا دەردەکەون وەك ئارەزووی ئازاردانی منداڵ یان فڕێدانی لەسەر زەوی یان ئەشکەنجەدانی، بەچەپێنراوی لەم ژنانەدا دەمێننەوە یان خۆیشیان لەم ئارەزووانەی خۆیان تێناگەن.

بارودۆخی منداڵبوونو ئەو گۆڕانە فسیۆلۆژیانەی بەسەر دایکدا دێن لەدوای منداڵبوون وایلێدەکەن لەخستنەوەبەرفرمانی ئەو منداڵە شیرەخۆرە لەرووی سایکۆلۆژییەوە investir شکستبێنێت یان ناتوانێت دەست لەمنداڵەکە بدات یان قسەی لەگەڵدا بکات، هەروەها دایك ناتوانێت وەڵامدانەوەی بۆ داواکارییە زیندەییەکانی رۆژانەی منداڵەکەی، هەبێت.

منداڵیش لەمحاڵەتەدا ناتوانێت وەڵامدانەوەی بۆ ئەم مامەڵە توندوتیژە هەبێت تەنیا لەڕێگەی گریانو قیژەوە نەبێت، لەبەرئەوە داواکاری زیاتر دەبێتو بەتەواوەتی رێگەدەگرێت لەخستنەوەبەرفرمانی ئەو دایکە سەرقاڵەی بە گیروگرفتە تایبەتییەکانییو بەو ماتەمینییەوە son deuil کە بە تایبەتی بەندە بەپەیوەندی خراپی لەگەڵ دایکی خۆیداو بەویەکە سایکۆلۆژییەوە کە بۆ هەتاهەتایە لەدەستی چووە.

لەم شێواندنەدا کە روویداوە منداڵ شکستیی دەردەبڕێت لەتێگەیشتنی ئەوەی بەسەریدا دێت یان روودەدات، ناتوانێت گوزارشت لەوەڕسبوونی بکات تەنیا لەڕێگەی قیژەی هیلاککەرەوە نەبێت بۆ دایك (واتە منداڵ بەهۆی ئەو قیژەو گریانەوە دایکی هیلاك دەکات) ئەم منداڵە لەدواییدا ئارەزووی ئەوە دەکات بەرپرسیارێتی سەرنەکەوتن لەو پەیوەندییەدا بگرێتە ئەستۆی خۆی، لەبەرئەوە بەرپرسیارێتی خۆشنەویستنی دایکی دەخاتەپاڵ خۆی، منداڵ کاتێك هۆکاری هەڵە دەخاتەپاڵ خۆی، درك بەوە دەکات کە (منداڵێکی خراپە)و لەگەڵ هەموو کەسدا خراپ دەبێت، چونکە بەتایبەتی نەیتوانیوە خۆشەویستی دایکی بەدەستبێنێت.

ئەو دەرەنجامانەی لەم جۆرە پەیوەندییانەدا پەیدادەبن، لەدەستدانی درپێکردن و جیاکردنەوەیە لای منداڵ، بەشێوەیەك لەمنداڵەکەدا (من– moi son)ەکەی لەنواندن و تێگەیشتندا شکستدەهێنێت هەروەها ئەستەمە بۆی (من– moi) ێکی یەکگرتوو بەهێز دروستبکات کە بتوانێت بەرهەڵستی دەستدرێژیی جیهانی دەرەوە بکات)[٢٠].

د. ئەنزیو D.Anzieu[٢١] ئاماژەیداوە بە مەترسی سەرنەکەوتن لەم پەیوەندییە سەرەتاییە لەگەڵ دایکدا، هەروەها بۆ کاریگەرییەکەی لەسەر دروستبوونی (من– داپۆشەر) moi peau یان ئەوەی پێی دەوترێت بەرگەکانی من enveloppes du moi، داپۆشەر یان بەرگە جەستەییەکان رۆڵێکی سەرەکی لەو توندوتیژییە جەستەییە دەبینن کە دایك لەسەر منداڵ پراکتیزەی دەکات، چونکە بەشێوەیەکی دووبارەبۆوە منداڵ دەبێتە ئامانجی ئەو توندوتیژییە.



مایەی سوودمەندییە لێرەدا هەڵوێستەیەك لەسەر یەکێك لەم داپۆشەرانە بکەین کە ئەنزیو Anzieu قسەی لەسەرکردوون: بۆنموونە داپۆشەری دەنگی لەو دەنگ و ژاوەژاوانەی منداڵ پێکدێت کە گوێی لێیان دەبێت و یەکەمجار لەدایکەکەوە دەردەچن و ئەمیش بەخێرایی بەقیژەو گڕوگاڵ babillage وەڵامییان دەداتەوە. لەو بارەدا ئەگەر ئەم دەنگانە بوونیان نەبوو یان پشێویان تێکەوت، تێبینی دەکرێت بە رێگەیەکی ناڕاستەوخۆ منداڵ لەدروستبوونی (من–داپۆشەر moi peau)دا دووچاری شکستی دەبێت، ئەگەر دایك لاڵ یان بێدەنگ بێت و لەهاندانی منداڵە شیرەخۆرەکەیدا بۆ قسەکردن شکستبێنێت، کاتێك ئەگەر بێ هۆ قیژەیەکی توندی بەسەردا بکات، ئەوا لەوانەیە ئەم دایکە، منداڵە شیرەخۆرەکەی لەخامۆشییەکی کوشندەو تۆقێنەردا، بهێڵێتەوە.

هەروەها لەم نێوکۆیەدا تێبینی دەکرێت ئەگەر دایکی خەمۆك نەیتوانی وەڵامدانەوەی بۆ وەڕسی و بێتاقەتی منداڵە شیرەخۆرەکەی هەبێت، ئەوا ئەم هەڵوێستەی دایك کەلێنێکی هەمیشەیی لە (دەزگای پاریێزەری کارتێکەرەکان excitation pare)ی منداڵدا دروستدەکات، فرۆید فرمانێکی بۆ ئەم دەزگا پارێزەرە داناوە کە بریتییە لە (بەربەستدانان لەنێوان کۆئەندامی سایکۆلۆژی و فشارە توندوتیژەکانی لەجیهانی دەرەوە دەردەچن)[٢٢] پشتبەستن بەم شیکارییانە، تێبینی ئەو ژنانە کراوە کە بەدەست دایکێکی توندوتیژەوە نالاندویانە دانیان بەوەداناوە یادگارییەك هەیە لەیادەوەرییاندا بەندە بە وەڕسبوون و قەڵسبوونیان بەهۆی وەستانی کتوپڕ یان نەمانی دەنگی دایکیان، زۆربەی ئەم ژنانە باسی

ئەوەیانکردووە، گۆڕانی خێرا لەتێکڕایی دەنگو ئاوازی دەنگی دایکییاندا بانگەشەبوون بۆ نزیکبوونەوەی دەرپەڕینی تووڕەبوونو شۆڕشی هەڵچوونەکانی. هەندێکی دیکەیان باسی ئەوەیان کردووە کە نۆبەیەکی چاوەڕواننەکراو لەبێدەنگی دایکییاندا قیژەو هاواری توندی بەدوادا هاتووەو بێدەنگییەکەی بڕیوە: ئەم تەقینەوانە بانگەشەن بۆ زللەیەکی چاوەڕوانکراو لەلایەن دایكو هەروەها بانگەشەن بۆ قسەی کتوپڕی دایك کەئامانجی لۆمەو سەرزەنشتکردنی منداڵەکەیەتی یان گاڵتەپێکردنییەتی.

لەهەڤپەیڤینێکدا کە لەگەڵ ١٠ ژن لەیەکێك لەناوچەکانی لوبناندا سازمدا، ئەو ناوچانە بە نەریتی توندوتیژی بەرامبەر بەکچان دەناسرێن، دەرکەوت ئەم ژنانە بەدەست پەروەردەیەکی ڕەق و توندوتیژەوە لەلایەن دایکیانەوە ناڵاندوویانەو ویستوویانە کچەکانیان ملکەچی پێودانگە کۆمەڵایەتییە باوەکان لەو ناوچانەدا بن: لەوناوچانەدا دایك بە هەموو ڕێگەیەك دەستدرێژی دەکاتە سەر جەستەی کچەکەی، بەشێوەیەك توندوتیژی جەستەیی هەمیشە هاوکات بوو لەگەڵ توندوتیژی لەڕێگەی قسەپێووتنەوە، لای زۆربەی ئەم دایکانە فەنتازیای دایکایەتی توانایەکی واقیعی ئاشکرادەکات بۆ هەڕەشەکردن لەرێگەی قسەکردنەوە، هەروەها نەفرەتکردن لەجەستەی ئەو کچە کە بە کەسێکی گوناهبار دادەنرێت تەنیا لەبەرئەوەی دابونەریتە باوەکانی پێشێلکردووە یان زۆر بەسادەیی، چونکە بەکچی لەدایکبووە.

ئەم کارە توندوتیژییانە هاوکاتن لەگەڵ نەفرەتییەکانی دایك بەرامبەر کچەکەی، ئەو کچە ئەم توندوتیژییانەی دایکی بەشێوەی



وێنەیەك دێتە خەیاڵیی کە ئامانج تێیدا تێکشاندنی جەستەو لەتوپەتکردنیی ئەوە بۆ چەندەها پارچە.

ئەو کچەی دەبێتە قوربانی توندوتیژی دایکی، کاتێك ئەو توندوتیژییە دەگاتە سنووری سادیزمو شێتییەکی کوشندە، هەندێجار ئەو کچە لەتوانایدا نابێت هیچ کۆئەندامێکی بەرگری تایبەت پەرەپێبداتو ناشتوانێت پەنا بۆ داواکردنی یارمەتی لەکەسانی چواردەوری بەرێت تا لەم توندوتیژییە رزگاری بکەن.

زۆربەی تاکەکانی خێزان جۆرێك لەکەمتەرخەمی ئاشکرادەکەن بەرامبەر ئەوەی لەدەوروپشتیان ڕوودەدات، نەك هەر ئەمە، بەڵکو پەنا دەبەنە بەر لۆمەو سەرزەنشتکردنی کچو هەندێجار تۆمەتبارکردنیشی، لەوەدەچێت گومانی تێدانەبێت ئەو کچەی بەدەست خراپ مامەڵەکردنی دایکییەوە ناڵاندوویەتی لەترسو پەژارەیەکدا دەژی بەتەواوەتی ئیفلیجی دەکاتو هەروەها ئەم دۆخە دژوارەشی دەشارێتەوە، چونکە بیرۆکەی هەڵسوکەوتی دایکی بەشێوەیەك وەرگرتووە کە هەڵسوکەوتێکی (سروشتین). کاتێك کچ تێبینی دەکات، دایکی لەمامەڵەکردنی لەگەڵ براکانیدا جیاوازی دەکات هیچ کاتێك بیر لەوەناکاتەوە کە ئەم خۆی بابەتی زوڵمو ناهەقی بێت، چونکە ئەو توانایەی نییە وا بیر لەخۆی بکاتەوە کە تاکێکە لێکچووە یان هاوتایە بەوانی دیکە، نەخێر بەپێچەوانەوە بەیەقینێکی ئاشکراوە خۆی دەبینێتەوە ڕقوکینەو لادانی پاساو بۆ خراپ مامەڵەکردنەکەی دایکی دەهێننەوە. هەمیشە دەبینین ئەو کچەی ڕووبەڕووی جۆرەها توندوتیژی جیاواز لەلایەن دایکییەوە بۆتەوە، وایلێدێت یان حاڵەتەکە بەرەو ئەوەی دەبات وەڵامدانەوەی

پرسیار دەربارەی شێوازی پەروەردەکردنی رەتبکاتەوە، هەمیشە لەژێر کاریگەری ترسدا پابەندە بەبێدەنگییەوە، بڕوای بەوە هەیە کە ئەم شایستەی ئەم جۆرە مامەڵەکردنەیە.

ئەو کچانەی رووبەڕووی مامەڵەکردنی خراپ بوونەتەوە، هەر لەقۆناغی سەرەتای منداڵییانەوە ناتوانن خۆیان وەك خودی جیاکراوە لەدایك یان لەجیهان وێنابکەن. لەوە دەچێت کۆئەندامەکانی دیکەی پاراستنیان بە شێوەیەکی پێویست لەکۆئەندامی سایکۆلۆژی بە دامالڕاوی بمێنێتەوە، واتە ئەو کۆئەندامانەی بەهۆیەوە دەتوانن بەرهەڵستی ئەو دەستدرێژییەی دایکیان بکەن کە بە ناهەقی لەسەریان پراکیتزەی دەکات، بەمشێوەیە لەئاشکراکردنی شەڕانگێزیی و تووڕەبوونیان بەشکستی دەمێننەوە بەرامبەر هەر کەسێك کە دەستدرێژی دەکاتە سەریان. هەروەها واش دەردەکەوێت کە بەشکستی بمێننەوە لەفراوانکردنی بواری پەیوەندیان و ناسینی کەسانی دیکە جگە لەدایکیان تا پەنایان بۆ بەرن و داوای یارمەتییان لێبکەن.

ئەو دایکە لەبەرچاوگرتنی سەربەخۆیی کەسێتی کچەکەی رەتدەکاتەوە یان کاریتێدەکات، هەروەها ئەم دایکە شکستی خۆی ئاشکرادەکات کە درك بەکچەکەی ناکات وەك بابەتێکی هەمەکی، ئەو دایکەی بەتوندی لەکچەکەی دەدات یان دەیسوتێنێت (داخی دەکات)و گاز لەشوێنی تایبەت لەجەستەی دەگرێت لەوە ناچێت وەك تاکێکی تێروتەواو درك بە بوونی ئەو کچەبکات (واتە وەك تاکێکی سەربەخۆ لەخۆی نایبینێت).

بەتاڵکردنەوەی توندوتیژی قۆناغی منداڵی خۆی لەخۆیدا



تێکشکاندنی بەرگری ئەوی دیکەیە، ئەم توندوتیژییە لەدایکدا دەیەوێت شوێنەوارێکی هەمیشەیی بەجێبهێڵێت، لەم هەڵسوکەوتەوە لەوە دەگەین ئەو دایکە ناتوانێت بوون و سەربەخۆیی کچەکەی وەربگرێت ئەگەر ئەم سەربەخۆبوونەی ئاسەواری زامێکی هەمیشەیی لەسەر جەستەی بەجێنەهێڵێت و شایەتحاڵ بێت لەسەر ئەو پەیوەستییەی بەشێوەیەکی هەمیشەیی بەیەکیانەوە دەبەستێتەوە.

ئەو دایکەی گاز لەجەستەی کچەکەی دەگرێت گوزارشت لەشکستییەك دەکات لەبەرگەگرتنی لەدەستچوونی یەکەم پەیوەندی کە بە کچەکەیەوە دەبەستێت، هەروەها گوزارشت لەئەستەمی دەربڕین لەڕێگەی قسەکردنەوە لەجیاتی گازگرتن دەکات، وێڕای ئەمانە ئارەزووی دایکەکە ئاشکرادەکات لەسەرلەنوێ پێکەوەنووسانی reincorporer لەگەڵ منداڵدا یان گواستنەوەی چەند بەشێکی بۆ جەستەی خۆی. ئەو دایکە لەڕێگەی ئەم هەڵسوکەوتەوە دەبێتە خاوەنی توانا (توانای بۆ پەیدا دەبێت) بۆ رزگاربوون liquidation لەدڵەراوکێی جیابوونەوە کە بەندە بەقۆناغی لەدایکبوونی یان نەرزەبوونی کچەکەوە. ئەو دایکەی گاز لەکچەکەی دەگرێت یان داخیدەکات هیچ هەستێکی سۆزداری بەرامبەر کچەکەی نییە: کچەکەی لەگوزارشتکردن لەهەڵچوون و هزرەکانی بێبەشدەکات، ئەم هەڵسوکەوتە ئەو هەستەی پێدەبەخشن کە سەرکەوتنی بەدەستهێناوە لەتێکشاندنی بابەتەکەدا (کچەکە)و هەروەها ئەو هەستەی پێدەدەن کە ئەوو بابەتەکە یەك (گشت) دروستدەکەن، لەبەرئەم هۆکارە لەوەدەچێت کاتێك توندوتیژی لەسەر کچەکەی پراکتیزەدەکات بێئاگابێت لەو ئازارە جەستەییەو لەو

وەڕسیی و قەڵسبوونە دەروونییەی کە ئەم دەبێتە هۆی دروستبوونیان لای کچەکە، لەدوای پراکتیزەکردنی ئەو توندوتیژییە هەست بەهیچ گوناه یان پەشیمانییەك ناکات و هەروەها وادەردەکەوێت کە زۆرجار هەڵسوکەوتەکانی بەڕێگەیەکی نەستی بەڕێوەدەچن.

ئەم توندوتیژییەی لەم دایکەوە دەردەچێت تەنیا دەرەنجامی ئەوە نییە کە خۆی لەمنداڵیدا ڕووبەڕووی مامەڵەکردنی خراپی دایکی بۆتەوە، بەڵکو بەتایبەتی بەهۆی دانپێدانەنانی دایکییەتی بەوەی کە ئەم (واتە کچەکەی کەئێستا خۆی بۆتە دایك) خاوەن کەسێتییەکی دەگمەن و سەربەخۆو خاوەنی هزرو ئارەزووی تایبەتییە، کاتێکیش ئەم کچە گەورە دەبێت و خۆی دەبێتە دایك دەست بەپراکتیزەکردنی توندوتیژییەکی کوشندە دەکات بەرامبەر بە خۆیی و کچەکەی: سزای خۆی دەدات لەڕێگەی وێنە لێکچووەکەیەوە کە لەکچەکەیدا خۆی دەنوێنێت، ئەم دایکە بەردەوام چاودێری بچووکترین جیاوازی دەکات لەنێوان کچەکەی و ئەو نموونەیەی کە خۆی دیاریکردووەو هەر لەسەرەتاوە وێنەی کردووە، هەر بە ڕوودانی جیاوازییەك شکستدەهێنێت لەناسینەوەی کچەکەیداو بەمەش جامی تووڕەیی بەسەردا دەڕژێنێت، ئەم گەڕانەوەیە بۆ خود یان لێکچووەکەی identique وەهمێکە بەمێشکی هەموو دایکێکدا دێت. ئەم وەهمە بەخێرایی نامێنێت هەر کە دایك کاریکرد بۆ هاوجێکردنی کچە واقیعییەکەی لەگەڵ کچە خەیاڵییە رازێنراوەکەی بەهەموو کەمالیاتێکەوە (دایکی توندوتیژ هیچ کاتێك دەستبەرداری ئەم وەهمە نابێت کە شێواویەك لەسنووری نێوان واقیع و خەیاڵدا دروستدەکات و کارێکی باش و خراپ لەبەجێهێنانی ئەرکی دایکایەتیدا، دەنوێنێت)[٢٣].

-دواجار دەتوانین بڵێین دایك ئەم شەڕانگێزییە سەرەتاییەی خۆی، لەچوارچێوەی ئەو کچەدا دەدۆزێتەوە کە لە خۆی دەچێت، ئەم کچە خۆی دەهێنێتەوە یاد کاتێك منداڵێکی بچوك بووە، ئەم کچە سەرلەنوێ ئەو هاوچەشنییانە لای ئەم دایکە چالاکدەکاتەوە کە زیاتر مایەی ئەشکەنجەبوون بۆی.

منداڵی کچ هەر لەسەرەتای لەدایکبوونییەوە خۆی لەجیهانێکی سنووردارو هەندێك پێودانگی مێیەتیدا دەبینێتەوەو دایکی هەر لەسەرەتاوە ئەوەی بۆ ئاشکرادەکات کە ئەم وەك (منداڵێکی دووانی)[٢٤] وایە، بەلای ئەوەوە ئەم واتە دایك هەڵیگرتووەو هەر ئەویش بەهاکانی ژن لەخێزاندا دیاریدەکات، چونکە ئەم دایکە نمایندەی ژنێکی دیکەیە: ئەو ژنەی دی دایکی خۆیەتی کە پێودانگی ئەو ئەرکانەی دیاریکردووەو ئەمیش پێویست بووە پەیڕەوییان بکات، لەسەر بناغەی جووت فرمانی دایك، کچ بە ملکەچبوونێکی دوانی وەڵامیدەداتەوە: یەکەمیان وەك بابەتی بنەڕەتیی پشتدەبەستێت بەڕووداوێکی سروشتی و خۆی دەنوێنێت لەهۆگربوون بە دایکیەوە، دووەمیان بەندە بەواقیعی کولتوورو لەئەستۆگرتنی بارگرانی نموونە سەرەکییەکانی مێیەتیدا خۆیدەنوێنێت.

## پەراوێزەکانی وەرگێڕ:

(ا) پەروەندە: فاسد

(ب) سەرگرتە: ئینتیباع

(ج)بیرۆکەی گەستن morsure de la pense : کاتێك ڕێگە لەمندالّ دەگیرێت بە هەموو شێوەیەك توندوتیژی بەرامبەر کەسێکی دیکە یان دەوروپشتی دەرببڕێت ئەوا ئەو توندوتیژیە بۆ خۆی دەگەڕێتەوەو تێبینی دەکرێت ئەو مندالّە گاز لەدەستی خۆی دەگرێت.

(د) ناچیز: مکروه

(ت)بەرچاوتەنگی Avidite : بەرچاوتەنگی مندالّ واتە تێرنەبوونی لەسۆزو خۆشەویستی باوان، تا باوان بە خراپی مامەڵە لەگەڵ مندالّدا بکات ئەوەندە مندالّ بۆ سۆزو خۆشەویستی بەرچاوتەنگتر دەبێتو تێر نابێت.



## پەراوێزەکان:

1-BERER M., Des entretiens familiaux a la representation de soi, Paris, Ed. Apsygee, 1990, P.55.

2-BERGERT J., La violence Fondamentale, Paris,Dunod, 1984.

3-ROUSSILLON R.,Paradoxes et situations limites de l,analyse, Paris, P.U.F, P72.

4-WINNICOTT D.W., Jeu et realite, Paris, Gallimared, 1975, PP.28-35.

5-BERGER M.,Les trubles du devloppment cognitive, Toulouse, Ed. Privat, 1992, P.105.

6-ibibd., PP.120.

7-FREUD S.,Au-dela du principe de plaisir, in Essaia de Psychanalyse, Paris, Payot, 1920,P. 209.

8- FREUD S., La negation dans resultats, idees, Problemes, Tome II, Paris, P.U.F, 1925,PP. 230-236.

9-GREEN A., Reflexions libres sur la representation et L'affect, inRev. Franc. Psychanal, XLIX, Paris Gallimard, 1990, P.773.

10-BLEGER J., Symbiose et ambiguite, Paris, P.U.F, 1981, PP.34-40.

11-KLEIN M., Les devloppments de la Psychanalyes, Paris, Gallimard, 1990. PP. 190-198.

12-KLEIN M., Envie et gratitude et autres essais, Paris, Gallimard, 1968, PP,120-136.

13-GREEN A., La foli Privee, Paris, Gallimard, 1990, P.36.

14-BERGER M.Difference des sexes carence prococe, Expose fait au 7eme congres de therapie familiale, Paris, 1990.

15-LEMAIREJ-G., Le couple: sa vie, sa mort, Paris, Payot, 1979, PP. 232-253.
16-FREUD A., Le moi et les mecanismes de defense, Paris, P.U.F, 1949, PP. 40-55.
17-CRIVILLE A., Acorps et a cris: parent maltraitant-enfant meurtri, in Nov. Rev. Psychanal, 33, Paris, Gallimard, 1986, P.217.
18-KRISTEVA J., Soleil noir, Depression et melancolie, Paris, Gallimard, 1987, PP. 38-39.
19-ANTONYE., CHILAND C., L,enfant vulnerable, Paris, P.U.F, 1982. P. 189.
20-GREEN A., Narcissme de vie narcissime de mort, Paris, minuit, 1983 P. 230.
21-ANZIEU D., Le Moi- peau, Paris, Dunod, 1985.
22-FREUD S., L,inquietante etrangete, in Iinquietant etranget et autres essais, Paris, Gallimard, 1919, PP, 70-74.
23-GERARD R., La violenc et le sacre, Paris. Grasset, 1972, P. 63.
24-FREUD S., Au-dela du principe de Plaisir, in Essais de Psychanalyes, Paris, Payot, 1920, P.209.



## کۆتایی

ژیـانی هاوسـەرێتی پەیوەسـتنامەیەکە لـەنێوان دوو هاوبەشـدا، پەیوەنـدی لـەم پەیوەسـتنامەیەدا لـەنێوان پەیوەنـدی دروسـتو پەیوەنـدی پاسـۆلۆژیدا دەگۆڕێـت: چـونکە ژیـانی هاوسـەرێتی وا پێویـستدەکات تـاك پـەنا بـەرێت بـۆ فرمانـە سـایکۆلۆژییەکانی رووخـسارە زۆر دێرینـەکانو ئـەو روخـسارانەی زیـاتر بـۆ سـەردەمی منـداڵی دەگەڕێنـەوە، هـەروەها وا پێویـستدەکات ئـەم رووخـسارانە لەگـەڵ رووخـسارە زۆر دێرینـەکانی هاوبەشـەکەی دیـدا پێکـەوە کارلێکبکـەن: پەرۆشـی بـۆ توانـەوەو جیاکردنـەوەو مەیلـەکانی گەڕانـەوەو پاڵنـەرە جێنیتالییـەکانو میکانیزمـە بەرگرییـە زۆر دێرینـەکانی قۆنـاغی پارانۆیـدیو خـەمۆکی هـەموو ئەمانـە دەشـێت لەماوەی ژیانی خۆشەویستی یان عەشقدا، سەرهەڵبدەنەوە.

بەهەڵـەدا دەچین ئەگـەر دەسـتەواژەی نەخۆشـی (پاسـۆلۆژی) مـان بەسـەر هـەر گوزارشـت یـان رووخـسارێکی میکانیزمـە نیورۆسـسی (دەمـاری) یـان سایکۆسسیەکاندا گشتگیرکرد، چونکە ئـەوە دەزانـین هـەموو بونـەوەرێکی مرۆیـی لـەناو خـودی خۆیـدا شـوێنەواری ئـەم روخـسارە بۆماوانـە هـەر لەقۆناغـە سـەرەتاییەکانی منداڵییـەوە دەپارێزێت، رێـونێنی دەکرێت یان پاڵی پێوەدەنرێت بۆ سـەرلەنوێ بەکارهێنانـەوەی لەشـوێنێك یـان لـەکاتێکی دیکـەدا: ئـم شـوێنەوارە بەبێـدەنگی دەمێنێتـەوەو دەرناکـەوێت یـان ئاشـکرا نابێـت تـەنیا

لەحاڵەتی خۆشەویستی یان عەشقدا، نەبێت.

لەگۆشەنیگای شیکارییەوە، ناتوانین پەنابردن بۆ ئەنجامدانی قۆناغی شیزۆ-پارانۆیدی schizo-paranoide بە نەخۆشی(پاسۆلۆژی) دابنێین، بەڵام ئەوەی دەتوانرێت بە نەخۆشی دابنرێت، بریتییە لەشکستهێنان لەنواندنی هەڵسوکەوتدا بەپێچەوانەی ئەمەوە لەدواییدا، واتە بە پێچەوانەی شێوازە دێرینەکەو ئەوەی بۆ سەردەمی منداڵی دەگەڕێتەوە: لەپەیوەندی خۆشەویستیدا ناکرێت پەنابردن بۆ دابەشبوون و ئایدیالیزەکردن بە نەخۆشی دابنرێت، بەڵام ئەوەی بە نەخۆشی دادەنرێت ئەوەیە تاك لەداهاتوودا لەگەڵ سەلماندنی واقیع و تێپەڕبوونی کاتیشدا ناتوانێت بەشێوەی جیاواز هەڵسوکەوت بکات .

کرداری ڕەتکردنەوەی واقیعە ڕێگە لەتاك دەگرێت لەدانانان یان تەسلیمبوون بەوەی کە هاوبەشەکەی خاوەنی بوونێکی تایبەتییە، هەروەها بەهۆی دابەشبوون و ڕەتکردنەوەی چڕەوە پشتیوانی لەئایدیالیزەکردنی ئەو وێنەیە دەکرێت کە دەربارەی ئەو هاوبەشە هەر لەسەرەتاوە دروستبووە. وێڕای ئەمانە ئەستەمە تاك بۆ تەنیا ساتێکیش دەستبەرداری تێرکردنی پێداویستییە نارسیزمەکانی خۆی ببێت. بەڵام بە پێچەوانەوە، گەڕانەوەی پاڵنەرە شەڕانگێزییەکان بەرامبەر هاوبەشەکەی دی، بەمەرجی سەرەکی دادەنرێت، کە ڕێگەدەدات بە گەڕانەوە بۆ پەیوەندییەکی دووفاقی(خۆشەویستی و ڕق)و دانانان بە هەندێك لەسەربەخۆیی هاوبەشی بەرامبەر یان بابەتی خۆشەویستیی.

ئەستەمی گەیشتن بە پەیوەندییەکی دووفاقی لەگەڵ هاوبەشی



بەرامبەردا، وەك حاڵەتێکی نەخۆشی دەردەکەوێت، چونکە تاك لەناو خودی خۆیدا بەردەوام هەوڵدەدات بەشێوەیەکی تەواو پارێزگاری لەوێنەیەکی گونجاوی هاوبەشەکەی بکات و هەر لایەنێکی نێگەتیڤیش دووربخاتەوە. ئەو لایەنە نێگەتیڤە دەخاتە پاڵ خێزان یان کەسوکاری هاوبەشەکەیی و بەمشێوەیە شەڕانگێزیی ئاڕاستەی کەسانی دیکە دەکات و پارێزگاری لەپەیوەندییەکی ئایدیالیزەکراو لەگەڵ هاوبەشەکەیدا، دەکات: ئاڕاستەکردنی ئەم شەڕانگێزییە لەلایەکەوە پەیوەندی بە دابەشبوونەوە هەیە و لەلایەکی دیکەوە پەیوەندی بە ئەستەمی دانان بەبوونی هەر ڕەگەزێکی شەڕانگێزیی هەیە لەناو خودا کە ئاڕاستەی هاوبەشی بەرامبەر بکرێت. کەواتە ئەوەی بەردەوام بە نەخۆشی دەردەکەوێت چەسپاندنی ڕەتکردنەوەی واقیعە ئەویش وەك هەوڵدانێك بۆ فەرامۆشکردنی پاڵنەری مردن بەهەردوو روخسارەکەیەوە، رووخساری روخێنەر بۆ خودو روخێنەر بۆ ئەویدی.

پاساوە جیاوازەکان بۆ ڕەفتاری شەڕانگێزی لای کەسی لاواز وەك دەرئەنجامی پێداویستیی زۆری تاك بۆ ڕەتکردنەوەی پاڵنەری مردن لەناو خوددا دەردەکەوێت هەروەها بۆئەوەی ئەو پاڵنەرە بخاتە پاڵ کەسێکی دی، هەروەك بڵێی ئەم کەسە لەدرککردنیدا بەبوونی تۆزقاڵێك لەرقوکینە بەرامبەر بابەتی خۆشەویستیی هەست بە گوناهێکی بەهێزو بەرگەنەگیراو دەکات، لێرەدا ئەستەمیی لەدرکردنی ئەوی بەرامبەر وەك بابەتێکی خراپ کۆنابێتەوە، هێندەی ئەوەی ئەو تاکەی بەرامبەر تا چەند بابەتێکە بۆ خۆشەویستی، واتە بەو هێندەی ئەو کەسە چەندە لەلایەن تاکی بەرامبەرەوە وەرگیراو بێت و لەرێگەی

پرۆسەی خۆشەویستییەوە لەگەڵیدا پێکەوەنووساوبێت. ئەم کارە روودەدات هەروەك بڵێی ئەم بابەتە پێکەوەنووساوە لەگەڵ تاکدا بۆتە بابەتێکی خراپو دەستدرێژی دەکاتە سەر ئەو کەسە خۆی یان کەسەکە تێکدەدەاتو ئەویش لەچوارچێوەی بەجێهێنانی کارێکدا کە لێکچووە لەگەڵ بەجێهێنانی قۆناغە سەرەتاییەکانی شیزۆ- پارانۆیدی. ئەگەر لەناو مندا پێکەوەنووسان لەگەڵ ئەو بابەتە خراپەدا یارمەتیدەر بێت لەوەی ئەو کەسە خۆی خراپ ببێت و پاڵی پێوە بنێت بۆ وێرانکردنی، ئەوا لەدژی ئەم مەترسییە تاك لەرێگەی ئایدیالیزەکردنی هاوبەشەکەیی و گۆڕینی بۆ وێنەیەکی هاوجێ لەگەڵ خودی خۆیدا بەرگری لەخۆی دەکات. ئەو تاکە خۆی لەسەلماندنی واقیع بە دوور دەگرێت .

کەواتە ئەستەمە زمانی تەقلیدی لەسایکۆلۆژیی نەخۆشیدا بۆ ئەو نەخۆشیانەی کە تایبەتن بە ژیانی خۆشەویستیی بەکاربهێنرێت، چونکە خۆشەویستی لەژیانی سایکۆلۆژیی- سۆزداریدا، فۆرمە فرە دێرینو ئەوانەی زیاتر بۆ سەردەمی منداڵی دەگەڕێنەوە بەکاردەهێنێت: پێکەوە نووسانو وەرگرتنو هەڵلوشینی ئەوی بەرامبەر، هەموویان پێکەوە پێکهاتەی خۆشەویستی پێکدێنن، لەبەرئەوە لایەنە ئاشکراکانی خۆشەویستیی تەنانەت ئەولایەنانەی کە کارتێکراو کارتێکەریشن ناتوانرێت بە نەخۆشی واتە(حاڵەتی پاسۆلۆژی) دابنرێن، هەروەها ئەوەی یارمەتی تێگەیشتن لەم سەلمێنراوە کلینکیە دەدات، ئاشنابوونە بەو دژایتییەی ، لەچوارچێوەی خێزانو لەدەرەوەی خێزاندا لەهەڵسوکەوتی تاکدا روودەدات: هەندێك لەو کەسانەی وادادەنرێت (کە هاوسەنگ)و



بەویقارو ناوازەن، لەژیانی کۆمەڵایەتیی و پیشەییاندا کەسانی گونجاوو تێگەیشتوون، بەڵام ئەم کەسانە لەچوارچێوەی خێزاندا چەوسێنەرو زاڵمن. بەپێچەوانەشەوە، هەندێجار تێبینی دەکرێت کەسانێك هەن لەژیانی کۆمەڵایەتییدا تاوانبارو جەلادو لادەرو شەڕانگێزن، بەڵام لەناو چوارچێوەی خێزانی خۆیاندا، کەسانێکن توانای خۆشەویستییان هەیەو بەسەبرو دڵسۆزن.

نەخۆشییەکانی خۆشەویستی لەنەخۆشییە نارسیزمییەکان دەچن، تەنیا ئەوەندە بەسە سنووری تایبەتی تاك یان خستنەوەبەرفرمانی نارسیزمی (من- moi) رووبەڕووی مەترسی ببێتەوە، ئەو کاتە پەرچەکرداری بەرگریی سەرهەڵدەدات کە توانای هەیە لەفۆرمی پاسۆلۆژی توندا دەربکەوێت: دەڵێین پاسۆلۆژی(یان نەخۆشی)، چونکە لەئەنجامی روودانی دژبەیەکییەك لەناخی کەسی ناچاردا دەردەکەوێت (کەسێك بۆ بارێك ناچار بێتو توانای هەڵبژاردنی لەنێوان دووشتدا نەبێت لەبەرئەوەی پێویستی بە هەردووکییانە-وەرگێڕ) لەکاتێکدا بەرەنگاری بابەتی خۆشەویستیی دەکات کە زۆر پێویستیشی بەوەیە پارێزگاری لێبکات، بەمانایەکی دیکە دەتوانین بڵێین ئەم کەسە بەرەنگاری ئەو پەیوەندییە تایبەتیی دەکات لەکاتێکدا ناتوانێت بەرگەی ئەو بیرۆکەیە بگرێت کە ئەو پەیوەندییە بخاتە بەر لێدوان یان تەنانەت بیر لەپچڕانو هەڵوەشاندنەوەی بکاتەوە.

لەواقیعدا ئەستەمە تەنیا لەسنوری تاکدا باس لەنەخۆشییەکانی ژیانی خۆشەویستیی بکرێت، چونکە تەنیا لەسنووری کۆمەڵدا نەبێت ناتوانرێت لەبەیەکداچوونو تێکچڕژان لەتوانای تووشبوون بە

نەخۆشی تێبگەین، واتە دەبێت بەهۆی بەجێهێنانی ئاڵوگۆڕکراوی خولیی(دەوری)و پەرچەکرداری گەڕانەوەیی retroaction وە بێت: ئەگەر یەکێك لەو دوو هاوبەشە هەوڵیدا وەڵامدانەوەی هاوبەشەکەی دی هێوربکاتەوەو بۆ باری هاوسەنگیی پێشووی بگەڕێنێتەوە ئەوا پەرچەکرداری گەڕانەوەیی نێگەتیڤ دەبێت، بەڵام ئەگەر یەکێك لەو دوو هاوبەشە لەرێگەی خستنەڕووی وەڵامدانەوەی هاوشێوەی وەڵامدانەوەی هاوبەشەکەی پشێوی ئەو هاوبەشەی زیادکرد، ئەوا پەرچەکرداری گەڕانەوەیی پۆزەتیڤ دەبێت.

کارلێکردنی سایکۆلۆژیی نێوان دوو هاوبەش و رۆڵی یارمەتیدەری هاوبەشییان لەیەك فەنتازییادا: بۆ نموونە (وەرگرتن و هەڵلوشینی ئاڵوگۆڕکراوو چەوساندنەوەو سادی- مازۆشی و چەندانی دیکە) ئەمانە هیچ کاتێك بوونی نەخۆشیی بە شێوەی تاکانەیی یان تایبەت لای یەکێکیان رەتناکاتەوە. بۆ نموونە ئەگەر مەسەلەی (شکستهێنانی سێکسوالی) مان لای یەکێك لەو دوو هاوبەشە وەك نموونە وەرگرت، تێبینی دەکەین ئەم هاوبەشە پەنا دەباتە بەر وەستانی تاکانەیی لەبەجێهێنانی کاری سێکسوالی و بەمەش رێگەگرتنی خۆی لەئەنجامدانی کاری سێکسوالی بەشێوەیەکی تەواو، ئاشکرا دەکات (واتە دەردەبڕێت): ئەم نیشانەیە بۆ ئەم هاوبەشە جۆرێك لەچاکسازیی و رێککردن بەدیدەهێنێت لەلایەکەوە لەنێوان نیازو ئارەزووە ئاشکراکانی (وەك گەڕان بە شوێن تێرکردندا، رەتکردنەوەی ملکەچبوون بۆ ئارەزووی ئەوی بەرامبەر، رەتکردنەوەی داننان بە دەسەڵاتیدا، سزادانی یان هەر نیازێکی دیکە)، یان نیازو ئارەزووە نەستییەکانی(وەك خۆبەدوورگرتن



لەدڵەڕاوکێی خەسان، خۆبەدورگرتن لەبەرگەگرتنی گرێی شەڕانگێزی یان سادیزم لەتوانای سێکسواڵداو هی دیکە). ئەم نیشانەیە دژبەیەکی ناوەوە لای یەکێك لەودوو هاوبەشە دەسەلمێنێت، ئەم حاڵەتە بەهۆی بوونی ئەم سیفەتەوە(بوونی دژبەیەکی) شایەنی ئەوەیە بە بارێکی پاسۆلۆژیی (نەخۆشی) دابنرێت، بەچاوپۆشین لەوەی سەرچاوەی فاکتەرەکانی تاکێتیی کە بوونەتە هۆی روودانی، هەرچییەك بن.

لەم بارودۆخەدا، پێویستە نەخۆشی تاکانەیی (واتە ئەو نەخۆشییانەی پەیوەندییان بە کەسەکە خۆیەوە هەیە-وەرگێر)و نەخۆشی پەیوەندی (واتە ئەو نەخۆشییانەی پەیوەندییان بە پەیوەندی کەسەکە لەگەڵ هاوبەشەکەیدا هەیە-وەرگێڕ) بەباشی لەیەکتر جیابکرێنەوە هەرچەندە رووبەڕووی ئەستەمیش لەدیاریکردنیان بەشێوەیەکی ورد، ببینەوە.

دانیشتنە کلینکییەکان ئەم راستییانەیان ئاشکرا کردووە کاتێك ئاماژەیانداوە بە پارادۆکسێك لەنێوان پەیوەندییە نەخۆشەکان کە هاوبەشەکان تووشی ئەشکەنجە دەکەن و دەیانبەستنەوە لەکاتێدا ئەو هاوبەشانە لەپێش هاوسەرێتیاندا هیچ نیشانەیەکی نەخۆشییان پێوە دیارنەبووە لەگەڵ ئەو تاکانەی بەدەست پشێوی گەورەوە لەپێش هاوسەرێتیاندا ناڵاندوویانەو، بەڵام کە هاوسەرێتیان کردووە توانیویانە بگەنە کۆنترۆڵکردنی ئەم پشێوییانە: هەندێك نەخۆش دەتوانن پەیوەندی تا رادەیەك گونجاو دروستبکەن و لەوە دەچێت ئەم پەیوەندییانە زامنی ئەو بارودۆخەیان بۆ بکات کە یارمەتیان دەدات بۆ بەدیهێنانی کرانەوەی کەسێتیان و ئەستەمە بێ

بوونی ئەم پەیوەندییانە ئەم کرانەوەیان بۆ بەدیبهێنرێت.

بەچاودێریکردنی هەندێك لەو کەسانەی تووشی نەخۆشی سایکۆسسی (لەشێوازی پارانۆیدی) بوونو پەیوەندی هاوسەرێتی ئارامو درێژخایەنیان بەستووە، تێبینی دەکرێت جۆرێك لەرێکخستنی تایبەتی دەردەکەوێت کە دەناسرێت بەوەی هاوبەشە ساغەکە(سروشتییەکە) توانایەکی گەورەی بۆ لێبوردنو چاوپۆشین هەیە بەرامبەر دەربڕینە وڕێنەییە ئاشکراکانی ئەو هاوبەشەی دی کە نەخۆشە (واتە ئەو هاوبەشە ساغە جۆرێك لێبووردنی بەرامبەر ئەو هاوبەشە نەخۆشە هەیەو گوێ بە وڕێنەکانی نادات–وەرگێڕ)، هەروەها تێبینی دەکرێت منداڵەکانی ئەم دوو هاوبەشە(کە یەکێکیان نەخۆشن) ئەوانیش توانای لێبوردەیی هەڵدەگرنەوەو زۆرکات ئەمە دەرئەنجامی مەترسداری بۆ سەر گەشەی سایکۆلۆژییان، نابێت (واتە بەهەمان شێوە منداڵەکانیشیان توانای لێبووردنیانو هەیەو نەخۆشییەکەی دایك یان باوکییان فەرامۆش دەکەن– وەرگێڕ).

هەروەها دەتوانین لەچوارچێوەی ئەم پەیوەندییەدا دوو شێوازی دژبەیەك لەکرداری هاوچەشنیکردنی ئاڵوگۆڕکراو، جیابکەینەوە: ئەم هاوچەشنیکردنە لای هەندێك کەس لاواز دەبێت واتە ئەو دوو هاوبەشە هەردووکیان لەبارێکی خۆپارێزیدا دەمێننەوەو هەریەکەیان چۆنێتیی بەجێهێنانی کرداری سایکۆلۆژیی ناوەوەی ئەویدی فەرامۆشدەکاتو پەیوەندیکردن لەنێوانیاندا بە گەمارۆو سنوورداری دەمێنێتەوە. بەڵام لای هەندێکی دی تێبینی پێچەوانەی ئەمە دەکرێت، هاوچەشنیی ئاڵوگۆڕکراو لەنێوان ئەو دوو هاوبەشەدا بەهێز دەبێت، بەمەش پەیوەندیی نێوانیان لاوازتر دەبێت، ئەم



پەیوەندییە بە شێوەیەك دەردەکەوێت هەروەك بڵێی کەمترین ئاست لەخۆپاراستن بۆ هەریەکەیان بەرامبەر رووبەڕووبوونەوەی هەستکردن بە لاوازی خود زامندەکات، هەروەها لەوانەیە بارێکی وڕێنەیی ئاشکراو هاوبەش لەنێوانیاندا دروستببێت، بارێکی وڕێنەیی کە ئەو دوو هاوبەشە لەنێوان خۆیاندا بەشیدەکەن تەنانەت ئەگەر تەنیا یەکێکیشیان لەشێوازی سایکۆسسی بێت.

ئەو پەیوەندییانەی کەسانی خەمۆك لەخۆدەگرن، گرژترنو زۆرکات رێکخستنی تایبەتیان هەیە، چونکە ئەو جۆرە کەسانەی ئەم پەیوەندییانە دەبەستن پەیوەندی خۆشەویستی وەك هۆکارێك بۆ بەرهەڵستیکردنی پاڵنەری مردن بەکاردەهێنن. ئەو هەڵوێستە خەمۆکییەی یەکێك لەو دوو هاوبەشە دەیگرێتەبەر وەك (هەستکردن بە گوناه، رەشبینی، دابەزینی بەهای خودێتی)، لەوانەیە تاك بەشێوەیەك تیایدا بژی یان کەسی بەرامبەر بەشێوەیەك هەستی پێبکات، هەروەك بڵێی بانگەشەیە بۆ خۆپاراستنو هەروەها جەختلێکردنەوەیەکی بەهێزترە لەبەهای خود. ئەم هاوبەشە خۆی دەبینێتەوە دڵنیایە لەخۆی بەو سیفەتەی پارێزەری هاوبەشە خەمۆکەکەیەتی، بەمەش لەرێگەی ئەو پشتیوانیەوە کە پێشکەشی هاوبەشەکەی دەکات بەهای خودێتیی زیاددەبێت. دابەشکردنی ئەم رۆڵانە بە رێگەیەکی هاوتا رێکدەخرێت.

لەمبارەدا هەمیشە شلۆقیو نۆبەتداری لەرۆڵەکاندا یان بارودۆخە سەرەکییەکاندا روودەدات، لەکاتێکدا هاوبەشی دووەم خەمۆك دەبێت هاوبەشی یەکەم بۆ دۆخی سروشتیی دەگەڕێتەوەو متمانەی بەخۆی دەبێتو هەوڵدەدات یارمەتی هاوبەشە خەمۆکەکەی بداتو رۆڵی

پارێزەرێك بۆ هاوبەشەكەی، دەبینێت.

پێویستە ئاگاداری ئەوە بین، بەشێوەیەكی جیاكراوە، رێكخستنی هاوتایی هەمیشە بە ئاڕاستەی جوڵە یان نۆبەكاری لەبارودۆخی خەمۆكیدا، روونادات. لەباری ئاساییدا (پەرچەكرداری گەڕانەوەیی) لەشێوەی شێوازی نێگەتیڤدا، روودەدات كە ئامانجی كەمكردنەوەی خەمۆكی یەكێك لەو دوو هاوبەشەیەو لەزنجیرە كردارێكی خولیدا(دەوریدا) دەیخاتەپاڵ هاوبەشەكەی دی كە بەمە توندی رووخساری نەخۆشیی بەرامبەر پەیوەندیی نێوانیان بەیارمەتی جۆرێك لەرێكخستنی ئاڕاستەیی خود، هێور دەبێتەوە. لەهەندێك حاڵەتی دەگمەندا تێبینی دەكرێت پەرچەكرداری گەڕانەوەیی لەشێوەی شێوازی پۆزەتیڤدا روودەدات، بەو مانایەی جۆرێك لەخەمۆكیی تاكانەیی بەشێوەیەكی ئاڵوگۆڕكراو گەورە دەكرێت (واتە هەر یەك هەوڵدەدات خەمۆكی ئەوی دی زیادبكات – وەرگێڕ) بە ئیستدلالی دەتوانین وایدابنێین ئەم دیاردەیە هەروەك بڵێی بناغەیەك بێت بۆ روودانی هەندێك تراژیدیای ناوازە، بەتایبەتی وەك لەحاڵەتی خۆكوشتنی بەكۆمەڵدا تێبینی دەكرێت. لێرەدا دەردەكەوێت رێكخستنی ئاسایی خولی(دەوری) بەهۆی پەرچەكرداری گەڕانەوەیی نێگەتیڤەوە بەشێوەیەكی باش كاری نەكردووەو لەوانەیە بەهۆی كردارێكی پێچەوانەوەی گرنگترەوە رێگەی لێگیرابێت، هەروەك بڵێی ئەو ئازارە سایكۆلۆژییەی یەكێك لەو دوو هاوبەشە چەشتوویەتی، بۆتە هۆی هەستكردن بە گوناهو دڵەڕاوكێو ئازار لای هاوبەشەكەی دیو ئەمەش رێگەی لێگرتووە رۆڵی خۆی بگۆڕێتو فرمانی پاراستنو چاودێری بەرامبەر ئەویدی، بووروژێنێت. كەواتە



لەكرداری چاكسازی یان قەرەبووكردندا نوشستی یان هێواشییەكی گەورە بەدیدەكرێت كە كاتی پێویستی نەبووە بۆ دەستێوەردان لەپێش روودانی تراژیدیاكەدا: ئەو ئازارەی لەلایەن یەكێك لەو دوو هاوبەشەوە دەچێژرێت بۆتە هۆی (وەستانی جەختلێكردنەوە) لای هاوبەشەكەی دی كە لەلایەن خۆیەوە جەختلێكردنەوەی لەهەستكردن بەبەهای خود لەهاوبەشی یەكەمدا وەستاندووە، دەتوانین لەم حاڵەتە جیاكراو یان تایبەتیانەدا بڵێین، ئەم پەیوەندییە لەپێش ئەوەی فرمانی ئاسایی خۆی لەبەرگریكردنو سەرلەنوێ گەڕانەوەی چاكسازی پراكتیزە بكات، بەشێوەیەكی بێزراو فرمانی گەورەكردنی خەمۆكی لای هاوبەشەكەی دی پراكتیزە كردووەو ئەمەش كاریگەری پاسۆلۆژیی بە جێهێشتووە.

پێویستە ئەوە لەیادنەكەین ئەم جۆرە دیاردانە ئەستەمە تێبینیان بكرێت، هۆكاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئەم جۆرە پەیوەندییانە هیچ كاتێك دروست نابنو ئەگەر دروستیش بوون درێژە ناكێشن، بەباشی ئەوە دەزانین فرمانی پەیوەندی زامنكردنی پاراستنو چاودێرییە، بەڵام ئەوەی لەم جۆرە پەیوەندییانەدا تێبینی دەكرێت پێچەوانەكەیەتی، واتە جۆرێكە لەتێكشكاندن: ئەگەر یەكێك لەو دوو هاوبەشە هەستیكرد هاوبەشەكەی بەهای نارسیزمی ئەمی رووبەڕووی مەترسی كردۆتەوە ئەوا ئەستەمە بۆی هیچ پەیوەندییەكی چەسپاو لەگەڵیدا رێكبخات، چونكە ناشێتو ناكرێت پەیوەندی بەردەوام بێتو بچەسپێت تەنیا لەو بارەدا نەبێت كە هاوبەشەكەی دی بابەتی خۆشەویستی بێتو هەروەها هۆكارێكیش بێت بۆ جەختلێكردنەوە لەنارسیزمی خودێتی ئەویدی.

کەواتە دەتوانین بڵێین ئەو پەیوەندییەی پەرچەکرداری گەڕانەوەیی تیایدا نێگەتیڤە ئەوە پەیوەندییەکی سروشتییە، چونکە ئامانجی گەڕانەوەی هاوسەنگیو کۆنترۆڵکردنی خودە، هەرچی ئەو پەیوەندییەیە کە پەرچەکرداری گەڕانەوەیی تیایدا پۆزەتیڤە ئەوا پەیوەندییەکی پاسۆلۆژییە pathologique، چونکە بەهۆی هەریەك لەو دوو هاوبەشەوە کرداره پاسۆلۆژییە ورووژاوەکان گەورە دەبن، دابەشکردنی ڕۆڵەکان لەم پەیوەندییەدا لەگەڕانەوەی هاوسەنگیو کۆنترۆڵکردنی خود-دا فرمانی خۆی نەبینیووە، بەڵکو بە پێچەوانەوە بۆتە هۆی تێکدانیو وێرانکردنی.

لەچوارچێوەی پێوەری پەیڕەوکراو بۆ دیاریکردنی ئەو نەخۆشییانەی تایبەتن بە پەیوەندی، مەسەلەی ڕۆڵی نەخۆشیی تاکانەیی هەریەك لەو دوو هاوبەشە دێتە ناوی (مەبەست لەو نەخۆشییانەیە کە هەریەك لەدوو تاکە خۆیان هەیانە-وەرگێڕ)، هەروەها زانینی ئەوەی ئایا ئەو پەیوەندییە هاوسەرێتییە دەبێتە هۆی هێورکردنەوەی ئامادەباشی تووشبوون بەم نەخۆشییانە لەتاکدا یان دەبێتە هۆی بەهێزکردنی ئامادەباشی تووشبوون پێیان.

لەو حاڵەتانەدا کە ئازار لای یەکێك لەو دوو هاوبەشە یان لای هەردووکیان جێگیر بووە یان چەسپاوە، ئەستەمە ئەوە بزانرێت یان دیاریبکرێت ئایا ئەو پەیوەندییە هاوسەرێتییەی نێوانیان ڕۆڵی هەیە لەم ئازارەدا: لەزۆربەی حاڵەتەکاندا سەلمێنراوە پچڕانی ئەو پەیوەندییە یارمەتیدەر نابێت لەهێورکردنەوەی ئەم ئازارەدا، هەروەها دەرکەوتووە ئەو مازۆشییەی ڕۆڵی هەیە لەکێشبەندی ئەو ئازارەدا لەکاتی بوونی پەیوەندیدا بەهێز نابێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە



زیاتر دەرکەوتووتر دەبێتو شێوەیەکی ئیرۆسی هاوکات لەگەڵ چێژدا، وەردەگرێت. هەروەها وا دەردەکەوێت کە ئەو ئازارە ناتوانرێت وەك پێوانەیەکی گونجاو بۆ دیاریکردنی نەخۆشییەکانی تایبەتن بە پەیوەندی نێوان دوو هاوبەش بەکاربێت، چونکە ئەو ئازارە بە پلەیەك لەپلەکان بەشێك لەبوونی مرۆیی وەك گشت، پێکدێنێت، هەروەها ئەم ئازارە لەهەندێك قۆناغی ڕەخنەییدا کە دوو هاوبەشەکە ڕووبەڕووی دەبنەوە سوودبەخش دەبێت بەتایبەتی لەو قۆناغانەدا کە یارمەتیدەر دەبێت لەسەر نوێ بیناکردنەوەی پەیوەستییە ناوەکییەکانی نێوانییانو سەرلەنوێ بیناکردنەوەی پەیوەندی نێوانیان بەشێوەیەکی زیندوو نوێکار.

کەواتە ناکرێت پلەی ئەو نەخۆشیانەی تایبەتن بە پەیوەندی نێوان دوو کەس دیاریبکرێن (مەبەست لەو نەخۆشییانەیە کە تووشی پەیوەندی نێوان دوو کەس دەبێت واتە پەیوەندییەکە خۆی پەیوەندییەکی دروست نییە-وەرگێڕ)، هەروەها تێبینیکردنی بارێکی دیاریکراوی تایبەتی ناشێت بەسەر هەموو حاڵەتەکاندا، گشتگیر بکرێت: ئەگەر هەندێك کەس بڵێن لەدوای پچڕانو لێکهەڵوەشاندنەوەی پەیوەندییەکەیان دڵخۆشو بەختەوەرتربوون ئەوا کەسانی دیکە هەن(کە لەکاتی پەیوەندی هاوسەرێتییاندا دڵتەنگو خەمبار بوون) دەڵێن لەدوای پچڕانو لێکهەڵوەشاندنەوەی پەیوەندی هاوسەرێتییان دڵتەنگو خەمبارتربوون.. لەهەموو حاڵەتەکاندا پێودانگی تایبەتی هەیە ڕێگە بە بەراوردکاری نادات.

بەمشێوەیە ناکرێت لەپێودانگە خودیی یان تاکێتییەکانەوە لەمەسەلەی نەخۆشی تێبگەین، بەڵکو پێویستە لەخودی

پەیوەندییەکەوە وەك ستراکتۆر structure و تێگەیشتن لەمۆرکی پاسۆلۆژییانەی پەیوەندیی باس لەمەسەلەی نەخۆشی بکرێت.

هەر جیاوازییەك لەنێوان رێکخستنی فەرمی پەیوەندییو چۆنێتی بەڕێوەچوونو بەجێهێنانی لەواقیعدا، تێبینی بکرێت لەوانەیە ئاماژەبن بۆ بوونی تێکچوون لەچۆنێتی بەجێهێنانیی ئەو پەیوەندییەو ڕوودانی بەدحاڵیبوون لەنێوان دوو هاوبەشەکەدا.

ئەم جیاوازییە روونو ئاشکرا لەبریکارێتی یان کۆمسیۆنکردنی شاراوەی رۆڵەکاندا دەردەکەوێت کە ئەو رۆڵە شاراوانە لەچوارچێوەی پەیوەندی هاوسەرێتیدا هیچ کاتێك لەگەڵ پراکتیزەکردنە واقیعییەکانیاندا هاوجێنابن بەتایبەتی لەمەسەلەی دەسەڵاتو پلەوپایەدا، هەندێك کەس لەوانەیە پەنا ببەنە بەر بەکارهێنانی نەخۆشی راستەقینە یان ئازار بۆئەوەی هاوسەنگی لەپەیوەندیی دەسەڵاتو پلەوپایە لەگەڵ هاوبەشەکانیاندا بگەڕێننەوە. بۆ نموونە لەچوارچێوەی پەیوەندییدا شکستهێنانی دووبارە بۆوە یان رووخسارەکانی نەخۆشییە دەروون- جەستەییەکان (واتە سایکۆسۆماتییەکان) لای یەکێك لەو دوو هاوبەشە دەردەکەوێتو - لەرووی مەبدەئەوە هەژموون دەگرێت بەسەریدا- ئەو هاوبەشە ئەم نەخۆشیانە وەك هۆکارێك بەکاردەهێنێت تا ئەو دەسەڵاتە بگەڕێنێتەوە بۆخۆی کە هاوبەشە چەوسێنەرەکەی بەشێوەیەکی تەواو لێی داماڵیووە.

دەتوانین بە کورتی بڵێین پەیوەندی ئەو شوێنەیە تیایدا گوزارشت لەئارەزوو مەیلە دێرینو ئەوانەی بۆ سەردەمی منداڵی تاك دەگەڕێنەوەو رووخسارە نەستییەکان، دەکرێت، لەبەر ئەم هۆیە



پەیوەندی ئەو شوێنەشە کە بە ناهەقی تیایدا پەیوەندییە دروستو پاسۆلۆژییەکان دیاریدەکرێن.

هەموو تاکێك بەشوێن جەختلێکردنەوە لەبەهای نارسیزمیی خۆیدا دەگەڕێت، لەکاتێکدا ئەگەر پەیوەندیی ئەم پێداویستییانە بۆ دابیننەکات ئەوا ئەو پەیوەندییە هەڕەشەی نەمانی لەسەر دەبێت یان دەبێتە هۆی ڕوودانی بەدحاڵیبوونێکی هەمیشەیی لەنێوان دوو هاوبەشەکەدا.

